زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی ١٥

# ژن و مێردی ئیسلامی بەختەوەر

وەرگێران و ئامادەکردنی

نەوا محمد سعید

چاپی شەشەم







2008

## مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین .
- ئاشناکردنی خوێنەرە لاوی موسڵمانی کورد بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی و سازێنەری ڕابوونی ئیسلامین .
- شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە ، ئازادکردنیان لە گشت کۆت و بەند و بۆچوونی تەسکی حزبایەتی و تاکڕەوی و ڕەوتگەرایی .
- بناغەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتییەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسڵمانی کورد ، تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکارییانە هەبێ ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردووە .

دەگەڵ ڕێز و تەقدیرمان بۆ بیروڕای نووسەرانی ئەم زنجیرەیە ، مەرجیش نییە ئێمە پابەندی هەموو بیر و بۆچوونەکانیان بین .

با دەستووریشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت :

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

التفسير

# ژن و مێردی ئیسلامی بەختەوەر

نووسینی

## محمود مهدی الاستانبولی

وەرگێڕان و ئامادەکردنی

## نەوا محمد سعید


چاپی یەکەمی وەرگێڕان – ١٩٩٥
چاپی دووەمی وەرگێڕان – ١٩٩٧
چاپی سێیەمی وەرگێڕان – ٢٠٠١
چاپی چوارەمی وەرگێڕان – ٢٠٠٣
چاپی پێنجەمی وەرگێڕان – ٢٠٠٥
چاپی شەشەمی وەرگێڕان – ٢٠٠٨






بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

ناوی کتێب بە عارەبی: الزواج الإسلامي السعيد
ناوی نوسەر: محمود مهدي الاستانبولي
ناوی کتێب بەکوردی: ژن و مێردی ئیسلامی بەختەوەر
ناوی وەرگێڕ: نەوا محمد سعيد
چاپ و بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
کۆمپیوتەر: نوسینگەی تەفسیر
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: ئەمین مخلص
دیزاینی ناوەوە: عزالدین محمد
نۆرە و ساڵی چاپ: شەشەم ١٤٢٩ك - ٢٠٠٨ز
تیراژ: ٥٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: ٢٦٤ ساڵی ٢٠٠٣

تەفسیر
بۆ بلاوکردنەوەو راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٠٧٥٠٤٦٠٥١٢٢ - ٠٧٧٠١٣٨٧٢٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

www.al-tafseer.com

# پێشکەشە

بەو کوڕو کچە مسولّمانەی کە سورە لەسەر ژیانی داوێن پاکیو، ئارەزومەندی ژیانێکی شادەو هەوڵی پێکەوەنانی نەوەیەکی بەهێزی بڕوادار دەدات .

بە بۆنەی پێشڕەوی کردنیان دەربارەی هاوسەر گرتن، ئەم نامەیان پێشکەش دەکەم.

خوای گەورە لەسەر بەختی باش پیرۆزی بکات.

# پێشەکی چاپی شەشەمی وەرگێڕان

تەنها بە ناوی خوای تاكو پاك

سوپاس و ستایشی بێژمار بۆ خودای بەخشندەی میهرەبان درودو سڵاو برژێ بەسەر پێغەمبەرو ئالی بەیتو یارانی.

سەری نەوازش بە ملکەچیەوە بۆ پەروەردگاری جیهان دادەنوێنم، کە فەزڵو چاکەی ناوازەی پێبەخشیم، کە جارێکی تر بۆ شەشەمین جار کتێبی (ژنومێردی ئیسلامی بەختەوەر)، جیاکار لە چاپەکەی پێشوو، بە قەبارەی گەورەو بە بژارکردنی هەڵەکانو ڕاستکردنەوەیان، دنیای چاپ ببینێتەوە، خوێنەرانی لە ئاوی سازگاری تێنوێتیان بشکێنن.

دیارە چاپی پێنجەم، کە لە چاپخانەیەکی بەغدا بە چاپ گەیشت، هەڵەی زۆری لەخۆ گرتبوو، لە مۆنتاژیش هەڵە کرابوو، کە دوو بابەت دووبارە دانرابۆوە، کە ئەمەش بە دەر لە ویستی ئێمەبوو، چونکە کارمەندانی چاپخانەکە شارەزای زمانی کوردی نەبوون. هەر بۆیە داوای لێبوردن دەکەین، کە بەم شێوەیە کەوتە بەردەستی خوێنەران.

دەمەوێ ئاماژە بەوە بکەم، کە لە چاپی یەکەمیشدا ئاماژەم پێداوە، کە بابەتانێ هەبوون، نوسەر بە پێی بارو ڕەوشی ناوچەکەی خۆی دایبەزاندووەو، بۆ ئەوێ مایەی سود لێوەرگرتن بووە، بە پێویستم نەزانیوە تەرجەمەکەی بکەم، هەروا پرسیارە جنسیەکانیش، زۆرینەی پرسیارەکان لە یەك تەوەرەدا دەخولانەوە، بۆیە ئەوانیشم بە پێی پێویستی و بە چڕکراوەیی تەرجەمە کردووە.

حەز دەکەم خوێنەرانی ئازیزم زانیاریان هەبێ، کە ئەم کتێبە هەر لە چاپی یەکەمەوە (١٩٩٥) تا چاپی شەشەم (٢٠٠٨)، پازدە هەزار دانەی چاپکراوە، ئەمەش مایەی دڵخۆشیو ئاسودەییە، گەر خودای میهرەبان لە بەندەی گوناهبار وەربگرێو، بیکاتە مایەی سڕینەوەی گوناهەکانمو لە نامەی کردەوە باشەکان بۆم تۆمار بکات.

نەوا محمد سعید

١٠ی ڕەمەزانی ١٤٢٨

٢٣ / ٩ / ٢٠٠٧ ز

هەولێر

# پێشه‌کی چاپی پێنجه‌می وه‌رگێڕان

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا اله الاّ الله وأشهد أن محمداً عبده ورسوله وبعد:

سوپاس و ستايشی بێپايان بۆ په‌روه‌ردگاری جيهانيان، كه بواريدا ئه‌م په‌رتوكه بۆ پێنجه‌م جار به‌زمانی شيرينی كوردی به پوخته‌كراوی‌و هه‌ڵه‌بژێری له‌سه‌ر ئه‌ركی نوسينگه‌ی ته‌فسير چاپ بكرێته‌وه، خوای گه‌وره پاداشتيان بداته‌وه.

دياره له چاپدانه‌وه‌ی ئه‌م كتێبه بۆ جاری پێنجه‌م مانای زۆرو به‌ڵگه‌ی به‌نرخيی‌و زيندويی‌و واقيعيه‌تی بابه‌ته‌كانی‌و سه‌ركه‌وتويی ده‌به‌خشێ.

هه‌ر بۆيه كه چوار جار چاپ كراو كه‌وته به‌ر ديدی خوێنه‌رانيه‌وه، به هه‌موو چين و توێژێكه‌وه به گه‌رمی‌و به په‌رۆشه‌وه ئامێزيان بۆ گرته‌وه، ئه‌ويش به مه‌به‌ستی شاره‌زابون له چۆنيه‌تی مامه‌ڵه‌ی هاوسه‌رايه‌تی ئيسلامی، كه ده‌مێكه په‌رده‌ی به‌سه‌ردا دراوه‌و خه‌ڵك لێی غافڵ بوونه.

سه‌ره‌ڕای ئه‌مه دياره هێشتا تينويه‌تی زۆرانی نه‌شكاندوه‌و پێويستی به ئاوده‌ركردنيان هه‌يه، له‌به‌ر ئه‌وه به پێويستی ئه‌مڕۆ زانرا چاپ بكرێته‌وه‌و مسوڵمانانی كوردستان له چۆنيه‌تی مامه‌ڵه‌كردنی ژن‌و مێرد له‌گه‌ڵ يه‌كتری له ديدو روانگه‌ی ئيسلامدا، خۆيانی پێ برازێننه‌وه‌و زانينيان پێی هه‌بێ. هه‌روه‌ها چاويان به‌و ئايه‌ت‌و فه‌رمودانه‌ی پێغه‌مبه‌رﷺ تايبه‌ت به هاوسه‌رگرتن و په‌يوه‌ندی نێوانيان رۆشن بێته‌وه.

خوێنەری ئازیز:

ئەوەی پێویستە ئاماژەی پێ بکرێ ئەوەیە لە چاپە عەرەبیەکەی ئەم کتێبە بابەتو پەراوێزی وا هەبون پێویستی خوێنەری کورد نەبونو نوسەر بەپێی بارودۆخی ناوچەی خۆی نوسیوەو بۆ ئەوان پێویست بوە، بۆیە ئێمە بەچاکمان نەزانیوە وەربگێڕینە سەر زمانی کوردیو پەراوی پێ زیاد بکەین.

بۆ راڤەکردنی ئایەتەکان هەوڵم داوە بە زۆریی تەفسیرە وەرگێڕاوەکەی مامۆستا هەژار بەکار بێنم.

بەپێویستی دەزانم ئاماژە بەوە بکەم لە ساڵی ١٩٩٩ چاپێکی ئەم کتێبە بە قەبارەی (١١٨) لاپەڕە، کە لێی نوسراوە چاپی سێهەمو بێ دیاری کردنی ساڵی چاپەکە کەوتە بازاڕ، بێ ئەوەی لێی ئاگادار بم و پرسم پێ بکرێ، کە ئەمە مافێکی یاسایی بەندەیە.

جا ئەوەی هەڵساوە بە چاپ دانەوەی مەبەستی بازرگانی کردنو پارە پێ پەیداکردن بوە، نەك کاری خەیرو سود بەخشین، پێچەوانەی یاسای مافی لەچاپ دانەوەی ئەنجام داوەو کارێکی ناشەرعی کردوە. دیاریشە کە مافی لە چاپ دانەوە پارێزراوە بۆ نوسەر، نەك هەر کەسێك بۆی گونجا چاپی بکاتەوە.

جا چاپی ئەم کتێبە بە مەرەدی کتێبەکەی شێخ محمد ناصرالدین ألبانی چو، کە بەبێ پرسو ئاگاداری ئەو، کتێبێکی لەچاپ درایەوە، ئەویش لە (تمام المنة)دا فەرمودەیەکی پێغەمبەرﷺ دەکاتە بەڵگەی ناشەرعی لەچاپ دانەوەی بێ ئاگاداری نوسەر، کە دەفەرموێ: (**لا يحل مال إمريء الاّ بطيب النفس منه**).

لەبەر ئەوە کتێبی (ژن و مێردی ئیسلامی بەختەوەر) کە چاپی سێهەمی لەسەر نوسراوەو بە رەنگی سور نوسراوەو وێنەکەیشی بە رەنگی پرتەقاڵی رەنگ کراوە، هەمان چاپی یەکەمەو بە ناشەرعی لەچاپ دراوەو بۆ بازرگانی پێ کردن بوە.

ئومێدەوارم مسوڵمانان کتێبی ژنو مێردی ئیسلامی، بکەنە مەنهەجو پەیڕەوی پەیوەندی پیرۆزی هاوسەرێتیو، لەپاش تێلانە بیکەنە دیاری بۆ بوكو زاوا لە جیاتی بردنی کەلوپەلو پارەیەك، کە بە سینگ فراوانیەوە نابەخشرێ.

لەخوای پەروەردگار داواخوازم چاپی پێنجەمی شەرعی کتێبی (ژن و مێردی ئیسلامی بەختەوەر) ببێتە تێگەیشتنی راستەقینەی ئیسلامیانە لە هاوسەرگرتنو رێنمایی کردنی مسوڵمانان.

لەخوای بەخشندەم داوایە وەرگێڕانی ئەم کتێبەم بۆ بکاتە کردەوەی باش و، توێشوی رێگا بۆ ڕۆژی سەختی قیامەتو، لە تاریکاییەکانیو گەرمی ئەو ڕۆژەم بپارێزێ.

نەوزاد محمد سعید

١٠ / محرم / ١٤٢٦

٢٠٠٥ / ٢ / ١٩

# پێشەکی چاپی دووەمی وەرگێڕان

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار، هەزاران درودو سلاو بڕژێ بەسەر گیانی پێشەواو پێشەنگمان محمدﷺ وە لەسەر یارو یاوەرانی و شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی دوایی.

کۆمەڵگەی کوردی دەمێکە دوچاری دەردی بێ ئاگاو دورەپەرێزیو کەنارگیری فەرمایشتەکانی خوای گەورەو فەرمودە شیرینەکانی پێغەمبەرﷺ بوە، هەروەها دوچاری بێ‌ئاگایی بوە لە یاساو دابو نەریتی ڕەسەنی ئیسلامی. بەڵێ" گەلی کورد بە گشتیی چەند دروشمێکی ئیسلامیی وەك نوێژو ڕۆژوو زەکاتو حەجی داماڵراو ڕوتو بێ‌گیان پیادە دەکات، بەڵام بەبێ تەواوکردنی پێداویستیو تەواوکەرەکانیو، باقی بنەماو بنەڕەتو یاسا بنچینەیی‌یەکانی تری کە کاکڵەو ماهییەتی ئیسلامن، فەرامۆش کراوە.

یەکێ لەو بنەما کاریگەرو قوڵە، کە کۆمەڵگەکەمان بە دواوەی ناوەو پشت گوێی خستوە، هاوسەرگرتنی ئیسلامیو پەیوەستی پەیوەندییەکانی ژن و مێردو، چارەسەرکردنی کێشەکانیانە لە ڕوانگەی ئیسلامدا.

دیارە خێزان پێکەوەنان گەر لەسەر بنەماو بنچینەیەکی (ضبط)کراو بنیات نەنرێ، ئەوا هەرگیز خێزانێکی پتەو و ڕێکوپێكو بەختیار دروست نابێت، ضبط کردنیش تەنها لە بەرنامە داڕێژراوەکەی خوای گەورە دەستەبەر دەکرێ، نەك بیرۆکەو ڕێچکەی دەستکردی هەواو ئارەزوبازان.

جا بۆ ئەوەی گەنج و لاوی مسوڵمان (کچ و کوڕ) شارەزا و ئاگادار بن بە پەیوەندیو مافەکانی ژنو مێردو هەڵسوکەوتو مامەڵە لەگەڵ یەکتری

له ڕوانگه‌ی ئیسلامه‌وه، به خه‌م ئه‌وه بوم كتێبێكی ئیسلامی چڕوپڕی له‌ مه‌ڕ ژن و مێردی ئیسلامیم ده‌ست كه‌وێ، كه به قه‌ڵه‌می یه‌كێك له‌ زانا هاوچه‌رخه‌كان نوسرابێ بۆ ئه‌وه‌ی به‌نده لێی به‌هره‌مه‌ند بێ‌و پیاده‌ی بكات، پاشانیش كۆمه‌ڵگه‌كه‌مان له حه‌قیقه‌ت و واقیعیه‌تی ئیسلام تێبگات، ئه‌و ته‌مه‌ی كه خراوه‌ته سه‌ر چاوه‌كان لا ببرێت، ڕاستییه‌كانی پێ ببینرێت.

ئه‌م كتێبه‌ی دانراوی مامۆستا (محمود مهدی الاستانبولی) به‌ڕای به‌نده، تاكه كتێبه كه به پاكی و ڕاستگۆیی‌و واقیع بینانه له‌ژێر تیشكی ڕێنمایی یه‌كانی فه‌رمایشتی خوای گه‌وره‌و فه‌رموده‌كانی پێغه‌مبه‌رﷺ و زانایـان و زانست باس له په‌یوه‌ندی‌و ڕه‌فتاری ژن‌و مێرد بكات، چاره‌سه‌ری بـڕدر بـۆ كێشه‌كانیان دابنێت.

بـه هـۆی گرنگـی دان‌و به‌ده‌مــه‌وه‌هاتنی خوێنــه‌رانی‌و نه‌مانــه‌وه‌ی لــه كتێبخانه‌كان بۆ دووه‌مین جار چاپ كراوه‌ته‌وه، جا له‌به‌رئه‌وه‌ی بـه ئـه‌ركی سه‌ر شانم زانی ئه‌م كاره پیرۆزه بخه‌مه ئه‌ستۆ و به ناوی خـوای تـاكی پـاك ده‌ست بكه‌م به وه‌رگێڕانی بۆ سه‌ر زمانی شیرینی كوردی، ئه‌وه بو له ساڵی ١٩٩٤ ده‌ست كرا به‌م كاره‌و له ساڵی ١٩٩٥ سوپاس بۆ خـوا بـه هـه‌وڵی خێرخوازێك له چاپ درا، بوه مایه‌ی بڵاوبونـه‌وه‌ی ڕۆشـنبیرییه‌كی گـشتی له‌مــه‌ڕ هاوســه‌رگرتن و هۆشـیاربونه‌وه‌ی مـسوڵمانان لـه‌م مه‌ســه‌له‌یه‌داو، كردنه‌وه‌ی گرێ كوێره‌ی زۆر له گه‌نج‌و لاوی مسوڵمان. ته‌نانه‌ت بابایه‌ك به خوێندنــه‌وه‌ی كتێبه‌كـه‌و ده‌رك كردنـی بـه حه‌قیقـه‌تی كراوه‌یـی ئیـسلام، مسوڵمانیه‌تی خۆی ئاشكرا كرد.

جێی ئاماژه‌یه خوێنه‌ران لـێی ئاگاداربن، كه‌وا پێشه‌كی چاپی یه‌كه‌می وه‌رگێڕانه‌كه ئامــاژه بـۆ وه‌رنـه‌گێڕانی هه‌نـدێ بابـه‌ت‌و گـشتی پرسـیاره جنسییه‌كان كرابو، بـه‌ڵام چـاپی ئـه‌جاره زۆربـه‌ی بابه‌تـه بنه‌ڕه‌تییـه‌كان‌و

پوختەیەکی گوشراوی پێویست لە پرسیارەکانی گرتۆتە خۆ.

لە خوای بەخشندە خوازیارم بە چاپ گەیەنەرانی چاپی دوەم: (پـڕۆژەی چـاپی تەفـسیری قورئـانی پـیرۆز) پاداشـتی بـە خـەیریان بداتـەوە، لـە نیعمەتەکانی خۆشی بەهەشت بێبەش نەکات.

هەروەها لە خوای میهرەبان ئاواتە خوازم ئەم کارەم بـۆ بکاتـە (صـدقة جارية)، کە ببێتە وەسیلەیەك بۆ لێخۆش بون لە گوناهەکانم.

وەرگێـــڕ
١٩ی جەمادی یەکەم-١٤١٨ك
١٥ / ٩ / ١٩٩٧

## ژیانی ژن و مێردایەتی لە ئیسلامدا بە خواپەرستی دادەنرێ

### ((ژن هێنان و شوکردن لە نیعمەتەکانی خوایە))

گوزەران و ژیان بەسەربردن لەسەر زەوی، گەر بەشی خۆشیو شادیو ئارەزوە حەڵاڵەکانی تێدا نەبو، ئەو ژیانە ژیانێکی وشك و ناخۆش دەبێت، لەبەر ئەوە حیکمەتی خوای میهرەبان گشت غەریزەکانی مانەوە لەسەر زەوی بەهۆی ڕابواردنی حەڵاڵ و چێژو خۆشییەوە ڕاگیر کردوە.

بیرکردنەوەش لەم حیکمەتە وا لە مرۆڤ دەکات بزانێ مەبەستی ئەم خۆشیو ڕابواردنە حەڵاڵە چیە، ئەوەش تەنها ئامانجێك نیە بۆ گەیشتن بەم خۆشییە، بەڵکو ڕێگەیەکە.. وەسیلەیەکە بۆ گەیشتن بە چەند ئامانجێکی چاك. دیاریشە کە لقی چاك لە ئەسڵێکی چاكو باش نەبێ پەیدا نابێ، کە ئەوەش ژیانی حەڵاڵی ژنو مێردە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾(الروم ٢١). واتە: لە بەڵگەو نیشانەکانی گەورەیی خوا ئەوەیە کە لەخۆتان هاوسەری بۆ بەرهەم هێنان کە پێیان بحەسێنەوەو خۆشەویستیو ئەوینی خستۆتە ناوتان.[1] لەمەدا بۆ کەسانێ

---

١) ژنێك لە شەوی بوکێنیدا دوای جوتبونی لەگەڵ مێردەکەی لە ئامێزی مێردەکەی بو، بە مێردەکەی گوت: من بە بەختەوەریم قەرزاری تۆم، نازانم چۆن هەندێك چاکەت بدەمەوە، مێردەکەش وەڵامی دایەوە گوتی: (جوانترین شت کە بم دەیەوە ئەوەیە، کە ئێستا لە ئامێزم دای!)

کە بەوردی سەرنج بدەن بەڵگە زۆرن.

بە گوێرەی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوە دەردەکەوێ، کە بنەماو بنەڕەتو بناغەی ژنو مێرد لەسەر خۆشەویستیو ڕێزلێنانو تەباییو بە بەزەیی لەگەڵ یەکتریدا دامەزراوە، نەك لەسەر بنەمای سەیرکردنی ژن بە چاوی خزمەتکارو بێڕێزو، مامەڵە لەگەڵدا کردنی ئاژەڵیانە، دیارە ئافرەت وەك پیاو نەفسی هەیە.. ئارەزوی هەیە.. هتد. خوای بەخشندەش ئافرەت دەدات بە پیاو وەك هاوسەری ژیان، وەك ئەمانەتێك.. وەك ڕاسپاردەیەك دەیدات بە پیاو بۆ پێك هێنانی خێزانێکی بەختەوەرو سەرفرازو دڵشاد.

ئافرەت لە کۆندا بە چاوی ئاژەڵێکی بێگیان سەیر دەکراو، بێبەش دەکرا لە گشت مافە ڕەواکانی. تا لەساڵی ٥٨٦ دا بیرکراوە، کە ئافرەت بەچاوی مرۆڤ سەیر بکرێو بڕیاری بە مرۆڤ دانانیان داو، بڕیاریشیان دا، کە ئافرەت ئاژەڵ نیەو... مرۆڤێکە بۆ خزمەتکاری پیاوان دروستکراوە.. بەڵام ئیسلام چواردە سەدە پێش ئێستا بەگوێرەی ئایەتەکەی، کە باسکرا بڕیاری داوە ئافرەت بەڵگەیەکە لە بەڵگەکانی خوای گەورە!...کەوا ئافرەتی لە لاشەی پیاو دروستکردوە، نەك لە قوڕێکی جیا، هەروەها دروستیشی کردوە تا هاوسەری ژیانی پیاو بێ، نەك خزمەتکار. خوای باڵا دەفەرموێ: ﴿**هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا**﴾(الاعراف- ١٨٩)، واتە: خوای بەدیهێنەر ئێوەی لەیەك کەس وەدی هێناوە" ژنەکەشی هەر لە ماکی ئەو پێك هێنا، کە لەوڕا بحەسێتەوە.

قورئانی پیرۆز بە دەقی ئەم ئایەتە، بەردی بناغەی ژیانێکی پڕ لە سۆزو عاتیفەو خۆش وهێمن دادەنێ. ژن شوێن تامگەو خۆشیو شادی و

حەوانــەوەی مێردەکەیــەتی، چــونکە کاتێــك مێردەکــەی لــەدوای هــەوڵ‌و کۆشــش‌و مانــدوبونێکی زۆرو، لــەپێناو پەیــداکردن‌و دابینکردنــی ژیــانی ڕۆژانەی دەگەڕێتەوە لای ژنەکەی، کە ئەویش دەبـێ بــە ڕویــەکی خــۆش‌و گەش‌و بە سینەیەکی فراوانەوە بەردەو ڕوی بــێ‌و پێــشوازی بکــات‌و ســۆزو خۆشەویستی بۆ دەربڕێ، ئا لەو کاتەدا مەیلی بەلادا دەچێ و دەگاتە ئــەم خۆشییە... ئەم حەوانەوەیە.. ئەم شوێن تامگەیەی کــە باســکرا. چــونکە بەهۆی ئەم ڕەفتارو هەڵسوکەوتەوە ماندویەتی‌و خەم‌و پەژارەی ژیان لــەبیر مێردەکەی دەباتەوە.

((محمود بن الشريف لە کتێبەکەی (الإسلام والحياة الجنسية)دا دەڵێ: ژن سوکناو شوێنی حەوانــەوەو دڵنیاکــەرو دڵنــەوایی مێردەکەیــەتی، چــونکە ئافرەت لەژێر سێبەری خۆشەویستی‌و تــەبایی‌و بــەزەیی‌و داوێــن پاکیــدا، تینویەتی جنسی پیاو دەشکێنێ‌و، لە خراپەکاریدا جنس‌و دڵ ئارام‌و هێمن دەکاتەوەو، ئەندامەکانی لەش لە کردەوەی بەدڕەفتارو ناشیرین دەپــارێزێ، هەروەها لە خلیسکان بۆ ناو لیتاوی گوناهو تاوانکاریی دەیپارێزی!)).

لێرەدا پرسیارێك دێتە کایەوە: ئایا ئەو ئافرەتەی لــە دەرەوەی مــاڵ بــۆ ماوەی چەند ســەعاتێك کــار دەکــات، دەتوانــێ هەڵــسێ بــە دڵنــەوایی‌و پیشاندانی ڕوخۆشی‌و خەندەی لێو بۆ مێردەکەی؟ یان دەتوانــێ لــە خــەم‌و پەژارەو ماندوبونی هاوسەرەکەی کەم بکاتەوە؟!

## هانـدان بۆ ژن هێنــانو شـوکردن

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾(النساء -٣)، واتە: ژن مارە ببڕن لەوانەی کە بۆتان حەڵاڵە، دوان یان سیان یان چواریش بن هەروایە. ئەگەر ترسان نەتوانن ژنەکانتان وەکو یەك تەماشا بکەن، ئەوا دەبێ یەك ژن بهێنن.

بۆیەش خوای گەورە وای باس دەکات، چونکە بە یەکسان تەماشا نەکردنو بەخێو نەکردنیان بە یەکسانیو ماف نەدانیان وەك یەك، ستەم لێ کردنیانەو، وە بەر کاری حەرام دەکەوێ.

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی (واجب) بونی ژن هێنان و شوکردن دەکات، جا ئەو کەسانەی نایانەوێ ژن بهێنن و داوێنیان لە خراپەکاری ناپارێزن، دەست دەکەن بە پڕوپاگندە بۆ پەشیمان بونەوە لە ژن هێنانو گاڵتەکردن بە هاوسەرگرتن. ئەوانەی ئەم کارە دەکەن، لە ڕاستەڕێی خواو لەم کارە پیرۆزە دور دەکەونەوە، کە خوای گەورە لە قورئان دایناوەو هانی ئەنجامدانی داوە.

خوای میهرەبان لە بارەی فەزڵی ژن هێنانو شوکردنو، دانانی ژنو پیاو بەیەك لاشە لەژێر یەك پۆشاکدا دەفەرموێ: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾[1](البقرة-١٨٧) ئیمامی طەبەری لە تەفسیری ئەم ئایەتە زۆر بەجوانی بۆی چوەو دەڵێ: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ﴾، واتە: ژن و پیاو پۆشاكو بەرگی

١) خێزانەکانتان پۆشاکن بۆ ئێوەو ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان.

یەکترین، چونکە لەکاتی نوستن و بە ڕوتی لەیەك پۆشاك کۆدەبنەوە، لەیەکتر نزیکبونەوەی هەر یەکێکیشیان بۆ لای یەکتری، وەك ئەوە وایە یەك پۆشاك، یەك جل‌وبەرگ بەیەك لەشدا دوراوە. تەفسیری دیش هەیە، کە گوتویانە ئەم ئایەتە بە واتای: (ژن و مێرد پۆشاکی یەکترین).

یەکێك لە نوسەرە گەورەکان لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ﴾ باس دەکات دەڵێ: ئەم چەند وشە کەمە، وێنە هێنانەوەیەکی زۆرجوانە بۆ بەدیار خستنی پەیوەستیی لەش (الجسد)و گیان (الروح) لە یەك کاتدا. چونکە پۆشاك گرنگترین پێویستی مرۆڤەو، بۆ ئادەمیزادیش دانراوە.

لە ڕاستیدا لە هەمو شت زیاتر کە پێکەوە دەنوسێن ژن‌و مێردە کاتێك کە جوت دەبن بەیەك جەستەو یەك گیان پێك دەگەن‌و لە چرکەساتێکدا لەناو لەزەتێکی بێ‌سنوردا بۆ یەکتری دەتوێنەوە.

ژن‌و مێرد داپۆشەری یەکترین، لەبارەی جەستەیی (جسدي)دا، کە دەبنە پارێزەری داوێن و ئەندامی لەشیان لە گوناهو تاوان. داپۆشەری گیانی‌و دەرونین بۆ یەکتری‌و، هیچ کەسێکیش وەك ژن‌و مێرد داپۆشەری یەکتر نین، چونکە هەردوکیان دەبنە پاسەوانی پاراستنی سومعەو ماڵ‌و سامان‌و نەفس‌و نهێنی یەکتری. جا وەك ئەو جل‌وبەرگ‌و پۆشاکە پارێزەرە وایە کە ئەو کەسەی جلەکە لەبەردەکات لە گەرمای هاوین‌و سەرمای زستان دەیپارێزێ.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((اذا تزوج العبد فقد استكمل نصف دينه،

فليتق الله في النصف الباقي))[١]، واتە: گەر بەندەى خوا ژن بهێنێ یـان شـو بكات، ئەوا نيوەى ئيمان و دينەكەى تەواو كردوە، با بۆ نيوەكەى تـر كـە ماويەتى لە خوا بترسىٚو خۆى لە گوناهو تاوان پارێز كات.

چونكە ژن هێنان دەبێتە بڕياردانى نيوەى چارەنوسى مسولٚمانو، دەبێتە مايەى ئەوەى بانگى بكات بۆ بايەخ دان بە بـاش هەلٚبـژاردنى هاوسـەرو، لێكۆلٚينەوەى وردو ئيستيخـارەى شـەرعى، ئيـستخارەكەش بريتيـە لـە دو ركعات نوێژ پاشان ئەو دوعايە دەخوێنرێ، كە لە پێغەمبەردوە هاتوە، جـا ئەوەى دواى ئەمە رودەدات ئەوە خەيرو چاكەيە، دوعـاى ئيستيخارەش بەم شێوەيە كە بوخارى لە (صحيح)دكەيدا گێڕاويەتيەوە:

((اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي، أَوْ قَالَ عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ، وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي، أَوْ قَالَ فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ، فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ وَاقْدُرْ لِيَ الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ أَرْضِنِي)).

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((الدنيا متاع، وخير متاعها المـرأة الصالحة))[٢]، واتە: ژيانى دنيـا ڕابـواردنو خۆشـييە، چـاكترين خۆشـى دنياش ژنێكى (صالحة)يە.. ژنێكى خاوەن ئيمانو تەقوايە.

هەروەها دەفـەرموێ: ((ثلاثة حق على الله عونهم: المكاتب الذي يريد

١) رواه البيهقي-حديث حسن لطرقه .

٢) رواه مسلم .

الأداء، والناكح الذي يريد العفاف، والمجاهد في سبيل الله))[1]، واتـه: سێ کەس حەقن، کە خوای گەورە یارمەتیان بدات: ئەو کۆیلەیەی، کە دەیەوێ بە پارە خۆی ئازاد بکات، جا ئیش‌و کارو هەوڵی بۆ دەدا، تا پارەکەی دەستکەوێ، هەروەها ئەو کەسەی دەیەوێ ژن بهێنێ تا خۆی داوێن پاك ڕاگرێ، ئەو کەسەی لەپێناوی خوادا جیهاد دەکات.[2]

زۆربەی ئەو کەسانەی ژن ناهێنن و توانای ژن هێنانیشیان هەیە، دیارە ئەوانە بیر لە داوێن پیسی دەکەنەوە، داوێن پیسیش مرۆڤ لەسەر ڕێی ئیمان دور دەخاتەوە. ئەو مسوڵمانەش کە ژن ناهێنێ‌و شو ناکات، ئەوا لە دینەکەی تێنەگەیشتوەو ناشارەزایە، با باش بزانێ ئەو جۆرە کەسانە نقومی گوناهو تاوانن. بۆ ئاگادار کردنەوەشیان ئەم گوتەیەی ئیبن مەسعود بخەینە ڕو کە دەڵێ: ((گەر لە تەمەنم دە ڕۆژ بمێنێ، حەز دەکەم ژن بهێنم بۆ ئەوەی کاتێك، کە مردم بەبێ ژنی نەچمە لای خوای بەرزو مەزن)).

جا مسوڵمانانی پێشین، گەر منداڵەکەی بالغ بوباو توانای هاوسەرگرتنی هەبا، قسەی دەربارەی هاوسەرایەتی لەگەڵ دەکردو، یارمەتی دەداو هانی دەداو ئافرەتێکی دیندار لە ماڵە پاك‌و پارێزگارەکانی بۆ دەستنیشان دەکرد. ئا ئەمە شێوازێکە بۆ پاك ڕاگرتنی ژیان‌و پاڵنانی بۆ ڕێیەکی ساغ‌و ڕاست[3].

---

١) رواه الترمذي والنسائي.

٢) ئەم فەرمودەیە چەند بەرزو گەورەیە، کە هاوسەرگرتن‌و جیهادکردن لە ڕێی خواو ئازادکردنی بەندەی یەکسان کردوە.

٣) (الحياة الزوجية) .

# بەرز ڕاگرتنى غەريزەى جنسى

مەبەست لە بەرز ڕاگرتنى غەريزەى جنسى ئەوەيە، كە زۆربەى زانايانى دەروونناس ناويان لىٚ ناوەو دەستەواژەيان بۆ داناوە، ئەوەش بە پێويستى بەرز ڕاگرتنى غەريزەى جنسىو بەرزكردنەوەيەتى بەرەو ئاسۆيەكى زانستىو ئەدەبىو هونەرى بەكەڵك، لە حاڵێكدا كە يەكێك نەتوانىٚ ژن بهێنىٚو خۆى بەداوێن پاكى ڕاگرىٚ. پێغەمبەريشﷺ فەرمانى بەبىٚ ژن داوە كە بەڕۆژو ببىٚ ئەوەش بۆ پاراستنى ئەسڵى غەريزەكە، كە جۆرێكى بەرزە لە جۆرەكانى بەرزبونەوەى غەريزەى جنسى كە ئيسلام دەست پێشخەرى كردوە، ئەمەش ئەوە ناگەيەنىٚ، كە مرۆڤ بە هەميشەيىو هەردەم بەو شێوەيە بمێنێتەوە وەك، كە هەندىٚ لە پياوانى ئايينى مەسيحى پەيڕەوى دەكەن، بە واتاى ژن ناهێنن! بڵندوبەرزى ئەم غەريزەيەش چەند سودێكى گرنگ دەبەخشىٚ لە جيهانى تۆژينەوەداو لێكۆڵينەوەو بەرهەم هێناندا.

ئەوەى باسكرا كە ئاڕاستەيەكى جنسى پاكە لەكوىٚ و بانگەوازيەكەى فرۆيدى جولەكە، كە دەيكات لەكوىٚ، كە مرۆڤ هەڵدەنىٚ بە پەلە ئارەزوە جنسييەكانى تێر بكات، كە چەواشەى خەڵك دەكات بەوەى گەر جنس تێر نەكرێت جا بە هەر شێوەيەك بێت، ئەوا توشى كپ بونى جنسىو خەمۆكىو نەخۆشى نەفسى دەبىٚ.

دكتۆر ئەلكسيس كاريل لە كتێبەكەيدا بەناوى (الإنسان ذلك المجهول)دا دەڵىٚ: (لە ڕاستيدا زێدەڕۆيى كردن لە كردارى جنسى دەبێتە هۆى ڕێگەگرتن لە چالاكييەكانى عەقڵى، دياريشە كە ژيرى (عقل) پێويستى بە ڕژێنە جينسييەكى باش هەيە، تا بتوانىٚ بگاتە ئەوپەڕى پلەى بەهێزى).

کورته‌ی تیۆر (نظرية)ی فرۆید بریتیه له بانگه‌وازیه‌کی جوله‌که‌یی بۆ ئه‌وه‌ی ڕێگه نه‌گیرێ له تێرکردنی جنسی به حه‌رامی‌و، نقوم بون له زه‌لکاوی ئاره‌زوبازیدا، به مه‌به‌ستی بێهێزی‌و لاواز کردنی جنسی مرۆڤ. ئه‌وه‌ش به پێی نه‌خشه‌ی جوله‌که‌ی جیهانی، که له (پرۆتۆکۆلات)ی سه‌رانی جوله‌که‌یه، که ده‌ڵێ: (پێویسته هه‌وڵ بده‌ین کاربکه‌ین بۆ ئه‌وه‌ی ڕه‌وشت له گشت شوێنێك بڕوخێ، جا ئه‌و کاته ده‌سه‌ڵاتمان به سه‌ریاندا ئاسان ده‌بێ، فرۆیدیش له ئێمه‌ی جوله‌که‌یه، که به به‌رده‌وامی باسی په‌یوه‌ندییه سێکسی یه‌کان ده‌کات بێ په‌رواو به ئاشکرا، تا هیچ شتێکی پیرۆز به پیرۆزی نه‌مێنێ!! ئه‌و کاته‌ش ئه‌و که‌سانه هه‌مو مه‌به‌ستێکیان، ته‌نها گرنگی دان به چۆنیه‌تی تێرکردنی جنسی ده‌بێت، جا به هه‌ر وه‌سیله‌یه‌ك بێت، جا ڕه‌وشت و ئاکاری به‌رز هیچی نامێنێ!!).

گه‌رچی تیۆری فرۆید له زۆربه‌ی وڵاتانی دنیا فرێدراو به‌لاوه نرا، هه‌روه‌ها له یه‌کێتی سۆڤیه‌تیش، چونکه ئاسه‌وارو ئاکامه پیس‌و خراپه‌که‌ی ڕون بویه‌وه‌و به‌دیار که‌وت، به‌ڵام له زۆربه‌ی په‌یمانگاکانمان وه‌ك ڕاستییه‌کی سه‌لمێنراو ده‌خوێندرێ.

ئه‌مه کورته‌یه‌ك و پێشه‌کییه‌کی باسه‌که‌مان بو، جا له‌مباره‌وه با بێینه سه‌ر مه‌سه‌له‌ی ڕاگرتنی جنس به پاکی له‌ژێر تیشکی فه‌رموده‌ی خواو پێغه‌مبه‌رﷺ.

خوا ده‌فه‌رموێ: ﴿وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّى يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ﴾(النور- ٣٣)، واته: با ئه‌وانه‌ی توانای زه‌ماوه‌ندیان نیه، خۆ ڕا بگرن هه‌تا خودا له‌چاکه‌ی خۆی ده‌روێکیان لێ ده‌کاته‌وه‌و کاره‌که‌یان مه‌یسه‌ر ده‌کات.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((**یا معشر الشباب! من استطاع منكم الباءة فليتزوج**[1] **فإنه أغض للبصر، وأحصن للفرج. ومن لم يستطع فعليه بالصوم فإنّه له وجاء**))[2]، واتە: ئەی کۆمەڵی گەنج و لاوان! هەر کەسێك لە ئێوە گەر پارەو سامانو پێداویستییەکانی ژن هێنانو توانای جنسی هەیە با ژن بهێنێ، چونکە بەهۆی ژن هێنانەوە چاو لە ئاست حەرام دەپارێزرێ، هەروەها ژن هێنان دەبێتە قەڵای پاراستنی داوێن لە داوێن پیسی. هەر کەسێکیش توانای ژن هێنانێ نەبو با بەڕۆژو بێ، چونکە بەڕۆژوبون بۆوی قەڵغانەو لە خراپەکردن دەیپارێزێ.

پێغەمبەرﷺ کە دەفەرموێ: ((**ومن لم يستطع**)) لێرەدا شتێك دەخەینە ڕو، ئەویش ئەوەیە گەر گەنج بیەوێ ژن بهێنێ، بەڵام لەبەر نەبونی پارە نەتوانێ بیهێنێ، ئەو نەتوانینە لە کاتێکدا بوە، کە ئیسلام تازە بناغەی داکوتابو، بەڵام کە دەوڵەتی ئیسلامی دادەمەزرێو سەرمایەی دەبێو (بيت المال)ی دەبێ، ئەوا ئەو کاتە هەمو گەنجێکی مسوڵمان بۆی هەیەو دەبێ ژنی بۆ بهێنرێو، دەبێ دەوڵەت لە دارایی پارەی ژن هێنانی بۆ بدات، گەر ئەو گەنجە مسوڵمانە قەرزیشی کرد بو، دەوڵەت دەبێتە دابینکەری قەرزەکەی لە بەشی قەرزاران لە پارەی زەکاتدا، چونکە زەکات بە قەرزاران دەدرێ. نمونەیەکی واقیعیش دەخەینە ڕو، کە لە کتێبی ئیبن الحکم دا لە ژياننامەی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا هاتۆتە دی، کە

---

١) دەقەکانی قورئانو سوننەت ئاماژە بەوە دەکەن، ئەو کەسەی دەتوانێ هاوسەر بگرێ، ئەوا پێویستە لەسەری، نازانم چۆن هەندێك پێشەوا دەڵێن ئەم فەرمانە بۆ (استحباب)، یان ڕێ پێدانە؟

٢) رواه البخاري ومسلم

دەڵـێ: ((کوڕێکی عومەری کوڕی عبدالعزیز داوای لە باوکی کرد، کە ژنی بۆ بهێنێ‌و لە (بیت المال)دا پارەی مارەیی بۆ بدات. عومەر لـە کوڕەکـەی توڕە بو، چونکە کوڕەکەی ژنی هەبوو دەیویـست ژنێکـی تـر بهێنـێ. جـا نامەیەکی بۆ نوسی‌و گوتی: نامەکەتم بەدەست گەیشت، کـە داوای پـارەت کردوە لە (بیت المـال)ی مسوڵمانان بۆت کۆ بکەمـــــــەوە، لە کاتێکـدا کوڕە موهاجیرەکان یـەکێکیان ژنیـان نیـە، لەبەرئـەوە پـارەت لـە دارایـی مسوڵمانان بۆ نادەم، پاشان نامەیەکی تری بۆ نوسی کە تیایدا نوسـیبوی، کە ئەو مس (نحاس)و کەلوپەلەی پێشتر بومانە بیفرۆشە بۆ خۆت))[١].

خەلیفە سەری نەسوڕماو بە لایەوە شتێکی نامۆ نـەبو، کـە کوڕەکـەی داوای پارەی لە (بیت المال)ی لـێ بکات بۆ ژنهێنان، بەڵام ژنهێنانی کوڕی موهاجیرەکانی بەلاوە (واجب) ترو پێویست تر بو.

هەر لەم بارەیەوە عومەری کوڕی عبدالعزیز نوسراوێکی بۆ کارمەندانی سەرپەرشتی کارانی (بیت المال) نوسی و پێی گـوتن: ئـەو کەسـانەی، کـە قەرزارن پارەکەیان بۆ بدەن و قەرزیان بـۆ بدەنـەوە. ئـەوانیش لـە وەڵام دا بۆیان نوسی: ئێمە کەسی وا دەبینین خانوی هەیە... خزمەتکاری هەیـە... ماینی هەیە... کـەلو پـەلی ماڵـەوەی هەیـە، چـۆن قـەرزی بـۆ بـدەین. عومەریش بۆی نوسین: پیاوی مسوڵمان دەبـێ خـانوی هـەبێ، کـە تێیـدا جێگیر ببێ.. خزمەتکاری هەبێ ئیش‌و کـاری بـۆ بکـات.. ماینیـشی[٢] هەبێ دژی دوژمنان تا جیهـادی پـێ بکـات ، دەبـێ مـسوڵمان خـاوەنی شتومەکی ماڵەوە بێ بۆ خێزان‌و منداڵەکانی. لەبەر ئەوە گەر خـاوەنی ئـەم

---

١) لاپەڕە: ١٢٥.

٢) کە ئێستا (ئۆتۆمبیل) دەگرێتەوە. وەرگێڕ

شتانەش بێ ئەوا هەر بە قەرزار دەژمێردرێ و هەرچی قەرزێکی هەیە دەبێ بۆی بدەنەوە[1].

دەربارەی ئەمەش فەرمودەیەکی (صحیح) هاتوە، کە لەسەر دەوڵەت پێویستە، ژن و خانو و خزمەتکار بۆ فەرمانبەرانی خۆی دابین بکات.

پێغەمبەرﷺ کە دەفەرموێ: ((فعليه بالصوم)) لەم بارەیەوە شتێك دەخەینەڕو: لە ئیسلامدا، کە دەڵێ مرۆڤ دەبێ خۆی داوێن پاك ڕابگرێ، تا کاتی ئاسان بونی ژن هێنانی، نوسەر دەڵێ: بە پێویستم زانی وەڵامی لایەنگرانی تیۆری (فرۆید)ی تاوانباری جولەکە بدەمەوە، کە خەڵك هان دەدەن بە بەتاڵ کردنی وزەی جینسی و ئەنجامدانی داوێن پیسی بە بیانوی ئەوەی داوێن پاکی و بەتاڵ نەکردنی جینس دەبێتە هۆی مەترسی و کاریگەری لەسەر تەندروستی مرۆڤ.

(هنری میلەر)ی زانا دەڵێ: باشترین هۆو وەسیلە بۆ پاراستنی لەش لە نەخۆشی، بەتاڵ نەکردنی جنسە پێش ژن هێنان، جا بەهەر وەسیلەیەك بێت. هەروەها دەڵێ: ملکەچی و تەسلیم بون بۆ هەر هەل (فرصة)ێك بۆ کرداری سێکسی (زیناکردن)، ئەوا ئەو تەسلیم بونە دەبێتە هۆی دابەزاندنی ئیرادەو شەخسیەتی ئەو کەسە. شەخسیەتیش لەسەر ئیرادە بەهێزی وەستاوە! لە هۆیەکانی بەهێز کردنی کەسایەتی، سنور دانانی غەریزەی جنسییە. ملکەچی و تەسلیم نەبون بۆ ئارەزوە جنسییەکان (بە حەرامی) لە ئەوەڵەوە، لەوانەیە زەحمەت و سەخت بێ، بەڵام بە ڕاهێنانی نەفس، وردە وردە ئاسان و مەیسەر دەبێ. ئەو کەسەش پەیوەندی لەگەڵ ئافرەتان دەبەستێ و پاشانیش ژن دەهێنێ، ئەو جۆرە کەسە حاڵەت و نەفسیەتی جێگیر (مستقر) نابێ و، هەرگیز لە سۆزو عاتیفەی دڵی خێزانەکەی ناگات،

---

١) سيرة عمر عبدالعزيز لإبن الحكم ص١٦٤.

بەڵام کەسانێك کە داوێنیـان.. جنسیان بـەپاکی ڕادەگـرن، تـا کـاتی ژن هێنانیان، بەڕاستی ئەوانـە ڕێـزی ئـافرەتو ژنـەکانیان دەگـرن، کـە بـە هاوسەری ژیانیانو.. دایکی منداڵـەکانیان دادەنـێن کـە لـە خۆشەویـستی دەربڕینیدا خەڵاتێکی هەمیشەیی بەدی دەکەن.

لە کۆتاییدا با ئەوە بڵێین، کە ڕادە دانانو سنور دانان بۆ جوتبون لەگەڵ خێزاندا شتێکی پێویستە، چونکە زۆر حاڵەت هەیـە پیـاو ناچـار دەکـات لەگەڵ خێزانەکەی جوت نەبێ وەك: سك پڕیو حەزکردن بـە درێژکردنـەوەی ماوەی منداڵ نەبون، هەندێ نەخۆشی تایبەتی ئـافرەت و... هتـد. لەبـەر ئەوە کاتێك مرۆڤ پێش ژن هێنانی گەر خۆی ڕاهێنابو لەسەر سنور دانـانو قەدەغەکردنی کرداری جنسی، ئەو کاتـە دەتوانـێ لـەم حاڵەتانـەدا خـۆی بگرێ، و سور بێ لەسەر بەرژەوەندی خێزانەکەی.

ڕەنگە پێم بڵێی: ئەمە شتێکی جوانە، بەڵام ئایا ئەمە دەکرێ؟.. بەڵێ! مرۆڤی ئاسایی دەتوانێ خۆی لە خلیسکان و ڕەتڵ بردن بپارێزێ، تەنانـەت لەکاتی زەواجیشدا، نمونەی ئەمەش زۆرە!.. ڕەنگە پێم بڵێـی: بـەڵام ئایـە خۆگرتنەوە لە جوتبون زیان بە تەندروستی ناگەیەنێ؟ ئا لێرەوە بەم شێوەیە وەڵامی ئەم قسەیەت دەدەمەوە:

١/ هەندێ کەس وا گومان دەبەن، کە خۆگرتنەوە لە جوتبون دەبێتە هـۆی کزیو لاوازی ئەندامی زاوزێ (الأعضاء الجنسية)، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا پێچەوانەکەی ڕاستە! گەر سەردانی پزیشکان بکەیت، پێت دەڵێن: ئـەو باوکانەی کرداری جنسی بە باشترین شێوە ئـەنجام دەدەن، ئەوانـەن کـە بەر لە ژن هێنان توانیویانە داوێن پاکی خۆیان ڕابگرن.

٢/ هەندێ کەس دەڵێن: خۆگرتنەوە لە جوتبون ئەندامی زاوزێ دەوروژێنێ؟ ڕاستیەکەی ئەوەیە، کە ئەنجام دانی کرداری جنسی، دەیروژێنێ، چونکە

مومارەسەکردنی کرداری جنسی وا لە ئەندامی زاوزێ دەکات، کە هەردەم لەباری وریاییدا بێت، پاشانیش رۆژێك دادێ کە ویست و بەرگری (مقاومة) ناتوانێ خۆی لەبەر راگرێ. بەڵام خۆگرتنەوەی کردەیی (فیعلی)، زۆر ئارەزوکردنی جوتبون کەم دەکاتەوە بە مەرجێك بیرکردنەوەو تێروانینەکان هێدیو هێمن بن.

٣/ کەسانی تر پێت دەڵێن: خۆگرتنەوە لە جوتبونو کرداری جنسی، خەڵك رادێنێ لەسەر دەستپەڕکردن (الأستمناء)، بە دڵنیاییەوە دەڵێم: هاوڕێیەتی کردنی خراپەکارانو، تەماشاکردنی وێنە وروژێنەرەکان، گەنجان کێش دەکا بۆ ئەم کردارە. هەر کەسێکیش یەکجار ملکەچی دەستپەڕ بو، ئەوا زۆر جاری تریش ملکەچی دەبێو ئەنجامی دەدات، چونکە لەدەستدانی ویست (إرادة) یارمەتی ئەمە دەدات. هەروەها ئەوانەی لە بەندیخانەکان بەندکراون زۆرینەیان ئەم کارە ئەنجام دەدەن، بەڵام شتێك هەیە، کە لە سەرەتاوە داوامان کردوە، ئەویش بەهێزی ویست (إرادە)و پاك داوێنی دو شتن، کە ناهێڵن ئەم کارە ئەنجام بدرێ، ئەوەشمان لەبیر نەچێ ئەوانەی بەدوای ژنان دەکەون، ئەوانە لە کەسانی تر زۆرتر بەرەو ڕوی ئەم کارەوە دەچن، بەتایبەتی گەر ئافرەتێکیان دەست نەکەوێ، کە ئارەزوی خۆیان لێ تێر بکەن، ئا ئەوانە دەستپەڕکردن بە هۆو وەسیلەیەکی ئاسانتر دەبینن بۆ تێرکردنی پێویستی جەستە. کەواتە زەروریو پێویستە بەر لە هەمو شتێك قەناعەت هەبێ بەوەی، کە خۆگرتنەوە لەکرداری جنسی بەسودو پێویستە.

٤/ دەڵێن: خۆگرتنەوە لە کرداری جنسی سەردەکێشێ بۆ دو مەترسی، یەکەم: لە دەستدانی مادەی مەنی، درێژە دەدات بە خۆگرتنەوە، بەڵام راستیەکەی ئەوەیە، کە ئەمە نەخۆشییەکە لەئەنجامی بەردەوام

مومارەسەکردنی کرداری جنسیەوە دێتە کایەوە، کەواتە ئەو نەخۆشیە لە ئاکامی خۆگرتنەوە نیە، بەڵکە لە ئەنجامی مومارەسەکردنە.دوەم: شەیتان پێکەنین، واتە ئەو دەرهاوێژ (إفراز)انەی، کە هاودەمی نوستنە. جا ئەم شەیتان پێکەنینە گەر یەکەمجار خەو بینینی لەگەڵ بو، ئەوا وەسیلەیەکی سروشتییە، کەوا ئامێری زاوزێ (چوك) ئەوەی لێی زیادەیە دەری دەچوێنێو، هیچ خراپەیەکی تێدا نیە، بەڵام مەترسیدارە گەر وا لە گەنج بگەیەنرێ، کە ئەم وەسیلەیە زیانبەخشە، چونکە بە ترسان لێی ملکەچی چەند بیرکردنەوەیەکی ڕەش دەبێ، ئەم بیرکردنەوە ڕەشانەش تەنها لە هەڵەی ئەم تێگەیشتنەوە دێتە کایەوە..

با وریای شتێك بین، زۆر بیرکردنەوە لەلایەنی جنسی، دەبێتە هۆی زۆر شەیتان پێکەنین (ئیحتیلام)، ئەو کاتەش دەرچونی ئەم دەرهاوێژە دەبێتە کردەیەکی ویستی (إرادي) ناڕاستەوخۆ، کەواتە کەوتنەوەی ئەم ئەنجامە، لە خۆگرتنەوە لە کرداری جنسی نیە، بەڵکە لە ئەنجامی دابەزینی گیان (روح)ەوەدیە، کە ئەویش بەرپرسیارە.. ئەو کزی جنسیەش کە لە هەندێ کەسانەوە رویداوە، سەرچاوەکەی خۆگرتنەوە لە کرداری جنسی نیە، بەڵکە لە ئەنجامی زێدەڕۆیی کردنە لە دەستپەڕکردن (الإستمناء)، یان لە ئەنجامی زێدەڕۆیی کردنە لە کرداری جنسی..

لێکۆڵینەوەو باسکردن لەم بابەتە درێژە دەکێشێ، لەبەر ئەوە خوێنەر رەوانەی بەناوبانگترین پزیشك و دانراوەکانیان دەکەین، ئەو کاتەش دەبینین ئێمە لە خۆمانەوە قسەمان نەکردوە، بەڵکە ئەمە ئەزمونو تۆژینەوەی واقیعی تەندروستیە.

# ئافرەت خۆشترین خۆشی ژیانە

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ (الروم- ٢١)، لە واتای (مودة)دا لەم ئایەتە پیرۆزەدا، مانای بەرزی ئەمەی بە دەرخستوەو بەدەری دەخات، کە پەیوەندی نێوان ژنو مێرد تەنها پەیوەندی سەرجێیی نیە، بەڵکو پەیوەندیی چاوەدێریو سەرپەرشتیو خۆشەویستیو دڵنەرمیو ڕێزو سۆزو عاتیفەییە. ئەوەش ڕیزی کەسایەتی ئافرەت وبەرزی پلەی ئافرەت دەردەخات.

پێغەمبەرﷺ دەربارەی خۆشویستنی ئافرەت دەفەرموێ: ((حُبِّبَ اليّ من دنياكم: النساء والطيب! وجعلت قرة عيني في الصلاة)).[1] واتە: لە دنیادا دو شتم لە لا خۆشەویست کراوە: ئافرەتو بۆن خۆشی! نوێژیش ڕونو ڕۆشنایی چاومە.

پێغەمبەر کە دەفەرموێ: لە لام خۆشەویست کراوە، واتە خوای گەورە ئەم دو شتەی لە هەمو شتەکانی دنیا هەڵبژاردوەو خۆشەویستی کردوە، کە هەر یەکەیان نیعمەتێکەو تایبەتمەندیو تام و چێژی خۆی هەیە. ئافرەت خۆشەویستە چونکە چراو ڕۆشناییو دڵنەواکەرو سوکنایی ماڵەوەیەو، پەروەردەکەرو هۆی بونی منداڵە. بۆن خۆشیش بۆیە خۆشەویست کراوە، چونکە دڵ و دەرون فێنك دەکاتو گوشادی دەکات، هەروەها دڵخۆشکەری فریشتەکانە. نوێژیش ڕونی چاوو دڵخۆشیو پاڕانەوەو نزاو داواکردنی

---

١) رواه النسائي، والإمام أحمد في المسند، والحاكم وسنده صحيح.

سەرفرازیو رزگارییە لە نێوان بەندەو پەروەردگاریدا. لـەم نـزاو پاڕانـەوەدا خۆشیو شادی دەدات بە دڵی بەندە، ئەوەش بەختیارترینو سەربەرز تـرین حاڵەتی مرۆڤە))[١].

ئیمام (ابن الجوزي) لـە کتێبـی (نـوادر الأذکیـاء) بـاس دەکـات، کـە شاعیرێك بـەلای چـەند ئافرەتێکـدا تێپـەڕ بـوەو جوانیەکـەیان، سـەرنجی ڕاکێشاوەو ئەم هەڵبەستەی گوتوە:

إن النساء شياطين خلقن لنا نعوذ بالله من شرّ الشياطين

واتە: ئافرەتان شەیتانن بۆ ئێمە دروست بون، پـەنا بـەخوا لـە خراپـەی شەیتانان.

یەکێك لە ئافرەتەکان وەڵامی دایەوەو گوتی:

إن النساء رياحين خلقن لكم وكلكم يشتهي شم الرياحين!!

واتە: ئافرەتان رەیحانن بۆ ئێوە بـەدیهێنراون، هەموشـتان حـەز دەکـەن بۆنی رەیحانتان بکەن.

لەسەر ئەو قسەیەی کە دەڵێ: ئافرەتان رەیحانەن، خاوەنی کتێبی (واجب الآداب) دەگێڕێتەوە: ڕۆژێك خالیدی کوڕی یەزیدی کـوڕی معاویـە باسـی عبداللهی کوڕی زوبەیر دەکات کەوا ڕەزیلە، خێزانەکەشی رەملـەی کـچی زوبەیر، کە خوشکی عبداللهیە دانیشتبو، بـێ‌دەنگ بـوو قـسەی نـەکرد، خالد پێی گوت: ئەوە بۆ قسە ناکەیت! بە قسەکەم ڕازی، یـان هـەر حـەز ناکەیت وەڵامم بدەیتەوە؟! ئەویش گوتی: نە ئەمیانو نـە ئـەویان! ژن بـۆ ئەوە دروست نەبون دەست بخەنە کاری پیاوان، لە راستیدا ئێمـە رەیحانـەین بۆ بۆن کردنو لەئامێزگرتنین! چیمان داوە دەست بخەینە کارتانەوە؟! دەڵـێ: بە قسەکەی سەرسام بوو نێوچاوانی ماچ کرد!

---

١) التاج الجامع للأصول.

# پەلە کردن بۆ پیشەکێش کردنی خواپەرستی چەوت و لاڕێ

ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردوە کە: ((سێ پیاو چونە ماڵی خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ، لە چۆنیەتی خواپەرستی پێغەمبەریان پرسی، کە چۆن خواپەرستی دەکات، کاتێك چۆنیەتی خواپەرستییەکەیان پێ گوترا، ئەوانیش گوتیان: ئێمە لە کوێین لەچاو خواپەرستی پێغەمبەر، خوای گەورە لە گوناهەکانی پێش‌و دوایی ئەو خۆش بوە!

یەکێك لەو پیاوانە گوتی: کەواتە من هەمو شەو شەونوێژ دەکەم.

یەکێکی تر گوتی: بەدرێژایی ساڵ هەمو ڕۆژ بەڕۆژو دەبم.

یەکێکی تریش گوتی: هەرگیز ژن ناهێنم.

کاتێك پێغەمبەرﷺ ئەم قسانەی پێ گەیشتەوە چوە لایان‌و فەرموی: ئەوە ئێوە ئەم جۆرە قسەیەتان گوتوە؟! بەخوا با پێتان بڵێم!! من لە هەموانتان زیاتر لەخوا ئەترسم‌و خۆم لە گوناهان پارێز ڕادەگرم، لەگەڵ ئەوەشدا بەڕۆژو دەبم‌و ڕۆژوش ئەشکێنم، نوێژیش دەکەم‌و ئەخەوم، ژنیش دەهێنم، هەر کەسێکیش واز لە سوننەت‌و ڕێبازی من بهێنێ، ئەوا لەمن نیە.

هەروەها ئیمامی بوخاری‌و ترمذی ریوایەتیان کردوە پێغەمبەرﷺ، سەلمانی فارسی‌و ئەبو دەردائی کرد بە برا، کاتێك سەلمان چوە لای لە ماڵەوە، ئوم دەردائی بینی جلی ئیش‌وکاری لەبەردا بو، وازی لە جل‌وبەرگی جوان هێنابو. سەلمان بە ئوم دەردائی گوت: بۆچی ئەم جۆرە جل‌وبەرگەت لەبەردو خۆت بۆ مێردەکەت جوان ناکەیت؟ ئوم دەردائیش

گوتی: ئەبو دەردائی برات، بە شەو شەونوێژ دەکاتو بە ڕۆژ بەڕۆژو دەبێ، ئەو پێویستی بەدنیا نیەو وازی لە دنیا هێناوە!.. کاتێکیش ئەبو دەرداء هاتەوە ماڵ پێشوازی کردو سەلامی لێکرد. سەلمان خواردنی بۆ ئەبو دەرداء هێنا، پێی گوت: خواردن بخۆ! ئەبودەرداء گوتی: بەڕۆژوم. سەلمانیش گوتی: سوێندم لەسەرت خواردوە، کە دەبێ ڕۆژو بشکێنی، منیش نان ناخۆم تا تۆ نان نەخۆی. ئەبو دەرداء بەقسەی کردو نانی لەگەڵ خوارد، پاشان سەلمان لە شەودا لای ئەبو دەرداء مایەوە. کاتێکیش شەو داهات ئەبو دەرداء ویستی هەڵسێ بۆ شەونوێژ، بەڵام سەلمان نەیهێشتو بە ئەبو دەردائی گوت: جەستەو لەشت مافی بەسەرتەوە هەیەو خێزانیشت مافی بەسەرتەوە هەیە، بەڕۆژو بەو ڕۆژوش بشکێنە، نوێژیش بکەو سەرجێییش لەگەڵ خێزانەکەت بکە!!بۆ هەمو شتێك مافی خۆی بدەرێ. کاتێك کە بەیانی داهات سەلمان گوتی: ئێستاکە هەڵسە نوێژ بکە، مەبەستی نوێژی پێش بەیانی. ئەبودەردائیش هەڵساو دەست نوێژی گرت دو رکات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی کردو پاشان بەیەکەوە چون بۆ مزگەوت بۆ کردنی نوێژی بەیانی. ئەبو دەرداء لە پێغەمبەر نزیك بۆوەو، ئەوەی سەلمان پێی گوتبو بە پێغەمبەری ڕاگەیاند، تا بزانێ حوکمی ئەوە چۆنە. پێغەمبەرﷺ پێی فەرمو: ئەبو دەرداء! جەستەو لاشەت حەقو مافیان بەسەرتەوە هەیە وەك سەلمان گوتی.. (لە ریوایەتێکی تردا پێغەمبەرﷺ فەرموی: سەلمان ڕاست دەکات).

لێکدانەوەی ((وأعط كل ذي حق حقه)) هەمو شتێك حەقی خۆی بدەیێ، ئەوەش کە سەلمان بە ئەبو دەردائی گوت. ئەوەیە: ئیسلام کە بەرنامەی ژیانە، نابێتە بەربەستو ڕێگر لەبەردەم ئارەزو و غەریزەی

جنسی حەڵاڵ. بەڵکو بە پێچەوانەوە هان دەدات و ڕێگەی بۆ خۆش دەکات. دیارە ئەوەش شتێکی سەر سوڕهێنەر نیە، چونکە تەنها ئارەزوی جنسی حەڵاڵە، کە دەبێتە هۆی مانەوەی ئادەمیزاد لەسەر زەوی. دژایەتی کردنو بەربەست کردنی جنس بە حەڵاڵی، ئەوپەڕی نالەباریو گەوجیەتییە. بەختیاریو بەردەوامیی ژیان لەوە دایە، کە جنس بە ئاراستەیەکی ڕاستو دروستو شەرعیانە ئاراستە بکرێو، مەنهەجیشی بۆ دابنرێ.

با خوێنەریش لە لای نامۆو غەریب نەبێ، گەر وتمان ئیسلام هەوڵ دەدات بۆ بەدەست هێنانو بەردەوامی خۆشیو ڕابواردنی دروستو ژیانی بەختەوەر. کاتێکیش داوێن پیسیو زیناو مەی خواردنەوە حەرام و یاساغ دەکات، ئامانج ئەوەیە، کە جەستەو لاشەی مرۆڤ بە دروستیو ساغی بمێنێتەوە، تا تامو چێژ لە جنسی حەڵاڵ بە بەردەوامی وەرگرێ. بینیشمان چۆن پێغەمبەرﷺ لەو کۆمەڵە کەسانە توڕە بو، کە ڕێگایەکی چەوت و لاریان بۆ خۆیان دانابو، بێئەوەی ئارەزوی جنسییان تێر بکەن، کە ئەوەش پێچەوانەو دژی سروشتی ئادەمیزادە، ئەم کۆمەڵە کەسە وایان گومان دەبرد، کە بەهۆی ئەم کارەوە لەخوای گەورە نزیك دەبنەوە، بەڵام پێغەمبەری مەزنﷺ پێی ڕاگەیاندن، کە بە ئەنجام دانی ئەم کارەتان ئێوە لە ئیسلامو بنەماو بنەڕەتەکانی فیترەتو سروشتی ساغ دور دەکەونەوە!!

هەروا بە بە بەرگریکردنی ئارەزوی جنسی، ئازارەکانی وەسوەسەی شەیتان دەناڵێننو خۆیان سەرقاڵ دەکەن، هەمو ئەمانەش لەبەر ئەوەیە، کە ڕەبەنی هەموی خراپەو شەڕە، دەگمەنێك نەبێت، ئەگینا کەسانی تر لە گوناهەکانی دەربازیان نابێ، گەر سەریش کەوتن ئەوا زۆرجار لەو فەرزەیان دەکات، کە خوای گەورە فەرزی کردوە.

ئیبن عەباس گوتویەتی: ژن بێنن چونکە ڕۆژێك لەگەڵ هاوسەرگرتندا باشترە لە خواپەرستی ئەوەندە ساڵە!

ئیبن مەسعود لە کاتێکدا کە پێکراوەو برینـدار کـراوە گوتویـەتی: ژنم لـێ مارەبکەن، چونکە حەزناکەم بە ڕەبەنی بە خزمەت خوا بگەم!

گوتراوە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە ڕۆژی دوەمی مردنـی ژنەکـەی، کـە دایکی عبدالله بو، ژنی هێنایەوەو گوتی: حەزناکەم بە ڕەبەنی بمێنمەوە!

# هەڵبژاردنی هاوسەری چاك

زۆربەی زۆری ئەو گیروگرفتانەی دێنە پێش ژن هێنانو شوکردن، هەڵبژاردنی هاوسەری ژینە بەبێ لێکۆڵینەوەو بەدوادا چونو سۆراغ کردن، چەند کوڕو کچی لاو هەبون پەلەیان لە هەڵبژاردنی هاوسەرەکەیان کردوە ، تەنها لەبەر ئەوەی شەیدای جوانیەکەی بوە، کە بەهۆیەوە توشی نەگبەتیو ماڵ وێرانی بوە.

ئیسلام هانی ئەوەی داوەو گرنگیشی پێ دەدات، کە ئەو کەسەی هاوسەر هەڵدەبژێرێ خاوەن رەوشتو دینو داوێن پاكو خاوەن ئیمانێکی پتەو بێو ملکەچی یاساکانی قورئان بێ.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللهِ أَتْقَاكُمْ﴾ (الحجرات-١٣)، واتە: بەڕێزترو نزیکترو پایەبەرز ترینتان لای خوا ئەو کەسەیە، کە زیاتر لە خوا دەترسێو خۆی پارێز دەکات لە ئاست گوناهو تاواندا.[١]

هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَنكِحُوا الأَيَامَى مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِنْ يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللهُ مِنْ فَضْلِهِ وَاللهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ (النور: ٣٢)، واتە: مارەیی ببڕن کە ئەوە بانگەوازە بۆ (وەلی ئەمر)ەکان، بۆ ئەو کەسانەی کە ژنیان نیە یان شویان نەکردوەو مێردیان نیە. لەو کەسانە مارەیی ببڕن، کە لە خۆتانن‌و (صالحن) لەو عەبدە پیاوو ژنانەی، کە لە لاتان کار دەکەن. ئەگەر لەبەر فەقیریو هەژاری، ژنیان بۆ نەهێنن،

---

١) نەیفەرموە بەڕێزترتان لای خوا ئەو کەسەیە، کە خاوەن خانوو سامانو خاوەن ئۆتۆمبیلو شەهادەو ناوو شۆرەت بێ. بەڵکو پێوەر لای خوا زیاتر پابەندبونە بە یاساکانی خواو خۆ نزیك کردنەوەیە بەکرداری جوان. (وەرگێڕ)

یان بەشویان نەدەن، ئەوا خوای بەخشندە بە میهرەبانی خۆی دەوڵەمەندیان دەکات‌و خوای باڵاش سۆزو رەحمەتی فراوان‌و زانایە بە حاڵی بەندەکانی.

لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ ﴿والصالحين﴾ بۆمان دەردەکەوێ، کە هاوشانی (کفاءة)ی هاوسەر هەڵبژاردن تەنها مەرجی (الصلاح)ی داناوە. (الصلاح)یش دین‌و رەوشت‌و تەقواو توانای مارەیی دان دەگرێتەوە.

خوای گەورە بەڵێنی بەو کەسانە داوە، کە ژن دێنن و ژنیان هێناوە، گەر فەقیری ڕوی تێکردن دەوڵەمەندیان دەکات. هاوشانی (کفاءة)یش مانای پابەندنەبون و تەواوکاری بنەماکانی ئیسلام دەگەیەنێ. هەروەها بۆ هاوشانی زانیاریشی وەگەڵ دەکەوێ. مەبەست لە زانیاری دیراسە کردن‌و کردەوە پێکردنی قورئان‌و سوننەتە.

لە ئیسلامدا کەفائەتی ماڵ‌و سامان‌و ناوو شۆرەت‌و شەهادەو ڕەچەڵەك‌و دەسەڵاتداریی هیچ کێشێکی بۆ دانانرێ، نمونەشمان لەمبارەیەوە پێغەمبەرە ﷺ، ئەوە بو کە کچی پوری بەشودا بە زەیدی کوڕی حاریسە، لە صەحابەکانیش (عبدالرحمن)ی کوڕی عەوف خوشکی خۆیدا بە بیلالی حەبەشی، ئەبوحوذەیفە هیندی کچی عوتبەی کوڕی رەبیعەی لە سالم مارەبڕ کرد، کە بەندەی ئازادکراوی ژنێکی ئەنصاری بو..

نمونەی دەقی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ هەیە دەربارەی ڕەچاو نەکردنی هیچ پلەو پایەیەك، تەنها دین‌و ئاکاری‌و ڕەفتاری جوان نەبێ، وەك دەفەرموێ: ((**إذا خطب إليكم من ترضون دينه وخلقه فزوجوه!! إلاّ تفعلوا تكن فتنة في الأرض...!! وفساد عريض!!**))[1]، واتە: گەر یەکێك خوازبێنی کچەکەتانی کردو ئێوەش لە ئایین‌و خوڕەوشتی ڕازی بون، ئەوا

---

١) رواه الترمذي، حديث صحيح.

بیدەنێ، گەر نەیدەنێ ئەوا فیتنەو خراپەکاری لەسەر زەوی بڵاودەبێتەوە..

هەروەها دەفەرموێ: ((تنكح المرأة لأربع: لمالها، ولحسبها، ولدينـــها، ولجمالها، فاظفر بذات الدين تربت يداك))[١]، واتە: ئافرەت لەبەر چوار شت مارە دەکرێتو دەهێنرێ: لەبەر ماڵو سامانەکەی یان سامانی باوکی، یان لەبەر ڕەچەڵەكو ناوداریەکەی، یان لەبەر دینو ڕەوشتی ئافرەتەکە، یان لەبەر جوانیو شۆخو شەنگی ئافرەتەکە. ئەو ژنە بێنـە کـە خـاوەن دیـنو ڕەوشتە، ئەگەر وا نەکەیت دەستت بە قوڕدا دەچێ[٢].

گەر سەرنجێك بدەینە ئەم فەرمودەیە، دەبینین بۆ هاوسـەریەتی، دیـن و ڕەوشتی هەڵبژاردوە، لەبەرئەوەی (دین) گرنگترین مەرجـە بـۆ هاوشـانی. ئەو پیاوەی پابەندی فەرمانەکانی ئیسلام دەبێو شتێك کە قەدەغە کرابـێ خۆی لـێ دور دەخاتەوە، ئەوا ئەو پیاوە هەڵسوکەوتو مامەڵەو ڕەفتـاری بەرامبەر خێزانەکەی چاكو باش دەبێـتو، ڕێـزی دەگـرێو خۆشـی دەوێو دەبێتە پارێزگاری خێزانەکەی لە هەمو بوارەکـان دا. ئـافرەتێکیش خـاوەن دینو ڕەوشت بێ، ئارەزوی نەفس کاری تـێ ناکـاتو چەواشـەی ناکـاتو خۆیشی بەرامبەر بە نەفس بە سوك دانانێو کاروبـاری ناومـاڵ فـەرامۆش ناکاتو، لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیداو لە مافەکانی مێردەکەی بێئاگا نابێ.

با ئەوەش بزانین کاتێك کە پێغەمبەر دەفەرموێ: ژن بـۆ جـوانی مـارە

---

١) رواه البخاري ومسلم وأبوداود والنسائي.

٢) (تربت يداك) واتە: دەستت بە قوڕدا چێ، ئەوەش کینایەیە بۆ هەژاریی، ئەم قسەیە بە مانای دوعا لێکردنە، بەڵام مەبەست پێی دوعالێکردنی ڕاستەقینە نیە، بەڵکە مەبەست لەم قسەیە ئەوەیە کە پیاو ئافرەتی دیندار بکاتە هاوسـەری خـۆی.. بڕوانـە (المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم)ی عبدالكريم زيدان، بەرگی شەشەم، ل٤٣.. (وەرگێڕ)

دەکرێ، لێرەدا مەبەست لەمە ئەوە نیە، کە هیچ ڕەچاوی جوانی نەکرێ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە، کە نابێ تەنها جوانی بکرێ بە مەرج. ئەگینا جوانیش ئیعتباری خۆی هەیە، وەك لە فەرمودەی: ((أنظر إليها، فإنه أحرى أن يؤدم بينكما)) بەدەردەکەوێ. کاتێك ژنێك خۆی پێشکەش بە پێغەمبەرﷺ دەکات، پێغەمبەریش دوای رامان لێیو سەرنجدانی، نەرێ دەکات.

ئەنەس دەڵێ: ئەبو طەڵحە ئوم سولەیمی مارەکردو مارەییەکەشی ئیسلام بونی ئەبوطەڵحە بو!

چونکە ئوم سولەیم لەپێش ئەبو طەڵحە مسوڵمان ببوو، کاتێك ئەبو طەڵحە داخوازی ئوم سولەیمی کرد، ئوم سولەیم گوتی: من مسوڵمان بوم، گەر تۆش مسوڵمان ببیت، شوت پێدەکەم. ئەبو طەڵحەش مسوڵمان بو، مسوڵمانیەتیەکەی بو بە مارەیی ئوم سولەیم[1].

بۆ هەڵبژاردنی هاوسەر، ئەم ئامۆژگاری‌یانەی خوارەوە دەخەینە ڕو، کە لەلایەن هەندێ شارەزاوە دانراوە:

١- لەو قوتابخانەیە بپرسە، کە ئەو کچەی تێدا فێر بوەو دەرچوە، پێش ئەوەی لەو ماڵە بپرسی، کە تیایدا پەروەردە بوە.

٢- کچی دایکێکی چاكو بروادارو چاك (صالحة) بخوازە.

٣- هاوسەریەتی ژنو پیاو، هاوبەشییەکی ژیانیو گوزەرانییە، ئافرەتێك هەڵبژێرە، کە لەگەڵ سروشت (طبیعة)و خواردنەوەو خوڕەوشتت دا دەگونجێو یەك دەگرێتەوە.

خوای گەورە دەفەرموێ:﴿الزَّانِي لاَ يَنكِحُ إلاَ زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ

---

١) رواه النسائي (حديث صحيح).

لاَ يَنكِحُهَا إِلاَّ زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذٰلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ (النور- ٣)، واتە: پیاوی زیناکەر ئافرەتێکی زیناکەری وەك خۆی نەبێ مارە ناکاتو ناشبێ مارەی بکات، چاویشی لە ئافرەتی داوێن پاك نیە بۆ مارەکردنی، هەروەها چاوی لە ئافرەتێکی موشریکەیە کە شوی پێ بکات. بە هەمان شێوە ئافرەتی زیناکەرو داوێن پیس پیاوێکی داوێن پیس نەبێ مارەی ناکاتو نابێ پیاوی داوێن پاك ئافرەتی داوێن پیس مارە بکات. جا مارەکردنی پیاوی بڕوادار بۆ ئافرەتی داوێن پیسو موشریکەو مارەکردنی ئافرەتی داوێن پاك بۆ پیاوی داوێن پیسو موشریك حەرامە.

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێ: نابێ پیاوی مسوڵمانو داوێن پاك، ئافرەتی داوێن پیس مارە بکات، لەبەر ئەوەی مارەیی‌یەکەی دروست نیە، تا ئەو کاتەی ئافرەتەکە تەوبە دەکات. گەر تەوبەی کرد ئەو کاتە مارەیی ئافرەتەکە دروستە، ئەگینا دروست نیە. هەروەها نابێو دروست نیە ئافرەتێکی مسوڵمانو داوێن پاكو بە ڕەوشت بە شو بدرێتە پیاوێکی خراپەکارو فاسقو فاجر. مارەبڕینی دروست نیە تا ئەو پیاوە نەگەڕێتەوە لای خواو تەوبە نەکات، دروست نیە ئافرەتی مسوڵمانی بەشو بدرێتێ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَحُرِّمَ ذٰلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەمە لەسەر بڕواداران حەرام کراوە.

جێگەی داخو دڵگرانی‌یە کە ئەم پێوان (قیاس)ە لەلای زۆربەی خێزاناندا هیچ نرخو بایەخی نیە. گەر پێیان بڵێی: ئەو کەسەی هاتوە بۆ داخوازی کچەکەتان نوێژ ناکات، پێت ئەڵێن: ئێستا ماوەیەتی نەفامو گەنجە. گەر بڵێی: عەرەقو شتی تری سەرخۆشکەر ئەخوات، دەڵێن: خوا گوناهەکانی ئەسڕێتەوەو لێی خۆش ئەبێ. گەر بڵێی: عەقیدەو بیروباوەڕی ئەم کوڕە پیسو خراپەو لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێ، ئەوا بەشتێکی بچوکی

دادەنێن. بەڵام کە پێت گوتن: ئەم کوڕە حاڵەتی ماددی مـام ناوەنـدی‌یـەو پارەی زۆری نیە، یەکسەر هاواریان لێ هەڵئەستێ‌و نەرێ دەکـەن، گەرچـی کوڕێکی مسوڵمان‌و باش‌و ڕێك‌و پێك‌و خاوەن ڕەوشتێکی باش بێت. بـەڵام ماڵ وێرانی‌و بەدبەختی‌و ژیان تاڵی بۆ ئەو کچەی کە شو بەو جـۆرە پیـاوە دەکات، کە ئەم سیفەتە جوانانـەی ئیـسلامی تێـدا نیـە. چـونکە ژیـانی کچەکە دەکەوێتە مەترسی‌و کارەسات‌و ئاشـوب‌و ئـاژاوەو خراپەکاریـەوە، ئەویش بەهۆی پەیوەستی بەو پیاوە داوێن پیس‌و زیناکەرەوەیـە. جـا گـەر ئافرەتەکە دیندار بێ، یا بەهۆی ئەنجامدانی شتە حەرامەکانـەوە دینەکـەی لەدەست دەدات، یان ژیانێکی کولەمەرگی‌و ناخۆش بەسەر دەبات.

زانیومە کچێك شوی بە کوڕێکی عەرەق خۆر کرد، کاتێك کوڕەکە ئـەم کچەی گواستەوە، بۆ بەسـەربردنی مـانگی هـەنگوین (شـهر العـسل) لـە یەکێك لە ئوتێلەکانی لوبناندا دابەزین، کوڕەکە زۆری لە کچەکە کـرد تـا عەرەق بخواتەوە، کچەکەش کە عەرەقی خواردەوەو هـەردوکیان سـەرخۆش بون، جا پێش ئەوەی بچێتە لای بـەنیازی جوتبـون، کـچکە لـە ژورەکـەی خۆیان چوە دەرەوە بۆ سەرئاو، کە گەڕایـەوە ویـستی بـچێ بـۆ ژورەکـەی خۆیان، بەڵام لەبەرئەوەی سەرخۆش بوو، چوە ژورێکی تر، کە پیاوێکی بـە تەنهای تێدا بوو، جا پیاوەکە پەلاماری داو داوێن پیسی لەگەڵدا کردو، تا بەیانی ئافرەتە تازە بوکەکە لەلای مایەوە، مێردەکەشی لەبەر سەرخۆشـی خەوی لـێ کەوتبوو ئاگای لە ژنەکەی نەمابو..

(ابو نعیم) لە (الحلیة)دا گێڕاویەتیەوە، کە گوتویەتی: (أبو طلحـة) بـەر لەوەی مـسوڵمان ببـێ خـوازبێنی (أم سُلَیم)ی کـرد ، (أم سُـلَیم) گـوتی: لەڕاستیدا حەز دەکەم، پیاوی وەك تۆ ڕەت ناکرێتەوە.. بەڵام تۆ پیـاوێکی

بێ‌بڕوای، منیش ژنێکی مسوڵمانم، بۆم دروست نیە شوت پێ بکەم. (أبوطلحة) گوتی: ئەی چاو بە ریقنە، ئەوە چیتە؟! (أم سُلَیم) گوتی: چیمە؟ گوتی: تۆ لەکوێی لە زەردو سپیان (مەبەستی ئەوەبو بە زێڕو زیو لە خشتەی ببات). (أم سُلَیم) گوتی: نە زەردم دەوێ نە سپی، تۆ مرۆڤێکی شتێك دەپەرستی، کە نە دەبیستێ‌و نە دەبینێ‌و هیچ سودت پێ نابەخشێ.. ئەوە تۆ شەرم ناکەیت دارێکی زەوی دەپەرستی، کە حەبەشیەکی کوڕی فلان دایتاشیوە؟! گەر مسوڵمان ببی ئەوە دەبێتە مارەیی من، جگە لەمە مارەیی ترم ناوێ! گوتی: ئەی چاو بە ریقنە! کێ هەیە ئیسلامم فێر بکات؟ (أم سُلَیم) گوتی: پێغەمبەری خواﷺ ئیسلامت فێر دەکات.. جا چوە خزمەت پێغەمبەرو مسوڵمان بو.

# لەکاتی داخـوازی پێویسـتە
# کـوڕو کـچ یەکتری ببینـن

ئەبو هورەیرە خوا لێـی رازی بـێ دەڵـێ: لەگـەڵ پێغەمبـەر بـوم ﷺ پیاوێك هاتـە لایو هـەواڵی پێـدا، کـە ئـافرەتێکی ئەنـصاری خوازتـوە. پێغەمبەرﷺ پێی فەرمو: ئایا سـەیری ئافرەتەکـەت کـردوە؟! پیاوەکـەش گوتی: نەخێر!

پێغەمبەریش فەرموی: بڕۆ تەماشای بکـە! چـونکە شـتێك لـە چـاوی ئافرەتە ئەنصاریەکان هەیە، بە واتای چاویان بچوکە))[1].

بۆ پاساودانی ئەم مەسەلەیە فەرمودەی (صحیح) هاتوە کە دەفەرموێ: ((أنظر اليها، فإنه أحرى أن يؤدم بينكما))[2]، واتە: تەماشای ئافرەتەکە بکە چونکە بەهۆی ئەم بینینەوە خۆشەویستیو بەزەیی لە نێوانتاندا زیـاتر بەردەوام دەبێ.

هەروەها دەفەرموێ: ((إذا خطب أحدكم المرأة، فإن استطاع أن ينظر الى ما يدعوه الى نكاحها فليفعل))[3]، واتە: گـەر داخـوازی ئافرەتێکتـان کردو توانیتان ئەو شوێنانە تەماشا بکەن کە بۆ مارەیی دەگونجێ تەماشـا بکرێ با تەماشای بکات.

هەر لە هەمان بابەتـەوە دەفـەرموێ: ((إذا خطب أحدكم امرأة فـلا جناح عليه أن ينظر إليها إذا كان، إنما ينظر اليها لخطبته، وإن كانت لا

---

١) رواه مسلم والنسـائي والطبراني (حديث صحيح).
٢) رواه ترمذي والنسائي وابن ماجة (حديث صحيح)
٣) رواه أبوداود والطحاوي وأحمد في المسند وابن ماجه (حديث صحيح).

تعلم))[1]، واته: گەر یەکێك لە ئێوە ئافرەتێكی داخـوازی كـرد، گونـاهی ناگا گەر تەماشای ئەو ئافرەتـە بكـات، چـونكە تەماشـا كردنەكـەی بـۆ داخوازی یە، با كچەكەش پێی نەزانێو ئاگای لێی نەبێ.

یەكێك لەو كەسانەی كاری بەم فەرمودەیە كرد (محمد كوڕی مەسلەمەی ئەنصاری) بو. سەهلی كوڕی ئەبی حەثمە دەڵێ: محمـدی كـوڕی مەسـلەمەم بینی زۆر بە وردی تەماشای بوثـەینەی كچی زوحاكی دەكرد، منـیش پـێم گوت: ئەوە تۆ شتی ئاوا دەكەی، تۆ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوای؟ محمدی كوڕی مەسلەمەش گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خـوا بـو دەیفـەرمو: ((إذا ألقي في قلب امرئ خطبة امرأة فلا بأس أن ينظر إليها))[2]، واتـە: گـەر ئافرەتێك كەوتە دڵی پیاوێك بـۆ داخـوازیكردنی، هیـچی تێـدا نیـە گـەر تەماشای بكات.

لەنێو شەرع ناساندا ڕاو بۆچونی جیاواز هەیـە لـەبارەی تەماشـاكردنی داخوازی كراو. هەندێك مەزهەب دەڵێن دەبێ تـەنها دەمو چـاو و هـەردو دەست تەماشا بكرێ. ئـەم پابەنـد (تقییـد)ەش هـیچ بەڵگەیـەكی نیـەو، لەكارخستنی تێگەیشتنی هاوەڵانە بۆی.

لێرەدا پرسیارێك بە مێشك دا دێ" گەر خـوای یاسـادانەری كاربـەجێ ڕێگەی دابێ بە پیاو كە بەر لە گرێبەست (عقد)ی هاوسەرگرتن تەماشـای ئافرەت بكات، ئایا وەلی ئافرەتەكە مافی ئەوەی هەیـە ئافرەتەكـە بـەبێ حیجابی شەرعی پیشانی پیاوەكە بدات؟! بە دیدی من —خـواش زانـاترە- ئەمە دروسـتە، مـادام خـوای یاسـادانەر ڕێگـەی داوە بـە خوازبێنیكـەر

---

١) رواه الطحاوي وأحمد في المسند (حديث صحيح).

٢) رواه إبن ماجه والطحاوي وأحمد في المسند وغيرهم (حديث صحيح).

تەماشای ئافرەتی خوازبێنیکراو بکات ئەوەی، کە دەتوانێ تەماشای بکات، با ئافرەتەکەش نەزانێ.

ئیمام ابن القيم لە کتێبی (تهذيب السنن)دا (٣/٢٥-٢٦) گوتویەتی:

داود گوتویەتی: دەتوانرێ تەماشای هەمو لەشی ئافرەتەکە بکرێ! ئیمام ئەحمەدیش سێ ریوایەتی هەیە، کە یەکێکیان دەڵێ: دروستە تەماشای دەمو چاوو هەردو دەستی ئافرەتەکە بکرێ، ریوایەتەکەی تر دەڵێ: ئەو ئەندامانەی کە بەزۆری بەدیارەوەیە وەك گەردنو هەردو قاچ دروستە تەماشا بکرێ. سێیەمیش دەڵێ: دروستە تەماشای هەمو لەشی ئافرەتەکە بکرێ.

ئەوەی شایانی وتنە لەبارەی بینینی داخوازیکەرو داخوازیکراو (الخاطب والمخطوبة)، سەرنج بۆ ئەوە رادەکێشین، کە نەریتێکی پیسو خراپ هەیە لەناو زۆربەی خێزانە بەناو مسوڵمانەکان بڵاوبۆتەوە، ئەویش تێکەڵ بونی کورو کچە پێش مارەبڕینیان، کە لە دەرەوەداو لە شوێنی چۆڵ بە یەکتری دەگەن بە بیانوی ئەوەی، لەژێر ئەزمون دان تا لە یەکتری بگەن. ئەوەش دابو نەریتی شارستانیەتی چەواشەو فێڵبازە، کە بونەتە کۆیلەو بەندەی ئەم شارستانەیەتە، کە دین و رەوشتیان لەلا نەهێشتین.

بەڵێ، ئیسلام رێگەی داوە بە داخوازیکاری کچ تەماشای دەستو روخساری بکات، گەر بەراستی نیازی هێنانی هەبێو ئافرەتی دڵسۆز بنێرێ، تا لە رەوشتو رەفتاری کچەکە ئاشنا بن بۆی هەیە زۆر لێی بکۆڵێتەوەو نوطفەی خۆی هەڵبژێرێ، بەڵام کار بگاتە ئەوەی کە حەرامی تێدا بەکار بهێنرێ، ئەوە ریسواییو شەرمەزارییە. خەڵکیش سەرفراز نابێ، تا نەگەرێنەوە سەر رێبازو یاسای دینەکەیانو کورو کچیان لە کاری حەرامی دور نەخەنەوە.

# پشـكنینی پزیشـكی پێش هاوسـەرگرتن
## (الفحص الطـبي قـبل الزواج)

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((فِرّ من المجذوم فرارك من الأسد))[١].
واتە: ڕاكردنت لە توش بو بە گولی، ڕاكردنتە لە شێر.
هەروەها دەفەرموێ: ((لا يورَدنّ مُمْرِضٌ علـى مُـصِحّ))[٢]، واتـە: نەخۆش نەبردرێتە لای كەسانێك، كە ساغنو نەخۆش نین.
((لا ضَررَ ولا ضِرار)) [٣]، واتە: نە زیان بگەیەنەو، نە بهێڵـی زیانـت پێ بگات.

ئەم فەرمودە پیرۆزە ئاماژەی حەزەرو ئاگادار بون دەكـەن لـە نەخۆشـی گرتنـەوە! زۆر لـە حكومەتـەكانی ئێـستا چـەند یاسـایەكیان دەركـردوە سەبارەت بە پێویست بونی پشكنینی پزیـشكی (فحـص طبـي)، بـەر لـە بەهاوسەر بونی كوڕو كچەكە، دیارە ئیسلام پێشینەی هەیە سەبارەت بـەم ئاڕاستەیە.

جێی داخە كە بڵێم ئـەو تاقیكردنـەوە پزیـشكییە زۆر لـە پزیـشكەكان ئاسـانكاری تێـدا دەكـەن، ژنو مێـردیش لـەم پـشكنینە هەڵـدێن، كـە ئاكامەكەی بەخراپ دەكەوێتە سەر خۆیانو منداڵەكانیان.

لەسەر هەر ژنو مێردێكی ئیـسلامی پێویـستە گـەر هـەر یـەكێكیان

---

١) رواه البخاري
٢) رواه البخاري
٣) رواه أحمد في المسند وابن ماجه، حديث صحيح.

توشی نەخۆشی یەکی درم بون، نەبنە هاوسەری یەکتری. لە فەرمودەی (صحیح)ی پێغەمبەر ﷺ هاتوە، کە دەفەرموێ: ((لا یؤمن أحدکم حتی یحب لأخیه ما یحب لنفسه من الخیر)).

دکتۆر وجیه زین العابدین لە رسالەکەی (الإسلام والتربیة الجنسیة)دا گوتویەتی: ئەوەی لەم فەرمودەیە تێدەگەم (لا ضرر ولا ضرار) ئەمە بۆ بەدوا گەڕانە بۆ ئافرەتی چاكو لادانی زەرەرو زیان لە خۆیو لە پیاو، دروستە بەڵکە پێویستە لە نیزامی ئیسلامیدا، کوڕو کچ پێش بەهاوسەری بونیان فەحس بکرێن، بە تایبەتی بۆ زانینی ئافرەتەکە، کە ئایا منداڵی دەبێ؟ هەروەها فەحسی پیاوەکە بکرێ نەبادا نەخۆشییەکی درمی، یان ئامێر نەرمی یان نەزۆکی یان شێتی هەبێت... بەڵام گرنگترین مەرج بۆ پیاو ئەوەیە، کە تەندروستی باش بێتو توانای جوتبونی هەبێت وەك لە فەرمودە هاتوە: ((من استطاع منکم الباءة فلیتزوج... هەر یەکێك لە ئێوە توانای هاوسەرگیری هەیە با هاوسەرگیری بکات الحدیث)).

البـــاءة: مانای توانای دابینکردنی خانوو پێداویستییەکانی ژن هێنانی هەبێت، هەروەها مانای توانای جنسی دەگەیەنێ.. وەك کە لە کتێبی (المحیط للفیروز آبادي) هاتوە.

لێرەدا چەند شیکردنەوە(تحلیل)ێکی پێویست هەیە، کە پێویستە لەسەر داخوازیکارو داخوازیکراو (کچو کوڕ) بەر لە بەهاوسەر بونیان ئەم تەحلیلە بکەن، دیارە ئامانجەکەشی ئاشکراو ڕونە: کە ئەویش دڵنیا بونە... تەئکید کردنە لە هەمو شتێك، تا بزانرێ ئەو کەسە کەمو کورتی هەیە؟ گەر هەیە، دەبێ چارەسەر بکرێ.

## پشكنینی گروپەكانی خوێنی ژن‌و مێـرد

مەبەستمان لێرە گروپی (البریزیز یـان أر أتـش)ــە، جـا لێـرەدا چـوار شیمانە (احتمال) هەیە ڕەنگە ڕو بدات:

شیمانەی یەكەم: لەوانەیە گروپی خوێنی هەریـەك لـە ژن‌و مێـرد ئیجـابی بێت.

شیمانەی دوەم: لەوانەیە گروپی خوێنی هەریەك لە ژن‌و مێرد سلبی بێت.

شیمانەی سێیەم: لەوانەیە گروپی خوێنی ژنەكە ئیجابی بێت و مێردەكەی سلبی بێت.

لەم سێ شیمانە (احتمال)ەدا، گروپەكانی خوێن لەگـەڵ یـەك گونجـاو و ڕێكن.

بەڵام لە شیمانەی چوارەم: لەو كاتەی گروپی خوێنی ژنەكە سلبی بێـت، هی مێردەكەی ئیجابی بێت، ئەو كاتە گروپەكانی ژن‌و مێرد ڕێك نابێـت‌و جیاواز دەبێت. خۆشبەختانە ئەم جۆرە شیمانەیە زۆر كـەم ڕو دەدات، لـەم حاڵەتەدا ڕەنگە منداڵەكە گروپی ئیجابی باوكی هەڵبگرێ‌و، لە لای دایـك دژە مژادی خوێنەكەی، كە سـلبی گروپـە دروسـت دەبێـت، ئەمـەش لـە ئاكامی سك پڕبون بە منداڵێكی ئیجابی گـروپ خوێنەوەیـە، جـا یەكـەم لەدایك بون هەردەم بە شێوەیەكی سروشتی دەبێـت سـەبارەت بـە یەكـەم منداڵ، بەڵام لـە سـكی دوەم‌و سـێیەم‌و دوای ئەوانـە، كۆرپەلـە (جـنین) دوچاری ئەو دژەمژادە دەبێت، كە لە ئاكامی دووگیانی یەكەم لـە خـوێنی دایكی پێك هاتوە.

ڕێژەی ئاڵۆزکاری (مضاعفات) لە منداڵی سێیەم زیاتر دەبێت لە منداڵی دوەم، چوارەم زیاتر دەبێت لە سێیەم. ئەمجۆرە موزاعەفاتانە زۆر بە کەمی ڕو دەدات، چونکە لە حیکمەتی خوای گەورەیە، کە خوێنی کۆرپەلە تێکەڵ بە خوێنی دایك نابێت، تەنها لە هەندێ حاڵەتی تایبەت نەبێت، کە بەکەمی ڕوودەدات.

شیمانەی ڕودانی ئەم موزاعەفاتانە لە (١٠٪) زیاتر نابێت. گەر ڕوشی دا لە یەکەم کاتی دوای لەدایك بون، ناتوانین بە کردەی گۆڕینی خوێنی منداڵەکە هەستین، گەر پێویستی کرد.

## شیکردنەوە (تحلیل)ی ئاوی مەنی پیاوەکەو دڵنیا بون لە ژمارەو زیندویەتی تۆوی پیاو

پێویستە ژمارەی سروشتی تۆو لە چل ملیۆن ملیلتر کەمتر نەبێت، رێژەی زیندەیی لە هەر پەڕین (قذف)ێکدا لە ٦٥٪ کەمتر نەبێت، جا گەر پاش شیکردنەوەکە، ئەم هاوکێشانە لەلای تایبەتمەندان نەگەیشتە شێوەی ئاوی مەنی، ئەو کاتە دەتوانرێ پەنا ببرێتە بەر چارەسەری پزیشکیی بۆ چالاککردنی تۆوو زیادکردنی ژمارەکەی، کە ئێستا ئەم کارە ئاسان کراوە.

## شیکردنەوەی دەرهاوێژی پرۆستات

ئەم شیکردنەوەیەش بۆ دڵنیا بونە لە توش نەبون بە هەوکردنی کەڤناری (مزمن)، چونکە هەبونی ئەمجۆرە هەوکردن (إلتهاب)انە، دەبێتە هۆی هەوکردنی ملی منداڵدانی ژنەکە.[1]

---

١) مجلة طبيبك الخاص.

# پێشبڕکێ نەکردن لە خوازبێنی[١]

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَعْتَدُوا إِنَّ اللهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ (البقرة- ١٩٠)، واتە: دەستدرێژی مەکەن، خوا دەست درێژیکەرانی خۆش ناوێ.

---

١) (بهي الخولي) لە کتێبەکەی (المرأة بين البيت والمجتمع)دا دەڵێ: ((بابایەك جوامێرو مەردبێ ناچێتە خوازبێنی ئافرەتێك، کە دەزانێ لەلایەن یەکێکەوە خوازبێنی کراوە، چونکە ئەم کارە دەبێتە هۆی پچڕانی پەیوەندیو، نانەوەی دوژمنایەتیو بوغزو قینە، هەروەها لە ئاکار خراپیو بێعەقڵیە.

ئەو کەسەی دەزانێ خوازبێنی ئافرەتێك کراوەو ئەویش خوازبێنی دەکات لەو حاڵەتەدا مەدحی خۆی دەکاتو بەرامبەرەکەی زەم دەکات.. هەروەها هەندێ سیفەتی چاك دەداتە پاڵ خۆی، خۆ گەر راست نەکات تەنها ئەوەندە گوناهەی بەسە، کە ئەو غەیبەتی کردوە..))

بەڵام گەر خوازبێنیکەری یەکەم وازی هێنا، ئەوا بۆ ئەویتر هەیە خوازبێنی بکات. هەروەها گەر خوازبێنیکەری یەکەم فاسق بو، بابای دوەم بۆی هەیە خوازبێنی بکات، چونکە ئەوکاتە مافی خۆیەتی کچەکە لەدەست کابرایەکی بێدین دەرباز بکات!

بابای مسوڵمان گەر راوێژی پێکرا، بۆی هەیە کێ بەباشتر بزانێ پێشنیار بکات.

لە کتێبی (جماع العلم)ی پێشەوا شافیعی بە تەحقیقی (أحمد محمد شاکر) هاتوە: (فاطمة بنت قیس) دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموم: گەر عیدەت تەواو بو ئاگادارم کەوە، جا کە عیدەکەی تەواو بو بە پێغەمبەری ڕاگەیاند، کە (معاویە)و (ابا جهم) هاتونەتە خوازبێنی، پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((معاویە هەژارەو ماڵ و دارایی نیە، ئەبوجەهمیش گۆچان لەسەر شانی ناهێنێتە خوارەوە (واتە زۆر لەژن دەدات)، بەڵام تۆ شو بە ئوسامەی کوڕی زەید بکە))، فاطمة دەڵێ: حەزم پێی نەکرد شوی پێ بکەم، جا پێغەمبەر فەرموی: شو بە ئوسامە بکە، منیش شوم پێکردو خوای گەورەش خێرو بەرەکەتێکی زۆری خستە ئەم زەواجەو پێی دڵخۆش بوم. شافیعی لە (رسالة الأم)و ئەحمەدو خاوەنی هەر شەش کتێبەکە جگە لە بوخاری گێڕاویانەتەوە.

دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا﴾(الأحزاب- ٥٨)، واتە: ئەوانەی ئازاری پیاوانی ئیماندارو ئافرەتانی ئیماندار دەدەن بێ‌ئەوەی تاوانێکیان ئەنجام دابێت، ئەوانە بوختان و گوناهو تاوانێکی ئاشکرا دەگرنە ئەستۆ.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: ((لا يخطب الرجل على خطبة أخيه حتى ينكح أو يترك)) [1]، واتە: کەسێك داخوازی کچێك نەکات کە برای مسوڵمانی داخوازی کردوە، هەتا براکەی مارەی دەکات یان وازی لێ دێنێ.

١) رواه البخاري ومسلم

## حەزەركردن لە مارەبڕينى كچى تەمەن بچوك

خواى گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ (البقرة- ٢٢٨).

واتە: ئافرەتان هەروەك ئەركى ژنانەيان لەسەر شانە، ژنەكانيش مافى ڕەواى خۆيان هەيە.

پێغەمبەرﷺ فەرمويەتى: ((لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه من الخير))[1].

واتە: ئيمانى هيچ كامێكتان تەواو نابێت، هەتا ئەوەى بۆ خۆى لەچاكە پێى خۆشە، بۆ براى مسولمانيشى پێى خۆش نەبێت.

هەروەها دەفەرموێ: ((لا ضرر ولا ضرار))[2].

واتە: نە زيان بە خەڵك بگەيەنن و، نە بهێڵن زيانتان پێ بگات.

سەبارەت بەم مەسەلەيە ڕەنگە ژن هێنانى پێغەمبەرت ﷺ بە خەياڵدا بێ، ئەويش مارەبڕينى خاتو عائيشەيە -ڕەزاى خواى لێ بێ- كە جياوازى يەكى زۆر هەيە لە تەمەنيان دا. ديارە ئەم حاڵەتە لەبەر چەند هۆيەك لە ڕێسا (قاعيدة) دەردەچێت وەك:

١- كەسايەتى پێغەمبەرﷺ ، كە ناتوانرێ بەراوردى لەگەڵ كەسايەتى ترى پێ بكرێت، لەبەر ئەوە خاتو عائيشە بەم هاوسەريەتيە بەختيار بو و خاتو عائيشە سەرپشك (مخير) كراوەو خۆى پێغەمبەرى خواى هەڵبژارد.

---

١) رواه أحمد في المسند والترمذي والنسائي وابن ماجه وغيرهم والزيادة لغيرهم، حديث صحيح.

٢) رواه أحمد في المسند وابن ماجه (حديث صحيح).

٢- مەبەستی سیاسی لەم ژنهێنانە بۆ زیادکردنی پەیوەندی نێوان پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) بوە، کە یەکێك بوە لە سەردارانی عەرەب و، بۆ ئاسانکردنی بەرژەوەندی نێوان پێغەمبەرو هاوڕێیەکەی بوە، ئەبوبەکریش بۆ بەرژەوەندی بانگەوازی ئیسلامی زۆر هاموشۆی پێغەمبەری دەکرد.

٣- بەهێزی دینداری خاتو عائیشەو، نمونەی ئەوو هەمو ئافرەتە صەحابیەکانو داوێن پاکیو عیفەتیان، ناکرێ لەم زەواجەدا ڕەچاوی کارو کاردانەوەی خراپەیان لێبکرێ.

٤- هێزی پێغەمبەرﷺ وەك لە فەرمودەی (صحیح) هاتوە کە هێزی چل پیاوی دراوەتێ.

من بە یەکسانی ئامۆژگاری پیاوو ئافرەتان دەکەم ، بە حەزەرکردن لە هەبونی جیاوازی تەمەنیان، کە دەبێتە هۆی کاردانەوەی زۆر خراپ بە تایبەتی لەم کاتەی ئێستادا، کە ڕێکخەرو قەدەغەی ئایینی تێدا کز بوە.

ئیمام (ابن الجوزي) لە کتێبەکەی (صید الخاطر) (٤٤٦/٢) گوتویەتی:

.... گێل ترین پیاو ئەو پیاوە بەتەمەنە (پیرە)یە، کە داوای کچێکی تەمەن بچوك دەکات.. بەڕاستی تەواوی چێژو خۆشی، لە کاتی کوڕایەتی یە، هەر کاتێك کچ باڵغ نەببو، ئەوا خۆشی وەرگرتنی کامڵ نیە! جا گەر باڵغ بو زۆر جوتبون دەخوازێ. پیاوی پیریش ناتوانێ زۆر جوت ببێ! گەر زۆر لە خۆشی بکات، ناگاتە مەرامی کچەکە، جا پیاوەکە بەزویی بە هیلاك دەچێ!

پیاوی پیر بە ئارەزوی بۆ جوتبون، نابێ لەخۆ بایی بێت، چونکە ئارەزوەکەی وەك سپێدەی درۆ (فجر الکاذب)ـە! پیاوی پیرمان بینیوە،

جاریەی کڕیوەو شەو لەگەڵی جوتبوە، کەچی بەمردویی سەری ناوەتەوە!..

راستییەك هەیە دەبێ بگوترێ، با پیاوی پیریش رازی بێت لەگەڵی جوت نەبێتو تەنها لەگەڵی رابوێرێ، بەڵام خۆ کچەکە رازی نابێت لەگەڵی جوت نەبێت، ئەو کاتەش کچەکە دەبێتە دوژمنێکی مامەپیرە، ڕەنگە ئارەزو بەسەریدا زاڵ بێو داوێن پیسی بکات! یان هەوڵ بدا خۆی لەکۆڵ پیرەپیاوەکە بکاتەوەو بیکوژێ، بەتایبەتی ئافرەتانی ئەوروپی، کە لەمبارەوە دڵڕەقن.

## بەمەرج دانانی وەلـی لە مـارەبڕینـدا

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنكِحُوا الأَيَامَى مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِنْ يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللهُ مِنْ فَضْلِهِ وَاللهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ (النور:٣٢) ، واتە: بۆ پیاوانی بێژن، ژن بخـوازنو ژنـانی بـێمێرد بەمێرد بدەنو هەروا بۆ کۆیلەو کەنیزانی خو چـاکیش ژن بێـنن‌و بیانـدەن بەشو، بیر لە دەست تەنگی مەکەنەوە چونکە گەر فەقیرو دەسـتەنگ بـن، خوا لە فەزڵی خۆی بێنیازیان دەکات، خوا فراوانگرو زانایە.

ڕاڤەکارانی قورئان ئەم ئایەتەیان کردۆتە بەڵگە، کە ناکرێ ئافرەت خۆی مارە بڕ بکـات، تـەنها بـەوەلی نـەبێت. چـونکە ئـەم ئایەتـە ئاراسـتەی وەلیـەکان (سەرپەرشـتیارانی ئافرەتەکـە) دەکـات... لەبـەر ئـەوە وەلـی پێویستە لە مارەبڕی باڵغ و نابالغ دا ئامادەبێ.

بە مەرج دانانی وەلی بۆ ڕەزامەندی بەشودان، لەگەڵ سروشـتو زەوقـی دروسـتدا یـەك دەگرێتـەوە، وەك هـەمو فەرمانـەکانی شـەریعەتی خـواو نەهیەکانی.

چەند شتێکی ناکاوی ترسناکە کاتێك وەلی ئافرەتەکە دەبینێ کچەکەی دێتەوە ماڵەوەو ئەو کەسەی لەگەڵە، کە پێی دەڵێن مێـرد، کەچـی خـۆی پێی ئاگادار نیە!! دیارە هیچ خاوەن عەقڵو جوامێرێك ئەمە قبوڵ ناکات!

حەنەفیەکان بۆ بەشودانی کچی باڵغ بەبێ وەلی، ئەم فەرمودەیە دەکەنە بەڵگە: ((الثيب أحق بنفسها من وليها)) واتە: بێوەژن خۆی لە وەلیەکـەی لەپێشـترو بە حەق ترە بۆ شوکردنەوە.

بەڵام ئەمە بە بەڵگە دانانرێ، (مناوي) لە (شرح الجامع الصغير) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: بە واتای وەلیەکەی بەشوی نادات، تاوەکو کچەکە بە قسە ئیزنی پێ دەدات، چونکە کچەکە لە وەلیەکەی شایەن ترە بۆ عەقدەکە. لێکدانەوەی حەنەفیەکانیش بۆ ئەم فەرمودەیە، فەرمودەی صحیحی بەسودتر رەتی دەکاتەوە بۆ بە مەرج دانانی وەلی!.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((لا نكاح الاّ بولي وشاهدَي عدل))[1] واتە: مارەبڕی دروست نیە، مەگەر بە ئامادەبونی وەلی و دو شایەت.

((أيما امرأة نكحت بغير إذن وليها فنكاحها باطل، فنكاحها باطل، فنكاحها باطل))[2]، واتە: هەر ئافرەتێك بەبێ ئیزنی وەلیەکەی مارەبڕ کرابێ ئەوا مارەبڕیەکەی بەتاڵە، مارەبڕیەکەی بەتاڵە، مارەبڕیەکەی بەتاڵە.

چەند جار هەبوە لەبەر پەلەکردنی ئافرەت لە بەشودانی خۆی بەو کەسەی، کە هیچ رەوشتی نەبوەو لەبەر کەم شارەزایی خۆی، بە زمان شیرینی هەڵی خەڵەتاندوەو بەهۆی فەرامۆشکردنی وەلی لە مارەبڕیدا، بوەتە مایەی کاری خراپو ترسناك، بوەتە مایەی نانەوەی بەدبەختی، رەنگە دوای جێبەجێ کردنی پێویستی خۆی گەیشتبێتە رادەی تەلاق دان.

جا هەرچەندە رەزامەندی وەلی لە بەشودانی ئافرەتەکە بە پێویست (واجب) دادەنرێ، بەڵام ئیسلام ئەمەی بە سنوری بەرژەوەندی ئافرەتەکەوە بەند کردوە، گەر لەم حەقەی کە شەرع داویەتێ، وەلیەکە لای داو ستەمی کرد، ئەو کاتە ئافرەتەکە بۆی هەیە بچێتە لای قازیو سکاڵا پێشکەش

---

١) صحيح .

٢) رواه أحمد في المسند والترمذي وابن ماجه. حديث حسن.

بکات، جا گەر دەرکەوت وەلیەکە بە هەواو ئارەزو رەفزی کردۆتەوە، ئـەوا بەشو دەدریێ بەو کەسەی کە ئافرەتەکە ئارەزوی لـێیەتی، ئەمـەش پـاش دڵنیا بون لە چاکی ئەو کەسە دەبێت.

چەند جار گوێ بیستی جەورو ستەمی هەندێ لـە وەلیـەکانی ئافرەتـان دەبین، کە ئەم حەقە بۆ ئارەزوی خۆیان بەکار دێنن، کە کـچەکەیان لـەلای خۆیان بۆ خزمەت کردنیان، یان خزمەتکردنی ژنەکەی دەهێڵنەوە. ئەمەش چ نەفامیو کورت بینیو کەم فیکری ئەو کەسە دەردەخات!

## رای ئیسلام دەربارەی خۆشەویستی

## چارەی خۆشەویستان تەنها هاوسەرگرتنە

ئیبن عەباس (رەزای خوایان لێبێ) گێڕاویەتیەوە، پیاوێك گوتویەتی: ((يا رسول الله! في حجري يتيمة قد خطبها رجل موسر ورجل معدم، فنحن نحب الموسر وهي تحب المعدم؟)) واتە: ئەی پێغەمبەری خوا! کچێکی هەتیوم لەلایە، پیاوێکی پارەدارو پیاوێکی دەست کورت هاتونەتە خوازبێنی، ئێمە حەزدەکەین بیدەین بە پیاوە پارەدارەکەو،کچەکەش حەز دەکات شو بە دەست کورتەکە بکات؟

جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((لم يُرَ للمتحابين مثل النكاح!))[1] واتە: جگە لە ماردبڕین بۆ خۆشەویستان وا نابینرێ هیچ چارەی تر هەبێ.

---

١) أخرجه ابن ماجه والحاكم والبيهقي والطبراني وغيرهم.. وقال الحاكم صحيح على شرط مسلم ولم يخرجاه. والحديث حسن بمجموع طرقه.

## خۆشـه‌ويسـتى زه‌حمه‌تـه

خواى گه‌وره ده‌فه‌رموێ: ﴿وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَـا لاَ طَاقَـةَ لَنَـا بِـهِ﴾(البقـرة- ٢٨٦)، واته: په‌روه‌ردگارا شتێك مه‌خه‌ره سـه‌رمان، كـه توانامــــان بـه سه‌رى يه‌وه نيه.

هه‌روه‌ها ده‌فه‌رموێ: ﴿وَخُلِقَ الإِنسَانُ ضَعِيفًا﴾ (النساء- ٢٨) ، واته: ئـاده‌ميزاد وا دروسـت كـراوه، نه‌فـسيه‌تى به‌رامبــه‌ر زۆر شـت بـێ‌هێزه‌و خۆڕانه‌گره.

ده‌فه‌رموێ: ﴿فَلَمَّا رَأَيْنَهُ أَكْبَرْنَهُ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَاشَ لِلّهِ مَا هَذَا بَشَرًا إِنْ هَذَا إِلاَّ مَلَكٌ كَرِيمٌ﴾ (يوسف- ٣١)، واته: كاتێـك ئافره‌تـه‌كان ته‌ماشاى يوسفيان كرد، له‌به‌ر جوانييه‌كه‌ى ئاگايان له‌خۆ نـه‌ماو ده‌سـتيان به چـه‌قۆ بـڕى، وتيـان: به‌ڕاسـتى ئه‌مــه ئـاده‌ميزاد نيــه، بــه‌ڵكو ئه‌مــه فريشته‌يه‌كى به‌ڕێزه.

((عـه‌مرى كوڕى عـاص گوتى: پێغه‌مبه‌رﷺ بـۆ سـوپايه‌كى نـاردم كـه ئه‌بوبه‌كرو عومه‌رى كوڕى خه‌تتابى تێدا بو، كاتێك گه‌ڕامه‌وه گـوتم: ئـه‌ى پێغه‌مبه‌رى خوا! خۆشه‌ويست ترين كه‌س له‌لات كێيه؟

پێغه‌مبه‌ر فه‌رموى: بۆچى وا ده‌ڵێى؟

ئه‌ويش گوتى: پێم خۆشه بزانم.

پێغه‌مبه‌ر فه‌رموى: عـائيشه.

عـه‌مريش گوتى: مه‌به‌ستم له پياوانه، كێت خۆشتر ده‌وێ؟

پێغەمبەر فەرموی: باوکی عائیشە))[1].

خاتوو عائیشە فەرمویەتی: خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ فاطیمەی کچی پێغەمبەریان ناردە لای پێغەمبەر، کە پێغەمبەرﷺ لەگەڵ من لەسەر پۆشاکەکەم ڕاکشا بو، فاطیمە هاتە ژورەوەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا خێزانەکانت داوات لێدەکەن دادگەری بکەیت دەربارەی کچی ئەبو قوحافە (مەبەستی پێ عائیشە بو)، منیش بێدەنگ بوم.

جا پێغەمبەرﷺ فەرموی: تۆ ئەو کەسەت خۆش ناوێ کە من خۆشم دەوێ؟!

فاطیمە گوتی: بەڵێ.

پێغەمبەریش فەرموی: کەواتە ئەمەت خۆش بوێ، واتە عائیشە))[2].

ئەم گێڕانەوەیە ئەوە دەگەیەنێ، کە خۆشەویستی شتێکە لە دەستی مرۆڤدا نی یەو، ناتوانرێ بەسەریدا زاڵ بی.

بوخاری دەگێڕێتەوە کە: ((موغیث بەدوای بورەیرەدا دەڕۆیی، کە پێشتر خێزانی بو، تەڵاقی دابو پاشان بەدوایدا دەڕۆیی و فرمێسك بەسەر ڕومەتەکانیدا دەهاتە خوارەوە[3] چونکە زۆری خۆش دەویست. پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئیبن عەبباس! تۆ سەرت ناسوڕمێ لە خۆشەویستی

---

١) رواه البخاري ومسلم.

٢) رواه مسلم والنسائي.

٣) نافع لە (ابن عمر)ەوە ﷺ لە فەرمودەیەکی درێژدا هێناویەتی، کە ((پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا بە بەردباران کردنی ژن و پیاوێك، جا بەردباران کران)) (ابن عمر) گوتی: دیتم پیاوەکەی دڵی بە ئافرەتەکە دەسوتاو لەبەردەکانی دەپاراست و لێی لادەدا!! ئەبوداود گێڕاویەتیەوە، فەرمودەیەکی (حسن)ە.

موغیث بۆ بورەیرەو لە ڕق بونەوەی بورەیرە بۆ موغیث؟!

ئنجا پێغەمبەر بورەیرەی بانگ کردو پێی گوت: بەڵکو بگەڕێیەوە لای موغیث. بورەیرەش گوتی: ئایا ئـەمرم پێدەکـەی؟! پێغەمبـەر فـەرموی: بەڵکو من تکاکارم بۆ پێك گەیاندنتان.

ئەویش گوتی: من پێویستیم بە موغیث نیە)).

## ( ئاسان كردنی هاوسەرگرتن و بەرەكەتیـەكەی )

## پێش بەشودانی كچ پێویستە ئیزنی لێ وەربگیرێ

پێغەمبـەرﷺ فەرمویـەتی: ((لا تُنكَح الأَيِّمُ حتى تُستأمَر ولا تُـنكَح البِكْرُ حتى تُستأذن. قالوا: يا رسول الله! وكيـف إذنُهـا؟ قـال: أن تَسكُت))[1]، واتە: ئەو ئافرەتەی كە بێوەژنە مـارەی نـابڕدرێ، تـا خـۆی بڕیار نەدات، كچیش مارەیی دروست نیەو مارەی نابڕدرێ، تا ئیزنو ڕەئی لـێ‌وەرنەگیرێ. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئیزنی چۆن لـێ وەردەگیرێ؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: بێدەنگیەكـەی نیـشانەی ڕازی بونیـەتی. ((عـن خنساء بن خذام: أن أباها زَوَّجها بدون إذنها —وهي ثَـيِّب— فأتـت رسول اللهﷺ فَـرَدَّ نكاحَها))[2]، واتە: لە خەنـسای كـچی خوزامـەوە، كەوا باوكی بەبێ ئەوەی ئیزنی وەرگرتبێ بەشوی داوە، كە بێوەژن بوە، جـا هاتــە لای پێغەمبــەر، تــا ســكاڵای لــەلا بكــاتو نــاڕەزایی دەربــڕێ، پێغەمبەریش مارەییەكەی ڕەت كردەوەو بەتاڵی كردەوە.

لە عـبداللەی كوڕی بەریدەوە ئەویش لە بـاوكیـەوە، گـوتی: ((كـچێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ و بە پێغەمبەری وت: باوكم بەشوی داوم بۆ كـوڕی براكەی، تا بـەهۆی ئـەم بەشـودانەم دەنائـەتو سـوكایەتی لەسـەر خـۆی نەهێڵێ. پێغەمبەریشﷺ كچەكەی سەرپشك كرد، كە ئەو بۆخـۆی خـاوەن ڕەئییەو بەبێ ڕەئی كچەكە مـارەیی بەتاڵـە. بـەڵام كـچەكە گـوتی: ئـەوا

---

١) رواه البخاري ومسلم.

٢) رواه الجماعة إلاّ مسلم.

مۆڵەتم بە باوکم دا، ویستم بۆ ئافرەتـان دەرکـەوێ و بـزانن باوکـان شـتیان بەدەسـت نیـە))(١). (حـافظ العراقـي) گێڕاویەتیـەوەو پیاوەکـانی پیـاوی (صحیح)ن.

١) ئیسلام کە مافی ئافرەتی داوە بە هەڵبژاردنی پیاوەکەی، تـا هاوسـەرگرتنەکە لەسـەر بناغەی خۆشەویستی دابمەزرێ، ئێمە ئامۆژگـاری کـچ دەکـەین ئـەم مافـە بـە جـوانی بەکاربێنێ و ملکەچی سۆزی هاروهاج و شـێتانە نـەبێت و، تـەنها بـەجوانی پیـاو فریـو نەخۆن، چونکە جوانی - وەك دەڵێن- شتێکی خواستراوەو نامێنێ، بەڵکە لەگـەڵ کـات دا بەرەو نەمان دەچێ. کەواتە لەسەر کچ پێویستە هاوسەری چاك و ڕازاوە بـە ڕەوشـتی پاك و هەڵسوکەوتی چاك و گـوزەرانی سـاغ و خۆشەویسـتی و کـاری جیـدی و کـارکردن هەڵبـژێرێ، چـونکە ڕەوشـتی جـوان فەزیلەتیـەکی چەسـپاوە، کـە لەگـەڵ ڕۆژگـاردا خۆشەویستی دروست دەکات و بەختەوەری بەردەوام دەرەخسێنێ.

دەگێڕنەوە گەنجێك هاتە خوازبێنی کچێکی دەشـتەکی کـچەکە بـە جـوانی کوڕەکـە سەرسام بو، بیری لە ڕەوشت و ڕەفتاری نـەکردەوە، باوکیـشی ئامۆژگـاری کـرد کـە بـە کەڵکی ئەو نایەت، بەڵام کچەکە ڕازی نەبو، دیسان باوکی دوپاتی کردەوە، کە بەم کوڕە ڕازی نیە، بەڵام کچەکە بـە بڕیـاری بـاوکی ڕازی نـەبو، ئـەوەبو شـوی پـێکرد.. دوای تێپەڕبونی مانگێـك بەسـەر هاوسـەرایەتیان، بـاوکی سـەردانی کـرد، باوکەکـە چـەند نیشانەیەکی لێدان لەسەر جەستەی کچەکەی بینی، کە لەلایەن مێردەکەیەوە لێی درابو، باوکەکەش خۆی لـێ بێئاگا کردو لێی پرسی: کچەکەم حاڵـت چـۆنە؟ ئـەویش خـۆی وا پیشان دا، کـە باشـە، بـاوکی پێـی گـوت: ئـەی ئـەم شـوێنی لێدانانـە چیە بەسـەر جەستەتەوە؟! ئینجا کچەکەی دەستی کرد بە گریان، گریـانێکی زۆرو بـەدەنگ، پاشـان گوتی: باوکەگیان چیت پێ بڵێم؟ من سەرپێچیم کردیت و ئەوم هەڵبژارد، بێئەوەی بیر لە بایەخ دان بە ڕەوشت و مامەڵەو هەڵسوکەوت باشی بکەمەوە.

## پێشگیری لە بەشودانەوەی بێوەژن

خـوای گــەورە دەفـەرموێ:﴿وَإِذا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذا تَرَاضَوْا بَيْنَهُمْ بِالْمَعْرُوفِ ذلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَاللهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ (البقرة- ٢٣٢)، واتە: گـەر ئافرەتتـان تـەڵاق داو پـاش بەسەر چونی ماوەی عیدەی، گەر مێردی ئەو ئافرەتە تەڵاق دراوە، ویستی مارەی بکاتەوەو، بەڕەزامەندی هەردوکیان بێو لەسەر ئەساسی چاکە بــێ، ئەوا قەدەغەی ئەو ئافرەتە مەکەنو مەبنە بەربەست لە ڕێگایاندا، یان گەر مێردەکەیشی مارەی نەکردەوەو یەکێکی تر ویستی مارەی بکاتــەوە ئێــوە مەبنە ڕێگر لەبەر دەمیانا. ئەوەش ئامۆژگارییە بۆ ئەو کەسـەی، کـە لـە ئێوە باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایــی هەیــە. ئـەم مارەکردنـەوەش بەسـودترو پاکترو بەدەستهێنەری بەرەکەتە، هەروەها بۆ پاکی سومعەی ئافرەتەکـەش باشترە تا خەڵك گومانی خراپی پێ نەبەن و، خوای گەورە باشــتر دەزانــێو ئێوە نازانن، کە چ شتێك بە سودترو قازانجترە بۆ مسوڵمانان.

حەسەن دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ((موعقەلی کـوڕی یەسـار خوشـکەکەی دا بەشو بە پیاوێکی مسوڵمان، ماوەیەك لەلای مایەوەو پاشان یەك تەڵاقی دا. کاتێك (عدة)ی ئافرەتەکە تەواو بو. ویـستی بیگەڕێنێتــەوە ژێـر نیکـاحی خۆی، ئەوە بو داوای کردەوە، ژنەکەی ڕازی بو بگەڕێتــەوە لای، جـا داوای لە موعقەل کرد، بەڵام موعقەل لێی توڕە بـو، گـوتی: مـن ڕێـزم گرتــیو خوشـکی خـۆمم پێـشکەش کردیـت: کەچـی تـۆ تـەڵاقت دا، نـا بـەخوا

ناگه‌ڕێته‌وه لات. حه‌سه‌ن ده‌ڵێ: به‌ڕاستی خوای گه‌وره زۆر چاك ده‌زانێ كه پیاو چه‌نده پێویستی به ئافره‌ت هه‌یه، هه‌روه‌ها ژنیش به هه‌مان شێوه پێویستی به مێرده‌كه‌یه‌تی، له‌به‌رئه‌وه خوای گه‌وره ئه‌م ئایه‌ته‌ی نارده خواره‌وه ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ...﴾، كاتێك موعقه‌ل گوێی له ئایه‌ته‌كه بو یه‌كسه‌ر گوتی: گوێڕایه‌ڵو فه‌رمانبه‌ری خوام! جا بانگی مێردی خوشكه‌كه‌ی كردو گوتی: خوشكه‌كه‌مت ده‌ده‌مه‌وه تا شوت پێ بكاته‌وه‌و ڕێزیشت ده‌گرم))[1].

پاش گێڕانه‌وه‌ی ئه‌م ڕوداوه ترمذی ده‌ڵێ: له‌م فه‌رموده‌یه‌دا به‌ده‌رده‌كه‌وێ‌و به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر دروست نه‌بونی ماره‌یی به‌بێ (وه‌لی)، چونكه گه‌ر خوشكی موعقه‌ل كه بێوه‌ژن بو، ئه‌مر به‌ده‌ست خۆی با، ئه‌وا پێویستی به‌وه نه‌ده‌كرد موعقه‌ل به‌شوی بدابوایه. له‌به‌ر ئه‌وه ئایه‌ته‌كه به (وه‌لی ئه‌مره‌كان)ی ڕاگه‌یاندو فه‌رموی: ﴿فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ﴾، واته: له شوكردنه‌وه‌دا قه‌ده‌غه‌یان مه‌كه‌ن‌و مه‌بنه به‌ربه‌ستیان.

شه‌ریعه‌تی ئیسلام چاوه‌دێری‌و ره‌چاوی بارودۆخی ئافره‌ت‌و ڕێزی ئاره‌زوه‌كه‌ی گرتوه.. ڕێزی ویست‌و ئیراده‌ی گرتوه. ئه‌و كه‌سه‌ی وه‌لی ئافره‌ته‌كه‌یه له‌سه‌ری حه‌رام كراوه، كاتێك پیاوێك دێت بۆ داخوازی ئافره‌ته‌كه، به‌شودانه‌كه‌ی دوا بخات، چونكه بێبه‌شكردنی ئافره‌ته‌كه له به‌شودانه‌وه‌ی، تاوان‌و خراپه‌و كارێكه پێویسته خۆی لێ بپارێزرێ. ڕون‌و دیاریشه كه ئافره‌ت خاوه‌ن غه‌ریزه‌ی جنسیه، ئه‌م ئاره‌زوه‌ش ده‌بێ به حه‌ڵاڵی تێر بكرێ، سه‌ركوتكردنی ئاره‌زوش، كارده‌كاته سه‌ر ته‌ندروستی

---

[1] رواه البخاري والترمذي وأبوداود.

ئافرەتەکەو زیان بە سۆزو عاتیفەو عەقڵو مێشکی ئافرەتەکە دەگەیـەنێ. لە ڕێگـای شـوکردنەوەش نـەبێ لـەم زیـانو مەترسـیانە پـارێزراو نابـێ، لەبەرئەوە دەبێ هەمو هۆیەکانی شوکردنی بـۆ ئاسـانو مەیـسەر بکـرێ، پێویستیشە ئارەزو و حەزەکانی ڕەچـاو بکـەین. گـەر ئافرەتەکـە مـەیلی لەسەر پیاوێك نەبو بەشوی نەدەین، چونکە ژیـانی ژنو مێردایـەتی، گـەر خۆشەویستیو بەزەیی تێدا نەبو، ئەو ژیانە هـیچ نـرخو بایـەخێکی نیـە، چـونکە ئەوکاتـە ئـەو ژیانـە دەبێتـە دەروازەیـەکی خراپـەو، هۆیـەك لـە هۆیەکانی دڵەڕاوکێو شڵەژان، دەبێتە مایەی توڕەییو سوکایەتی.

ئەوەی پێویستە لە ژنو مێردایەتی بێتە دی بریتیە لە دڵنەواییو سۆزو خۆشەویستی، بەڵام بەهۆی ئەوەوە دەبێتـە لێـك دورکەوتنـەوەو دڵڕەقـیو ئاشوب، ئەوکاتەش ژن کە هیچ دەرفەتێك نادۆزێتـەوە بـۆ دەربـازبون لـەو مێردەی، کە خۆشی ناوێ، هەتا هەلێك دەقۆزێتەوە، جا بە حەڵاڵی بێ یان بە حەرامی، ئا بەم جۆرە دەگەڕێو زۆر هەوڵ دەدات بـۆ ئـەو شـتەی، کـە مەبەستیەتیو ڕێگای جیابونەوەی بۆ دەسازێنێ، ژنو مێردیش لەدوای ئـەم پەیوەندییـە لێـك هەڵوەشـاوەیە، جگـە لـە خراپـەو سـەرەنجام خراپـیو بریندارکردنی هەستی ژنەکەیو سومعەی ژنەکـە، هیـچی تـر ناچـننەوەو، جگە لەدەستدانی هەلی گونجاو، کـە دەبێتـە مایـەی دروسـتبونی گـرێی دەرونی لەلایەن ژنەکەوەو، بە درێژایی ژیانی کاری تێدەکات.

## پیـــاوی صـالح بۆی هــەیــە
## کچەکەی بۆ پیاوی صالح بخاتە ڕو

﴿وَلَمَّا وَرَدَ مَاءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِنَ النَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِنْ دُونِهِمُ امْرَأتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لاَ نَسْقِي حَتَّى يُصْدِرَ الرِّعَاءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ، فَسَقَى لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّى إِلَى الظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ، فَجَاءَتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَاءَهُ وَقَصَّ عَلَيْهِ الْقَصَصَ قَالَ لاَ تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ، قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَاأَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الأَمِينُ، قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَنْ تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَةَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِنْدِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللهُ مِنَ الصَّالِحِينَ، قَالَ ذَلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا الأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلاَ عُدْوَانَ عَلَيَّ وَاللهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾(القصص:٢٣-٢٨)، واتە: موسا کە هاتە سەر ئاوی مەدیەن، کۆمەڵێ لە خەڵکەکەی دیت ئاو هەڵدێنجن، لەولای ئەوان دو ژنی دیت مەڕەکانی خۆیان دوردەخەنەوە، گوتی: ئێوە خەریکی چین؟ گوتیان: هەتا شوانەکان مەڕەکانیان لە ئاودانێ نەهێننەوە، ئێمە مەڕی خۆمان ئاو نادەین، باوکی ئێمەش ئیختیارێکی لەکارکەوتەیە.. ئەوسا ئاوی بۆ هەڵێنجان، پاشان خۆی گەیاندە سێبەر، گوتی: ئەی پەروەردگارم! من پێویستیم بەو خێرە هەیە کە تۆ دەینێری.. جا یەك لەو دوانە -کە بە شەرمەوە دەڕۆیی- هاتە لای و گوتی: باوکم بانگت دەکا تا بۆ ئاوێ کە بۆ ئێمەت هەڵێنجاوە کرێت بداتێ.. وەختێ

هاتو روداوەکەی بۆ گێڕاوە، گوتی: ترست نەبێ، لە کۆمەڵی ستەمکاران رزگار بوی.. یەکێ لەوان گوتی: باوە! بەکرێی بگرە، چاکترین رەنجبەر ئەوەیە، کە بەتاقەتو جێباوەڕ بێ.. گوتی: من خەیاڵم وایە یەکێ لەو دو کیژانەی خۆم بدەم بە تۆ، بەو مەرجەی هەتا هەشت ساڵان رەنجبەرم بی، ئەگەر دەساڵت بردەسەر کەیفی خۆتەو نامەوێ زۆریت بۆ بێنم، گەر خوا حەزکا زو دەزانی، کە لە پیاوباشەکانم.. گوتی: ئەمە بڕیارێك بێ لە نێوانی منو تۆدا" هەرکام لەو دو ماوەیەم پەڕاند، نابێ ناهەقیم لێ بکرێ" خوداش لەسەر هەرچی دەڵێین بریکارە.

ئا بەو شێوەیە ئەم پیاوە بەرزە، کچەکەی خۆی خستەڕوی موسا ﷺ و لە کەشێکی سادەدا شوکردنەکە تەواو بو. ئەو عادەتو نەریتە جێماوە ناشیرینەی، کە ئێستا دەیکەن بۆیان ساز نەداو پارەیەکی هەرە زۆری تێ نەچو، کە ببێتە بەربەست وبەرپەرچی ژن هێنان. کاتێك ئەم باوکە بەڕێزە زانی موسا خاوەن دەست پاکیو داوێن پاکیو جوامێریو خاوەن هێزی جەستەیە لەگەڵ ئەوەی، کە فەقیریش بو، یەکسەر کچەکەی خۆی خستە ڕوو پێشکەشی کرد.

ژن هێنانی پێغەمبەرو هاوەڵە بەڕێزەکانی، گشتیان بەئاسانیو بەبێ بارگرانی ئەنجام درا، ئەو دابو نەریتو رێوڕەسمەی ئێستا کە خەڵك پێوەی سەرگەرمن، لەڕاستیدا هەموی دابو نەریتی فیرعەونیەکانە بۆ ڕوخاندنی بنەمای خێزان و بەربەست دانان لەبەردەم ژن هێنان دا.

کاتێك کچەکەم بەشودا بە یەکێك لە پیاوچاکان مارەییەکەیان تەنها بە نوسین نوسی، بەبێ وەرگرتنی مارەیی جگە لە کەمێکی نەبێت، یەکەم مەرجو دوا مەرجیشم ئەوە بو، کە نابێ نە زێڕو نە شتیتری بۆ بکەن.

بەبۆنەی ئەوەی، کە دەشێ پیاو کچەکەی خۆی بۆ پیاوی چاك و بەتەقوا بخاتە ڕو، ئەم چیرۆکە واقعییە باس دەکەین، کە لە کتێبەکانی مێژو تۆمار کراوە:

((لە عبداللهی کوڕی ئەبی وداعەوە، کە گوتویەتی: من لە کۆڕو دانیشتنەکانی سەعیدی کوڕی موسەیەب ئامادە بوم، بەڵام چەند ڕۆژێك لە دانیشتنەکان ئامادە نەبوم، کاتێکیش چومە لای بۆ ئامادەبونی وانەکان پێی گوتم: لە کوێ بوی؟ منیش گوتم: خێزانەکەم ئەمری خوای بەجێ هێناوەو وەفاتی کردوە، منیش سەرقاڵی ئەمە بوم. ئەویش گوتی: دەبوایە پێت گوتباین، تا یارمەتیمان بدایتایە؟! عبدالله دەڵێ: پاشان ویستم هەڵسم بڕۆم، سەعید پێی گوتم: بەنیازی ژن هێنان نی؟ منیش پێم گوت: ڕەحمەتی خوات لێ بێ! کێ کچ بەمن دەدا، من خاوەنی دو یان سێ درهەمم!

سەعید گوتی: من کچی خۆمت ئەدەمێ.

منیش گوتم: ئەوە بەڕاستتە؟!

سەعید گوتی: بەڵێ.

ئنجا گوتی: الحمد الله تعالى وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه، لەسەر دو درهەم یان سێ درهەم کچەکەی لێ مارە کردم.

عبدالله دەڵێ: لە خۆشیا نەمدەزانی چی بکەم، گەڕامەوە ماڵەوە بیرم لەوە دەکردەوە لەکێ شت وەرگرم.. لە کێ قەرز کەم. پاشان نوێژی ئێوارەم کردو چراکەم داگیرساندو بەربانگم کردەوەو ویستم نان بخۆم، کە نان و ڕۆنی (زەیت) بو. ئا لەوکاتەدا لە دەرگا درا، گوتم: کێیە؟

گوتی: سەعید.

دەڵێ: بیرم لە هەمو کەسێك کردەوە کە ناوی سعید بێ، تەنها سەعیدی کوڕی موسەیەب نەبێ. چونکە بۆ ماوەی چل ساڵ، ڕێگای سەعید نێوان مزگەوت و ماڵەوە بو، کاتێك چومە دەرەوە بینیم سەعیدی کوڕی موسەیەبە، گومانم برد کە پەشیمان بوبێتەوە، پێم گوت: باوکی محمد! بەدوامت بناردایە، خۆم دەهاتم بۆ لات.

ئەویش گوتی: نا! تۆ شایستەتری کە بێینە لات.

گوتم: چ دەفەرموی؟ سەعید گوتی: تۆ پیاوێکی بێ ژنی و تازە ژنت مارە کردوە، لەبەرئەوە پێم باش نەبو بە تەنهایی شەو بکەیتەوە، ئەوەش خێزانەکەت، کە لە دواوەی سەعید وەستا بو. کاتێك کە هێنایە ژورەوە بۆم دەرکەوت، کە جوانترین ئافرەتەو لە هەمو کەسێك زیاتر قورئانی لەبەرەو شارەزاترین کەسە لە سوننەتی پێغەمبەرﷺ ، هەروەها لە هەمو کەس زاناتر بو بەرامبەر بە مافەکانی پیاو..

عبدالملکی کوڕی مەروان داخوازی ئەم کچەی سەعیدی کوڕی موسەیەبی کرد بۆ کوڕەکەی، کە ناوی وەلید بو، کوڕی خەلیفە بو. بەڵام سەعید ڕازی نەبو کچەکەی خۆی بەشو بدات بە کوڕی خەلیفە))!!

لێرەدا شتێك هەیە کە دەبێ بگوترێ، ئەویش ئەوەیە بۆیە سەعید یەکسەر بەبێ پرسی کچەکەی بە عبداللەی گوت کچەکەمت پێشکەش دەکەم، چونکە کچە مسوڵمانەکەی کچێکی قورئان لەبەرو شارەزا بو، باوکی سەرپشك (مخیر) کردبو بۆ بەشودانی، بە مەرجێ ئەو کەسەی داخوازی دەکات دەبێ بەتەقواو صالح بێو خۆی بۆ خوا یەك لایی کردبێتەوە، با سەروەت و سامانیشی نەبێ. بەڵگەی ڕاستیی ئەوەش، ڕەتکردنەوەی داخوازییەکەی عبدالملك بو بۆ کوڕەکەی کاتێك کە بە

سەعیدی گوت: کوڕەکەم بەقەد کێشی کچەکەت خشڵو زێڕی بۆ دەکات. بەڵام کچەکەی پێی ڕازی نەبو، چونکە نەیدەویست بەهۆی فێڵو چەواشەیی خشڵو زێڕو ماڵو سامانو کۆشكو تەلارو خزمەتـچیەوە، خـوای گـەورەی لەبیر بچێتەوەو لەخوا پەرستی کەمتەرخەمی بکات. لەبەرئەوە خستنەڕوی کچ بۆ پیاوی صالح تەنها پیشەی (سلف الـصالح) نەبوە، بـەڵكو لـە هـەمو چاخو سەردەمێکدا پیاوی صالح کچی خۆی بۆ پیاوی بەتەقواو بـە ڕەوشـت خستۆتە ڕو.

یەکێك لە برادەران بۆی باسکردم، کە ئیمامی مزگـەوتی (حـي میـدان) لە دیمەشق ڕۆژێك لە کاتی خوتبەدا هانی گـەنجانی دەدا بـۆ ژن هێنـان و، هانی باوکانی دەدا مارەیی سوكو ئاسان بکـەن. ئیمامەکـە گـوتی: مـن چـەند کـچێکم هەیـە، هـەر کەسـێ دەیـەوێ بیـانخوازێ، مـن ئامـادەم پێشکەشیان کەم بەبێ هیچ مەرجێك، تەنها مەرجی دین و ڕەوشت نـەبێ. دەڵێ: مانگێك تێپەڕی نەکرد، تاوەکو هەمو کچەکانی بەشودا.

بوخاریو نەسائی دەگێڕنەوە کە عومەری کوڕی خـەتتاب ڕەزای خـوای لـێ بێ گوتویەتی: کاتێك مێردی حەفصە مرد، بە عوسمانی کوڕی عـەفان گەیـشتم و حەفـصەم خـستە ڕو بـۆ ئـەوەی خـوازبێنی بکـاتو مـارەی بکاتەوەو، پێم گوت: گەر حەز دەکەی، تا حەفصەی کچی عومـەرت لـێ مارە بکەم، عوسمانیش گوتی: با بزانم چۆن دەبێ.

چەند شەوێکی پێ چو، عوسمانم بینیەوەو بەهەمان شێوە پێیم گوتـەوە، ئەویش گوتی: ژن ناهێنم. پاشان توشـی ئەبوبـەکر بـوم و پێمگـوت: گـەر حەزدەکەی تا حەفصەی کچی عومەرت لـێ مارە بکەم، ئـەویش بـێدەنگ بو و بـۆی نەگەڕایـەوە، ئـا بـەو شـێوەیە مایـەوە، پاشـان پێغەمبـەرﷺ

خوازبێنی کردو لە پێغەمبەرم مارە کرد.

ئەبوبەکر توشم بو و گوتی: رەنگە لە دڵت گران بوبێ کاتێك حەفصەت بۆ خستمە ڕو، من نەگەڕامەوە. عومەر گوتی: بەڵێ. ئەبوبەکر گوتی: هیچ شتێك نەبوە بەربەست بۆ نەگەڕانەوە بۆ وەڵامی مارەبڕینی حەفصە. بەڵام من دەمزانی کە پێغەمبەر نیازی ئەو خوازبێنیەیە، بۆیە نەگەڕامەوە. حەزیشم نەکرد نهێنی پێغەمبەرﷺ بدرکێنم. بەڵام گەر پێغەمبەرﷺ وازی لەم خوازبێنی یە بهێنابایە ئەوا مارەکردنی حەفصەم قبوڵ دەکرد.

## داوانەکردنی مـارەیــی زۆر

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((إن من يُمْن المرأة تيسيرُ خِطْبَتها، وتيسيرُ صداقها، وتيسيرُ رَحِمِها))[1]، واتە: لە خێرو بەرەکەتی ئافرەت ئەوەیە، کە خوازبێنییەکەی ئاسان بکرێو مارەیی یەکەی سوك و ئاسان بێو زۆر نەبێ.

بوخاریو موسلیم دەگێڕنەوە: ((ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەری خواو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من خۆمت پێشکەش دەکەم. پێغەمبەرﷺ سەیرێکی کردو پاشان سەری بە نیازی ڕازی نەبون ڕاوەشاند، ئنجا ئافرەتەکە هەڵساو یەکسەر پیاوێك هەڵسایە سەرپێو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا گەر تۆ نایهێنی، لەمنی مارە بکە. پێغەمبەرﷺ فەرموی: چیت هەیە تا بیکەی بە مارەیی، یان ماردیی پێ بدەی؟ پیاوەکەش گوتی: تەنها ئەو کراسەم هەیە!

پێغەمبەرﷺ فەرموی: هەوڵدە ئەموستیلەیەکی ئاسن بۆ ماردیی پەیدا بکە.

بەڵام پیاوەکە بۆی پەیدا نەبو، پێغەمبەرﷺ پێی فەرمو: چ شتێکت لە قورئان لەبەرە؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، ئەم سورەتو ئەو سورەتە. پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەوا تێوەم لە یەکتری مارە کرد بەوەندە ئایەتەی لەبەرتە.

لە گێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بڕۆ ئەوا لە یەکتریم مارەکردنو، قورئانی فێر بکە)) بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردوە.

---

١) رواه أحمد في المسند والنسائي (حديث حسن).

ئەنەس دەڵێ: ((ئەبو طەڵحە ئوم سولەیمی مارە کردو مارەیی یەکەشی مسوڵمان بونی ئەبو طەڵحە بو! چونکە ئوم سولەیم لەپێش ئەبو طەڵحە مسوڵمان ببو، جا داخوازی کرد، ئوم سولەیم گوتی: من مسوڵمان بوم، گەر تۆش مسوڵمان ببیت ئەوا شوت پێدەکەم. ئەویش مسوڵمان بو، مسوڵمان بونەکەی بوە مارەیی یان))[1].

((ئەبی سەلمە گوتویەتی: لە عائیشەم پرسی: مارەیی دانی پێغەمبەرﷺ چەند بو. ئەویش گوتی: مارەیی دانی بۆ خێزانەکانی دوازدە ئۆقیەو (نەش) بو.

عائیشە گوتی: دەزانی (نەش) چیە؟

گوتم: نەخێر.

عائیشە گوتی: نیو ئۆقیەیە.

گوتم: کەواتە پێنج سەد درهەمە[2])) [3].

ئیبن عەباس رەزای خوای لێ بێ گوتویەتی: (لەوکاتەی کە عەلی کوڕی ئەبو تالیب فاطیمەی کچی پێغەمبەری مارە کرد، پێغەمبەرﷺ بە عەلی فەرمو: شتێك بدە بە فاطیمە! عەلی گوتی: هیچ شتێکم نیە! پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەدی زرێیەکەت لەکوێیە؟ بیدە بە فاطیمە)[4].

ئا ئەوە بو مارەیی کچی پێغەمبەرﷺ، کە بە هیچ شێوەیەك بە پارە مەزەندە ناکرێ، باوکی بەزرێیەك بە شوی دەدات کە سودی لێوەرناگیرێ،

---

١) رواه النسائي (صحيح).

٢) ئۆقیە چل درهەمە،کەواتە مارەیی یەکە پێنج سەد درهەمە، درهەمێکیش دەکاتە چل قرشی سوری، کەواتە کۆی مارەیی یەکەی دوسەد لیرەی سوریە!!

٣) رواه مسلم.

٤) رواه النسائي والحاكم، (حديث صحيح).

بەڵكو تەنها وەك ڕەمزێك دادەنرێ بۆ پەیوەستکردنی پەیوەندی ژنو مێرد.
گەر سەرنج بدەین، جیاوازیەکی زۆر هەیە لەنێوان ئاسانکردنی ژن هێنان لە ئیسلامو دابو نەریتە نەفامیو جاهیلیەکانمان لەم سەردەمەدا، تەنانەت ژن هێنان بۆتە مایەی نەگبەتیو سەر ئێشەو مەینەتی.

عومەری کوڕی خەتتاب گوتویەتی: (ألا لا تغالوا[1] بصداق النساس!! فإنها لو كانت مكرمة في الدنيا وتقوى عندالله لكان أولاكم بها نبي الله ﷺ!

ما علمت رسولَ الله ﷺ نكح شيئاً من نسائه ولا أنكح شيئاً من بناته على أكثر من اثنتي عشرة أوقية)[2]، واتە: ئاگاداربن نەکەن مارەیی نافرەتان زۆر بکەن!! چونکە گەر لە دنیادا مارەیی زۆر، جێگەی ڕێزو چاکیو تەقوای خوا بوایە پێغەمبەرﷺ لە هەموانتان شایستەتر بو بۆ

---

١) چیرۆکی ئەو ژنەی بە ئایەتی (وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا) وەڵامی عومەری کوڕی خەتتابی دایەوە کە بانگێشەی ئەوەی دەکرد لە مارەییدا داوای شتی زۆر نەکرێ، ڕاست (صحیح) نیە لە دو لایەنەوە:

یەکێکیان لە لایەنی فەرمودەیە: چیرۆکەکە لە چەند گێڕانەوەیەك هاتوە کە هەندێکی پچڕان (انقطاع)ی تێدایە، هەندێکی تریش لاواز (ضعیف)ن بەهۆی مجالدی کوڕی سەعید، یان قەیسی کوڕی ڕەبیع، کە هەردوکیشیان ئیبن حەجەری عەسقەلانی بەلاوازی داناون.

لایەنەکەی دی فقهیە: چونکە زۆر داواکردنی مارەیی حەرامەو خراپەکاری لێ پەیدادەبێ، ئایەتەکەش ئەوە دەگەیەنێ، کە پیاو بە خۆیەخشینەوە دەتوانێ ئەوەندەی بداتێ گەر زۆریش بێ. بەڵام گەر کچەکە، یان وەلی کچەکە داوای زۆر بکەن ئەوەیان قەدەغە لێکراوە،ژیریش قبوڵ ناکات ئەم ژنە ڕەخنە لە خەلیفە بگرێو خەلیفەش لێی بێدەنگ بێ، سەرەڕای ئەوەش بڵێ: عومەر هەڵەی کردو ژنەکە پێکای! بەتایبەتی لەپێشتر باسی مارەییمان کرد، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەڕو بەرەکەتی ژنی بە ئاسانیو کەمی مارەییەکەیەوە بەستوە.

٢) رواه أحمد في المسند والترمذي والنسائي (حديث صحيح).

زۆردانی مارەیی. پێغەمبەرﷺ بۆ مارەیی خێزانەکانی لە دوازدە ئۆقیە زیاتری نەداوە، هەروەها بۆ کچەکانیشی بەهەمان شێوە.

عەلی کوڕی ئەبوتالیب گوتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ دۆشەگ و بالیفێکی کردە جیازی فاطیمە، کە ناواخنەکەی پوش بو.

جابر دەڵێ: لە ڕۆژی گواستنەوەی فاطیمەدا ئامادەی زەماوەندەکە بوین، کە هیچ بوکێنی یەك لەو باشترمان نەدیبو. ئەو شتەی کە لەسەری دانیشتبوین لیفە بو، خورماو مێوژیان بۆ هێناین، ئێمەش خواردمان ئەو پێخەفەی شەوی بوکێنیەکەی لەسەری دەنوستن پێستی بەران بو.

# پــرۆژەی ژن هــێنــان

ئیمامی ئەحمەد لە مەسنەددا بە (صحیح)ی گێڕاویەتیەوە: یـەکێك لـە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەرﷺ خـۆی یـەکلا کردبـۆوە بـۆ خزمـەتکردنی پێغەمبەرﷺ، لەلای پێغەمبەر دەمایەوە بۆ جێبەجێکردنی پێویستی یەکانی. پێغەمبەرﷺ پێی فەرمو: بۆ ژن ناهێنی؟ ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبـەری خوا من نەدارمو هیچ شتێکم نیە، لەبەر ئەوە خـۆم یـەکلا دەکەمـەوە بـۆ خزمەتکردنی جەنابت. جا بێدەنگ بـو پاشـان دوبـارە هـەمان پرسـیاری لێکردەوەو ئەویش هەمان وەڵامی دایەوە، پاشان ئەم هاوەڵە بـەڕێزە بـیری کردەوەو گوتی: بەخوا پێغەمبەری خوا بۆ بەرژەوەندی دنیاو ئاخیرەتم چاکتر دەزانێ، گەر ئەمجارە پێم بڵێتەوە بەقسەی دەکەم. جا ئەمجارە پێغەمبـەرﷺ پێی فەرمو: بۆ ژن ناهێنی؟ ئـەویش یەکـسەر گـوتی: دەی ژنم بـۆ بێنـە. پێغەمبەرﷺ فەرموی: برۆ لای بەنی فلان، بڵێ پێغەمبەری خوا فەرمانتان پێدەکات کە کچەکەتانم بدەنێو لێم مارە بکەن...

هاوەڵە بەڕێزەکەش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من هیچ شتێکم نیە.

پێغەمبەریش بە هاوەڵەکانی فەرمو: ((بەقەد کێشی دەنکە خورمایـەك لەزێڕ بۆ براکەتان کۆبکەنەوە))[1] ئەوانیش بۆیان کۆکردەوەو زێرەکەیان بـۆ

١) لە دێرینەوە لە هەندێ وڵاتدا وا باوبوە، گەر گەنجێك پێویستی بایە ژن بهێنێو عەقدی مارەیی ببڕێ، گەنجەکە بەم بۆنەیەوە ئاهەنگێکی سادەی سـاز دەکـردو، هـاوڕێو خـزمو کەسوکاریو دراوسـێکانی دەهـاتن، ئـەویش بـە دانیـشتنەوە پێـشوازی لـێدەکردنو کڵاوەکەی بە وەرگەڕایی بەدەستەوە دەگرت، جا هەرکەسەو بەگوێرەی توانای خـۆی وەك دیاریەك شتێکی دادەنا، گەنجەکەش هەر ئەوەندەی دەزانی کڵاوەکـەی پـڕ بـوە، جـا بـۆ مارەییو وەلیمەی خەرج دەکرد.

قەومەکە بردو کچەکەیان لـێ مارەکرد، هەروەها هاوەڵەکان بۆ ڕۆژی بـوك گواستنەوە بە هەمویان مەڕێکیان بۆ برد.[1]

١) رواه أحمد في المسند (حديث صحيح).

## مارەیی و سوربون لەسەر بەجێهێنانی

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَآتُوا النِّسَاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً فَإِنْ طِبْنَ لَكُمْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيئًا مَرِيئًا﴾ (النساء- ٤)، واتە: مارەیی تەواو بدەن بە خێزانەکانتان، ئەگەر ڕازی بون و پڕ بە دڵ پێیان خۆش بو، بەشێك لە مارەیی‌یەکەیان بخۆن یان پێتان بدەنەوە، ئەوا بەنۆشی گیانی بیخۆن یان وەری گرن.

بەم بۆنەیەوە پێویستە ئەوە بزانرێ مارەیی مافی ئافرەتەو هی خۆیەتی‌و مێردەکەی هیچ مافێکی بەسەرەوە نیە، چ هەموی بێ یان نیوەی مارەیی یەکە. بەهیچ جۆرێکیش پیاو بۆی نیە زۆر لە ژنەکەی بکات مارەیی یەکەی لێ بسێنێ‌و لێی گل داتەوە، یان لە مارەیی‌یەکە کەلوپەل‌و شتومەکی ناو ماڵی پێ بکڕێ‌و پێی ئامادە بکات. چونکە ئیسلام لەسەر پیاوی داناوەو ئەرکی سەرشانیەتی، کە کەلوپەل‌و شتومەکی ناوماڵ‌و پۆشاکی خێزانەکەی دابین بکات‌و بژێویشی بدات. بەلام گەر ئافرەتەکە بەگەردن ئازایی‌و بە نەفسێکی بێ‌گەردەوە پارەی مارەیی‌یەکە بدات بە مێردەکەی، ئەوا مێردەکەی بۆی هەیە وەریگرێ‌و بیخوات، بەلگەش ئەم ئایەتە پیرۆزەی سەرەوەیە.

هەر لەم بارەیەوە خوای بالادەست دەفەرموێ:

﴿وَإِنْ أَرَدْتُمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا ۝ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُ وَقَدْ أَفْضَى بَعْضُكُمْ إِلَى بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنْكُمْ مِيثَاقًا غَلِيظًا﴾(النساء: ٢٠-٢١)،

واتە: ئەگەر ویستتان واز لە ژنەکانتان بێنن و ئافرەتێکی تر بخوازن لە کاتێکدا ماڵێکی زۆرتان پێ بەخشی بون، نابێ هیچی لێوەربگرنەوە. جا وەك پرسیارێکی سەر سوڕمان لێمان ئەکات و، دەفەرموێ: ئایا دەتانەوێ بەزۆر پارەکەیان لێوەربگرنەوە، کە ئەوەش تاوان و گوناهێکی ڕون و ئاشکرایە. چۆن وەریدەگرنەوە لەدوای ئەوەی، کە لەیەك دابڕاون و لێك جیابوینەوەو پەیمانێکی پتەوو توندیشیان لێوەرگرتون بە زیادە پێبەخشینیان، نەك لێگرتنەوەیان، ئێوەش پەیمانتان پێداون بەجوانی و ڕێكوپێکی پێکەوە بژین لە گوزەرانی ژیانی ژن و مێردایەتی، کاتێکیش لێك جیاواز دەبنەوە بەهەمان شێوە بە جوانی و بە ڕێكوپێکی و بێ ستەم لە یەکتری کردن جیا ببنەوە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**أحق الشروط أن توفوا به ما استحللتم به من الفروج**))[1]، واتە: شایەنترین مەرج، کە وەفای پێبکرێ ئەوەیە، کە بەهۆیەوە داوێنی هاوسەری پێ حەڵاڵ کراوە.

- هەر لەبارەی مارەیی دان پێغەمبەر دەفەرموێ: ((**أيّما رجل تزوج امرأة على ما قل من المهر، أو كثر، وليس في نفسه أن يؤدي إليها حقها خدعها، فمات ولم يؤد اليها حقها، لقي الله يوم القيامة وهو زان!**))[2]، واتە: هەر پیاوێك ژن مارە بکات، جا مارەیی‌یەکەی زۆر بێ یان کەم، لە دڵ و دەرونیدا وا نەبێ، کە حەقی مارەیی‌یەکەی بە ژنەکەی بدات، ئەوا فێڵی لە ژنەکەی کردوە. کاتێکیش مردو حەقی مارەیی‌یەکەی نەدا بو، ڕۆژی قیامەت بە زیناکەر بەخوا دەگات.

---

١) رواه البخاري ومسلم.

٢) رواه الطبراني (حديث صحيح).

## داخـوازىو دوعـاكـەى

لەكاتى گرىٚبەستى مارەكردندا، پێويستە وتارێك بخوێندرێتەوە، كە بـە سوپاسو ستايشى خواو درود دان لەسەر پێغەمبەرﷺ دەست پىٚبكات بەم شێوەيەى خوارەوە:

(إِنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاللهِ مِـنْ شُـرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَـلا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ).. ، (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ) (يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْـسٍ وَاحِـدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّـهَ الَّـذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا) (يَاأَيُّهَا الَّـذِينَ آمَنُـوا اتَّقُوا اللهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُـوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا).

پاش كۆتايى هاتنى ئەم وتارە ئنجا ئەو كەسە باسـى داخـوازى دەكـاو دەڵـێ: (هاتوم بۆ داخوازى كچەكەتان بۆ كوڕى فلاّن).

پێغەمبەرﷺ فەرمويـەتى: ((كل خطبة ليس فيها تشهد فهي كاليـد الجذماء))[1] واتە: هەر وتارێك شايەتمانى تێدا نەگوترىٚ ئـەوا وەك دەسـتى بڕاو وايە.

---

١ رواه الترمذي وحسنه.

## ئامۆژگاری و ڕاسپاردە بەر لە هاوسەرگرتن

### ئامۆژگاری دایك و باوك بۆ كچی تازە بەشودراو

ئەنەس دەڵێ: هاوەڵە بەڕێزەكانی پێغەمبەری خواﷺ كاتێك كە بوكێكیان بۆ زاوا دەگواستەوە، فەرمانیان بە بوكەكە دەكرد كە خزمەتی مێردەكەی بكات و چاودێری مافی ژن و مێردایەتی بكات.

### ئامۆژگاری باوك لەكاتی بەشودانی كچەكەی

عبداللەی كوڕی جەعفەری كوڕی ئەبوتالیب ئامۆژگاری كچەكەی كردو پێی گوت:

نەكەی (غیرة)ت بەرامبەر مێردەكەت هەبێ، واتە لێی بترسی لەوەی كە دڵی بە ئافرەتێكی ترەوە بێت. چونكە ئەم (غیرة)یە كلیلی دەرگای تەڵاق دانە! نەكەی زۆر گلەیی و گازاندەو ناڕەزایی دەربڕی، چونكە دەبێتە هۆی توڕەبونی.

پێویستە چاوەكانت بە كل[1] بڕازێنیتەوە، چونكە جوانترین ڕازانەوەیە، خۆشترین و باشترین بۆن ئاوە.

---

١) لەو كاتەی (قرافصة بن الأحوص) نائیلەی كچی خۆی لە میری بڕواداران عوسمانﷺ مارەكردو بۆی برد، باوكی ئامۆژگاری كردو گوتی: كچە شیرینەكەم! تۆ دەچیتە لای ئافرەتانێ لە ئافرەتانی قورەیشی، كە ئەوان لەتۆ زیاتر دەتوانن خۆیان بۆنخۆشكەن، كەواتە دو خەسڵەت هەیە لێمی وەرگرە" كل لەچاوت بدەو، یان بە ئاو خۆت بۆنخۆش

بکە، هەتا بۆنت وەك بۆنی ئەو کوندە ئاوە بێت، کە باران لێی دەدات. (الأغاني لأبي الفرج الأصفهاني)

عەمری کوڕی حجر پاشای کندە داخوازی (أم أياس بنت عوف بن مسلم الشيباني) کرد، کاتێ وەختی گواستنەوەی هات، دایکی کچەکە بە تەنیا لەگەڵ کچەکەی دانیشتو چەند ئامۆژگـــاریەکی کرد، ئامۆژگـــاریەکان بنەماکـــانی بەختـــەوەریی ژیانی ژنو مێردایەتیو، ئەوەی پێویستە لەسەری بەرامبەر بە مێردەکەی بیکات، بەدیار دەخست کە دەکرێ بکرێتە دەستور بۆ گشت ئافرەتان.

ئامۆژگاریەکان بریتی بون لە:

یەکەمو دوەم: بە قەناعەت بەو بەباشی گوێڕایەڵو فەرمانبەری بە.

سێیەمو چوارەم: نەکەی بهێڵی شتێکی ناشیرینت پێوە ببینێ، یان بۆنی ناخۆشــت بکــات، بەڵکو با خۆشترین بۆنت هەڵمژێ.

پێنجەمو شەشەم: ئاگاداری کاتەکانی خواردنو نوستنی بە، چونکە برسـێتی گـڕ لــە پیــاو بەردەدات، تێرخەو نەبون مایەی توڕەبونە.

حەوتەمو هەشتەم: ماڵو سامانی بپارێزەو چاودێری منداڵەکانی بکە.

نۆیەمو دەیەم: سەرپێچی فەرمانی مەکە، نهێنی ئاشکرا مەکــە، چــونکە گــەر سەرپێــچی فەرمانی بکەیت، یان دڵیت شکاند، نهێنیت ئاشکرا کرد، ئەوا لە غــەدرو تــوڕەیی ئــەو پارێزراو نابی، گەر مێردەکەت خەمبار بو، نەکەی خۆت بە دڵخـۆشو شــادمان پیـشان بدەیت، گەر دڵخۆش بو نەکەی خۆت بە خەمبار پیشان بدەیت!

(أبو أسود) بە کچەکەی گوت: نەکەی غیرەت هەبێ، چـونکە غـیرە کلیلـی تەلاقدانــە، پێویستە خۆت بۆ مێردەکەت جـوان بکــەیت، جـوانترین رازاوەش کلــە، پێویـستە خـۆت بۆنخۆش بکەیت، باشترین بۆنخۆش دەستنوێژ هەڵگرتنە..

یەکێك لە ئافرەتە جوانەکانی ئەوروپی ئامۆژگاری ئافرەتان دەکــات، کــە رۆژانــە چــەند جارێك دەم و چاویان بەئاوی سارد بشۆن!

کەواتە دەستنوێژ هەڵگرتن حیکمەتی گەورەی تێدایە.

## ئامۆژگاری خەزور بۆ زاواکەی

لەو کاتەی ئیمامی عەلی داخوازی فاطیمەی لە پێغەمبەرﷺ کرد، پێغەمبەر پێی فەرمو: ((هي لك أن تُحسن صُحبتَها))، واتە: فاطیمە بۆ تۆیە، بە مەرجێ بە باشیو بە چاکی هەڵسوکەوتو ڕەفتاری لەگەڵ بکەیت))[1].

عوسمانی کوڕی عەنبەسەی کوڕی ئەبو سوفیان داخوازی کچە مامەکەی کرد، کە عوتبە مامی بو. عوتبەش عوسمانی لەلای خۆی دانیشاندو دەستی بەسەری دادەهێناو، پاشان گوتی: نزیکترین خزم داخوازی خۆشەویسترین خۆشەویستی کردوە، کە ناتوانم ڕەتی بکەمەوە. ئەوا ڕازی بوم ببنە هاوسەری یەکتری، تۆ لەو بەڕێزتری لە کاتێکدا کە کچەکەم بە دڵمەوە نوساوە، لەبەرئەوە ڕێزی بگرە، تا بەزمانی شیرینەوە باست بکەم. هەرگیز قسەی ناشیرینی پێ نەڵێیتو بە کەمی نەزانی، ئەگینا ڕێزت لەلام کەم دەبێتەوەو بە بچوکی دێیە بەر چاوم. لەگەڵ ئەوەی نزیکی بەلام نزیکترم کردویەوە، لەبەرئەوە خۆت لە دڵم دور مەخەرەوە.

---

١) رواه الطبراني (صحيح).

# دایکێـك ئامۆژگـاری کچەکـەی دەکات پێش شـەوی گواسـتنەوەی

دایکێکی هاوچەرخ ئامۆژگاری کچەکەی بـەم ئامۆژگاریانـە کـرد، لـە کاتێکدا خەندەو فرمێسك تێکەڵ بە یەکتری ببون گوتی:

(کچە شیرینەکەم! تۆ بەرەو ژیانێکی نوێ بەڕێ دەکەوی.. ژیانێـك کـە جێگـەی بـاوك‌و دایکـتی تێـدا نابێتـەوەو جێگـەی خوشـکەکانتی تێـدا نابێتەوە... لەبەر ئەوە تۆ دەبیە هاوڕێو هاوسـەری پیاوێـك، کـە نایـەوێ کەسێکی تـر بەشـداری لەگـەڵ دا بکـات، بـا ئـەو کەسـەش لـە خـوێن‌و گۆشتیشت بێ...

کچەکەم! تۆ ببە ئەو هاوسەرە، کە مافی هاوسەریەتی خۆی بدەیتێ، لـە سۆزو خۆشەویستیدا بۆی ببە بەدایك، تۆ وا بکـە ئـەو هەسـت بکـات تـۆ هەمو شتێکی ژیانی ئەوی. ئەوەش بزانەو هەردەم لەبیرت بێ، کە پیاو جا هەرچ پیاوێك بێ -منداڵێکی گەورەیە- کەوا بچوکترین‌و کـەمترین وتـەی شیرین‌و خۆش، بـەختیاری‌و شـادی پـێ دەبەخـشێت. بـەو شـێوە ڕەفتـار نەکەی، کەوا هەست بکات بەهۆی شوکردنی تۆوە لە کـەس‌وکارو خزمیـت کردوە، چونکە ئەویش بەهەمان شێوە لەپێناو تۆ، وازی لـە مـاڵی دایـك‌و باوکی هێناوە. بەڵام ئەو جیاوازییەی نێوان تۆو ئەو ئەوەیـە، کـە لـەنێوان ژن‌و پیـاو دایـە.. ئـافرەت هـەردەم سـۆزی بـەلای دایـك‌و بـاوکی‌و بـراو خوشکەکانیدا دەجوڵێ. هەروەها سۆزو بیری بەلای ئەو ماڵە دەجوڵێ، کـە تێیدا پەروەردە بودو پێگەییوەو گەورە بـوەو فێـری خوێنـدن بـوە.. بـەڵام ئافرەت دەبێ خۆی لەسەر ئەم ژیانە نوێیە ڕابهێنـێ، دەبـێ ژیـانی خـۆی

بگونجێنێ لەگەڵ ئەو پیاوەی، کە بوەتە هاوسەری ژیانیو، بوەتە باوكو چاودێرو سەرپەرشتیاری منداڵەکانی... ئا ئەمەیە دنیا نوێیەکەت.

کچەکەم! ئا ئەمە ئێستاو ئایندەتە، ئا ئەوەیە ئەو خێزانەی، کە تۆو هاوسەرەکەت بەشداری دروست کردنیتان کردوە. بەڵام دایكو باوکت بەراببردو دادەنرێن..

خۆشەویستەکەم! من داوای لەبیرکردنی دایكو باوكو خوشكو براکانت ناکەم، چونکە ئەوان هەرگیز تۆیان لەبیر ناچێ، دایك چۆن جگەرگۆشەکەی لەبیر ئەچێتەوە. داوات لێدەکەم هاوسەرەکەت خۆشبوێو بۆی بژیو، لەگەڵیدا بە بەختیاریی ژیان بگوزەرێنە)[1].

١) ئا ئەوەیە دایکی مسوڵمانی عاقڵو تێگەیشتو و ڕۆشنبیر، کە کچەکەی هان دەدات مێردەکەی خۆشبوێو نەبێتە کۆتو بەربەرچ لەسەر ڕێگای ژنو مێردایەتی. ئائەوەیە ئامۆژگاری، نەك وەك دایکە بەناو مسوڵمانەکانمان، کە جارێ کچەکە نەچۆتە ماڵی مێردیەوە هانی ئەوەی دەدات، کە بارگرانابیو بیانو و گلەیی لە مێردەکەی بکات، کە ئەوەش ئاشوب گێرییەو، دەبێتە مایەی ژیان تاڵی کچەکەی . (وەرگێڕ)

## خۆشـــی و شـــادیەکانی ژن گواســتنەوە

### گـۆرانی و دەفــە لێـــدان

روبەیعەی کچی موعەوەز دەڵێت: ((کاتێـك بـە بـوکی بـۆ مـاڵی زاوا گواسترامەوە، پێغەمبەرﷺ هاتــە سـەردانمان، رایـەخێکمان بـۆ راخـستو دانیشت، وەك چۆن تۆ ئاوا دانیشتویت -مەبەست پێی گێرەرەوەکەیەتی-، کۆمەڵێك کەنیزەك دەستیان کرد بە دەف لێـدان، هۆنراوەیـان بەسـەر ئـەو کەس‌وکارانەمانــدا هەڵـدەدا، کــە لــە رۆژی بــەدردا شــەهید بوبـــون، دەیانلاواندەوە، کتوپڕ یەکێکیان گوتی:
(وفينا نبّي يعلم ما في الغد)، واتە: پێغەمبەرێکمـــان لەناودا دانیشتوە، دەزانێ سبەی چی رودەدات.
پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: ((دَعـي هـذه و قـولي الـذي كنـتِ تقـولين ...))، واتە: واز لەو قسانە بێنەو برۆرەوە سەر قسەکانی ئێستات))[١].
لە گێرانەوەیەکی راست دا پێغەمبەری خواﷺ فـەرموی: ((لا يعلـم مـا في غد إلا الله))، واتە: جگە لە خوای مەزن، کەسی تر نازانــێ سـبەینێ چ رودەدات)) [٢].
((خــاتو عـائیــشە گوتوویــەتی: ئافرەتێـك درابــو بەشــو بــە پیــاوێکی ئەنصاری، لەکاتی گواستنەوەیدا پێغەمبەری خوا ﷺ فـەرموی: عـائیـشە! ئایا هیچ ئاهەنگێکتان ئامادە نەکردوە؟ چونکە ئەنصاری‌یەکان حەزیان لە

---

١) رواه البخاري والبيهقي وأحمد في المسند.
٢) رواه الطبراني (صحيح).

یاری‌و ئاهەنگە))[١].

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((فصل ما بين الحلال والحرام الصوت والدف))[٢] ، واتە: جیاوازی نێوان نیكاحی حەڵاڵ‌و حەرام، ئاشكراكردنیەتی بە دەف‌و گۆرانی.

ئەو گۆرانیەش كە دروستە لەكاتی ژن گواستنەوەدا بگوترێ وەك، كە لە فەرمودەكەدا هاتوە ئەوەیە، كە گۆرانیەكە ماناو مەبەستەكەی ساغ‌و دروست بێ‌و دور بێ لە قسەی بێ ڕەوشتیەوەو، نابێ مۆسیقای حەرامی لەگەڵ دابێ تەنها دەف نەبێ.. چونكە ئەو مۆسیقا جنس بزوێن‌و ئەو گۆرانیە ڕوتانە دەبنە هۆی بڵاوبونەوەی بەدڕەوشتی‌و خراپەكاری‌و بزواندنی جنس بە حەرامی.

با باوك‌و دایكان‌و هاوسەران ئاگاداربن لە مەترسی گوێگرتنی ئەم جۆرە گۆرانیە حەرام‌و مۆسیقا ئارەزو بزوێن‌و لە خوا غافڵ كارانەدا.

ئیمام صدیق حەسەن خان گوتویەتی:

گوێگرتنی گۆرانی بەبێ مۆسیقا جیاوازی‌و خیلافێكی زۆری لەسەرە، لە نێوان (سەلەف‌و خەلەف)دا. بە گوێرەی گوتەو بەڵگەكانیان دەردەكەوێ، كە گوێگرتن لە گۆرانی بە تەنها بەبێ زوڕنا نە مەكروهەو نە حەرامە، زانایان لەسەر حەرامی گۆرانی كۆڕا نین وەك هەندێكیان وایان گوتوە.

ئەوەشمان گوت: ئەو گۆرانیە حەڵاڵە، كە وشەكانی باسی شیرك‌و بەسەردا گوتن بە لەش‌و لارو سیماو قەدو باڵای ئافرەتێك پێك نەهاتبێ.

پێغەمبەرﷺ گوێبیستی چەند كەسێك بو لە ژن گواستنەوەیەكدا

---

١) رواه البخاري وغيره.

٢) رواه النسائي والترمذي وابن ماجه وغيرهم (حديث صحيح).

گۆرانیان دەگوت کە بەو شێوە دەیانگوت:

(وزوجك في النادي ويعلم ما في غـد)، واتـە: مێردەکـەت لـەناو کـۆڕو کۆمەڵەو، دەزانێ بەیانی چ ڕودەدات.

پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((لا يعلم ما في الغد إلاّ الله سبحانه))[١]، واتە: کەس نازانێ بەیانی چ ڕو دەدات، تەنها خوای پاكو بێگەرد نەبێ.

لە عامری کوڕی سەعدەوە، کە گوتویـەتی: چـومە لای قـرظـە کـوڕی کەعبو ئەبی مەسعود، جا سێ جار دوبارەی کردەوە، کەوا جاریەیان لـەلا بو و دەفەیان لـێدەداو گۆرانیان دەگوت. دەڵێ: منیش گوتم: ئێوە هاوەڵی پێغەمبەرنو گوێ لەم گۆرانیە دەگرن؟!

ئەوانیش گوتیان: پێغەمبەرﷺ لە ئاهـەنگی ژن گواسـتنەوەدا ڕێگـەی داوە بۆ ئێمە داوە)) [٢].

---

١) رواه الطبراني والحاكم والبيهقي (صحيح).

٢) رواه الحاكم والبيهقي والنسائي والطيالسي (صحيح).

# خۆت بۆ خێزانەکەت جوان بکەو با ئەویش خۆی بۆت جوان بکات[١]

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾(البقرة-٢٢٨)، واتە: ئافرەتان هەروەك ئەرکی ژنانەیان لەسەر شانە، هەروەها مافی ڕەوای خۆیان هەیە.

((پرسیار لە خاتو عائیشە کرا، ڕەزای خوای لێبێ، کە پێغەمبەرﷺ دێتە ماڵەوە یەکەم شت چ دەکات؟ گوتی: سیواك دەکات![٢])) [٣].

ئیبن عەباس دەڵێ: من خۆم بۆ خێزانەکەم جوان دەکەم هەروەك ئەو خۆی بۆم جوان دەکات،[٤] حەزیش ناکەم هەمو مافەکانم بۆ جێبەجێ بکات، چونکە هەمو ئەو مافانەی ئەو، کە لەسەرمە پێویست دەبێ و ناتوانم هەموی جێبەجێ بکەم، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ

---

١) لە هەندێك (آثار)دا هاتوە، کە دەفەرموێ: جلەکانتان بشۆن، قژتان کورت بکەنەوەو سیواك بکەن، خۆتان جوان بکەنو خۆتان پاك ڕاگرن، چونکە بەنی ئیسرائیل ئەمانەیان نەدەکرد، بۆیە ئافرەتەکانیان توشی زیناکردن بون.

٢) ڕەنگە پێغەمبەر ﷺ بۆیە سیواکی کردبێت، تاوەکو بە ماچکردن پێشوازی خێزانەکانی بکات!.. چەند جوانە ژنو مێرد بەیانیان بە ماچکردن یەکتری بەجێ بێڵنو، ئێوارانیش بە ماچکردن بە یەکتری بگەنەوە، تاوەکو یادەوەریەکەیان بەردەوام بێت.

٣) رواه مسلم .

٤) بەڵێ، پێویستە لەسەر ژن خۆی بۆ تۆ جوان بکات نەك بۆ پیاوانی سەرشەقامو ئاهەنگەکان.

مِثْلُ الّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾[١].

پیاوێکی قژ تێکەڵو دانەهاتو و تۆزاوی لەگەڵ ژنەکەی بە نیازی سکاڵاکردن، چونە لای خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب، ژنی پیاوەکە بە خەلیفە عومەری وت: گەورەی بڕواداران! منو ئەو پیاوەیان نەگوتوە، بە مانای لەدەست ئەو پیاوەم رزگار کە.[٢] خەلیفەش زانی ژنەکە حەز بە

١) قورتوبی لە راڤەی ئەمە لە ئیبن عەباس دەگێڕێتەوە، کە ئەمە پوختەیەتی: (بۆیە پیاو کاری وا گونجاو دەکات، بۆ ئەوەی لەبەردەم ژنەکەی جوان بێتو ژنەکەی دڵی پێ بکرێتەوەو دڵخۆش بێ، یا ژنەکەی داوێن پاك بێ لە ئاست پیاوان)، گوتویەتی: (بۆنخۆشیو سیواكو لابردنی بۆنی پیسی لەشو لابردنی موی لەشو خۆ پاککردنەوەو نینۆککردن، شتێکی دیارەو گونجاوە لەگەڵ ئایینداا.)

پاشان دەڵێ: پێویستە پیاو ئەوکاتانەی ژن بزانێ، کە پێویستی بە پیاو هەیە، تا داوێن پاك بێو چاو نەگێڕێ بۆ پیاوی تر، هەرکاتێکیش پیاو بینی ناتوانێ مافی خۆی لە سەرجێیی کردن بداتە ژنەکەی، ئەوا بۆی هەیە ئەو دەرمانانە بەکاربهێنێ، کە ئارەزوی جنسی بەهێز بکات، تا ژنەکەی داوێن پاك بێ.

٢) لە کتێبی (تحفة العروس)دا هاتوە: (ئافرەتان یاری پیاوانن، کەواتە با پیاو بە پێی توانای یاریەکەی جوان بکات!)

خۆ جوانکردن مایەی وروژاندنی ئارەزوی پیاوەو، مایەی چاوتێرکردنیەتیو دیارترین جوانی ژنەو مایەی بەردەوامی ئولفەتو خۆشەویستی یە!

(أبو الفرج) لە کتێبی (النساء) گوتویەتی: کە ئەمە ماناکەیەتی: ژن کاتێك لەلای مێردەکەی خۆشبەخت دەبێ، دوای تەواو جوان ئاکارییو تەواو جوانبونی، گەر لەسەر خۆ جوانکردنو خۆپاك راگرتن بەردەوام بێ، هەوڵ بدات هەرچی خشڵو جلوبەرگ هەیە بە هەمو شێوەکانیەوە بەکاری بێنێ، کە جوانیەکەی زیاتر دەکاتو بەدڵی مێردەکەیەتیو حەزی پێدەکا، با زۆر وریاو ئاگادار بێ نەهێڵێ مێردەکەی بەشێوەیەك ببینێ، کە حەزی پێناکات وەك پیسو پۆخڵیو بۆن ناخۆشی.

مەترسی لەدەستچونی پیاویش دەگەڕێتەوە بۆ ژن، چونکە ئەو بۆتە مایەی کەمتەرخەمی نواندنو، ئەویش چاو ببڕێتە ئافرەتیتر.. هەروەها با ژن خۆ جوانکردنی زیاتر بکات لەو کاتانەی، کە خوای گەورە لە قورئان باسی کردونو قەدەغەی کردوە

هاوسەرەکەی ناکات، لەبەرئەوە مێردی ژنەکەی نارد، تا خۆی بشوات و خۆی ڕێك بخات و قژی کورت بکاتەوە و نینۆکی پەنجەکانی کورت بکاتەوە، جا کاتێك پیاوەکە هاتەوە لای خەلیفە، ئیمام عومەریش فەرمانیدا بە ژنەکەی لێی بچێتە پێشەوە، کاتێك کە چوە پێشەوە ژنەکەی نەیناسیەوە و بەلایەوە غەریب بو، یەکسەر لەلای لاکەوت، پاشان کە مێردەکەی ناسیەوە پێی رازی بو و، ئەو داوایەش کە کردبوی بۆ رزگار بون لەدەست مێردەکەی لێی پاشگەز بوەوە. ئیمامی عومەریش فەرموی: خۆتان بۆ خێزانەکانتان ئاوا لێبکەن، بەخوا چۆن ئێوە پێتان خۆشە ژنەکانتان خۆیان بۆتان جوان بکەن، بەهەمان شێوە ئەوانیش بەو شێوەیە پێیان خۆشەو دەبێ خۆتانیان بۆ جوان بکەن.

پێغەمبەرﷺ لەبارەی نەچونە لای خێزان لە کاتێکدا، کە خۆی نەڕازاندۆتەوەو ئاگاداری مێردەکەی نیە دەفەرموێ: ((إذا دخلت ليلاً فلا تدخل[1] على أهلك حتى تستحدّ المغيبة وتمتشط الشعثة: الكيّس

بەندەو منداڵان بێنە ژورەوەی ژنو مێرد، مەگەر بە مۆڵەت وەرگرتن بێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ مِن قَبْلِ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ الظَّهِيرَةِ وَمِن بَعْدِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ ثَلَاثُ عَوْرَاتٍ لَّكُمْ﴾(النور– ٥٨)، واتە: ئەی بڕواداران! با ئەوانەی خولامو کەنیزەی ئێوەن، ئەو کەسانەش لەئێوە باڵغ نەبون، سێ جار ئیزنو لێ بخوازن: لە پێش نوێژی بەیانیداو نیوەڕۆیان. کاتێ شمەکان دادەنێنو لەپاش نوێژی خەوتنانیش" کە ئەم سێ کاتە وەختی تەنیایی ئێوەیە.

١) لە کتێبی (فيض القدير) هاتوە، کە ئەمە پوختەکەیەتی: (گەر پیاو لە سەفەردا بو نزیك بو بگەڕێتەوە، ژنەکەش بە گەڕانەوەی دەزانیو ئاگادار بو، ئەوکاتە ژنەکە خۆی بۆ ئامادە دەکات ئەوا کەراهەتی نیە.. چونکە ئەو هۆیە لادراوە کە مایەی کەراهەتە، هۆیەکەشی بریتیە لە خۆئامادەنەکردنی ژنەکە بۆ پیاوەکەی.

الكـــيس؟))[١]، واتـە: گـەر بەشـەو چـویە ژورەوە یـان ماڵـەوە بـۆ لای خێزانەکەت، یەکسەر مەچوە لای لە کاتێکدا تۆ لە سەفەر بوی‌و لێـی دور کەوتویتەوە، تا ئەو کاتەی بە هەواڵی ئامادە بونت دەزانێ‌و ئـەو موانـەی لەشی لادەدات، کـە پێویـستن لا بـدرێن‌و قـژی دابهێنـێ‌و پیـسی لەشـی لابدات. لەبەرئەوە ئاگاداربەو تێگەیشتو بـەو، ژیـری‌و خـۆگری‌و ئـارامی بەکاربهێنە، تا نەکەویە نـاو حەرامـەوە، وەك جوتبـون لـە کاتێکـدا، کـە خێزانەکەت لە حەیز دایە.

لەم فەرموودەیەدا ئاڕاستەیەکی جوان‌و پڕ بایەخی بۆ ژنان تێدایە، کەوا گرنگی بە لەش‌ولارو سینگ‌و بەرۆکی بدات بۆ مێردەکەی‌و، بـە جـوانترین شێوە، خۆی بۆ مێردەکەی نمایش بکات‌و خۆی بەدەربخات، وەك لـە شـەوی گواستنەوەیدا بێت ئاوا بکات، بەڵام بەداخەوە زۆرینەی ژنـە مێردارەکـان خۆیان لەم مەسەلە هەسـتیارو گرنگـە بێ‌ئاگـا کـردووە، کـەوا خـۆی بـە جل‌وشمەکی پیسەوە، پیشانی مێردەکـەی دەدات، کـە دەبێتـە هـۆی قێـز لـێ‌بوونەوەی‌و خۆ لـێ‌دورخستنەوەی .

پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ((عشـــرة من الفطرة: قَصُّ الـــشـــارب[٢]،

---

١) رواه مسلم.

٢) سمێڵ قرتاندن‌و کورتکردنەوەی: بەگوێرەی ئەم فەرمودەیە (واجب)ـە: سمێڵ تا سەر لێـو کورت بکرێتەوەو نابێ درێژ ببێ، هەروەها نابێ سمێڵ بتاشـرێ وەك کـە هەنـدێك کـەس ڕیشیان دەهێڵنەوەو سمێڵیان دەتاشن لەراستیدا ئەوە بێ‌ئاگایی‌و نەزانینە لە مانـای ئـەم فەرمودەیەدا. پرسیار لە ئیمام مالیك کرا دەربارەی ئەو کەسـەی سمێڵـی روت دەکـات‌و دەیتاشـێ!، ئـەویش گـوتی: وا ئـەبینم لێـی بـدرێ، لێـدانێکی بـە ئـێش. بەیهـەقی گێڕاویەتیەوە (١/٣٥٣).

واعفاء اللحية[١] والسواك[٢] واستنشاق الماء[٣]، وقص[٤] الأظافر... وغسل البراجم[٥]، ونتف الإبط[٦]، وحلق

---

١) ڕیش هێشتنەوە: ڕیش هێشتنەوە یەکێکە لە هۆیەکانی جوانی پیاو، ئایە نەتبینیوە نێرینەی شێر لەمێیەکەی جوانترە، کەڵەشێر لە مریشك جوانترە، نێرینەی باڵدار لە مێیینەکەی جوانترە، هەمو ئەو جوانیە بەهۆی هەبونی مو لە دەموچاویدا. ڕیش بەهێزترین هۆیەکانی چالاکی جنسی یە، کە یارمەتی فرێدانی هۆرمۆناتی نێرینە لە خوێندا دەدات، بە پێچەوانەشەوە ڕیش تاشین یارمەتی فرێدانی هۆرمۆناتی مێیینە لە خوێن دا دەدات، چونکە بەهۆی ئەوەوە ڕێژەی خۆچواندن بە ئافرەتانی تێدا زۆر دەبێت! لەناو خەڵکیش ئەوە باوەو ناوبانگی هەیە، کە ئەو کەسانەی ڕیشیان هەیە لەو کەسانەی، کە ڕیشیان نیە هێزی جنسیان بەهێزترە.

دکتۆر صبري القباني لە کیتێبەکەیدا باسی ئەوەی کردوە، کە بونی ڕیش دەبێتە هۆی بزواندنو جولاَندنی ئارەزوی جنسی ئافرەت، لەکاتی کرداری جنسی دا واتە لەکاتی جوتبوندا.

٢) سیواك کردن: پێغەمبەرﷺ بەهۆی سیواکەوە گرنگی داوە بە پاککردنەوەی ددان، تا ددانی پاك ڕاگرێو بەجوانی بێنێتەوە. لە فەرمودەی (صحیح)دا هاتوە کە فەرمویەتی: ((لولا أن أشق على أمتي لأمرتهم بالسواك))، واتە: گەر لەسەر ئومەتەکەم بەزەحمەتو ناخۆشی نەبوایە، فەرمانم پێدەکردن، کە سیواك بەکار بهێنن.

٣) ئاو لە دەم و لوت وەردان.

٤) نینۆك کردن: ئەوی جێگەی داخە زۆربەی ئافرەتان بە پێچەوانەی سروشتی مرۆڤ ڕەفتار دەکەن، ئەویش بە درێژکردنی نینۆکیان، کە وەك درندە خۆیان دەنوێننو نینۆکیشیان بۆیە دەکەن، لەڕاستیدا ئەمە حەرامە، چونکە خۆ چواندنە بە کافران. هەروەها لەکاتی دەستنوێژ گرتن ئاوی بەرناکەوێو دەست نوێژەکەی پێ دروست نابێ. ئەوەی نامۆو غەریبە ئەو جۆرە ئافرەتانە خۆیان بە نوێخوازو پێشکەوتنخواز لەقەڵەم دەدەن، کەچی پێچەوانەی سروشتو زەوقی ساغی نادەمیزاد دەکەن، کە وەك پشیلە نینۆکیان درێژ دەکەن.

٥) شتن و پاککردنەوەی نێوان پەنجەکان.

٦) هەڵکەندنی موی بن هەنگڵ: هەڵکەندنی مو باشترە لە تاشینی چونکە تاشینی مو دەبێتە هۆی بریندارکردن. هەڵکەندنی مو لە کاتێکا بەسوكو ئاسانی هەڵدەکەنرێ کە کاتی خۆشتن بێ یان دوای خۆشتن بێ.

العـــانة[1]، وانتقاص المـــاء[2]))[3] ، واته: (ده) شت هەیە کە لـە فیترەت و سروشتی ئادەمیزادن: سمێڵ قرتاندن و ڕیش هێشتنەوە و سـیواك کـردن و ئـاو لـە دەم و لـوت وەردان و نینـۆك کـردن و شوشـتنی نێـوان پەنجەکان و بن هەنگڵ کردن و بەرکردن و خۆپاککردنەوە لە میز و پیسایی.

١) لابردنی موی بەر (العانة).
٢) خۆپاککردنەوە لە پیسایی.
٣) رواه مسلم وغيره.

## قەدەغەکردنی هەڵگرتنی مووی برۆو روخسارو قژی دەستکرد

بوخاریو موسلیم گێڕاویەتیانەوە، کە ((لعن رسول الله ﷺ الواشمات والمستوشمات والنامصات والمتنمصات والمتفلجات للحسن المغيرات خلق الله))، واتە: پێغەمبەرﷺ نەفرەتی لەو کەسانە کردوە، کە دەستو چەناگەو سەری لوتیان بە دەرزی دەکوتن، نەفرەتەکەش هەردو کەس دەگرێتەوە ئەوەی داوای دەکاتو، ئەوەیش وەك پیشە بەکاری دێنێ، نەفرەتی لەو کەسانەش کردوە کە برۆ باریك دەکەنەوەو ئەو ئافرەتانەش، کە داوا دەکەن برۆیان بۆ باریك بکرێتەوە[1]. هەروەها نەفرەتی لەو کەسانە

---

١) لە کتێبی (مفصل أحكام المرأة والبيت المسلم)دا، سەبارەت بە برۆو دەمو چاوکردن، جیاڕایی زانایانی هێناوەو هەندێکیان رێگەیان پێداوە بە مەرجو، هەندێکی تر بە حەرامیان داناوە، ڕای پەسەند (أرجح)یشی لەمبارەوە هێناوەو دەڵێ: ئەو ڕایەی لای من پەسەند (ارجح)ە ئەوەیە کە حوکمی برۆ باریك کردنەوەو دەموچاو کردن حەرامە، ئەوەش ئەو بنچینەیەیە، کە ڕواڵەتی فەرمودەکە دەریدەخات، کە بریتیە لە لەعنەتکردن لە ئافرەتی برۆکەرو برۆ باریککراو. کەواتە بۆ ئافرەتی شونەکردو دروست نیە برۆو دەمو چاوی بکات، بە تایبەتی ئەگەر خوازبێنی کرا، چونکە گەر ئەم کارە بکات لەو حاڵەتەدا دەبێتە فریودانو چەواشەکردنی خوازبێنیکەر. بەڵام ژنی مێردار، ئەگەر مێردەکەی حەزی پێکردو داوای لە ژنەکەی کرد برۆو دەمو چاوی بکات، وا دەبینم بۆی دروستە بیکات، چونکە لە جوغزی خۆ جوانکردنو ڕازاندنەوەیە بۆ مێردەکەی، ئەوەش لە شەریعەتدا کارێکی خوازراوەو (مرغوب فيه) بۆ بەردەوام بونی سۆزو خۆشەویستی نێوان ژنو مێردەو بۆ چەواشەی مێردەکەی نیە، ئەگەر ژنەکە حەزی پێدەکرد بەبێ داواکردنی مێردەکەی، بەڵام گەر بە مۆڵەتی مێردەکەی بێت، ئەوا هەر دروستە، چونکە مۆڵەتدانی

کردوه، که کەلێن‌و بۆشایی لە ددانەکانیان بۆ جوانی دروست دەکـەن، کـە ئەوەش دەبێتە هۆی گۆڕینی دروستکراوی خوا.

بوخـاریو موسـلیم گێڕاویەتیانـەوە کـە ((لعـن الله الواصـلة والمستوصلة))، واتە: خوای گەورە نەفرەتی لەو کەسـە کـردوە، کـە قـژی دەستکرد (بارۆکە) لەسەر دەکەن‌و ئەو کەسەش، کە داوای دەکات.

---

وەك داواکردنیەتی بۆ ئەم کارە. ئەگەر پیاویش داوای لە ژنەکەی بکات برۆو دەم‌و چـاوی بکات یان مۆڵەتی پێبدات، وا دەبینم هـەر دروسـتە، چـونکە ناکەوێتـە بـەر حـوکمی برۆکراو (متنمصة)ە، دیارە خۆ جوانکردنی ژن بۆ مێردەکەی، خۆشەویـستی مێردەکـەی زیاد دەکات، کەواتە دروستە.

بۆ زیاتر قوڵ بونەوە لەم مەسەلەیە بگەڕێوە بۆ کتێبـی (المفـصل في أحكـام المرأة) د. عبدالکریم زیدان، بەرگی سێیەم، لاپەڕە٣٨٣، چاپی دوەم-١٤١٥ك-١٩٩٤ز. (وەرگێڕ)

## قەدەغەکردنی بڕینی قژی ئافرەت و ئوتودانی بە مەبەستی لاسایی کردنەوەی بێگانە

((لعن رسول اللهﷺ المتشبهين من الرجال بالنساء والمتشبهات من النساء بالرجال))[١]، واتە: پێغەمبەرﷺ نەفرەتی لەو پیاوانە کردوە، کە لە هەمو ڕەفتاریاندا وەك ئافرەت هەڵس‌وکەوت دەکەن‌و خۆیان بە ئافرەتان دەچوێنن. نەفرەتیش لەو ئافرەتانە کردوە، کە وەك پیاوان ڕەفتار دەکەن‌و لاسایی‌یان دەکەنەوەو، خۆیان بە پیاوان دەچوێنن.

هەروەها دەفەرموێ: ((من تشبه بقوم فهو منهم))[٢]، واتە: هەر کەس خۆی بە هەر گەل‌و کەسانێ بچوێنێ، ئەوا ئەو کەسە وەك ئەوانە.

لەم فەرمودە پیرۆزەدا دەردەکەوێ، کە چەند حەرامە گەر ئافرەت بە مەبەستی لاسایی‌کردنەوەی پیاوو ئافرەتی بێگانە (ڕۆژئاوا) قژی ببڕێ‌و کورت بکاتەوە.

بەڵام گەر ئافرەت قژی ببڕێ، بێ‌ئەوەی مەبەستی لاسایی‌کردنەوە بێت، ئەوا حەرام نیە، وەك کە ئیمام موسلیم گێڕاویەتیەوە (١٧٦/١) ئەبی سەلەمەی کوڕی عبدالرحمن دەڵێ: لەگەڵ برای شیری عائیشە چومە لای خاتو عائیشە، جا پرسیاری چۆنیەتی خۆشتنی جەنابەتی پێغەمبەری کرد... عائیشە (لە درێژەی قسەکانیدا) گوتی: خێزانەکانی پێغەمبەر قژیان کورت دەکردەوە، کە لە گوێیەکانیان تێپەڕی نەدەکرد.

ئوتودانی قژو چاکردنی، ئەوە بە ڕون‌و ئاشکرایی‌و بە دڵنیاییەوە خۆچواندنە بە بێگانە، لەبەر ئەوە حەرامە.

---

١) رواه البخاري وأبوداود وأحمد في المسند.

٢) رواه أبوداود وأحمد في المسند والطحاوي (حديث صحيح).

## موسـتيلـەی زێـڕ بۆ پيـاوان حەرامـە

پێغەمبەرﷺ پیاوێکی بینی موستیلەی زێڕی لەدەستدا بـو، پێغەمبـەر یەکسەر موستیلەکەی لەدەست دامالّیو فڕێی داو فەرموی: کەس هەیە لە ئێوە پشکۆ ئاگرێك لەدەست بکات!!

دوای ئەوەی پێغەمبەر ڕۆیشت، بـە پیاوەکـەیان گـوت: موسـتیلەکەت هەڵگرەوە بۆ ئـەوەی سـودی لـێوەرگری! پیاوەکـەش گـوتی: نـا بـەخوا! هەرگیز هەڵی ناگرمەوە، چونکە پێغەمبەر فڕێی داوە)).[1]

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((**من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يلبس حريراً ولا ذهباً**)).[2] واتە: هەر کەسێك بـڕوای بـە خـواو ڕۆژی دوایی هەیە با ئاوریشمو زێڕ نەپۆشێ. (لێرە مەبەستی پیاوە).

---

١) رواه مسلم والنسائي.

٢) رواه أحمد في المسند (حديث حسن).

## بۆنخۆشی خۆشەویستی دروست دەکات

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((حُبّبَ اليّ من دنياكم النساء والطيب! وجعلت قرة عيني في الصلاة))[1]، واتە: لە دنیاکەتاندا دو شت لەلام خۆشەویست کراوە، ئافرەت و بۆنخۆشی، لە نوێژدا چاوو دڵم رۆشن دەبنەوە.

لەبارەی بۆنخۆشیەوە هەندێك لە شارەزایان دەڵێن: ڕازاندنەوەو خۆ جوانکردنی ژن بۆ مێردەکەیو خۆ بۆنخۆشکردنی، لە بەهێزترین هۆیەکانی خۆشەویستیو تەباییو بەزەیی دادەنرێ. هەروەها بۆنخۆشکردن دەبێتە هۆی نزیکی لە یەکتریو ڕق لێنەبونەوە. چونکە چاو و لوت سەری دڵن، جا گەر دیمەنێکی باشو جوانی بینی یەکسەر بۆ دڵی دەگەیەنێو خۆشەویستی دروست دەبێ، ئەگەر دیمەنێکی ناشیرین کەوتە بەرچاوی وەك جلو بەرگ، ئەوا یەکسەر ئەم شتەی، کە پێی ناخۆشە بە دڵی دەگات، ئەو کاتە ڕقی لێدەبێتەوەو لێی دور دەکەوێتەوە. لەبەر ئەوەی بۆن کاریگەرییو مەترسی لەسەر دڵو دەرون هەیە. بەڵام پێغەمبەرﷺ قەدەغەی ئەوەی کردوە، کە ئافرەت بە بۆنخۆشییەوە[2] بچێتە سەر

---

١) رواه أحمد في المسند والنسائي والبيهقي (صحيح)

٢) سەبارەت بە بەکارهێنانی بۆن بۆ ئافرەتان، کاتێ لە ماڵ دەچێتە دەرەوە، پێویستە هەڵوەستەیەك بکەینو زۆر گرنگیشە بە پوختی لەسەری بدوێین:

مەسەلەی بەکارهێنانو بەکارنەهێنانی بۆنو عەتر بۆ ئافرەتان،کاتێ لە ماڵ دەچێتە دەرەوە، وەك مەسەلەی درێژکردنی پانتۆڵو شەرواڵ بە هۆ (علّة)ەوە پەیوەستو بەندە، بۆ نمونە: کاتێ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ما أسفل الكعبين من الأزار ففي النار... ئەو کەسەی پانتۆڵەکەی یان شەرواڵەکەی لە خوار گۆزینگەوە بێت ئەوا لە ئاگری دۆزەخە)). (صحيح البخاري بشرح العسقلاني ج ص٢٥٦ و رواه النسائي في سننه ج ٨ ص ١٨٣) بەڵام لە فەرموودەیەکی

شەقام و بازاڕ، چونکە دەرچونی ئافرەت بۆ بە بۆنخۆشی دەبێتە هۆی سەرنج ڕاکێشان و بزواندنی ئارەزوی پیاو و هاندان بۆ ئەنجامدانی کاری بەدڕەوشتیی و زیناکردن.

((خاتو عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ گوتویەتی: ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ پرسیاری دەربارەی پاك بونەوەی لە خوێنی حەیز لێکرد، پێغەمبەریش فەرمانی پێدا، کە چۆن خۆی پاك بکاتەوەو خۆی بشوات، فەرموی: کەمێك لە (مسك) کە جۆرە بۆنێکە، بێنەو خۆتی پێ پاك

---

تردا هۆ (علّة)ەکە دیار دەکات، کە گەر بە مەبەستی فیزو لووتبەرزیی و شانازی کردنەوە پانتۆڵ و شەرواڵ درێژ بکرێت هەرەشەکە دەیگرێتەوە، ئەوەتا دەفەرموێ: ((لا ینظر الله الی من جرّ ثوبه خیلاء... خوا تەماشای کەسێك ناکات، کە پۆشاکی بە مەبەستی شانازیی و فیزو لەخۆباییەوە بە دوای خۆی ڕابکێشێ)) .(هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ٢٥٢)، وەك لە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کراوە، کە دەفەرموێ: ((أیما إمرأة استعطرت فمّرت علی قوم لیجدوا من ریحها فهي زانیة)).

شێخ ئەلبانی لە (جلباب المرأة المسلمة)و د.عبدالکریم زیدان لە (مفصل أحکام المرأة)دا دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێن: ((بۆیە دروست نیە ئافرەت لە دەرەوەی ماڵ خۆی بۆندار بکات، لەبەرئەوەی بۆنی عەترەکە سەرنجی پیاوان ڕادەکێشێ و ئارەزوو (شهوة) یان دەبزوێنێ)).

ئەدی ئەگەر هۆیەکە نەماو، تەنها ئافرەتەکە خۆی هەست بە بۆنەکەی بکات وەك ئەو عەتــــرو بۆن (معطر)انەی لە بازاڕەکاندا هەنە، کە بە تایبەتی بۆ بن هەنگــڵ بەکاردەهێنرێ و بۆنی ناخۆش و ئارەقە دەبڕێ، ئەوا دروست (جائیز)ە ئافرەت بۆ دەرەوە بەکاری بێنێ. بەڵام بۆن و عەتری کشمیرو هاوای و ئەمریکاو هاوشێوەی ئەوانە، کە بۆنیان تیژەو لەلایەن پیاوانەوە هەست بە بۆنیــان دەکرێ، دروست نیەو نابێ ئافرەت خۆی پێ بۆندار بکات لە دەرەوەی ماڵ.

ئەو جۆرە بۆنانەی باســمان کردن، کە بۆنیان تیژە وەك هاوای و کشمیر زۆر دروستەو، ئافرەت بۆ مێردەکەی خۆی پێ بۆنخۆش بکات و ســەرنجی مێردەکەی بۆ لای خۆی پێ ڕابکێشێ، کە خۆشەویستی زیاتر دەکات. (وەرگێڕ)

بکەرەوە. ئافرەتەکەش گوتی: چۆن خۆمی پێ پاك بکەمەوە.

پێغەمبەر فەرمووی: خۆتی پێ پاك بکەوە. ئافرەتەکە گوتی: چۆن؟

پێغەمبەر فەرمووی: سبحان الله، خۆت پاك بکەوە!

خاتوو عائیشە دەڵێ: دەستی ئافرەتەکەم گرت و پێم گوت: شوێنی خوێنەکەی پێ پاك بکەوە))[١].

بە مانای: ئافرەت پاش ئەوەی، کە پاك دەبێتەوە لە حەیزدا، تۆزێك بۆنی مسك، یان هەر بۆنێکی تری خۆش بە پارچە لۆکەیەك یان پارچە قوماشێك بە (فەرجی)یەوە بنێ بۆ ئەوەی شوێنی خوێنەکە بۆنی خۆش ببێ و بۆنی پیس و ناخۆشی لێ لابدرێ.

ئەبو داود دەڵێ: ((**كانت لرسول الله ﷺ سُكّة: يتطيب منها**)) [٢]، واتە: پێغەمبەر ﷺ گولاو پرژێنێکی هەبو، کە خۆی پێ بۆن خۆش دەکرد.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**أطيب الطيب المسك**))[٣]، واتە: خۆشترین بۆن، بۆنی میسکە.

هەروەها فەرمویەتی: ((**طيب الرجال ما ظهر ريحه وخفي لونه، وطيب النساء ما ظهر لونه وخفي ريحه**))[٤]، واتە: بۆنی پیاوان ئەوەیە کە بۆن بکرێ و رەنگەکەی بشاردرێتەوە، بۆنخۆشی ئافرەتانیش ئەوەیە، کە رەنگەکەی بەدەربکەوێ و بۆنی نەکرێ.

هەروەها دەفەرموێ: ((**من عرض عليه ريحان فلا يرده، فانه طيب**

---

١) رواه البخاري ومسلم.

٢) حديث حسن.

٣) رواه أبوداود (حديث حسن وصحيح).

٤) رواه الترمذي والنسائي (صحيح).

الريح، خفيف المحمل))[1]، واتە: گەر یەکێك رەیحانی پێشکەش کرا، با وەریبگرێو ڕەتی نەکاتەوە. چونکە بۆنی خۆشەو، هەڵگرتنیشی سوکە.

هەر بەو بۆنەیەوە بوخاریو نەسائی گێڕاویەتیانەوەکە پێغەمبەرﷺ لە کاتێکدا گەر یەکێك بۆنی پێشکەش کردبا، ڕەتی نەدەکردەوەو لێی وەردەگرت.

١) رواه مسلم

# لەسەر جێگای بوكێنی

## لاواندنەوەی ئافرەت لەکاتی دخول پێکردنی

لە ئەسمای کچی یەزیدی کوڕی سەکەنەوە دەڵێ: ((لە شەوی گواستنەوەدا، عائیشەم بۆ پێغەمبەر جوان کردو ڕازاندەوە، پاشان چومە لای پێغەمبەرو بانگم کرد بۆ ئەوەی بێتە لای عائیشە. پێغەمبەریش ﷺ چوە تەنیشت عائیشە دانیشتو پەرداخێ شیری هێناو هێندێکی خواردەوە، پاشان بۆ عائیشەی ڕاگرت، کە ئەویش بیخواتەوە. عائیشەش لە شەرمان سەری نەوی کرد.

ئەسماء دەڵێ: منیش سەرزەنشتی عائیشەم کردو پێم گوت: لە دەستی پێغەمبەری وەرگرە.

ئەسماء دەڵێ: عائیشە لە پێغەمبەری وەرگرتو کەمێکی لێ خواردەوە.

پاشان پێی فەرمو: بیدە بە هاوڕێکانت[1]))[2].

---

١) ئا بەم جۆرە ئاهەنگی بوك گواستنەوە تەواو بو بەبێ تەکلیفو بە سادەیی کۆتایی پێهات. گۆرانی هاوسەنگو دەف لێدان بۆ ئاشکراکردنی مارەکردنو پەرداخێکی گەورە لە شیر، ئەوەش ئەوەندەیە کە لە توانادا بوە! ئەوە لە کوێ لە بەرامبەر ئەوانەی ئەمڕۆ دەیکەن، کەوا ماڵو سامانێکی زۆر خەرج دەکەن، ڕەنگە بە سو (ربا) قەرزیان کردبێو بۆ ریابازیو شانازی کردنەوە بێ، کە باری کابرا هێندە گران دەکەن بە خەرجکردنی ئەم پارە زۆرە کە وای لێدێ بۆ چەند ساڵ قەرز بداتەوەو ئاییندەی خۆیو خێزانی لەناو ببات. سەرەڕای ئەوەش ئەو هەمو حەرامیەی لێ ئەنجام دەدرێ، وەك تێکەڵ بونی پیاوو ئافرەتانی نیمچەڕوت، چەندەها ئافرەتی بێڕەوشتی گۆرانی بێژی لێ ئامادە دەبێتو مەی تێدا دەخورێتەوە، هەمو ئەمانە بۆ ڕازیکردنی دڵی خەڵکە، ئەگەر بە خەشمو توڕەیی خواش تەواو بێت.

٢) رواه أحمد في المسند وغيره (صحيح).

لێرەدا لەبارەی ئەوەی، کە عائیشە ئەم هەڵوێستو ڕەفتارەی نواند، کە بریتی بو لەسەر نەوی کردنو شەرم کردن، ئەوە جۆرێك لە نازو شەرم دەگەیەنێ.

نازکردنو لاواندنەوەش شتێکی پێویستە! کە سۆزو عاتیفەی پیاو دەبزوێنێو هێزو چالاکی زیاتر دەکات، بەڵام ئەم نازکردن نەگاتە ڕادەی زۆر لە ڕادەبەدەر، کەوا لە پیاوەکە بکات دور بکەوێتەوەو، وا گومان ببات ژنەکەی خۆشی ناوێ. ئەو ڕەفتارەی کە پێغەمبەر لە یەکەم شەوی زاوایيدا نواندی، کە بە لوتفو نەرمی لەگەڵ عائیشەدا جولآیەوە، جێگەی ئەوەیە، پەندو ئامۆژگاری لێوەربگیرێ، بە تایبەتی بۆ گەنجان، کە هەندێکیان لە یەکەم شەوی زاوایيدا بەخراپی لەگەڵ ژنەکەیان ڕەفتار دەکەن، دەیانەوێ بە پەلە جوت بن، بێئەوەی هیچ پێشەکیەك دابنێن بۆ لاواندنەوەی (بوك)، تا بە هێمنیو لەسەرخۆیی شەرمی بوکەکە نەهێڵرێ.

لەبەرئەوە دەبێ ئەوە بزانرێ، یەکەم شەوی زاوایی بەدەرخەری خۆشەویستیو ڕق لێبونەوەیە. چونکە لەو شەوەدا بە دەردەکەوێ، کە ئەم بوكو زاوایە چۆن ڕەفتار لەگەڵ یەکتری دەکەن.

دانەری کتێبی (تحفة العروس) دەڵێ: (وا باشترە ئافرەت لە شەوی بوکێنیدا لە داوای زاوا زۆر ڕێگری نەکات. هەروەها هیچیشی تێدا نیە، گەر ئافرەت کەمێك قەدەغەی هاوسەرەکەی بکات بۆ ئەوەی جارێ جوت نەبێ، بەڵام زۆر قەدەغەکردن دەبێتە هۆی شکاندنی ئارەزوی جنسی پیاوەکە، لەوانەیە ئەو شکاندنی ئارەزوە لە یەکەم شەودا بۆ ماوەیەکی درێژ، ببێتە هۆی شکاندنی ئارەزوی جنسی ئەو پیاوە، لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر ئافرەتان زۆر ئاگاداری ئەم کارە بن!!.)

خاوەنی کتێبی (نثـر الدر) ئەبو فەرەج لە کتێبی (الأغاني)دا دەڵێ:
کاتێك بوکێکیان بۆ زاوایەك گواستەوە، کـە زاوا خەلیفەیـەك بـو، لـە ژورەکەدا قەرەوێڵەکەی لە تەنیشت قەرەوێڵەکەی داناو لەسـەری دانیـشت، پاشان بە ژنە تازەبوکەکەی گوت: یان تۆ بۆ من وەرە پێشەوە، یان من بـۆ تۆ دێمە پێشەوە! جا ژنەکەی هاتە لایو لەگەڵی دانیشت، جا پیاوەکە ئەو کڵاوەی لەسەری بو دایناو گوتی: پێت خۆش نیـە بەسـەری ڕوت و بـێمو (أصلع) من ببینی؟ ئەویش گوتی: من لـەو ئافرەتانـەم، کـە پـێم خۆشـە تەمەنی مێرد لە سی سـاڵی تێپـەڕیبێو سـەر ڕوت بـێ!! ئـەم پیـاوە بـە ژنەکەی گوت کە جلەکانی یەکە یەکە دانـێ؟ پاشـان پێـی گـوت: ئـەوەی عەورەتی داپۆشیوی ئەویش داکەنە. ئەویش گوتی: ئەوەیان خۆت ئەنجامی بدە، چونکە ئەوە کاری تۆیە. پیاوەکەش گوتی: ڕاست دەکەی، جا لەگەڵی جوت بو و پێك شاد بون.

بەبۆنەی باسکردنی ڕوت کردنەوەی ئافرەت بۆ جوتبون، یەکێك لە زانـا دەرونناسە ئافرەتەکان نـاوی (مـاری سـتۆب)ە دەیـەوێ ئـارەزوی کـچانی هاونەژادی خۆی دەربـبڕێو دەڵێ: (...پێویستە لەسـەر پیـاویش لـەکاتی جوتبونـدا خـۆی ڕوت بکاتـەوەدو جلـی لەبـەر نـەبێ، ئـەوەش شـتێکی سەرسوڕماو نیەو ئاسـاییە، کـە بەشـێوەیەکی ئاسـایی وردە وردە ئـەنجام بدرێ، بۆ ئەوەی ژنەکەی لە لای شتێکی غەریبو ناکـاو (مفاجـأ) نـەبێ!! چونکە بەهیچ جۆرێك دروست نیە، ژنەکـە ڕوت بـێو مێردەکەشـی جـلو بەرگی لەبەردا بێ، ئەوەش بۆ ئەوەی تاوەکو ئافرەتەکـە بەشـتێکی خـراپ لێکی نەداتەوە...).

لەوانەیە کەسێ هەبێو بڵێ: چۆن دەبێ ئافرەت خۆی ڕوت بکاتەوە؟ لـە

کاتێکدا کە پێغەمبەر دەفەرموێ: ((إذا جامع أحدکم زوجته أو جاريته، فلا ينظر الى فرجها، فإن ذلك يورث العمى)) واتە: گەر کەسێك لە ئێوە لەگەڵ خێزانەکەی جوت بو، با تەماشای (فەرجی) نەکات، چونکە بە هۆی تەماشاکردنی فەرجیەوە دوچاری کوێری دەبێت.

منیش وەڵامی ئەو کەسە دەدەمەوەو دەڵێم: ئەم فەرمودەیە بە زمانی پێغەمبەر ﷺ هەڵبەستراو (موضوع)ە وەك ئیمام ئیبن الجوزی لە کتێبی (الموضوعات)دا گوتویەتی ئەم حەدیسە موضوعە. بیروبۆچونی ڕاستو دروستیش ناڕاستیو بەتاڵی ئەم فەرمودە (موضوع)ە بەدەردەخات. چونکە گەر خوای گەورە ڕێگەی بەپیاو دابێ لەگەڵ خێزانەکەی جوت ببێ، ئایا ژیریو عەقڵ قبوڵ دەکات، کە تەماشاکردنی فەرج قەدەغە بێ؟! دەڵێین: نەخێر! ئەوەی ئەم قسەیەمان بۆ بەڕاست دەگێڕێو پشتگیری دەکات، فەرمودەکەی عائیشەیە، کە دەفەرموێ:

((منو پێغەمبەرﷺ پێکەوە خۆمان شتوە لەیەك مەنجەڵ دا، کە هەردوکمان دەستمان بۆ دەبرد، پێغەمبەر زوتر دەستی بۆ دەبرد بۆ ئەوەی ئەو زوتر ئاو بەخۆیدا بکات، تا من دەم گوت: بۆ منی لێگەڕێ... بۆ منی لێگەڕێ، لە کاتێکدا هەردوکیان لەشیان پیس (جنب) بوە))[1].

ئەوەی بە ظاهری لەو فەرمودەیە دەردەکەوێ ئەوەیە، دروستە پیاو تەماشای عەورەتی ژنەکەی بکات. ئەوەی پاڵپشتی دروستی تەماشاکردنی عەورەتی ئافرەت دەکات گێڕانەوەکەی ئیبن حبانە، کە لە ڕێگای سلێمانی کوڕی موساوە وەریگرتوە، کە دەربارەی تەماشاکردنی پیاو بۆ فەرجی ژنەکەی پرسیویەتیو گوتویەتی: لە عطام پرسی، ئەویش گوتی: لە

١) رواه البخاري وغيره.

عائیشەم پرسی، عائیشەش ئەم فەرمودەیەی باسکرد بە ماناکەی. حافظ لە کتێبی الفتح (١/٢٩٠) گوتویەتی: (دروستە پیاو تەماشای عەورەتی خێزانەکەی بکات، بە پێچەوانەشەوە ژنەکەش بۆی دروستە تەماشای عەورەتی پیاوەکەی بکات.)

لەوەوە دەردەکەوێ تەماشاکردنی عەورەت هیچ جیاوازی‌یەکی نیە، چ لەکاتی خۆشتن بێ، یان لەکاتی جوتبوندا، ئەو فەرمودەیەش، کە دەڵێ نابێ تەماشای عەورەت بکرێ بەدەرکەوت، کە بەتاڵەو ڕاست نیە. ئەم جۆرە فەرمودە لە کتێبی (الوضع)دا نوێ‌یە، کە دەڵێ: ((**لا تكثروا الكلام عند مجامعة النساء، فإن منه يكون الخرس والفأفأة**)). واتە: لەکاتی جوتبوندا لەگەڵ خێزانەکانتان زۆر قسە مەکەن، چونکە ئەو منداڵەی کە لەدایك دەبێ، کەڕو لاڵ دەبێ.

ئەم فەرمودەیە زۆر لاواز (ضعيف جداً)ە کە لە کتێبی (الأحاديث الضعيفة والموضوعة)(ج١ ج٢ ص٩٨)دا هاتوە. فەرمودەی زۆر لاوازیش کاری پێ ناکرێ تەنانەت لە (فضائل الأعمال)یشدا.

هەروەها فەرمودەیەکی تری لاواز (ضعيف) هەیە، کە دەڵێ: ((**إذا أتى أحدكم أهله فليستتر ولا يتجردا تجرد البعيرين**)). واتە: گەر کەسێ لە ئێوە چوە لای خێزانەکەی، با خۆی داپۆشێ‌و خۆیان لە جل‌و بەرگ دانەماڵن‌و وەك حوشتر خۆیان ڕوت نەکەنەوە.

ئەم فەرمودەیە بەیهەقی‌و نەسائی‌و غەیری ئەوانیش بە لاوازیان داناوەو دەڵێن: حەدیسێکی (منكر) خراپە. حەدیسی منکریش کاری پێ ناکرێ‌و وەرناگیرێ.

## لە شەوی زاوایی‌دا چی دەڵێی؟

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((إذا تزوج أحدكم امرأةً فليأخذ بناصيتها (أي بمقدم رأسها) ويُسَمِّ الله عَزَّوجلَّ، ولْيَدْعُ بالبركة وليقُل: اللهم إنّي أسألُك من خَيرها وخَيرِ ما جبلْتَها عليه وأعوذ بك من شَرِّها وشَرِّ ما جبلتَها عليه)) [١]، واتە: گەر کەسێك لە ئێوە ژنی هێناو گواستیەوە، با نێوچاوانی بگرێ‌و ناوی خوا بهێنێ‌و بڵێ: (بسم الله)، با دوعای خێرو بەرەکەتی بۆ بکات‌و بڵێ: خوایە من داوای خێرو خۆشی ئەو ژن هێنانەت لێ دەکەم‌و داوای چاکەو خێری خورەوشت‌و رەفتاری ئەو ئافرەتەت لێ دەکەم. خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لە خراپەی ئەو ئافرەتەو خراپی خورەوشت‌و رەفتاری.

١) رواه البخاري وأحمد وأبوداود والبيهقي وغيرهم.

## بەر لە جوتبون بوك و زاوا پێكەوە نوێژ دەكەن

عبداللەی كوڕی مەسعود ئامۆژگاری پیاوێكی كرد، كە كچێكی مارە كردبوو، پێی گوت: ((گەر شەوی زاوایی هاتە لات پێی بڵێ با دو ركات نوێژت لەگەڵ بكات و بڵێ: خوایە بەرەكەت بخەیە خێزانەكەم و منو، ئەوانیش بۆ من بكەی بە خێرو بەرەكەت. خوایە پێكەوەمان كۆبكەوە گەر بەو كۆبونەوەمان خێری تێدایە، لە یەكتریمان جیاكەرەوە، كاتێك ئەم لێك جیابونەوە خێری تێدابێ))[١].

گومانی تێدا نیە ئەم جۆرە ئاراستەكردنە، هەرچەندە دوعاو نوێژو دوعا بۆ مندالّی صالحە، بەلاّم لە ڕاستیدا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، كە لەم شەوەدا مەبەستی سەرەكی هاوسەرێتی تەنها ڕابواردن نیە، بەلكو بەجێهێنانی ئەركێكی ئایینییە بۆ مندالّ بون، كە هەر لە بچوكیانەوە مالّ ئاوەدان دەكەنەوەو لە تەمەنی گەورەیشیاندا خزمەتی دین و میللەتەكەیان دەكەن، كە ئەوەش بەهۆی پەروەردەكردنێكی ئیسلامیانەوە ئەنجام دەدرێ.

ئا بەم شێوەیە ئیسلام لەم شەوەدا ورەی ژن و مێرد بەرز دەكاتەوەو، چەمكی كردەی جنسی لە سەروی ئیعتباری لەزەتی ئاژەڵی دادەنێ، كە هۆیە، نەك مەبەست!

---

١) رواه أبوداود (حديث حسن).

## لە کـاتی جوتبـون پیـاو چ دەڵـێ

کاتێك پیاو دەچێتە لای خێزانەکەی پێویستە بڵێ:
((بسم الله، اللّهم جنّبنا الشَّيطانَ، وجنِّب الشَّـــيطان ما رزقتَنا))[1]، واتە: بەناوی خوا، خوایە شەیتانمان لـێ دور خەرەوەو، شەیتان دورخەرەوە لەودی، کە پێمان دەبەخشی.

هەروەها دەفەرموێ: ((فإن قضى الله بينهما ولداً، لم يضره الـــشيطان أبداً))[2]، واتە: گەر ئەم دوعایەی سەرەوە لـەکاتی جوتبونـدا بخوێنـدرێ، گەر منداڵیان ببێ، هەرگیز شەیتان ناتوانێ زەرەری پێ بگەیەنێ.

ئەم تەوجیهەی پێغەمبەرﷺ چەند جـوانو رێکـە داوای ئـەوە دەکـات، لەکاتی جوتبون دەست بکرێ بە ناوهێنانی خوا، تا دەرکەوێ کە ئامانج لە کرداری جنسی ئامانجێکی بەرزو داوێـن پاکییـە، بـە پێـچەوانەی هەنـدێ ئایینی تر، کە ئەم کردارە بـە پـیسو قێـزەون دادەنـێن، ئەمـەش لەگـەڵ فیتـرەتی ساغ تێك دەگیرێت.

١) رواه البخاري.
٢) رواه البخاري وغيره.

## باسکردنی نهێنی یەکانی جوتبون و ڕابواردن بۆ خەڵکی حەرامە

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللَّهُ﴾ (النساء- ٣٤)، واتە: ئەو ئافرەتانەی صاڵحەن، بەڕاستی ئەوانە گوێڕایەڵی فەرمانی خوان، ئەوانە ئەو نهێنی‌یانەی لەکاتی جوتبونی ژن و مێردا ڕو دەدات، دەیپارێزن و لای کەس نایدرکێنن و، باسی ناکەن، کە چۆن لەگەڵ هاوسەرەکانیان جوت دەبن.

لە ئەسمای کچی زەیدەوە، کە خۆی لەلای پێغەمبەرﷺ دانیشتوەو پیاوان و ئافرەتانیش دانیشتون، پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((لەوانەیە پیاو هەبێ، چی لەگەڵ خێزانەکەیدا دەکات باسی بکات! لەوانەشە ئافرەتی وا هەبێ، چی لەگەڵ پیاوەکەی دەکات لای ئافرەتان باسی بکات! ئەوانەی لەوێ بون بێدەنگ بون و، وەڵامیان نەدایەوە، ئەسما دەڵێ: منیش وتم: بەخوا ڕاستە ئەی پێغەمبەری خوا، ئافرەت و پیاو باسی ئەوە دەکەن.

پێغەمبەر فەرموی: ئەمە نەکەن! ئەمە وەك ئەوە وایە شەیتانی نێرە لە ڕێگادا بە شەیتانی مێ بگات و لەگەڵی جوت ببێ و خەڵك سەیری بکەن))[1].

بابزانین ئەو جۆرە کەسانەی باسی سەرجێیی لەلای خەڵك دەکەن، پێغەمبەر ﷺ بە خراپترین خەڵك (شرّ الناس)ی داناون.

ئەوەی جێگەی داخە هەندێك پیاو بۆتە نەریتیان لای هاوڕێکانیان باسی

---

١) رواه أحمد في المسند وله شواهد أخرى (حديث حسن).

جوانی ژنەکانیان دەکەن، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو کەسانەی باسی جوانی ژنەکەیان لەلا دەکرێ، حەز لەژنی باس کەرەکە بکەن، ئافرەتیش هەیە باسی چۆنیەتی سەرجێیی کردنی لەگەڵ مێردەکەی بۆ ئافرەتانی تر باس دەکات. بەڕاستی ئەوە کارێکی دور لە ڕەوشتی ئیسلامی‌یەو مایەی خەشمو تورەیی خوایە.

لە کتێبی: (المدخل للإمام أبي عبدالله محمد الشهير بابن الحاج) بەناوی ((آداب الرجل في الاجتماع بأهله))دا هاتوەو دەڵێ: گەر پیاو بیەوێ لەگەڵ ژنەکەی جوت ببێ، نابێ لە ماڵەوە یان لە ژورەکەدا کەسی تری، جگە لە ژنەکەی لێبێ.

باس کراوە عبداللەی کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ گەر بیویستایە لەگەڵ ژنەکەی جوت ببێ، ئەو ئافرەتەی شیری دەدا بە منداڵەکەی پێی دەگوت بچێتە دەرەوە.

ئەو کەسەی دەیەوێ لەگەڵ ژنەکەی جوت ببێ، بە ئارەزوی خۆیەتی چ کاتێك هەڵدەبژێرێ، لە سەرەتای شەو بێ، یان کۆتایی شەو، بەڵام بۆ جوتبون سەرەتای شەو باشترە، لەبەرئەوەی لەوکاتەدا ماوەی خۆ شوشتن زۆرە، بە پێچەوانەی کۆتایی شەو، کە کاتەکەی کەم دەمێنێ، بۆ ئەنجامدانی نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ، یان دواکەوتن یان لەدەست چونی نوێژی بەیانی.

لە ڕویەکی ترەوە لەمەڕ باش نەبونی جوتبون لە کۆتایی شەو، لەبەرئەوەیە، کە دوای خەوتن هەردوکیان دەمیان بۆن دەکا یان لوت بۆن دەکا، ئەم بۆن کردنەش دەبێتە هۆی لێك دورکەوتنەوەیان لە یەکتری.

ئایا نەت بیستوە پێغەمبەرﷺ نەهی کردوە کە پیاو لە ناکاو بچێتەوە

لای ژنەکەی، پێش ئەوەی ژنەکەی خۆی بۆ ئامادە بکات. لەبەر ئەوە نەهی کردوە هەتا ژنەکەی خۆی بۆن خۆش کات و قژی شانە بکات و ئامادە بێ، بۆ ئەوەی تا خۆشەویستی و بەزەیی لەنێوان یەکتری بەردەوام بێ.

پێغەمبەر ﷺ کاتێك کە لە سەفەر دەگەڕایەوە، ڕاستەوخۆ دەچو بۆ مزگەوت و نوێژی تێدا دەکرد، ئەوەش لەبەر چەند هۆیەکی بەسود لەوانە:

١- سەردانی کەعبەی پیرۆز، کە ماڵی خوایە تا ملکەچی بە روکعەو سوجدە بردن بۆ خوای گەورە بنوێنێ.

٢- تا هاوەڵە بەڕێزەکانی بەشیان هەبێ لە بینینی پێغەمبەرو سەلام کردنیان لێی.

٣- بۆ ئەوەی خێزانەکانی بۆ پێشوازیکردنی پێغەمبەر ﷺ ئامادەیی خۆیان وەرگرن.

٤- زۆرجار بەهۆی ئەوەی، کە یەکێك لە سەفەردا بوبێ، یان لێی دور بکەوێتەوە، پاشان لەناکاو بچێتەوە ماڵەوە لەوانەیە لە خۆشی و شادیان ژنەکەی لەهۆش خۆی بچێ و ببورێتەوە، یان لە خۆشیا بمرێ.

لەبەرئەوە پێویستە ئەو کەسەی دەیەوێ لەگەڵ خێزانەکەی جوت ببێ دەبێ خۆی لەو شتانە بپارێزێ، کە خەڵکی ڕەشۆکی (عەوام) دەیکەن، لە کاتێکدا کە نەهی لێ کراوە، ئەویش جوتبون لەگەڵ خێزانە، کە هێشتا خۆی ئامادە نەکردوە. بەڵکو دەبێ گەمەوگاڵتەی لەگەڵ بکات و ماچی بکات، هەر کە بینی ژنەکەی ئامادەیی جوتبونی هەیە ئەو کاتە جوت ببێ. حیکمەتی شەرعی خوا گەورەش لەوەدا دیارە، ئەویش ئەوەیە، کە پیاو چی لە ئافرەت پێ خۆشە، ئافرەتیش بەهەمان شێوە حەز بەهەمان شتی پیاوەکەی دەکات. کاتێك پیاو بەبێ هیچ پێشەکی‌یەك دەچێتە لای

ژنەکەی، وەك ماچ‌و لاواندنەوەو قسەی خۆش، ئەو کاتە پیاوەکە جنسی خۆی تێر دەکات‌و ئافرەتەکەشی بە جنس تێر نەبویی دەمێنێتەوەو بە (معلق)ی ئەمێنێتەوەو، ناتوانێ ئایینەکەی بەچاکی بپارێزێ‌و لەوانەیە سەر بۆ خراپە بکێشێ.

پێویست(واجب)ـە گەر پیاو کاری جنسی خۆی بەجێ هێنا پەلە لەوە نەکات، کە لەسەری هەڵسێ‌و بەجێی بهێڵێ، چونکە ئەم هەڵسانە سەر لە ئافرەتەکە تێك دەدات‌و دڵەڕاوکێی توش دەکات. بەڵکو دەبێ پیاوەکە هەڵنەستێ، تا ئەوکاتەی، کە دڵنیا دەبێ ژنەکەی پێویستی جنسی تێر بوەو، گەیشتۆتە چێژو خۆشی. لەبەر ئەوە هەر کەسێك لەم مەسەلەیە کەمتەرخەمی بکات ئەوا لەلای خوای گەورە بەرپرسیار (مسؤول) دەبێ‌و تاوانبار دەبێ.

لەکاتی جوتبوندا پێویستە مسوڵمان نیازو مەبەستی پێ ئەوەبێ، کە منداڵیان ببێ بۆ زیادکردنی مسوڵمانان‌و، ببێتە یەکێ لە زانا چاکەکان. ئەو کەسەش دەیەوێ جوتبونەکەی دوبارە بکاتەوەو، خۆشی نەشۆردبێ، بەر لەوەی دوبارە جوت ببێتەوە با (زەکەری) بشوات.

قاضی عیاض ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (بۆیە باشترە پیاوە، زەکەری بشوات، چونکە شوشتنی زەکەر، ئەو ئەندامە بەهێزو چالاك دەکات...)[١].

وای بەباش دەزانم کاتی جوتبون بە کەمێك پاش نوێژی بەیانی ئەنجام بدرێ، چونکە لەو کاتەدا ژن‌و مێرد هەردوکیان لەش‌و فکریان حەساوەیە، پاش جوتبونەکەیان چی تێدا نیە گەر کەمێکیش بخەونەوە، چونکە خۆشیەکی زۆری تێدایە!

---

١) ص ٢/٣٣-٣٥ باختصار.

## دوای مانگی هەنگوین

کچێك تازە شوی کردوە، نامەیەك بۆ دایکی دەنێرێ، زۆر ئامۆژگاری‌و وتەی خۆشی لەخۆ گرتوەو دەڵێ:

{دایەگیان... دوای ئەوەی مانگی هەنگوینمان بەسەر برد ئەمڕۆ گەڕامەوە ماڵەکەمان، بۆ ئەو خانوە بچوکەی، کە مێردەکەم دروستی کردوە.. دایکە گیان! ئاواتەخواز بوم لەلام بای، تا هەمو شتێك لە ژیانی ئەزمونی نوێم لەگەڵ هاوسەرەکەمدا بۆت باس بکەم..

هاوسەرەکەم پیاوێکی باشەو منی خۆش دەوێ، منیش ئەوم خۆش دەوێ، بەڵام هێشتا لە سروشتی ئەو ڕانەهاتوم، هەندێك جار وا هەست دەکەم چەندەها ساڵە دەیناسم.. هەندێ جاری دیش وا هەست دەکەم لەمن نامۆیە.. ئەوەی لەتوانام دایە بۆ رازی کردنی دەیکەم.

دایەگیان! دڵنیابە هەمو ئامۆژگاریەکانت جێبەجێدەکەم.. بەتایبەتی ئەو ئامۆژگاریەی، کە خەندەو فرمێسکەکانت ئاوێتە ببون، بەردەوام هەر لەیادمە.. هەر وشەیەکت بە گوێمدا چرپاندبێ لەیادمە، بەتایبەتی، کە لە شەوی گواستنەوەمدا منت بە سینگی سۆز ئامێزتەوە گوشیبو.

گشت وشەیەکم لەیادەو لەیادم نەچوە.. من لە روانگەی تۆوە تەماشای ژیان دەکەم.. تۆ نمونەی بەرزی منی.. منیش دەمەوێ وەك تۆ بم، تۆ چۆن بوی بۆ باوکە باشەکەم‌و بۆ ئێمەی رۆڵەت منیش وادەکەم.. بەڕاستی هەمو سۆزو خۆشەویستیت بە ئێمە بەخشیبو، ماناو چۆنیەتی پێکەوە ژیانت فێرکردین.. تۆوی خۆشەویستیت تێدا چاندین..

دوێنی پیرۆزباییەکەی بەرێزتم پێگەیشت، کە بە بۆنەی گواستنەوەمت

ناردبو.

دایەگیان! کاتێك دەخوێندەوە فرمێسکەکانم هۆن هۆن دەهاتنە خوار، لە خوێندنەوەی هەر وشەیەك گوێبیستی دەنگەکەت دەبوم، شتێك هەیە کە لێی بێبەش بوم، ئەویش ماچە سۆز ئامێزەکەتە، کە لەسەری راهاتبوین، ئەوە تازە لە چێشت ئامادەکردن بومەوە، هاوسەرەکەم هێندەی نەماوە بگەڕێتەوە.

دایەگیان! هیچ خەمت نەبێ، ئەوە من بومەتە چێشت لێنەرێکی کارامەو بەباشی دەزانم چێشت دروست بکەم، کاتێك دەبینم مێردەکەم خواردن بە حەزو ئارەزووەوە دەخوات، ئەو خواردنەی کە خۆم بە دەستەکانم بۆیم لێناوە، هەست بە بەختەوەری و شادی دەکەم، کە لە خواردنەکە دەبێتەوە، سوپاسم دەکات لەسەر ئەو خواردنە خۆشەی، کە خواردویەتی.

دایەگیان! لەبیرت نەچێ من قوتابی تۆم، تۆ فێری چێشت لێنانت کردم، تۆ فێرت کردم، کە کورتترین رێگا، کە لێیەوە بچیتە ناو دڵی پیاوەوە" گەدەیەتی.. ئەوە گوێم لە دەنگی کردنەوەی دەرگایە، بەڵێ، ئەوە هاوسەرەکەمە هاتەوە.. ئەوە دەیەوێ ئەو نامەیەی، کە بۆ تۆی دەنوسم بخوێنێتەوە.. دەیەوێ بزانێ چ بۆ دایکم دەنوسم.. دەیەوێ هاوبەشی ئەو ساتە خۆشانە بکات، کە من بە گیان و فیکرم لەگەڵ تۆی بەسەر دەبەم.. داوام لێدەکات لە نامەکە شوێنێکی بۆ بەجێبهێڵم، تا شتێکیت بۆ بنوسێ.

دایەگیان! دەستەکانت ماچ دەکەم.. دەستی باوکم ماچ دەکەم.. چاوی براو خوشکەکانم ماچ دەکەم.. خوا حافیز.

{کچی خۆشەویستت} (١)

---

١) لەگۆڤاری (العربی) وەرگیراوە.

## کـاتی بەیـانی زاوا چ دەکـات

لەسەر زاوا پێویستە، کە بەیانی داهات سەلام لەو خزمانە بکات کە لە ماڵەکەیدان سڵاویان لـێ بکات، دەبێ ئـەوانیش بەهـەمان شـێوە ڕەفتـار بکەن.

((أَوْلَمَ رسول الله ﷺ إذ بنـــى بزينب فأشبع المسلمين خبزاً ولحماً، ثم خرج الى أمهات المؤمنين فسلَّم عليهن، ودعا لَهُنَّ وســلَّمن عليــه ودَعْون له، فكان يفعل ذلــك صــبيحة بنائــه))[1]، واتـە: لەوکاتـەی پێغەمبەرﷺ زەینەبی گواستەوە دەعوەتی مسوڵمانانی کرد، کە چێشتەکە نانو گۆشت بو، جا مسوڵمانانی تێر نانو گۆشت کرد. کە بـەیانی داهـات چوە لای خێزانەکانی تریو سەلامی لـێکردنو دوعای بۆ کردن، ئـەوانیش سەلامیان لـێ کردو دوعای بەخێریان بۆ کرد.

١) رواه النسائي (صحيح).

## چۆن پیاو دەچێتە لای خێزانەکەی؟

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ﴾ (البقرة- ١٨٧)، واتە: لە شەوی ڕەمەزان دا حەلاڵە بۆ ئێوە لەگەڵ ژنەکانتان جوت ببن. ژنەکانتان بۆ ئێوە وەك پۆشاك وان[١]، ئێوەش بۆ ئافرەتان وەك پۆشاك وان.

هەروەها دەفەرموێ:﴿نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾

---

١) کینایەیە بۆ پێکەوەنوسانو تێکەڵ بون، ئیبن عەباس دەربارەی ڕاڤەی ئەمە گوتویەتی: واتە ئافرەتان سوکنایی دڵتانو ئێوەش سوکنایی دڵی ئەوانن.. کەسانی تریش گوتویانە: ژنو مێرد وەك پۆشاك وان بۆ یەکتری، کە بە پێستیانەوە دەنوسێ، بۆیە جوتبونیان بە ڕوتی بە پۆشاك ناوزەد کراوە.

زەجاج گوتویەتی: عەرەب بە ژن دەڵێن پۆشاكو کراس.. گوتراویشە: پۆشاکی پیاو ئەودیە، کە دایپۆشێ، بەپێی ئەم مانایە هەندێ لە شەرع ناسان رایان وایە، کە بار (وضعیة)ی ڕاست بۆ جوتبون پاڵخستنی ژنە!

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ هەر ئەم بارە بەکاربهێنرێ! بەڵکە قورئان چەند بارێکی تری باس کردوە، کە پێویستە لەسەر ژنو مێرد کامە باریان حەز لێیە ڕاشکاوانە بە یەکتری بڵێن، چونکە نوێکاری لە جوڵەو بارەکان، خۆشی خۆی هەیە.

پزیشکێك گوتی: (ژنێك بۆی باس کردم کە لەژێر قورسایی مێردەکەی هەرهێندە نافلیقێتەوە، هەر دەڵێی فیلە، هەر هێندەی نامێنێ بخنکێ!!ئەم دێوەزمە هەراسانکەرەی لەکۆڵ نابێتەوە، مەگەر دوای چەند کاتێك لە هەر جوتبونێکدا! ئەمەش لەبەر ئەوەی مێردەکەی باری خۆی ناگۆڕێ، وادەزانێ ئەمە ئەو بارە سروشتییەیە، کە شەرع ڕێی پێداوە.. ئەوەی کە قورەکەی خەستتر کردوە ئەوەیە، کە نازانێ پێویستە لەسەری قورسایی خۆی بخاتە سەر هەردو دەستەکانی، نەك لەسەر جەستەی خێزانەکەی!! ئا لەم حاڵەتەدا کە پیاو قەڵەو بێ، پێویستە ژنەکە بچێتە سەر پیاوەکە، ئەمجۆرە بارەش هیچ حەرام نیە.

(البقرة- ٢٢٣)، واتـە: ژنـەکانتان وەك کێلگـەوان بـۆ ئێـوە، ئێـوەش بـە ئارەزوی خۆتانە، چۆن دەچنە ئەو کێلگەیە، جا لـەپێش بـێ یـان لـەپاش، بەڵام لە شوێنی منداڵ بون واتە (فەرج).

جابر رەزای خوای لـێ بێ دەڵێ: جولەکەکان دەیانگوت: گـەر پیـاو بـۆ جوتبون لەپاشەوە بچێتە لای ژنەکەی لە ڕێی پێشەوە (فەرج)یدا، ئەوا ئەو منداڵەی لەدایك دەبێ خێلو شەل دەبێ. بەڵام خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾. پێغەمبەرﷺ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرموی: گەر جوتبون لە پێشەوە بێ یان لە پاشـەوە بـێ بـە مەرجێ لە ڕێگەی (فەرج)ەوە بێت دروستو حەڵاڵە.

ئافرەتێك لە ئوم سەلمە دەربارەیئەو پیاوە پرسیاری کرد، کەدەچێتە لای ژنەکەی بۆ جوتبون، کە لە حاڵەتی داهاتنەوە (رکوع)، یـان لەسـەر ئـەژنۆ دانیشێو سەری لە زەوی بدات. ئوم سـەلمە ئـەم پرسـیارەی لـە پێغەمبـەر کرد، کە ئایا ئەوە گوناهە؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: ﴿نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾ [١].

ئیبن عەباس گوتویەتی: ئەم ئەنصارانەی کە بت پەرست بون لەگەڵ ئـەو جولەکانەی، کە خاوەن کتێبن، وایان دەبینی کە بەهۆی زانـستەوە فـەزڵیان بەسەریاندا هەیـە، ئـەوانیش زۆر بـە کـردەوەی ئـەوانیان دەکـرد، خـاوەن کتێبیش کاریان وابو گەر لەگەڵ ئافرەتەکانیان جوت ببـان، تـەنها لەسـەر لاتەنیشت لەگەڵیان جوت دەبون، ئـەم قورەیـشیانەش ئافرەتـەکانیان پـاڵ دەخست، ئینجا چێژیان لـێ وەردەگرتن، لەپێشەوە با یان لە دواوە با.

کاتـێ موهاجیرەکـان هاتنـە مەدینـە، پیاوێکیـان ژنێکـی ئەنـصاری

---

١ ) حدیث صحیح.

مارەکردو گواستیەوە، جا بەم شێوەیە لەگەڵی جوت بو، ئەویش نارەزایی دەربڕی‌و گوتی: ئێمە لەسەر باری لاتەنیشت لەگەڵمان جوت دەبون، یا ئاوا دەکەی، یان لێم دورکەوە!

هەواڵەکەیان گەیشتەوە پێغەمبەری خواﷺ، خوای گەورەش ئایەتی ﴿نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾ی دابەزاند، واتە بچنە لای خێزانەکانتان لە پێشەوە یان لە دواوەو بە پاڵکەوتنەوە، واتە لەڕێی شوێنی منداڵبونەوە..[١]

---

١) رواه أبوداود والحاكم وصححه، و وافقه الذهبي وهو كما قالا.

## دەست کەوتنی خێرو پاداشت لەکاتی جوتبوندا

لەوکاتەی پیاو لەگەڵ خێزانەکەی جوت دەبێ خێرو پاداشتی بۆ دەنوسرێ بەو مەرجەی هەردوکیان نیازی داوێن پاکی‌و خۆپاراستن لە خراپەیان هەبێ.

ئەبو زەری غەفاری دەڵێ: ((إن ناساً من أصحاب النبي ﷺ قالوا للنبّي: يا رسول الله ذهب أهل الدثور بالأجور، يُصَلُّون كما نُصلي، ويصومون كما نصوم، ويتصدقون بفضول أموالهم. قال: أو ليس قد جعل الله ما تصَّدَّقون؟ إن بكل تسبيحة صدقةً، وبكل تكبيرة صدقةً، وبكل تهليلة صَدَقَةٌ، ونَهْيٌ عن المنكر صدقةٌ، وفي بُضْع أحدكم صدقةً.

قالوا يا رسول الله أيأتي أحدنا شهوته ويكون له فيها أجر؟!

قال: أرأيتم لو وضعها في حرام، أكان عليه وزر؟ قالوا: بلى. قال: وكذلك اذا وضعها في الحلال كان له فيها أجر، وذكر أشياء... صدقة، صدقة.

ثم قال: ويُجْزِئُ مِن هذا كله: ركعتا الضحَى))(١).

واتە: ئەبو زەر دەڵێ: هەندێك لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ بە پێغەمبەریان فەرمو: ئەی پێغەمبەری خوا دەوڵەمەندەکان بەهۆی ئەوەی پارەدارن بۆ خۆیان بردویەتیانەوەو پاداشتیان بۆ دەنوسرێ، لەگەڵ ئەوەی ئێمە نوێژ دەکەین، ئەوانیش نوێژ دەکەن، ئێمە بەرۆژو دەبین، ئەوانیش بەرۆژو دەبن، بەهۆی ماڵو سامانیان خێرو سەدەقە دەکەن.

---

١) رواه مسلم والنسائي.

پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەدی خوای گەورە شتی وای بۆ دانەناون، کە بە سەدەقەو خێر بۆتان بنوسرێ؟ هەر (سبحان الله)یێك دەخوێنن بەخێر بۆتان دەنوسرێ، هەر (الله أكبر)یێك دەخوێنن بەخێر بۆتان دەنوسرێ، هەر تەهلیلەیەك واتە (لا الـه الا الله) بەخێرو سەدەقە بۆتان دەنوسرێت، هەروەها ڕێگری کردن لە خراپەکاریەك بە خێرو سەدەقە دەنوسرێ. کاتێك لەگەڵ خێزانەکانتان جوت دەبن خێرو پاداشتان بۆ دەنوسرێ.

هاوەڵەکانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا گەر ئێمە لەگەڵ خێزانەکانمان جوت بین بە خێرو پاداشت دادەنرێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: گەر ئەو شەهوەتو ئارەزوە لە شتێکی حەرام سەرف بکرێ، ئایا بۆی بە تاوانو گوناهـ نانوسرێ؟ ئەوانیش گوتیان: بەڵێ وایە. فەرموی: کەواتە گەر لە شتێکی حەڵاڵ سەرف بکرێ بە خێرو پاداشت بۆی دەنوسرێ. باسی چەند شتێکی کرد...کە بە خێرو سەدەقە دادەنرێ.

پاشان پێغەمبەرﷺ فەرموی: لە هەمو ئەوانە زیاتر پاداشتی بۆ دەنوسرێ دو رکات نوێژی چێشتەنگاو (الضحى)یە.

جا ئەو تەوجیهە بەرزو گەورەیەی، کە هانی مسوڵمانان دەدات بۆ ژن هێنانو شوکردنو ڕێزگرتنو سۆز نواندن لەگەڵ ئافرەت لە کوێو، ئەو ئایینە دەست لێ دراوە لەکوێ، کە ئافرەت بە خراپەکار دادەنێو ژن هێنان بە شتێکی پیس لە قەڵەم دەداتو، هانی خەڵکی دەدات بۆ خەساندنو وازهێنان لە ژن هێنان!!

ئەم ڕێبازە بەرزە لەکوێ لەچاو هەندێ شەریعەتی تر، کە مەسەلەی جنس بە گوناهو تاوانو قێزەونی تەنانەت شەیتانیش دادەنێن! ئەنجامی ئەمەش — لە بەرامبەر هێزی غەریزەی جنسی هەڵچو- ئەوەیە یا بە

تەواوی لـێی دوربکەوتەوەو قەدەغە بکـرێ کـە دەبێتـە مایـەی ڕێزپـەڕی (شـذوذ)و خەفەکردن، یان توانەوەو نقوم بون لە لیتاوی جنس بەڕێی حەرام، هەروەك ئەمڕۆ لە ڕۆژئاوا ڕودەدات.

کارەکە هەر بەوەندە کورت هەڵنەهاتوە، بەڵکە ڕۆژئاواییـەکان بـەپێی بیروڕایان، ئافرەت بـە شـەڕو خراپـە دادەنـێن، لەبەرئـەوەی دایکـە حـەوا هاوکاری شەیتانی کردوە لە فریودانی ئادەم، تـا درەختـە قەدەغەکراوەکـە بخوات، کە بوە مایەی ڕودانی یەکـەم گونـاهو تـاوانو، بـۆ کـچەکانی بـە میرات مایەوە.

کەچی قورئان رادەگەیەنێ شەیتان خوتخوتەی ئادەمو حەوای بەیەکەوەدا، خوای گەورەش تەوبەی لـێ قبوڵ کردنو لێیان خـۆش بـو، ڕایگەیانـد کـە گوناهو تاوان بە بۆماوە بەجێ نامێنێ! خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ کەس تاوانی کەس هەڵناگرێ، لـە تـەوراتیش هـاتوە: (باوکان بەهۆی تاوانی ڕۆڵەکانیان ناکوژرێن، هەروەها ڕۆڵـەکانیش بـەهۆی تاوانی باوکان ناکوژرێن، هەرکەسەو بەهۆی تاوانی خۆی دەکوژرێ!).

ئیمام (ابن قیم) ڕەحمەتی خوای لـێبێ گوتویەتی: پێغەمبـەرﷺ هـانی داوە ئەم دەرمانە سەرجێی (جوتبون) بەکاربهێنرێو، هانیـشی داوە پیـادە بکرێو پاداشتی لەسەر پەیوەست کردوەو کردویـەتی بـە خێـرو سـەدەقەی بکەرەکەی!!

لەوەی کە باسکرا بۆمان دەردەکەوێ خواپەرستیو بەندایەتی لە ئیسلام هـەر لـە نوێـژو ڕۆژو کـورت هەڵنـەهاتوە، وەك مامۆسـتا (محمـد أسـد) گوتویەتی، هەروەها ئیسلام لە هەمو بوارەکانی ژیانی مرۆڤ بە عەمـەلی دەکۆڵێتەوە.

## ئەو کەسەی لە ڕۆژی هەینی لەگەڵ هاوسەرەکەی جوت ببێ، پاداشتی بۆ دەنوسرێ

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((من إغْتَسل يوم الجمعة غُسْلَ الجنابة، ثم راحَ فكأنما قرَّبَ بُدنَةً، ومن راح في الساعة الثانية: فكأنما قرَّب بقرةً، ومن راح في الساعة الثالثة: فكأنما قرَّب كبشاً أقرنْ ومن راح في الساعة الرابعة: فكأنما قرَّب دجاجة، ومن راح في الساعة الخامسة: فكأنما قرَّب بيضة، فاذا خرج الإمام حضرت الملائكة يستمعون الذِّكْر))[1]، واتە: هەر کەسێك لە ڕۆژی هەینی دا خۆی بشوات و خۆشتنەکەشی لەبەرئەوە بێ، کە لەگەڵ خێزانەکەی جوت بوەو پاشان بۆ نوێژی هەینی بچێتە مزگەوت ، ئەوە وەك ئەوە وایە، کە حوشترێکی کردبێتە قوربانی، هەر کەسێك لە سەعاتی دوەم بۆ نوێژی هەینی بچێتە مزگەوت وەك ئەوە وایە، چێلێکی کردبێتە قوربانی، هەر کەسێك لە سەعاتی سێیەم بۆ نوێژی هەینی بچێتە مزگەوت وەك ئەوە وایە، کە مەڕێکی کردبێتە قوربانی، هەر کەسێك لە سەعاتی چوارەم بچێتە مزگەوت، وەك ئەوە وایە مریشکێکی کردبێتە قوربانی، هەر کەسێك لە سەعاتی پێنجەم بچێتە مزگەوت وەك ئەوە وایە هێلکەیەکی کردبێتە قوربانی. کاتێکیش ئیمام دەستی کرد بە وتاردان، فریشتەکان ئامادەی یادی خوا دەبن.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((من غَسّلَ يوم الجمعة وإغتسل،

---

١) رواه حافظ العراقي وغيره.

وبكّر وإبتكّر، ومشى لم يركب، ودنا من الإمام، واستمع ولم يَلْغُ، كان له بكل خطوة عَمَلُ سنة، أجْرُ صيامها، وقيامها))[1]، واتە: هەر کەسێك لە ڕۆژی هەینی خۆی بشوات‌و زو بچێتە مزگەوت بۆ نوێژی هەینی‌و بە پیادە بڕوات‌و بەبێ سواری‌و، لە ئیمام نزیك ببێتەوەو، گوێ لە وتاری هەینی بگرێ‌و قسە نەکات، ئەوا بۆ هەر هەنگاوێکی دەیهاوێژێ بەقەد کردەوەی باشی ساڵێکی ڕۆژو و شەونوێژی بۆ دەنوسرێ.

کەمترین سنوری جوتبون لەگەڵ خێزاندا یەك جارە لە هەفتەیەکدا، ئەوەش بە گوێرەی کەس‌و تەمەن لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕدرێ، نابێ لە هەفتەیەکدا دو جار زیاتر بێ -جگە لە ماوەی مانگی هەنگوینی (شهر العسل)! پێوستە لە تەمەنی شەست ساڵی جوتبون کەم بکرێتەوە، زۆر جیماع کردنیش دەبێتە هۆی زەرەرو زیانی جەستەو داتەپینی عەقڵ‌و لەکارخستنی عەقڵ‌و ژیری.

هەروەها زۆر کەمکردنی جوتبون دەبێتە هۆی خەفەو لەکارخستنی غەریزەی جنسی، سەرەڕای ئەمەش دەبێتە هۆی سەرنەکەوتنی ژیانی هاوسەرایەتی‌و پچڕانی شیرازەی ئەم پەیوەندیە.

لە ڕاستیدا ئافرەتی لێزان‌و شارەزا بەهۆی کارامەیی‌و ڕوخۆشی‌و جوانی‌و ڕازاوەیی، دەتوانێ تەرازوی مام ناوەندی جوتبون ڕاگرێ‌و هەوڵی پاراستنی گەنجیەتی خۆیی‌و مێردەکەی بدات بەبێ زیادەڕۆیی کردن.

ئەم ئاراستەکردنە بەرزو جوانەی ئیبن الجوزی چەند جوانە، کە دەڵێ: پێویستە لەسەر کوڕی پێگەیشتو (گەنج) ئاگاداری ئەوەبی، کە زۆر جوتبون

---

١) رواه أبو داود والنسائي والبيهقي (صحيح).

ـەکات، تا ناوەڕۆك و کرۆکی بهێنێتەوە چونکە سودی بۆ کاتێك هەیـە، کـە تەمەنی گەورە دەبێ و بەساڵا دەچێ.

ئەو کەسەی تێگەیشتوو دیندارە، با بزانێ چێژ و خۆشی بە نزیك بونـەوە لە هاوسەر بەدی دێت، نزیکبونەوەش بـە ماچـکردن و ئـامێزگرتن ئـەنجام دەدرێ و خۆشەویستی بەهێزتر دەکـات، بـەڵام جوتبـون خۆشەویـستی کـەم دەکاتەوە و چێژ و خۆشی و شـادی ناهێڵـێ. ئـەوەی لـە مەبەسـتی جوتبـون تێگەیشتبم، بۆم دەرکەوتوە مانایەکی سەرسوڕهێنەری هەیـە کـە لـە زۆر خەڵك شاراوەیە، ئەویش ئەوەیە گەر نـەفس عەشـقی ئافرەتێـك بـو پێـی خۆشـە لێی نزیك ببێتەوە، ئینجا لـە ئـامێزی دەگـرێ، ئەمـەش ئەوپـەڕی نزیك بونەوەیە، پاشان ڕومەتی ماچ دەکا، پاشان داوای نزیك بونەوەی ڕۆح دەکات، جا ئەو کاتە دەم ماچ دەکا. پێغەمبەر ﷺ عائیشەی خێزانی لـە ئامێز دەگرت و ماچی دەکردو زمانی دەمژی (فەرمودەی زمـان مـژین بـە سەنەد -صحيح- نیە، بەڵام لە ماناو واتادا وارد بوە). گـەر نـەفس داوای زیاترکردنی نزیك بونەوە بکات ئەوا جوتبون ئەنجام دەدرێ[١].

ئیمام ئیبن القیم دەڵێ: زۆر جوتبون دەبێتە هـۆی کـەم بونـەوەی هێـز، هەروەها زیان بە دەمارەکان دەگەیەنێ و مرۆڤ دوچاری لەرزۆکی و گرژبـون (تشنج) دەکات، هەروەها دەبێتە هۆی بێهێزی و لاوازی چـاو، هێزەکـانی لەش و گەرمایی غەریزەکان کەم دەکاتەوە.

لەبارترین و بەسودترین کات بـۆ جوتبـون دوای هەرسـکردنی خواردنـە. نابـێ لـەکاتی برسـیەتیدا جوتبـون ئـەنجام بـدرێ، چـونکە دەبێتـە هـۆی بێهێزی و لاوازی گڕو تینی ئارەزوی جنسی، هەروەها نابێ لەسەر تێربوندا

١) صيد الخاطر للإمام ابن الجوزي .

جوتبون بکرێ، چونکە دەبێتە هۆی دوچاربون بە نەخۆشی. نابێ کاتی ماندوبون‌و نائارامی دەرون، وەك هەبونی خەم‌و دڵ توندی‌و زویری‌و، هەروەها لەکاتی ئەوپەڕی خۆشی‌و شادی، جوتبون ئەنجام بدرێ.

لەبەرئەوە باشترین کاتی جوتبون ئەوەیە، کە ماوەیەکی زۆر تێپەڕیبێ، ئەگەر ڕێکەوتی هەرسکردنی خواردن بکات، ئنجا خۆی بشوات یان دەستنوێژ بگرێ پاشان بخەوێ، ئەو کاتە هێزو توانای لەش دەگەڕێتەوە دۆخی جاران. دەبێ ئاگاداری ئەوەش بێ لەدوای ئەنجامدانی جوتبون وەرزش نەکا، چونکە زەرەرو زیانی زۆری هەیە.

## جوتبـون له ڕێی كۆمـه‌وه حـه‌رامه

خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ وَقَدِّمُوا لأَنفُسِكُمْ وَاتَّقُوا اللهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ مُلاَقُوهُ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ﴾(البقرة-٢٢٣)، واته: ژنه‌كانتان كێڵگه‌ی خۆتانن، له‌هـه‌ر كوێـوه ده‌تانـه‌وێ بـچنه كێڵگه‌ی خۆتانه‌وه [١] تووێشویه‌كیش وه‌پێش خۆ خه‌ن، ده‌بێ له خوا بترسن، بیشزانن له‌گه‌ڵ خوا ڕوبه‌ڕو ده‌بن، مژده‌ش بده به بڕواداران.

پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رموێ: ((لا ينظر اللهُ الى رجـــلٍ يـأتي امرأتَهُ في دُبُرها))[٢]، واته: خوای گه‌وره ته‌ماشای ئه‌و پیاوه ناكات، له ڕێی كۆمـه‌وه له‌گه‌ڵ ژنه‌كه‌ی جوت ببێ.

هه‌روه‌ها ده‌فه‌رموێ: ((مَنْ أتى حائضاً أو إمـرأةً في دُبُرهـا، أو كاهنـاً فصدَّقهُ بـما يقول: فقد كفر بما أُنزِلَ على محمد))[٣]، واته: هه‌ر پیاوێـك

---

١) یه‌كێ له ڕاڤه‌كاران گوتویه‌تی: مانای ئه‌م ئایه‌ته ئه‌وه‌یه، كه ژنه‌كانی ئێوه، نه‌ك ژنانی كه‌سانی تر، كه ته‌نها بۆ ئێوه‌ن، كه‌واته په‌یوه‌ندیه‌كه له بازنه‌یه‌كی شه‌رعی ڕێگه‌پێدراوو وه‌رگیراو له په‌یوه‌ندی ڕۆحی‌و گرێبه‌نـدی شـه‌رعی نێـوان پیـاوو ژن ده‌سـوڕێته‌وه، جـا پێویسته ئه‌مه له چوارچێوه‌ی ئه‌م سنوره شه‌رعیه مه‌شروعه بێته كایه‌وه، له‌به‌ر ئه‌مـه قورئان بانگێشته‌ی هاوسه‌رگرتن ده‌كات و، بانگێشه‌ی وه‌دورخستنه‌وه‌ی زینا ده‌كات.

پاشان قورئان وه‌سفی ژن ده‌كات، كه كێڵگه‌ی مێرده‌كه‌یـه‌تی‌و شـوێنی منـداڵ بونـه‌و زه‌ویه‌كی به‌پیته بۆ شین بون.. ئه‌م وه‌سفه قورئانیه وێنه‌ی زه‌ویـه‌كی ئامـاده‌كراو پیـشان ده‌دات، كه جوتیار ده‌یكێڵێ، پاشان تـۆوی پێـدا ده‌كـات بـۆ وه‌بـه‌رهێنان، كـه بـژاری ده‌كات‌و پوش‌و په‌ڵاشی لـێ لاده‌دات، هه‌تا به‌روبومێكی جوان بێته كایه‌وه.

٢) رواه النسائي (صحيح).

٣) رواه أبوداود والنسائي والترمذي والبيهقي (حديث صحيح).

لەکاتی حەیزی ژنەکەی بچێتە لای بە نیازی جوتبون، یان بە ڕێی کۆمەوە جوت ببێ، یان هەرکەسێك بچێتە لای فاڵ گرەوەیەك[١] یان قاوەگرەوەیەكو بڕوای پێ بکات، ئەوا ئەو کەسە بڕوای بەو قورئانە نیە کە بۆ پێغەمبەر هاتۆتە خوارەوە، واتە پێی کافر دەبێ.

((جاء عمر بن الخطاب الى رسول اللهﷺ فقال: يا رسول الله هلكتُ! قال: وما الذي أهلكك؟! قال: حوَّلتُ رَحلي الليلة! فلم يرد عليه فأوحى الله الى رسول الله ﷺ هذه الآية: ﴿نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾، يقول أقبل وأدبر، واتّق الدبر والحيضة))[٢]، واتە: عومەری کوڕی خەتتاب هاتە لای پێغەمبەرﷺ و فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا بەهیلاك چوم!

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: چ شتێکت کردوە، بەهیلاکت ببات؟

عومەریش گوتی: ئەمشەو شێوەی چونە لای خێزانەکەم گۆڕیوە! واتە: لە دواوە چۆتە لای خێزانەکەی بۆ جوتبون بەلاّم بە ڕێگای (فەرج)ەوە (شوێنی منداڵ بون).

پێغەمبەرﷺ وەلاّمی نەدایەوە، خوای گەورەش ڕاستەوخۆ وەحی بۆ پێغەمبەری خوا ناردو ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾، فەرموی: لەپاش بێ یان لە پێشەوە جوت

---

١) ئەم فەرمودەیە ئەو کەلو (أبراج)انەش دەگرێتەوە، کە لە گۆڤارو ڕۆژنامەو کتێبەکان بلاّودەکرێتەوەو دەفرۆشرێ، جا ئەو کەسەی بڕوا بەو کەلو (أبراج)انە بکاتو قەناعەتی بە ڕاستیی پێشهاتەکانی بکات، وە بەر حوکمی ئەم فەرمودەیە دەکەوێ، با ئەو کەسە خۆی بە نوێژکەریش بزانێ. چونکە زانینی پێشهاتەکانو سبەینێ چ ڕوو دەدات، تەنها خوا دەیزانێو کاری ئەوە (لا يعلم الغيب الاّ الله). (وەرگێڕ)

٢) رواه النسائي والترمذي والطبراني (حديث حسن).

ببە، بەلاّم خۆت بپارێزە لە جوتبون بەرێگای دواوەو، لەکاتی حەیزیشدا.

((سأل رجل النبّيﷺ عن اتيان النساء في أدبارهنّ، أو إتيان الرجل امرأته في دبرها؟ فقال النبّيﷺ: حلال! فلما ولّى الرجل دعاه، أو أمر به فدعي، فقال: كيف قلت؟ في أي الخرزتين؟ أمِنْ دُبُرهـا في قبلها؟ فنعم، أم من دبرها في دبرها؟ فلا! فإن الله لا يستحي من الحق فلا تأتوا النساء في أدبارهنّ))[1]، واتە: پیاوێك دەربارەی چـونە لای ژن لـە دواوە، یـان گـەر پیـاو لـە دواوە لەگـەڵ خێزانەکـەی جـوت ببـێ پرسـیاری لـە پێغەمبەرﷺ کرد ؟

پێغەمبەرﷺ فەرموی: حەلاّڵە.

کاتێك پیاوەکە ڕۆیی، پێغەمبەر بانگی کرد، یان فەرمانی کرد بـانگی بکەن، پێغەمبەرﷺ فەرموی: چـۆنت گـوت؟ مەبەسـتت لـە کـام لـەو دو کونەیە؟ واتە: پێش و پاش. ئەگەر لە دواوە لەڕێی فەرجیەوە بـچیتە لای، بەڵێ حەلاّڵە. ئەگەر لە دواوە بچێتە لای بە ڕێی کۆم، نەخێر حـەلاّڵ نیـە. خوای گەورە لە ئاست حەق و راسـتیدا شـەرم ناکـات، لەبەرئـەوە لـەڕێی کۆمـەوە لەگەڵ هاوسەرەکانتان جوت مەبن[2].

سەعیدی کوڕی یەسار گوتویەتی: بە ئیبن عومەرم گوت: ئێمە کەنیزەك دەکرینو لەدواوە دەچینە لایان..

---

١) رواه النسائي والطحاوي (حديث صحيح).

٢) ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە بەلای جولەکە -وەك لە تلمود هاتوە- دروستە پیاو لـەڕێی کۆمـەوە لەگەڵ ژنەکەی جوت ببێ، چونکە وەك خۆیـان دەڵـێن: ژن بـۆ چـێژ وەرگـرتنو ڕابواردنە وەك پارچە گۆشتێکە، کە لە گۆشت فرۆش دەکڕدرێ، پیاو بە ئارەزوی خۆیەتی بە کولاّوی بیخوات، یان بە سورەوەکراوی!!

ئیبن عومەر گوتی: ئۆف! یەکێك خۆی بە مسوڵمان بزانێ چۆن شتی وا دەکات؟! نەسائیو کەسی تر گێڕاویەتیەوە و سەنەدەکەی ڕاستە.

ئیمام ابن القیم لە کتێبی (زاد المعاد)دا لەسەر فەرمودەی پێغەمبەر دەربارەی جوتبون، دەڵێ:

جوتبون لەدواوە بەڕێی کۆم، لەسەر زمانی هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکان ڕێگەی پێ نەدراوە، هەر کەسێك ڕێگەپێدانو دروستیو حەڵاڵی جوتبون لە دواوە لە ڕێی کۆم بداتە پاڵ هەندێك پێشین (السلف)، ئەوا هەڵەی کردوە، پاشان هەواڵ دان بە حەرام بونی بە توندی نەهی لێ کراوە، هەروەها دەڵێ: ئەم ئایەتە پیرۆزە لە دو ڕوەوە جوتبون لەدواوەی ژن حەرام دەکات، یەکێکیان: ئەوەی ڕێی پێدراوە بۆ چونە لای ژن شوێنی منداڵ بونە، نەك شوێنی کۆم، کە پیساییە. شوێنی (فەرج) ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ...﴾ ﴿فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾ چونە لای ژن لەدواوە بە ڕێی فەرجەوە، لەو ئایەتە سود وەرگیراوە، چونکە دەفەرموێ: ﴿أَنَّى شِئْتُمْ﴾ بەمانای فەرج هاتوە.

ڕاستییەکیش هەیە ئەویش ئەوەیە، گەر خوای گەورە جوتبونی ئافرەتی لە ڕێگای فەرجەوە لە ماوەی حەیزدا حەرام کردبێ، چۆن ئەو شوێنەی کە جێگەی پیساییو ئازارە، کە دەبێتە هۆی بڕینی وەچەو منداڵ بون، جوتبونی تێدا حەڵاڵ دەکات.

لە جوتبوندا ئافرەت مافی بەسەر پیاوەکەی هەیە، جوتبونیش لە ڕێی کۆمەوە ئەم مافەی ئەفەوتێنێو ئارەزوی سێکسی ژنەکە تێر ناکرێو، لێی بێبەش دەبێتو بە مەبەستو مەرامی خۆی ناگات. هەروەها پاشەوەی

ئافرەت بۆ ئەو کارە دروست نەکراوە، بەڵام (فەرج) بۆ جوتبون دروست کراوە. هەروەها جوتبون لە دواوە زیان بە پیاوەکەش دەگەیەنێ، لەبەرئەوە پزیشکە ژیرو پیتۆڵەکانو غەیری ئەوانیش، قەدەغەی ئەم کارەیان کردوە، چونکە فەرجی ئافرەت تایبەتمەندییەکی هەیە بۆ ڕاکێشانی ئاوی پیاو، کە لە کاتێکا ئەو ئاوەی دەچێتە ژورەوە هەموی نایەتە دەرەوە.. هەروەها پاشەوە شوێنی شتی پیسو پاشەڕۆكو پیسایی‌یە، کە زیان بە پیاوو بە ژنەکەش دەگەیەنێ. ئەم کارە بە سروشتی ساغو ڕاست، شتێکی نامۆ و غەریبە. جوتبون بە ڕێی پاشەوە سروشت (طبیعة) تێك ئەداو دەبێتە هۆی دڵ توندیو غەمو پەژارەیی بۆ هەردوکیان، هەروەها ڕۆشنایی دڵان ناهێڵێو دڵ ڕەش دەکات، لە نێوان ژنو مێرد، توڕەیی زۆر دەکاتو پەیوەندیان تێك دەچێو خۆشەویستییان نامێنێ، وای لێ دێ نەفرەت لە یەکتری بکەن، لە سەروی ئەم هەمو زیانانەش، دەبێتە هۆی توڕەبونی خوای گەورەو تەماشا نەکردنی بەچاوی ڕەحمەتو بەزەیی. لە گەورەترین هۆیەکانی نەمانی نیعمەتەکانی خوایەو، بەسەردا ڕژانی نەگبەتیو ناخۆشیە.

## جوتبـون لەگـەڵ ژنی حـەیزدار حــەرامە

خوای گەورە دەفەرمـوێ: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللهُ إِنَّ اللهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾ (البقرة- ٢٢٢)، واتە: لـە کاتێکـدا ژن لـە حەیزدایـە دەربـارەی جوتبـون پرسیارت لـێدەکەن ، بڵـێ: جوتبون لەماوەی حەیزدا مایەی ئێش‌و ئازارو نەخۆشی‌یە، بە مەبەستی جوتبون لێیان نزیك مەبنەوە، تـا ئەوکاتـەی لـە خوێنی حەیز پاك دەبنەوە. گەر لە خوێنەکە پاك بونـەوە، ئـەوا لەگـەڵیان جوت بن بەو شێوەیەی، کە خوای گەورە فەرمانی کردوە. خـوای بـاڵا ئـەو کەسانەی خۆش دەوێ، کە تۆبەکارن‌و ئەوانەش کە خۆیان پاك ڕادەگرن.

پێغەمبەرﷺ فەرمویـەتی: ((من أتى حائضاً، أو إمرأةً في دُبرهـا، أو كاهناً فصدَّقه بما يقول: فقد كفر بما أنْزَلَ على محمد))[1]، واتـە: هـەر کەسێك لەکاتی حەیزدا لەگەڵ خێزانەکەی جوت ببێ، یان لـەدواوە بـچێتە لای، یان بچێتە لای پێشبینێك‌و باوەڕی بە قسەکەی بکات، ئەوا بێبڕوایە بەوەی، کە بۆ محمد دابەزیوە.

((كان رسول الله ﷺ إذا أراد من الحائض شيئاً ألقى على فرجها ثوبا ثم صنع ما أراد))[2]، واتە: پێغەمبەرﷺ گەر ویستبای بچێتە لای یـەکێ لە خێزانەکانی، لە کاتێکدا لەماوەی حەیزدا بوایە، ئەوا پارچە قوماشێکی

---

١) رواه أبوداود والنسائي والترمذي والحاكم (حديث صحيح).

٢) رواه أبوداود والبيهقي (حديث صحيح).

بەسەر داوێنی خێزانەکەی دادەداو، پاشان چی بویستبوایە دەیکرد.

لە تەفسیری (المراغی)دا هاتوە، کە پزیشکی نوێی ئێستا بەدەری خستوە، کە جوتبون لەماوەی حەیزدا ئەم زیانانەی هەیە:

١- دەبێتە هۆی ئازار گەیاندن بە ئەندامەکانی زاوزێ لە ئافرەت، لەوانەیە ببێتە هۆی هەوکردنی (إلتهاب) منداڵ دانو هێلکەدان، یان زیان گەیاندن بە حەوزی ئافرەت کە زیانێکی زۆر بە تەندروستی ژنەکە دەگەیەنێو، لەوانەیە ببێتە هۆی لە کەلْك کەوتنی هێلکەدانو منداڵ نەبون.

٢- چونە ژورەوەی مادەکانی خوێنی حەیز بۆ زەکەر، کە دوچاری هەوکردنێکی کیمیاوی دەکات، کە بە (سەیلان) دەچێو لەوانەیە هەردو هێلکەی گون بگرێتەوەو ئازاریان بدات. جا لەوەوە نەزۆکی پیاو دروست دەبێ، لەوانەشە دوچاری نەخۆشی (زوهەری) ببێ، کە میکرۆبەکەی لە خوێنی ژنەکەوە هەبێت. لەبەر ئەم زیانانەی باس کرا، پزیشکەکانی ئێستا لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە پێویستە پیاو لە ماوەی حەیزدا بە مەبەستی جوتبون نزیك نەکەوێتەوە، وەك قورئانی پیرۆز باسی کردوە. لەبەرئەوە کاتێك خوای گەورە دەفەرموێ ئەم کارە مەکەن، بێ حیکمەت نیە.

ئای موعجیزەی قورئان چەندە بەرزو مەزنە!

لە ئیبن عەباسەوە رەزای خوای لێ بێ دەڵێ: ئەو کەسەی لە ماوەی حەیزدا بۆ جوتبون دەچێتە لای خێزانەکەی، ئەوا ((دەبێ دینارێك یان نیو دینار بکاتە خێر))[1]. کە دەکاتە نیو جونەیهی زێڕی ئینگلیزی یان بە نزیکی چارەگێك.

---

١) رواه البخاري ومسلم والترمذي والنسائي وأبوداود.

کاتی خۆی جولەکەکان عادەتیان وابو لەگەڵ ئافرەتی حەیزداردا نانیان نەدەخواردو لەگەڵیان نەئەخەوتن و، عەرەبەکانیش لە سەردەمی نەفامییان دا، بەو شێوەیە لاسایییان دەکردنەوە، بەڵام کە ئیسلام هات ئەوەی قەدەغە کرد، تەنها جوتبونی لەگەڵ ئافرەتی حەیزداردا حەرام کردو ڕێگەی بەوەدا، کە جگە لە فەرجی ئافرەتەکە بە شوێنی تر چێژ وەرگرێ[1]، وەك لە فەرمودەکەدا هاتبو، جا بەم شێوەیە ئیسلام میانەڕەوی یە لە نێوان زیادەڕەوی جولەکەو زیادەڕەوی کردنی ئەو کەسانەی، کە ڕێگە بەجوتبونی حەیزدار دەدەن.

بەبۆنەی قسەکردن دەربارەی حەیز بەباشی دەزانین باسی ئەوە بکەین چۆن ئافرەت خۆی لە حەیز پاك دەکاتەوە:

لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ کەوا: ئەسمای کچی یەزید دەربارەی خۆشتنی ئافرەت پرسیاری لە پێغەمبەر کرد، پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((تأخذ إحداكن ماءها وسدرها فتطهر فتحسن الطهور (او تتوضأ جيداً) ثم تصبُّ على رأسها الماء فتدلكه دلكاً شديداً حتى يبلغ شؤون رأسها، ثم تأخذ مسكةً (أي قطعة قطن أو صوف مطيبة بالمسك أو أي طيب آخر) فتطهر بها))، واتە: یەکێك لە ئێوە ئاو دەهێنیو خۆی پێ

---

١) لەو حاڵەتەدا دەکرێ پیاو لە نێوان دوو ڕانی ئافرەتکە، چێژ وەرگرێو بکاتە نەشئەو خۆشی. دیاریشە پیاو بەر لەوەی بگاتە خۆشی هۆیەکانی بەکاردێنێ، وەك : دەم ماچ کردنو مەمك مژینو شتی تر، بەڵام لەو حاڵەتەدا جنسی ئافرەتەکەش دەوروژێو وەك پیاوەکەی پێویستی بە دامرکاندنەوە هەیە، دامرکاندنەوەشی بەوە دەبێت، کە هاوسەرەکەی دەست بە میتکەی ژنەکەی دابێنێو بیجولێنێ، ئەمەش دەبێ لەسەر ئەو قوماشەوە بکرێ، کە بەسەر داوێنی دادراوە، یان مایۆی لەبەر کردووە. (وەرگێر)

پاك دەكاتەوەو، بە چاكی خۆی پاك دەكاتەوە (یان دەست نوێـژ بـە چـاكی دەگرێ) پاشان ئاوەكەی بەسەری دادەكاو بەچاكی دەستی پـێ دادەهێنـێ، تا ئاوەكە دەگاتە سەر پێستی سەری، پاشان پارچە قوماشێك یـان پارچـە لۆكەیەك یان پارچە سوفێك بەبۆنی مسك، یان بەهەر بۆنێكی تـر بـە بـۆن بكاو خۆی پێ پاك بكاتەوە.

ئەسما گوتی: چۆن خۆمی پێ پاك بكەمەوە.

(قال: سبحان الله تطهري بها!) سبحان الله! خۆتی پێ پاك بكەرەوە.

فقالت عائشة: كأنها تخفي ذلك (أي تسربه اليها) تتبعي أثر الدم[1].

عائشە گوتی: بیهێنە بە شوێنی خوێنەكەدا.

ئەوەش بۆ ئەوەیە تا شوێنی خوێنەكە بۆنی خۆشی لـێ بێو، ئـەو بۆنـە ناخۆشەی خوێنەكەی لـێ نەمێنێ.

بەبۆنەی خۆپاكردنـەوەی ژن لـە خـوێنی بێنوێـژی (حـیض)، پێویـستە ئاماژە بەوە بكەین، كاتێ ژن ماوەی خوێنی بێنوێژیەكەی تـەواو دەبێـت، پیاو بۆی دروستە یەكسەر لەگەڵی جوت ببێ، با ژنەكەش خۆی نەشوشتبێ، چونكە وشەی (الطـهر) لـە ئـایـەتـی ﴿وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ﴾ بەمانای شوشتنی خوێنی حەیزەكە دێ.. درێژەی ئەم بابەتەش لـە كتـێبی (آداب الزفاف) باس كراوە.

---

١) رواه البخاري ومسلم والنسائي وأبوداود وابن ماجه.

## داپۆشـینی عەورەتی پیاو لە هـەمو کەسـێك جگـە لـە ژنەکەی

(معاويه بن حيده) گوتویـەتی: ((قُلْتُ: يَا رَسُولَ الله، عَوْرَاتُنَا مَا نَأْتي مِنْهَا وَمَا نَذَرُ؟ قَالَ: احْفَظْ عَوْرَتَكَ إلاَّ مِنْ زَوْجَتِـكَ أَوْ مَـا مَلَكَـتْ يَمِينُكَ..)).[1]، واتە: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! کـێ بهـێڵین عـەورەتمان ببینێ و، لە کێی بشارینەوەو نەهێڵین بیبینێ؟

فـەرموی: عـەورەتی خـۆت لـە هـەمو کەسـێك داپۆشـە، جگـە لـە هاوسەرەکەت.

پێغەمبەر ﷺ دەفـەرموێ: ((لا ينظر الرجل الى عورة الرجـل، ولا المرأة الى عورة المرأة، ولا يفضي الرجل الى الرجل في الثوب الواحـد، ولا تفضي المرأة الى المرأة في الثـوب الواحـد))[2]، واتـە: نابـێ پیـاو تەماشای عـەورەتی پیاو بکات، جـا هـەر کەسـێك بـێ، نابـێ ئـافرەتیش سەیری عـەورەتی ئافرەت بکات، جا هەرچ ئافرەتێـك بـێ. نابـێ دو پیـاو لەژێر یەك پێخەف دا بخەون کە لەشیان بەلەشی یەکتر بکەوێو ڕوت بن. یا ئافرەت لەگەڵ ئافرەتێکی تـر لەیـەك پێخـەف دا نەخـەوێ، کـە لەشـیان پێکەوە بنوسێ بە روتی.

---

١) رواه أبوداود والترمذي والنسائي.

٢) رواه مسلم وغيره.

## واباشە لەنێوان دو جوتبوندا خۆبشۆرێ

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((إذا أتى[1] أحدُكم أهلَه ثم أراد أن يعود، فليتوضأ بينهما وضوءاً)) (وفي رواية وضوءه للصلاة)[2]، واتە: گەر یەکێك لە ئێوە لەگەڵ خێزانەکەی جوت بو، پاشان ویستی دوبارە لەگەڵی جوت ببێتەوە، با لەنێوان ئەو دو جوتبونەدا دەست نوێژ بگرێ. لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێ: دەست نوێژ بگرێ.

ئەبی رافع گوتویەتی: ((أن النبيﷺ طاف ذات يوم على نسائه، يغتسلُ عند هذه، وعند هذه. قال: فقلت له يا رسول الله ألا تجعله غُسلاً واحداً؟ قال: هذا ازكى وأَطْيَب وأَطْهَر))[3]، واتە: ڕۆژێك پێغەمبەرﷺ بەسەر خێزانەکانیدا گەڕاو چوە لایان بە مەبەستی جوتبون، لەلای هەر یەکێکیان دا خۆی دەشوشت، ئەبی رافع دەڵێ: بە پێغەمبەرم فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا! بۆ بۆ هەموان نایکەی بەیەك خۆشتن؟

---

١) ئیمام (ابن قيم) وای بەباشتر دەزانی، کە جوتبون بەڕۆژ بکرێ، تا هەستەکان بەشی خۆیان وەربگرن، لەبەر هۆیەکی دی کە سروشتیە، ئەویش لەبەرئەوەی بەشەو، هەستەکان تێیدا سارد دەبنەوەو پێویستیان بە حەسانەوە هەیە، ڕۆژیش جێی جوڵەجوڵو بزواندنە، هەروەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاسًا وَالنَّوْمَ سُبَاتًا وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُورًا﴾(الفرقان -٤٧). بەڵام هەندێکی دی بۆ جوتبون شەو لە ڕۆژ بەباشتر دادەنێن.

کورتەی قسە ئەوەیە: جوتبون بەڕۆژ بۆ بابای کرێکار ناگونجێ، مەگەر شەو نەبێت، هەروەك هەندێك لەو کەسانە بۆیان باسکردوم، ئامۆژگاری ئەوانی دیش دەکەم لەدوای نوێژی بەیانی جوتبون ئەنجام بدەن، ئینجا بخەونەوە.

٢) رواه مسلم وأبوداود وغيرهما.

٣) رواه أبوداود والنسائي والطبراني (حديث صحيح).

پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئا بەو شێوەیە پاکترو باشترو خاوێنترە. واتە: بۆ هەر جوتبونێك خۆی بشوات.

ئێستاش لەم سەردەمەدا پزیشکی ئێستا دەریخستوە، کە خۆشتن چالاکی‌و هێزو توانا بە لەش‌و جەستە دەداتەوە.

خاتو عائیشە گوتویەتی: ((كان رسول الله ﷺ إذا أراد أن يأكل أو ينام وهو جُنُبٌ، غسل فرجه وتوضأ وضوءه للصلاة))[١]، واتە: کاتێك پێغەمبەری خواﷺ لەشی پیس بوایەو، ویستبای نان بخوا یان بخەوتبا داوێنی دەشوشت‌و دەست نوێژی دەگرت.

هەروەها گوتویەتی: ((كان رسول الله ﷺ ينام وهو جُنُبٌ من غير أن يمسَّ ماءً حتى يقوم بعد ذلك فيغتسل))[٢]، واتە: کاتێك پێغەمبەری خواﷺ لەشی پیس بوایە ئەو کاتە دەنوست، بێئەوەی دەست بداتە ئاو بۆ خۆشوشتن، تا ئەو کاتەی لە خەو هەڵنەستایە، پاشان کە هەڵدەستا ئنجا خۆی دەشوشت.

یان گوتویەتی: ((كان رسول الله ﷺ اذا أَجْنَبَ فأراد أن ينام توضأ أو تيمم))[٣]، واتە: پێغەمبەری خوا گەر لەشی پیس بایەو، ویستبای بخەوێ ئەوا دەست نوێژی دەگرت، یان تەیەمومی دەکرد[٤].

---

١) رواه البخاري ومسلم وغيرهما.

٢) رواه ابو داود والترمذي وابن ابي شيبة وغيرهم (صحيح).

٣) رواه البيهقي وابن أبي شيبة (صحيح).

٤) بەگوێرەی ئەو فەرمودانەی باسکران بۆمان دەردەکەوێ باشتر وایە دوای جوتبون بەر لە خەوتن خۆ بشورێ، دروستیشە لەجیاتی خۆشوشتن دەستنوێژ هەڵبگیرێ و تەیەموم بکرێ تا کاتی پێش نوێژی بەیانی، هەروەها دروستە بەبێ خۆشوشتن‌و بێدەستنوێژو تەیەموم کردن بخەوی.

## خۆشوشتنی ڕۆژی هەینی پێویستە[١]

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((غُسْلُ الجمعة واجبٌ على كل محتلم، والسواك، وأن يمسَّ من الطيِّب ما يقدر عليه))[٢]، واته: خۆشتن له ڕۆژی هەینی لەسەر هەمو کەسێك که بالّغ بوبێ‌و ئیحتلامی بوبێ پێویسته. هەروەها سیواك کردن‌و خۆ بۆنخۆش کردن به گوێرەی توانا.

هەروەها دەفەرموێ: ((حقٌّ على كل مسلم أن يغتسلَ في كل سبعة أيام يوماً يغسلُ فيه رأسه وجسده))[٣]، واتە: پێویستە لەسەر هەمو مسولّمانێك لە هەمو هەفتەیەکدا ڕۆژێك سەرو جەستەو لەشی تێدا بشوات.

هەروەها دەفەرموێ: ((اذا جاء أحدكم الى الجمعة فليغتسل))[٤]، واتە: گەر یەکێك لە ئێوە چوە نوێژی هەینی، با خۆی بشوات .

---

١) دەربارەی خۆشوشتنی هەینی، شەرع ناسان جیاوازن، هەیە دەڵێ فەرزە، هەشە دەڵێ سوننەتە، ئیمام شەوکانی لە کتێبەکەیدا (نیل الأوطار ١/٢٥٣-٢٥٤) بەڵگەی هەردو کۆمەڵی هێناوە، ئینجا حوکمی فەرزبونی خۆشوشتنی ڕۆژی هەینی داوە.

٢) رواه البخاري ومسلم.

٣) رواه البخاري ومسلم.

٤) رواه البخاري .

## پێویستە لە ماڵ حەمام هەبێ

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((مَن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يُدخلْ حليلته الحمّام،[1] من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يدخل الحمّام الاّ بمئزر، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يجلس على مائدة يدار عليها الخمر!))[2]، واتە: هەر کەسێك بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە، با نەهێڵێ خێزانەکەی بچێتە گەرماوی بازاڕ، هەر کەسێك بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە بەبێ خاولی نەچێتە گەرماوی بازاڕ، هەرکەسێك بڕوای بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە با لەسەر خوانێك دانەنیشێ ، کە مەی لەسەر ئەخورێتەوە.

ئوم دەرداء دەڵێ: ((خرجت من الحمّام فلقيني رسول الله ﷺ

---

١) سوپاس بۆ خوا ئێستا گشت شارەکان، خانوەکانی گەرماوی تێدا دروست کراوە، دیارە پێشتر کە خانو گەرماوی تێدا نەبوە، ئەوە لەبەر بێئاگایی بوە. زۆریش لە گوندەکان گەرماوی تێدا نیە، ڕەنگە ئەم فەرمودانە ببنە هاندەری پیاوان، کە بە زویی گەرماو لە ماڵەکانیان دروست بکەن، شاراوەش نیە ئافرەت، کە دەچێتە گەرماوی بازاڕ چەند خراپەکاری لێدەکەوێتەوە، ڕەنگە هەندێ ژنە فاسقو بێڕەوشت چونە گەرماو بکەنە هۆیەك بۆ مەرامی تاوانی خۆیان!

گێڕاویەتیانەوە کە یەکێ لە ژنە مێردداره زیناکەرەکان هەندێ جارو دوای تەواوبونی ماوەی حەیزەکەی بەمێردەکەی دەگوت: ئەوا توشی خوێنی حەیز بومەتەوە، ڕێگەم بدە بچمە گەرماو، ئەویش ڕێی دەداو دەچو خراپەکاری دەکرد.

گەر ئەو پیاوە شارەزای حەیز بایە، دەیزانی ئەو خوێنەی دوای حەیز دێ ئەوە خوێنی (استحاضة)یەو پێویست بە خۆشوشتن ناکات.

٢) رواه الحاكم والترمذي والحافظ العراقي وأحمد في المسند (حديث صحيح).

فقال: من أين يا أم الدرداء؟ قالت: من الحمّام. فقال: والذي نفسي بيده ما من إمرأة تضع ثيابها في غير بيت أحد من أمهاتها[1] الاّ وهي هاتكة ستر بينها وبين الرحمن!!))[2]، واتە: لە گەرماوی بازاڕ هاتمە دەرەوە لە ڕێگا توشی پێغەمبەر بوم. پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئوم دەرداء لە کوێ بوی؟ ئوم دەرداء گوتی: لە گەرماو بوم. پێغەمبەرﷺ فەرموی: سوێندم بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، هەر چ ئافرەتێك لە غەیری ماڵی خۆی جلو بەرگی دابنێ، ئەوا ئەو ئافرەتە پەردەی شەرمی نێوان خۆی‌و خوای ئەتك کردوەو دڕاندوە.

١) زانیومە هەندێ ئافرەت و پیاوی بەرگدروی بۆدین کاتێ هەندێ ئافرەت دێنە لایان‌و جلەکانی دەرەوەیان دادەکەنن بە مەبەستی تاقیکردنەوەو قیاس گرتن، بەهەر فێڵێك بێت وێنەیان دەگرن‌و پاشان بەهۆی ئەم وێنانەوە هەڕەشەیان لێدەکەن، تا دەست درێژی بکەنە سەر ناموسیان، نەریتی ئیسلامی دێرینیش وابوە کە بەرگ درو بانگ کراوەتە ماڵەوە!

٢) رواه أحمد في المسند بسند صحيح.

## ئەدەبی پیـاو لەگەڵ کەس وکاری خێزانەکەی

قال علي بن أبي طالب رضي الله عنه: ((كنـــت رجلاً مَذّاءً فاســتحيــيتُ أن أسأل رسول الله ﷺ لمكان ابنتـــه منّي فأمرت المقداد فسأله)).

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب گوتی: ئاوی مەزیم زۆر دەهاتەوە،[١] جا لەبەر ئەوەی کچی پێغەمبەر خێزانم بو، شەرمم کرد لە پێغەمبەر بپرسم، کە حوکمی ئەوە چیە، لەبەر ئەوە بە میقدادم گوت کە ئەو لێی بپرسێ[٢].

---

١) ئاوی مەزی: ئاوێکی سپی ڕەنگ ئاوی لیقە، کاتێك لـە زەکـەر دەردەچێ، کـە پیـاو یاریو گاڵتە لەگەڵ خێزانەکەی دەکات، یان ماچی دەکات. هاتنە دەری ئەم ئاوە نابێتـە هۆی خۆشوشتن، بەڵکو دەبێ تەنها شوێنەکەی بشۆردرێو دەستنوێژ بگیرێتەوە.

٢) پێشەوا نەوەوی گوتویەتی: لەم قسەیەی ئیمام عەلی ئەوە دەردەکەوێ، کە بـۆ پیـاو وا باشترە لەکاتی وجودی یەکێك لە خزمـی خێزانەکـەی باسـی ئـەو شـتانە نـەکات، کـە پەیوەندی بە کاری شـەرعی ئافرەتانـەوە هەیـە وەك شـەوی زاوایـیو مـاچ کـردنو لـە ئامێزگرتنو حەیز. چونکە دەبێت بە بەشەرم داکەوتنی خزمی خێزانەکەی.

# ترساندنی ئەوانەی ژن هەڵدەخەڵەتێنن و لە مێردەکەی دەکەن

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((لیسَ مِنَّا مَنْ حلف بالأمانة، وَمَنْ خبب امرأة على زوجها) (رواه أحمد في المسند وابن حبان (حديث صحيح)).، واتە: ئەو کەسە لە ئێمە نیە، کە سوێند بە ئەمانەت دەخوات، هەروا ئەو کەسەش ژنێك هەڵخەڵەتێنیّ و لە مێردەکەی بکات.

دەگێڕنەوە خواپەرستێکی نەوەی ئیسرائیل کاری جوتیاری دەکرد، ژنێکی زۆر جوانی هەبوو، کە جوانترین ژنی نەوەی ئیسرائیل بوو. کاتیّ یەکیّ لە ستەمکارەکانی نەوەی ئیسرائیل جوانی ئەو ئافرەتەی پیّ ڕاگەیاندرا، یەکسەر پیرەژنێکی ناردە لای ژنە جوانەکەو پیّی گوت هەڵی خەڵەتێنەو لە مێردەکەی بکە، جا پیّی بڵیّ: بۆ ڕازی لە لای ئەو جوتیارە بیت؟ وەرە لای من بە زێڕو خشڵ دەترازێنمەوەو جلوبەرگی ئاوریشم دەکەمە بەرت و خزمەتکارت بۆ دادەنێم.

کاتیّ ژنە جوانەکە، ئەم قسانەی بیست هەڵخەڵەتا، جا کە شەو داهات و مێردەکەی گەڕایەوە ماڵیّ، کە پێشتر خواردنی بۆ دەهێنا، ئەمجارە خواردنی بۆ نەهێنا، پێشتر نوێنی بۆ ڕادەخست، ئەمجارە نوێنی بۆ ڕانەخست و، ڕەفتاری بەرامبەر مێردەکەی گۆڕابوو، مێردەکەی پیّی گوت: ئەوە چیتە! ئەوە بۆچی وات لێهاتووە؟

ژنەکەی گوتی: ئەوەیە کە دەیبینی!

مێردەکەی گوتی: تەڵاقت دەدەم؟!

ژنەکە گوتی: بەڵێ، تەڵاقم بدە.

ئەویش تەڵاقی داو، ستەمکارەکەی بەنی ئیسرائیل، ژنی جوتیارەکەی هێناو کردیە هاوسەری خۆی، جا شەوی گواستنەوە، پەردەکان شۆڕکرانەوە، جا پیاوەکەی دەستی درێژکرد، تا دەست لە ژنەکەی بدا، دەستی ڕەق‌و وشك بوو، هەروەها ژنەکەش دەستی درێژ کرد، تا دەستی لێ بدات، ئەویش دەستی ڕەق‌و وشك بوو، جا هەردوکیان کەڕو لاڵ بون‌و جنس‌و ئارەزویان لێ سەندرایەوە.

کە بەیانیان کردەوە پەردەکان هەڵدرانەوە، بینران کوێرو کەڕو لاڵن، جا هەواڵیان دایە پێغەمبەری نەوەی ئیسرائیل ئەویش هەواڵەکەیانی بۆ لای خوای گەورە بەرزکردەوە، خوا فەرمووی: وایانزانی ئەوەی بەو جوتیارەیان کرد، من نایانبینم!

- ئەبو موسلیمی خەولانی، گەر بچوبا ماڵێ، ژنەکەی عەباکەی‌و پێڵاوەکانی لێ وەردەگرت، ئنجا خواردنی بۆ دەهێنا، جارێکیان چوە ماڵێ، بینی چرای تێدانیەو، ژنەکەی بە کزۆڵ دانیشتووەو دارێکی بەدەستەوەیەو زەویەکە کون کون دەکات. پێی گوت: ئەوە چیتە؟

ژنەکەی گوتی: تۆ لەلای معاویە پلەوپایەت هەیە، ئێمەش خزمەتکارمان نیە، بەڵکو داوات لێ بکردبایە خزمەتکارو پارەی بێ ببەخشیباین!

ئەبو موسلیم گوتی: خوایە هەر کەسێك ژنەکەمی تێکداوە، تۆڵەی لێ بستێنیەوە.

دیارە پێشتر ژنێك هاتۆتە لای ژنی ئەبو موسلیم‌و پێی گوتووە: مێردەکەت لەلای معاویە پلەوپایەی هەیەو ڕێزی هەیە: بەڵکو بە مێردەکەت بڵێی داوا لە معاویە بکات خزمەتکارو سامانی بداتێ.

کاتێ ئەو ژنە لە ماڵی خۆی دانیشتبوو چاوی هیچی نەدەدیت و گوتی: بۆچی چراکەتان کوژاوەتەوە: جا بە گوناهەکەی خۆی زانیو، چوە لای ئەبو موسلیم، تا داوای لێبکات، لەخوا بپارێتەوە چاوی بۆ بگەڕێنێتەوە، ئەبو موسلیمیش بەزەیی پێداهاتەوەو، لە خوا پاڕایەوەو، چاوی بۆ گەڕایەوە.

شتێکی جوانیش دەربارەی جوامێری ژن دەگێڕنەوە، کە (عتبـي) گوتویەتی: لە یەکێ لە شەقامەکانی بەسرا دەڕۆیشت، بینی جوانترین و شۆخترین ژن، گەمەو گاڵتە لەگەڵ پیرێکی ناشیرین دەکاتو هەرکە دەیدوێنێ بە ڕوێکی گەشو خەندەوە دەیدوێنێ، جا دەڵێ: لە ژنەکە نزیك کەوتمەوەو پێم گوت: ئەم پیرە چی تۆیە؟!

گوتی : مێردمە.

پێیم گوت: ئەوە چۆن ئارام لەسەر ناشیرینی ئەو پیاوە دەگری، لە حاڵێکدا تۆ جوانو شۆخی؟ بەڕاستی ئەمە جێی سەرسوڕمانە!

ژنەکە گوتی: ئەی فلان! بەڵکو سوپاسی خوا دەکات، کە منی پێ بەخشراوە، منیش ئارام بگرم، کە ئەوم پێدراوە، دیارە زۆر ئارامگرو زۆر سوپاسگوزاریش بەهەشتین. ئەدی نابێ بە قیسمەتی خوا ڕازی بم؟!

دەڵێ وەڵامەکەی دەمکوتی کردمو، نەمتوانی قسەی دی بکەمو، منیش ڕۆیشتم.

## هـونەری لاواندنەوەو دەسـتبازی کردن

### (یـاری کردنی پیاو لەگەڵ خێزانەکەی)

جابر دەڵێ: ((كنا مع النّبــيﷺ في غزوة، فلما رجعنا- وكنا قريبــاً من المدينة- قلت: يارسول الله إنــي حديثُ عهد بعُرس! قال: أتزوجت؟! قلت: نعم. قال أبكرٌ أم ثيِّب؟ قلت: بل ثيِّب. قَال: فهلاً بكراً تلاعبها؟! وفي رواية: هلاّ بكراً تلاعبك وتلاعبها...))[1]، واتـە: لـە جەنگێکـدا لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ بـوین، کاتێـك گەڕاینـەوەو لـە مەدینـە نزیـك بوینەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ژنم تازە هێناوە.

پێغەمبەرﷺ فەرموی: ژنت هێناوە:

جابر دەڵێ: گوتم: بەڵێ.

پێغەمبەرﷺ فەرموی: کچە یان بێوەژنە؟

گوتم: بێوەژنە.

پێغەمبەرﷺ فەرموی: کچت هێنا بوایە، بۆ ئـەوەی گەمـەت لەگەڵـدا بکاتو یاریو گەمەی لەگەڵ بکەی....)).

لە گێڕانەوەیەکی تردا جابر دەڵێ: ((قال لي رسول الله من تزوجــت؟ فقلت: ثيّــباً. فقال: مالك وللعذارَى ولعابــها؟! قلت: يا رسول الله، إن عبدالله مات وترك سبع بنات أو تسعاً، فجئت بمن يقــوم علــيهن،

---

١) حديث صحيح.

ويصلحنّ.. قال: فدعا لـــــي))[1]، واتــە: پێغەمبــەرﷺ فــەرموی: چ ئافرەتێکت کردۆتەوە هاوسەری خۆت، واتە کچە یان بێوەژنە.

گوتم: بێوەژنە.

پێغەمبەر فەرموی: بۆ کچت نەهێناوە تا گەمەو یاری لەگەڵ دا بکەیو لیکی بــمژی!

گوتم: ئەی پێغەمبــەری خــوا، عبـدالله (واتــە: بــاوکی جـابر) مــردوەو حەوت، یان نۆ کچی لەدوای خۆی بەجێ هێشتوە، جا لەبــەر ئەوەیــە، کــە بێوەژنم هێناوە تا سەرپەرشتیو پەروەردەی ئەم کچانە بکەم.

جابر دەڵێ: پێغەمبەرﷺ دوعای خێری بۆ کردم.

لە گێڕانەوەیەکی تردا کە موسلیم گێڕاویەتیەوە: ((قال رســـول اللهﷺ لجابر: فهلا جاريـــة تلاعبـــها وتلاعبـــك! – أو قـــال تـــضاحكهـــا وتضاحكك–))، واتە: پێغەمبەری خوا بە جابری فەرمو: کـچێکت مــارە کردبایە، تا یاری لەگەڵ بکەیو یاریت لەگەڵ دا بکات، یان بە پێکـەنینی بێنیو بە پێکەنینت بێنێ.

خاتو عائیشە رەزای خوای لــێبێ گوتویەتی:

یــازدە ژن دانیــشتن عەهــدو پــەیمانیان دا، کــە حــاڵی مێردەکانیــان نەشارنەوەو هەموی باس بکەن.. زۆربەیان ســکاڵای کــەم بــژێوی (نفقــە)و بەخراپی هەڵسوکەوت کردنو دەستبازی نەکردنو کەم جوتبونیان دەکرد، دیارە ئەمانە گشتی لە ئامانجەکانی شوکردنە لای ئافرەت!

یازدەمین ژن، کە ئەمە کورتەکەیەتی گوتی:

---

١) رواه الخمسة (حديث صحيح).

ئەبو زەرعی مێردم، چ ئـەبو زەرعێکـە؟ منـی لـە ژیـانێکی تـەنگ‌و دەسـتکورتیەوە گواسـتەوە، بـۆ سـەروەت‌و سـامانێکی زۆرو فـرەوان، خزمەتکاری بۆ داناوم، بەتێری دەخەوم..

ئنجا ئوم زەرع گوتی: ئەبو زەرع بۆ سەفەرێ چوە دەردوە، توشـی ژنـێ بو، کە دو کوڕی لەگەڵدا بو، کە بەدو هەنار لەژێر کەفەڵ (خصر)یدا یاریان دەکرد، منی تەلاق داو ئەوی هێنا..

خاتو عائیشە گوتی: پێغەمبەری خواﷺ پێی فـەرموم: ((كنت بـك كأبـي زرع لأم زرع)) واتە: عائیشە! من بۆ تۆ وەك ئەبوزەرع وامە بـۆ ئوم زەرع[1].

ئیبن القیم گوتیەتی: بۆچی پێغەمبەرﷺ کچی هەڵبژاردوەو بە باشـتری داناوە لە ژنێك کە شوی کردبێت، لە کاتێکدا ئەم کـچێنی یـە بـە یەکـەم جوتبون دەبێت بەژن؟

وەڵامی ئەم پرسیارە لە دو ڕوانەوە وەڵام دەدرێتەوە:

یەکەمیان: مەبەست لە جوتبونی کچ ئەوەیە، پێش ئەو کـەس نەچـۆتە لای ئەو کچەو، تامی نەچەشتوە، لەبەر ئەوە خۆشەویستی پیاوەکە لە دڵی کـچەکە دەڕوێ، ئـەوەش دەبێتـە هـۆی بـەردەوامی گـوزەرانی یـەکتری. سەبارەت بە پیاوەکەش ئەوەیە، کە ئاگاداری‌و چاوەدێری ئەم کچە دەکات، کە هیچ کەسێك وەك ئەو چاودێری ناکـات. خـوای گـەورە ئامـاژەی بـەم مانایە کردوە، کە دەفەرموێ: ﴿لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنْسٌ قَبْلَهُمْ وَلاَ جَانٌّ﴾ (الرحمن-٧٤)، دوای ئەمە بەلابردنی پەردەی کچێنی، پیـاو بـە بـەردەوامی چـێژی جوتبون بەدی دەکات.

---

١) واتە: لە خۆشەویستی‌و نولفەت‌و بژێوی، نەك لە تەلاق‌و جیابونەوە.

دووەمیان: وەك لە پێغەمبەرەوە هاتوە، کە فەرمویەتی: ((إن أهل الجنة كلما وطئ أحدُهم امرأةً عادت بكراً كما كانت)) [1]، واتە: خەڵکی بەهەشتێ هەرکاتێ لەگەڵ ئافرەت جوت بون، ئافرەتەکە یەکسەر وەك کچێنی لێدێتەوە.

عائیشە نازی لەسەر پێغەمبەرﷺ دەکرد، چونکە تەنها عائیشەی بە کچێنی هێنابو. لەبەر ئەوە خاتو عائیشە بە پێغەمبەری دەفەرمو: ((لو نزلت وادياً فيه شجر أُكِلَ منها، وشجر لم يؤكل منها، في أيهما ترتع بعيرك؟! وكان يرد عليها: في التي لم يؤكل منها!)) [2]، واتە: گەر بچیتە دۆڵێکەوە دارو درەختی لێ بێو لەوەڕی لێ کرابێو، دارو درەختێ وای لێ بێو لەوەڕی لێ نەکرابێ، لە کامیان حوشترەکەت دەلەوەڕێنی؟ پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دەدایەوەو دەیفەرموو: (لەوەی دارو درەختەکەی لەوەڕی لێ نەکراوە).

لە هەندێ (آثار)دا هاتوە: (عليكم بالإبكار، فإنهنّ أعذب أفواهاً وأنتق أرحاماً وأسخن إقبالاً وأقل خبأ وأرضى باليسير من النفقة)، واتە: کچ بێنن، چونکە زمان شیرینن‌و منداڵیان زۆر دەبێ‌و بەگەرمی دێنە پێشەوەو، فێڵیان کەمەو بە کەم ڕازین.

هەرچەندی بە شان‌و باڵی کچ دا هەڵدەگوترێ، بەڵام بێوەژنیش تازیار (مزایا)ی خۆی هەیە، کەوا موماسەرەو ئەزمون‌و شارەزایی هەیە، لە باش هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ مێرددا، خوای گەورەش بە پێغەمبەرەکەی

---

١ رواه الطبراني في معجمه (روضة المحبين ص/٢٤٢).

٢) رواه البخاري.

رادەگەیەنێ کە دەفەرموێ: ﴿عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ مُسْلِمَاتٍ مُؤْمِنَاتٍ قَانِتَاتٍ تَائِبَاتٍ عَابِدَاتٍ سَائِحَاتٍ ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَارًا﴾(التحريم- ٥)، واتە: گەر ئێوە تەلاق بدا، شایەتا پەروەردگاری ئەو ژنانی لەنگۆ باشتری-لەباتی ئێوە- بداتێ: ژنانێکی گەردنکەچی بەباوەڕی بەرفەرمانی لە خراپە پەژیوانی خواپەرستانی رۆژوگر، لە بێوەژنانو کیژان.

(ابن كثير) لە راڤەی ئایەتەکە دەڵێ:واتە: تیایاندایە بێوەژنەو تیایاندایە کچە، بۆ ئەوەی ئارەزومەندی نەفس بێ، چونکە هەمەچەشنی نەفس فراوانو گوشاد دەکات، جا لەبەر ئەوەیە کە فەرموی ﴿ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَارًا﴾.

بە بۆنەی قسەکردن دەربارەی کچ، وای بەباش دەزانم ئامۆژگاریو هەندێك سود لەبارەی پەردەی کچێنیو چۆنیەتی لابردنی ئەم پەردەیە لەلایەن زاواوە باس بکەین، چونکە زۆر کەس بەهۆی نەفامیو تێنەگەیشتن دەربارەی ئەم پەردەیە یەکسەر خێزانەکەی تەلاق داوە.

لە یەکێك لەو کتێبانەی باسی جنس دەکات هاتوەو دەڵێ: هەستیارترینو وردترین ماوەی جیهانی ژنو مێرد، بریتیە لەو چەند کاتەی شەوی یەکەمی بوكو زاوا، کە پڕە لە ئاواتو ئامانج، لەبەر ئەوە هەڵسوکەوتو ڕەفتارکردن لەم شەوەدا دەبێ زۆر بە ئاگاییو هێمنیو لەسەرخۆیی بێت چونکە:

لەم شەوەدا ئەو ئافرەتە هەست بە ترسێکی زۆر لەم پیاوە نامۆو غەریبە دەکاتو، هەست بە ترسیش دەکات لەم ژیانە نوێیەی، کە بۆی دەچێ.. لەبەر ئەوە پیاوی لێزان ئەو پیاوەیە بە باشی پێشوازی ئەم ئادەمیزادە هێمن و لەسەرخۆو خۆشەویستە شڵەژاو و دڵ ترساوە دەکات.

زۆربەی زۆری پیاوان توشی دو هەڵەی زۆر ناشیرین دەبن:

١- لە یەکەم شەوی زاوایدا، هەمو خەم و گرنگییەکی بریتی دەبێ لە لابردنی پەردەی کچێنی، جا بەهەر چ ڕێگاو وەسیلەو شێوەیەك بێت.

٢- لەم ئافرەتە تازەیەی، کە بوەتە خێزانی، ئومێدو چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکات، بە حوکمی واقیعەوە ئەم کارە قبوڵ بکات و پێی ڕازی بێت، بەبێ بونی هیچ پێشەکی‌یەك بۆ لابردنی پەردەی کچێنی، گەر هەندێك کەس ئەم جۆرە توندو تیژیەیان پێ پیاوەتی بێت، ئەوا ئیسلام حوکمی ئەوە دەدات، کە نەرم و نیانی و بەنەرمی جوڵانەوە لەگەڵ مرۆڤ دا، تەنانەت لەگەڵ ئاژەڵیش بە پیاوەتی(رجولة) دادەنێ! لەبەر ئەوە خۆشەویست ترین و بەنرخ ترین شت لەلای ئافرەت پەردەی کچێنییە، کە بەلای ئەوانەوە دەبێ بەبێ هیچ بەرگریەك دەبێ قبوڵی لابردنی بکات، ئەمەش لەبەین بردن و ڕوخاندنی فیترەتی ئافرەتەکەیەو، شەڕکردنە لەگەڵ سروشتی ئەم ئافرەتە..

لەم شەوەدا، شەوی زاوایی، چەندە بەسودو چاك و باشە باسی خێزانی بەختیار بکەیت و باسی ئەو ئاوات و ئامانجانە بکەی، کە لە دوارۆژدا دێنە دی. هەروەها باسی منداڵ بکرێ کە لەمەودوا خوا پێیان دەبەخشێ، کە مایەی خۆشی و بەختەوەری و شادی ناو ماڵەکەن، هەر لەم شەوەدا باسی خۆشەویستی خۆت بۆ ئافرەتەکە بکە، کە ئەوت لەلا خۆشەویستە، باسی جوانی و شۆخ و شەنگی ئەو بکە. هەروەها باسی ئەوەی بۆ بکە بەهۆی بەدیارخستنی جوانی و ڕازاوەیی بۆ پیاوی بێگانە توشی گوناهو تاوان دەبێت.. نەکەی بەبێ پێشەکی قسەکردن و دڵنیایی پەلە لە جوتبون بکەی، نەکەی دەستت بۆ هیچ شوێنێکی ببەی، یان یەکسەر ماچی بکەی یان یەکسەر شوێنی خۆت بگۆڕی و بچیتە تەنیشتیەوە.

ئیمامی شەرع زان (ابن الحزم) لە کتێبەکەیدا بەناوی (طوق الحمامة)دا دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ئەبوبەکری محمدی کوڕی حەجەری بۆی باس کردم، کە یەکێك لە پیاوە گەورەکانمان لە بەغدا، کچێکی بینی و خۆشەویستی کەوتە دڵیەوەو داخوازی کردو هێنای.. لە یەکەم شەوی زاواییدا بەبێ هیچ پێشەکی و قسەکردن و لاواندنەوە، چوە لای بە نیازی جوتبون، کاتێك کچەکە (زەکەر)ی پیاوەکەی بینی لەبەر گەورەیی لەبەر دەستی هەڵات و، نەیویست بچێتەوە لای پیاوەکە تا مردن. ئا بەم شێوەیە پەلەکردن لە جوتبون لە یەکەم شەوی زاوایی، بوە هۆی پچڕانی پەیوەندی دو کەس و لێك جیابونەوەیان. گەر ئەم پیاوە چاوەڕێی ئەوەی کردبایە، تا ئافرەتەکە دەهاتە ژێر بارو هێدی و هێمن دەبۆوە، ئەو کاتە حاڵی باشترو بەختیارتر دەبو.

دکتۆر فریدریك کهن لە کتێبەکەیدا بەناوی (حیاتنا الجنسیة)دا دەڵێ: نەزانی و کەم شارەزایی پیاو لەم حاڵەتە ئەستەمانەدا، ڕەنگە ببێتە هۆی کارەساتی ئازاردەر، کە ئاکامەکەی گواستنەوە بێ لەسەر جێی هاوسەریی بۆ نەخۆشخانەی شێتان، درێژەی ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کچێکی هەستدار لەبەر ڕەوشت جوانییەکەی، خەڵك خۆشیان دەویست، بەڕەزامەندی خۆی شوی کرد، بەڵام هیچ شتێ دەربارەی ژیانی ژن و مێردایەتی نەدەزانی، کەس و کاری و دەستگیرانەکەشی بایەخیان بەم مەسەلەیە نەدابو. لە شەوی گواستنەوەدا زاوا داوای لێکرد، کە بێتە ژێربارو ئامادەبێ بۆ جوتبون، کچەکەش نەیهێشت ئەم کارە بکات، بەڵام پیاوە دڕندەکە پەلاماری دا تا ئەو شتەی کە بە مافێکی شەرعی خۆی دەزانێ دەستەبەری بکات! لەبەرئەوە کچەکە تورە بو دەستی کرد بە شکاندنی کەل و پەلەکانی ناو ژورەکە، گەیشتە ڕادەیەك، کە ئەو پیاوانەی

لە ئوتێلەکەدا بون شڵەژان، لەجیاتی ئــەوەی پزیــشکی بــۆ بــانگ بکــەن، تەلەفۆنیان بۆ پیاوانی پۆلیس کردو ئەوانیش پەل بەستیان کــردو، بردیانــە نەخۆشخانەی شێتان..

لەبەرئەوە ترسان لە کرداری جنسی (جوتبون) چەند هۆکــارێکی هەیــە، گرنگترینیان لای پیاو ئەوەیە، کە لە هەرەتی گەنجێتی لەبــەر نەشــارەزایی ناتوانێ کارەکە بکات، هــەروەها لەبــەر ئــەو بیروبۆچــونە هەڵەیــەی، کــە دەربارەی جنسی وەرگرتوە، کچیش لەم دو هۆکارە بەشدارە، کە لە کرداری جنسی دەترسێ.

بە بۆنەی قسەکردن دەربارەی لادانی پــەردەی کــچێنی، پێویــستە ئــەم ئاماژەیە بکرێ، ئەویش ئەوەیە کــەوا زۆربــەی پیــاوان لــە چــەند شــەوانی یەکەمی زاوایەتیدا، ناتوانن ئەم پەردەیە لابدەن لە ئــەنجامی تامــەزرۆیی، یان لەبەر توندو رەقی پەردەی ئافرەتەکە، ئەمەش شتێکی سروشتیە. لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر هاورێو خزمەکانی هەردولا زۆر گرنگی نەدەنو گوێ نەدەن بە لانەدانی ئەم پەردەیە لە یەکەم شەودا. هەروەها گــوێ بــە قــسەو قــسەلۆك نــەدەنو گاڵتــە بــە زاوا نەکــەن، چــونکە رەنگــە بــەهۆی ئــەم سەرزەنشتکردنە، دوچاری ئامێر خاوبونــەوە ببــێ کــە شــتێکی ترســناکەو هەرەشــە لــە ژیــانی ژنو مێــرد دەکــات، خاوبونــەوەش دو جــۆری هەیــە ئەنــدامیی و دەرونــی (عــضوي و نەفــسی)، نەفــسیەکەی دەگەرێتــەوە بــۆ حاڵەتی مێشك.

ئاشکراو رونە، دەتوانم بڵێم ئەو کەسە سەرکەوتو و زاڵ دەبێ، گەر خۆی لە ناخەوە باوەری وا بی کە لەم کارەدا سەردەکەوێ!!

هەندێك کەس باسی داب و نەریتێکی خراپیان بۆ کردم کە لە هەندێ لە

لادێکاندا ڕو دەدات، ئەویش ئەوەیە گەر ئەو گەنجە لە یەکەم شەودا نەیتوانی ئەم پەردەیە لادات واتە بە زاوا نەبێ، ئەوا هاوڕێکانی گاڵتەو یاری پێدەکەن‌و تاوانی خاوی‌و شلی زەکەری دەدەنە پاڵ! بەڵام گەر بە زاوا ببێ‌و پەردەی کچێنی کچەکە لاببات، ئەوا هاوڕێ‌و نزیکەکانی بوکەکە هاواریان لێ هەڵدەستێ‌و، تاوانی ئارەزوی جنسی دەدەنە پاڵ، گوایە ئارەزوی هەڵساوە بۆیە لە یەکەم شەودا ملکەچ‌و تەسلیم بوە بۆ زاوا، کە بەزاوا ببێ!

لەبەرئەوە بەهۆی ئەم بیروبۆچونە هەڵەیەی هاوڕێ‌و نزیکەکانی، نایەڵێ زاوا جوت ببێ، زاواش ناچار دەبێ دەست بکات بە لێدانی بوکەکە بۆ ئەوەی ئەویش لەدەست گاڵتەجاڕی هاوڕێکانی دەرباز بێت.

وا لە خوارەوە باسی چۆنیەتی لابردنی پەردەی کچێنی دەکەین:

١- قسەی خۆش‌و وتەی شیرین‌و لاواندنەوەو پیا هەڵدان‌و بە نەرمی ڕەفتارکردن لەگەڵ ئافرەتەکە، کۆسپ‌و تەگەرە ناهێڵێ. چونکە بەرگریکردنی ئافرەت بۆ لابردنی پەردەی کچێنی بەم وتە شیرین‌و قسەخۆش‌و لاواندنەوەیە، هیچی نامێنێ‌و پەردەکە بە ئاسانی لادەدرێ‌و ڕەقایی نامێنێ.

٢- گەر لەدوای لابردنی پەردەی کچێنی بەربونی خوێن (نزیف الدم) بەردەوام بو، ئەوکاتە پێویستە ئافرەتەکە بە حەساوەیی بێنێتەوەو، هەردو ڕانی بۆ ماوەیەك پێکەوە بنوسێنێ. پێویستیشە لەسەر پیاوەکە چاوەڕوان بکاو ئارام بگرێ‌و نەچێتەوە لای، تا خوێنەکە دەوەستێ.

٣- لەسەر ئافرەتەکە پێویستە دوای نەمانی پەردەی کچێنی گرنگی بەپاك‌و خاوێنی بدات‌و مەوادی پاك کەرەوە بەکاربهێنێ، تا برینەکەی

چاك دەبێتەوە، پێویستە پیاوەکەش تا خوێنەکە ڕادەوەستێ لەگەڵی جوت نەبێتەوە.

٤- پێویستە لەسەر پیاو بەر لە جوتبون، بە وەزەلین زەکەری چەور بکات، ئەوەش بۆ ئەوەی ئافرەتەکە هەست بە ئازار نەکات و نەبادا دوچاری بەربونی خوێن (نزيف الدم) بێت.

٥- گەر لەو چەند ڕۆژانەی یەکەم و هەفتەی یەکەم، ئەم پەردەیە لانەدراو بە زەحمەت لادەدرا، ئەوا دەبێ بچنە لای پزیشك و ئەو خواردن و خواردنەوانە بخۆن و مەوادی بەهێزکەر بەکاربێنن، کە پزیشکەکان ئاماژەی بۆ دەکەن وەك: گۆشت و قەرنابیت و هێلکەو برنج و ماسی و گێزەرو بیبەرو لیمۆو پیازو کەرەوزو مەعدەنۆس و نەعناو سلق و قاچی گوێرەکەو گۆشتی باڵندە.

ئەو هۆیانەی دەبنە هۆی کزی ئارەزوی جنسی بریتین لە هەبونی ئازارو نەخۆشی توندو زۆر ماندوبون لە ئیش وکارداو وەرزش نەکردن.

ئەوەی یارمەتی لادان و لابردنی پەردەی کچێنی دەداو ئاسانی دەکات جوتبونی کاتی بەیانی یە، چونکە زەکەری پیاو پێش میزکردن چالاك و بەهێز دەبێ.

لە عومەری کوڕی خەتتابەوە ﷺ هاتوە کەوا بڕیاری دا ئەو پیاوەی دوچاری نەرم و شلی زەکەر بوە ماوەی ساڵێك ژنەکە نەگوازێتەوە، تا خۆی چارەسەر دەکات، جا گەر ئەم خاوی و شلی یە لە ساڵێك زیاتر درێژەی کێشا، ئەوا قازی لە یەکتریان جیادەکاتەوە، گەر ژنەکەی داوای کرد لێی جیاببێتەوە.

جوانترین شت کە لە تەفسیرەکان بەدیم کردوە ڕاڤەی فەرمودەی خوایە

کە دەفەرموێ: ﴿اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَى قُوَّتِكُمْ﴾ (هود- ٥٢).

لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەوە وەردەگیرێ کە داوای لێخۆشبون کردن لەخوا رزق و رۆزی زیاد دەکات و یارمەتی توانای جوتبون دەدات، بە بەڵگەی ئەم ئایەتە ﴿وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَى قُوَّتِكُمْ﴾ و فەرمودەی ﴿وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ﴾، ئەمەو جگە لە پاداشتی رۆژی دوایی ﴿وَيَجْعَلْ لَكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَلْ لَكُمْ أَنْهَارًا﴾.

لەوەی باسکرا ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە یارمەتیدەری بەهێزکردنی پیاو بریتیە لە دوعاو پاڕانەوە لەخوای گەورە، هەروەك لە فەرمودەی (صحیح) هاتوە کە دەفەرموێ: ((اللَّهُمَّ مَتِّعْنَا بِأَسْمَاعِنَا وَأَبْصَارِنَا وَقُوَّتِنَا مَا أَحْيَيْتَنَا وَاجْعَلْهُ الْوَارِثَ مِنَّا)).

جا گەر پیاو نەیتوانی پەردەی کچێنی، لەبەر توندو رەقی لاببات، ئەوکاتە پێویستە سەردانی پزیشکی خۆی بکات، تا بە نەشتەرگەریەکی ئاسان لای ببات..

بەهەر حاڵ پێویستە بەرلەوەی پیاو ژن بگوازێتەوە، بپشکنرێ و فەحس بکرێ، نەبادا دوچاری خاو و شلی زەکەر بوبێ، کە بەردەوام بێ و چارەسەر نەکرێ.

لەبەرئەوە گەمەو یاری کردن و لاواندنەوە، لەگەڵ خێزان هونەرێکی گرنگە، کە بەردەوامی خۆشی و شادی و ژیانی ژن و مێردی لەسەر بەند دەبێ، پێغەمبەرﷺ پێش چواردە سەدە بە ڕاشکاوی ئاگاداری کردوین، وەك لەو چەند ریوایەتانەی باس کران، زانستی دەرونناسیش لەم سەدانەی

دواییدا، هاتو گرنگی گەمەو یاریو بە نەرمی جوڵانەوە لەگەڵ خێزانـدا بەدیار خست.

یەکێك لە زانایان دەڵێ: ژنو مێردی نمونەیی ئەوەیـە، کـە هـەردوکیان پێکەوە ئارەزوی جوتبونیان ببێ. لە پێویستییەکانی بەشداری هەردوکیان: یەکسان بونە لە مافەکانی یەکتریو وەك یەك چـێژ لـە جوتبـون وەرگـرن. پێویستە لە یەکەم کاتی دەستپێکردنی جوتبون، گەمەو یاری لەنێوانیانـدا بێ، چونکە نەبونی وتەی شیرینو گەمـەو یـاری دەبێتـە هـۆی دڵتـەنگی ئافرەتەکەو ڕەشبینی لەلا دروست دەبێو، تەنگ بە ژن هەڵدەچنێو ئازاری دەرونی دەدات.

گوێ نەدان بە قسەی خۆشو گەمەو یاری، نیشانەی گێژیو گێلـییـە، چونکە یـاری کـردن لەگـەڵ خێـزان هونـەرێکی پـڕ لـە خۆشـیو لـەزەت وەرگرتنە. لەزەتی گەمەو یاری کردنیش لە لەزەتو تامی جوتبون کـەمتر نیە!

قسەو تەماشاکردن بۆ سەرەتای جوتبون گرنگی خۆی هەیە، چونکە لەم قۆناغە نوێیەدا دەربڕی هەستو نەستە. لەوکاتەدا نەفس لە جەستە زیـاتر ئامادەیی هەیە بۆ کارتێکردنو وروژاندن، ئەگەرچی ئەم کارانە بە بـچوکی دێتە بەرچاو، بەڵام زۆر گرنگە. دیارە هەستی بۆنکردن پەیوەندی بەلایـەنی جنـسیەوە هەیـە. (ڕۆسـۆ)ش گوتویـەتی: بـۆنو عـەتر لـە ژوری نوسـتن کاریگەری خۆی هەیە.

یـاریکردنو دەسـتبازی، جێبەجێکـەری ئـەو کـارە پێویـستانەیە بـۆ سەرەتای پەیوەندیە جنسیەکانی هاوسەرایەتی، دەسـتبازی لـە نێـوان ژنو مێرد شتێکی خۆشو جوانە، هەستە جنسیەکان نوێ دەکاتەوە..

پێویستە لە هاوسەرگرتنی نمونەیی، لایەنی هونەری کردەیی تێدا بنوێنرێ. پێویستە گرنگی بە دەستبازیو ئیعجاب بون بە ژن بە ئەندازەی پێویستو لەکاتی گونجاو بدرێ.

زانایەکی دەرونناسی پسپۆڕ بە کێشەکانی جنس لەژێر ناونیشانی (المغازلة والمداعبة) گوتویەتی:

(بزانە تەنها ئەوەندە بەس نیە پیاو ئارەزومەندی هاوسەرەکەی بێتو بەسۆز بێت بۆ ئەوەی یەکجار بۆی بێتە ژێربارو بۆی تەسلیم بێ، بەڵکە دەبێ لەکاتی هەر پێکگەیشتنێك، ئارەزومەندی بێتو بیلاوێنێتەوەو قسەی خۆشی لەگەڵدا بکات، چونکە هەر پێك گەیشتنێك نمونەی زەواجێکی نوێیە!)

دەربارەی بەباشتر دانانی ئەو مێردە ناشیرینەی دەستبازیو یاریکردن بەباشی دەزانێ، لەو مێردە جوانەی کە وشکە و دەستبازی ناکات، پەندی کۆمەڵایەتی لەسەر هاتوە کە دەڵێ: (پیاوەکە دڕندەیە، بەڵام بە جوڵەجوڵو ئارەزومەندە!!)

ئادەمیزاد دو پێویستی جوتێنەی لەسەرە، لەسەریەتی خۆشەویستی بخاتە دڵی خۆشەویستەکەی، کە پەڕەی دڵی ئافرەتەکە دابگرێو پێوەی شەیدا بێ، هەتا وای لێدێ بەڕادەیەك سۆزی دەبزوێ، کە ئامادەیی تەواوی دەبێ بۆ جوتبون!

دیارە غەرامو خۆشەویستی ئافرەت بەهۆی دڵیو عەقڵیەوە گەرم دادێ، لەبەرئەوە مێردی بەڕێزو فامیدە خۆشەویستی خۆیو سۆزو عاتیفەی خۆی فەرامۆشو پشت گوێ ناخات، هەتا خۆشەویستی لە ئاسمانی عەقڵی هەردوکیان هەڵدەفڕێ.

ژن ئامادەکردن بۆ پێك گەیشتن (جوتبون) تەنها کردارێکی مرۆیی نیە، کە مەبەست پێی نەهێشتنی ئازاردانی بێ، بەڵکو کارێکی سودبەخشی گەورەیە بۆ خودی پیاوەکە، چونکە بەهۆی گۆڕینەوەی هەستو ئیحساسی ژنو مێرد بۆ یەکتری، پیاو ئەوپەڕی چێژو لەزەت وەردەگرێ.

لە کتێبی (تحفة العروس ونزهة النفوس)ی (أبا عبدالله بن احمد التيجاني) (أبو الريحان) لە کتێبەکەی (بالجواهر) هاتوە کە دەڵێ:

(پاشایەك شێتو شەیدای ئافرەت بو، کە جوت دەبو حەزی دەکرد دوبارەی کاتەوە، جا بینی زەکەری لە جوڵەو چالاکیدا کزو بێهێز بوە، جا حەوزێکی پڕکرد لە جیوەو رایەخی لەسەر راخست بۆ ئەوەی لەسەری جوت بێ، جیوەکەش دەیجوڵاندەوە بێئەوەی خۆی بجوڵێتەوە، بەمەش لەزەتو چێژی وەردەگرت).

پۆلیسێك پێی راگەیاندم ژنێکی گەنجی مێرداری بینی زینای دەکرد، ئەو ژنە مێردێکی جوانی هەبو، پۆلیسەکە سەری سوڕمابو لەوەی چۆن زینا دەکاو ئەو مێردە جوانەی هەیە؟ کە پرسیاری لێکرد بۆچی زینا دەکەی، گوتی: مێردەکەم تا ئێستا نازانێ ڕانم چۆنە، ئەو عادەتی وایە هەر دەیەوێ تەنها جوت بێو ئارەزوی خۆی تێر بکات، بێئەوەی دەستبازیو یاری بکات!

هەندێ لە شارەزاو ئامۆژگاریکاران گوتویانە: ناشیرینترینو خراپترین نەزانیو دەستەپاچەیی ئەوەیە، پیاو لەگەڵ ژنەکەی جوت ببێ بەرلەوەی قسەی لەگەڵ بکاتو بیلاوێنێتەوەو دەستبازی لەگەڵدا بکات.

دەبێ پیاو ئاگاداربێ نەکا، کە خۆی گەیشتە نەشئەو خۆشی، واز لە ژنەکەی بێنێ تا ئەویش دەگاتە خۆشی..

(ماری ستۆپ) کە ئافرەتێکی دەروونناسە دەڵێ:

(ئەوانەی دەربارەی جنس دەنوسن و ئەزمونەکانیان بە گوێرەی پێشکەوتنی دەروونناسی پیادە دەکەن دیدیان وایە" باشترین شت بوك بیکات ئەوەیە، کە لە کرداری جنسی بەشداری مێردەکەی بکات، چونکە بوکەکە رێنمایی دەکات کە چۆن پەردەکە لا ببات، بەوەش هەست بە کەمێك ئازار دەکات (گەر پەردەکە رەق بێت).

بەڵام ئەو پیاوەی کە بە تەنها دەیەوێ پەردەکە لا ببات، بە دڵنیاییەوە دەڵێم ئەو پیاوە لەوپەڕی چێژو خۆشی دایە، ئەو خۆشیە وای لێدەکات کوێر بێ و هەست بەو ئازارە نەکات، کە کچەکە دوچاری دەبێت.. بەم کردەوەیە بوك وا بە خەیاڵیدا دێت، کە مێردەکەی تەنها بایەخ بە ئارەزوەکانی دەدات، بالەسەر حیسابی هەراسان کردن و ئازاردانی خێزانەکەشی بێت.)

گەر ژن بە کردو کۆشی خۆی بەشداری مێردەکەی بکات کەوا لێك تێگەیشتنیان هەبێ و ئەو شێوازە بەکاربێنن، کە هەردولا پێی ڕازین، ئەوکاتە ئازارەکە کەم دەبێتەوە، ژنەکەش ئەوکاتە خۆی لە مێردەکەی دور ناخاتەوە.

هەروەها بۆ ئەوەی جوتبون بە سروشتی و بە خۆشی ئەنجام بدرێت، پێویستە ژن بەشداری مێردی بکات بۆ گەیشتن بەوپەڕی چێژو خۆشی، کە هەردولا دەیخوازن.

لە جوتبوندا نابێ تەنها یەك کەس وەڵامی هەبێ و ئەوی تر نەیبێ، بەڵکە دەبێ هەردوکیان بە ڕۆح و جەستەو دەرونەوە ئاوێتەی یەکتری بن، جا ئەم ئاوێتەبونەی هەریەکێك لە ژن و مێرد بە شەوق و سۆزو ئارەزو و

تەفاهوم بۆ یەکتری، ڕەنگێکی زۆر جوان و سەرنج ڕاکێش بە چێژو لەزەتی جوتبون دەبەخشێ.

بەڵام لەو حاڵەتەی ژن بەسلبیانە رەفتار بکات، هەروەك هەندێ ئافرەت ئەم حاڵەت و شوێنانە بیر لەوە دەکەنەوە، کە بە سلبیانە ڕەفتار بکەن، گەر ژن لەم کارەدا پیاوی بەتەنیا هێشتەوە، کە تەنها پیاو وەڵامی هەبێ، ئەوا زۆر لە ئیعتبارەکان بەفیڕۆو بەهەدەر دەچێ، دەربڕینی خۆشەویستیش کەم و کورتی دەبێ، گەر بەشداری هەردوکیانی تێدا نەبێ و بەئارەزوی هەردولا نەبێ. هەروەها خودی جوتبونیش چێژو خۆشی تەواو لەدەست دەدات، چونکە وەڵام نەدانەوەو وشکی ژن جوانترین و خۆشترین کاتی جوتبون لەناو دەبات.. کاتێك ئەوپەڕی چێژو خۆشی لە جوتبون وەردەگیرێ، کە ژن و مێرد بەیەکەوە تێیدا بەشدار بن.

گرنگترین شت پێویستە پیاو لە شەوی زاوایی‌دا ڕەچاوی بکات، ڕاگرتنی سۆزی ژنەکەیەتی. چونکە ئەم ئافرەتە ماڵی خۆی واز هێناوەو هاتۆتە ماڵێکی نوێ، کە پێشتر تیایدا نەژیاوەو لێی ڕانەهاتوەو هەست بەشەرم دەکات. لە سەروی ئەوانەشەوە پیاو دەبێ لەم شەوەدا زۆر لێزان بێ و ئەم شەوە بکاتە بەهێزکردنی پەیوەندی خۆشەویستی و هاوڕێیەتی، نەیکاتە شەوی هەراسان و بەدیار خستنی تواناو هێزو پیاوەتی و، لەناکاو نەچێتە لای. پێویستیشە یەکسەر دەست بە جوتبون نەکات تا ئەوکاتەی دەزانێ خێزانەکەی ئامادەیی هەیە، ئەگینا گەر ئامادەیی جوتبونی نەبو، دەبێ بۆ کاتێکی تر دوای بخات.

پێش ئەوەی کۆتایی بەباسی هونەری گەمەو دەستبازی خێزان بێنین، کە پێغەمبەرﷺ ئەمری لەسەر کردوە، دەمەوێ سەرنج بۆ ماوەی یاری کردن

لەپاش جوتبون ڕابکێشم. یەکێ لە زانا پسپۆڕەکانی جنس دەڵێ:

گەمەو یاری کردنی نێوان ژن و مێرد گرنگی‌یەکی گەورەی لە پەیوەندی یەکانی هەیە جنسی، کە پشتگوێ خراوە. زۆربەی پیاوان کردویانەتە خو لەدوای جوتبون لە ژنەکەیان دور دەکەونەوە، ئەوەش نیشانەی نەفامی‌و گێلی‌یە، ڕوی وەرئەگێڕی‌و لە خەودا نقوم دەبێ. ئافرەتەکەش ئەو کاتە هەست بە دابەزینی جنس دەکات‌و بێبەش دەبێت لە گەورەترین ماوەی سۆزو عاتیفەو خۆشی‌و لەزەت وەرگرتن.

ئێستاش با بێینەوە سەر فەرمودەکەی سەرەتا هێنامان: لە کتێبی (التاج الجامع للاصول في أحاديث الرسول) تەعلیقێك لەسەر ئەم فەرمودەیە هاتوە کە ئەوەش کورتەی باسەکەیەو دەڵێ: لەو کاتەی پێغەمبەر زانی جابر بێوەژنێکی هێناوە، پێی فەرمو: ((ما لك وللعذارى ولعابها؟!)) ، بە واتای : گەر کچ بوایە باشتر بو، تا گەمەو یاری لەگەڵ بکەی یان لیکی زمانی بمژی. ئەمەش ئاماژەیە بۆ مژینی لێو زمان کە لەکاتی گەمەو یاری لەگەڵ خێزان ئەنجام دەدرێ!!

دەربارەی یەکەم کاری هاتنەژورەوەی پێغەمبەرﷺ، لە خاتو عائیشە ڕەزای خوای لێبێ پرسیار کرا، ئەویش گوتی: پێغەمبەر سیواك دەکات! ڕەنگە ئەم سیواك کردنەش بۆ پاك کردنەوەی ددانەکانی بوبێ، تا بە ماچی گەرم پێشوازی لە خێزانەکەی بکات. ئەم جۆرە ماچ کردنەش بەختیاری‌و کامەرانی بەدەست دێنێ‌و هەمو خەم‌و پەژارەیەکی ژیان لا دەدات! لەبەرئەوە وا باش‌و چاکە کاتێك پیاو دەچێتە ماڵەوەو دێتە ددرەوە خێزانەکەی ماچ بکات، تا خۆشەویستی‌یان زیاتر بێت‌و، هەردەم ئەوەیان لەبیر بێت کە لەسەر پەیمانی خۆشویستنی یەکترین.

ئەم فەرمودەیە تیشك دەخاتە سەر ڕۆڵ و گرنگی (دەم) لەکاتی گەمەو یاری کردنی پیاو لەگەڵ ژنەکەی. زانستە دەرونیەکان (العلوم النفسیة) کاریگەری لیکی زمانیان بەدیار خستوە، (ماری ستۆب) کە پسپۆڕێکی دەرونی ئافرەتانەو دەربارەی ئارەزوی جنسی ئافرەتان بە ڕاشکاوی و بێپەردەو بە ئاشکرا دەردەبڕێ و دەڵێ:

لەسەر پیاوی ژندار پێویستە دەمی ژنەکەی ماچ بکات، کاتێك ژنەکەی بۆی ملکەچ بو و هاتە ژێر بارو وەڵامی بە دەمی دایەوە، واتە ئەویش ماچی دەمی پیاوەکەی کرد، ئەو کاتە نابێ بە تەنها لێوی ماچ بکات، بەڵکو دەبێ زمان و لیکی بمژێ[1]. ئەمانەش هەموی دەبێتە هۆی بزواندن و چالاك کردنی هەستی جنسی، هەروەها دەبێ جگە لە ماچ کردنی دەمی خێزانەکەی، دەبێ شوێنی تری هەستیار (حساس) ماچ بکات وەك گوێ و گەردن و سینگ.

---

١) لە کتێبی (مصابیح السنة)ی البغوي بەرگی دوەم هاتوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕۆژو بوەو خاتو عائیشەی ماچ کردوەو، زمانی مژتوە (عن عائشة رضي الله عنها أن النبي كان يقبلها وهو صائم، ويمص لسانها) أخرجه أحمد في المسند وأبوداود في السنن وأخرجه البيهقي في السنن الكبرى. -وەرگێڕ-

## یـاری و دەستبازی کردن لە مـاوەی حەیـزدا

لە بارەی چونە لای خێزان لەکاتی حـەیزدا پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ((اصنعوا كل شيءٍ الاّ النكـاح، -وفي لفـظ- الجمـاع))[١]، واتـە: لەماوەی حەیزدا لەگەڵ خێزان هەمو شتێ بکەن تەنها جوتبون نەبێ.

((ورد عن أزواج النبـي أنهﷺ كان اذا أراد من الحائض شيئاً، ألقى على فرجهـا شـيئاً، ثم صـنع مـا أراد))[٢]، واتـە: لـە خێزانـەکانی پێغەمبەرﷺ هاتوە کەوا پێغەمبەرﷺ گەر بیویستایە بـچێتە لای یـەکێك لە خێزانەکانی، کە لـە مـاوەی حـەیزدا بوبـان، شـتێکی بەسـەر فـەرجی خێزانەکەیدا دەدا، ئنجا ئەوەی بیویستایە لەگەڵی دەکرد[٣].

---

١) رواه الجماعة الاّ البخاري.

٢) رواه أبوداود والحافظ العراقي.

٣) حیکمەتی ئیسلام چەند جوانە، کە میانڕەوە لەنێوان ئەوەی کـە جولەکـە بیروباوەڕیـان وایە حەرامە لەگەڵ ئافرەتی حـەیزدار لـە یـەك ژوردا بخـەون، بیروبـاوەڕی گاورەکـانیش ئەوەیە، کە بەلایانەوە حەڵاڵە لەگەڵ ئافرەتی حەیزدار جوت بن.

## گەمەو یاریکردن لەگەڵ خێزان لەکاتی خۆشتندا

خاتو عائیشە رەزای خوای لـێبێ گوتویەتی: ((كنت أغتسل أنا و رسول الله من إناء بيني وبينه، تختلف أيدينا عليه: فيبادرني حتى أقول: دع لي دع لي![1] قالت وهما

---

١) لە ئەنجام گیری ئەم فەرمودە ڕاستەدا دو حوکم وەردەگرین:
یەکەم: دەست کەوتن بە ئافرەت دەستنوێژ ناشکێنێ، سەرەڕای فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە خێزانی خۆی ماچ کردوەو چوە بۆ نوێژو دەستنوێژی نەگرتۆتەوە، ئەم بابەتەش لە شوێنی تر باسکراوە.

بەهۆی نەزانینی ئەم حوکمەوە، چەندەها ژن‌و مێرد کێشەو ناکۆکیان کەوتۆتە بەینەوە، گوایە تەنها بە دەست لێدان دەستنوێژ دەشکێ! دیارە ئەوەش هیچ بەڵگەیەکی نیە، (ملامسة)ش کە لە ئایەتەکەدا هاتوە مانای جوتبونە هەروەك ئیبن عەبباس‌و کەسانی تر ئاوایان گوتوە. هەندێك پێشەواش هەمان رایان هەیە! کەوایە با ژن‌و مێرد ئەم هەڵە لەدەست نەدەن!!

رەحمەتی خوا لە پێشەوا شافیعی بێت، کە گوتویەتی -هەروەك گشت پێشەواکانیش هەمان قسەیان گوتوە-: (مسوڵمانان کۆڕان لەسەر ئەوەی گەر کەسێك لە پێغەمبەری خواوە ﷺ سوننەتێکی بۆ دەرکەوت، بۆی دروست نیە ئەم سوننەتە بۆ قسەی هیچ کەسێك لـێگەڕێ و بەلاوە نێ!)، پێشەوا ئەحمەدی کوری حەنبەل (رەحمەتی خوای لـێبێ) گوتویەتی: (هەرکەسێك فەرمودەی پێغەمبەری خوا ﷺ رەت بکاتەوە ئەو کەسە لەسەر لێواری تیاچونە!!).

گەر ئەمڕۆ مسوڵمانان رێك بکەون لەسەر ئەوەی، کەوا فەرمودەی پێغەمبەر فەرمانڕەوا بێ، هەروەك خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی ﷺ و گشت پێشەوایان فەرمانیان کردوە، ئەوا ئەو کاتە دەبونە یەك مەزهەب، هەروەك یارانی پێغەمبەر لەسەر یەك مەزهەب بون. ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە دوای پێشەواکان فەرمودەکان کۆکراونەتەوە.. شەعرانی لە کتێبی (الميزان)دا گوتویەتی، کە ماناکەی ئەوە دەگەیەنێ: گەر ئەمڕۆ ئەبوحەنیفە بێت، هەروەها پێشەواکانی تریش-، ئەوا لە زۆر رایەکانی پەشیمان دەبۆوە لەبەر ئەوەی دوای ئەو، فەرمودەکانی پێغەمبەر کۆکرانەوە.

جنـــبان))[1]، واتە: منو پێغەمبەری خوا لەشمان گران بو و بێنوێژ بوینو پێکەوە خۆمان دەشوت لەیەك مەنجەڵ دا، جا هەردوکمان دەستمان ئەبرد بۆ ئاوەکەو پێغەمبەر زوترو لەپێش من دەستی بۆ ئاوەکە دەبرد بۆ ئەوەی ئاوەکە بەخۆیدا بکاتو منیش پێم ئەوت بۆ منیش لـێگەڕێ بـۆ منـیش لـێگەڕێ تا ئاوەکە بەخۆم دا بکەم.

---

دوەم: حافظ لە کتێبی (الفتح)١-٢٩٠دا گوتویەتی: داودی ئەم فەرمودەیەی کردۆتە بەڵگە بۆ ئەوەی، کە دروستە پیاو تەماشای داوێنی ژنەکەی بکات، بە پێچەوانەوەش ژنەکەی دروستە تەماشای زەکەری پیاوەکەی بکات.

لە کتێبی (آداب الزفاف)ی شیخ محمد ناصرالدین الألباني هاتوە، کە ئەمە کورتەکەیەتی: ئەم فەرمودەیە ئەوە پوچەڵ دەکاتەوە، کە خاتو عائیشە گێڕاویەتیەوە کە گوتویەتی: (ما رأيت عورة رسول الله ﷺ قط) هەرگیز عەورەتی پێغەمبەری خوام نەبینیوە.. ئەم ریوایەتە راست نیە، چونکە یەکێ لە راویەکانی درۆزنێکی فەرمودە هەڵبەستەرە، ئەوەی تریش نەناسراو (مجهول)ە!

بۆیە (العراقي) لە کتێبی (تخريج الأحياء)٢-٤٦ بڕاندویەتیەوە، کە سەنەدەکەی لاواز (ضعيف)ە، نەسائیش گوتویەتی: فەرمودەیەکی (منکر)ە، ئەو بەناو فەرمودەیەش کە دەڵێ: ((إذا جامع أحدكم زوجته أو جاريته، فلا ينظر الى فرجها، فإنه يورث العمى ... گەر یەکێك لە ئێوە لەگەڵ هاوسەرەکەی، یان کەنیزەکەی جوتبو، با تەماشای داوێنی نەکات، چونکە کوێریی بۆماوە بەجێ دێڵێ))، ئەوەش هەڵبەستراو (موضوع)ە هەروەك أبوحاتم الرازيو (ابن حبان)و (ابن الجوزي)و کەسانی تریش هەمان رایان هەیە.

هەروەها ئە فەرمودەیەش (ضعيف)ە کە دەڵێ: ((إذا أتى أحدكم أهله، فليستتر ولا يتجردا تجرد البعيرين!... گەر یەکێك لە ئێوە لەگەڵ خێزانی جوتبو، با خۆی داپۆشێو خۆیان وەك حوشتری نێرو مێ روت نەکەنەوە)).

دەکرێ ئایەتی ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ﴾ بکەینە بەڵگە بۆ بەباش دانانی خۆ روتکردنەوەی ژنو مێرد بۆ یەکتری لەکاتی جوتبوندا، کە ئەوکاتە دوای ئەوەی جلەکانی دادەکەنێو مێردەکەی لە ئامێزی دەگرێ، هەریەکە دەبێتە پۆشاك بۆ ئەوی تر.

١) رواه البخاري ومسلم وغيرهم.

# خۆشەویستی یەکی پێغەمبەر و گەمەکردنێکی خۆش

خاتو عائیشە رەزای خوای لێ بێ گوتویەتی: ((كنت أشرب وأنا حائض -أي من إناء النبيﷺ- فيضع فاه على موضع فيّ، فيشرب! وأتعرّق العرْق، وأنا حائض ثم أناوله النبيﷺ فيضع فاهُ على موضع فيّ!))[١]، واتە: من لە حەیزدا بوم لە جامی پێغەمبەر ئاوم دەخواردەوە. جا پێغەمبەرﷺ دەمی خستە سەر ئەو شوێنەی کە دەمم پێوەنابو، ئاوەکەی خواردەوەو ئێسکە گۆشتم دەکڕاندەوەو لە حەیزدا بوم، پاشان ئەم دا بە پێغەمبەر دەمی دەخستە سەر ئەو شوێنەی، کە کڕاندبومەوە.

گەر سەرنجی ئەم فەرمودە بدەین، خۆشەویستی ژن و مێردی مسولمان بەدەر دەخات، ئەویش گەمەو یاری کردنە. جا ئەو خۆشەویستی یە لەکوێ و ئەودی لە خوارەوە باسی دەکەین لەکوێ؟

ئەویش ئەوەیە کە پیاوێك سێوێکی دا بە ژنەکەی بیخوات، کە خۆی پارچەیەکی لێ خواردبو، جا ژنەکەی چەقۆیەکی هێنا، مێردەکەی پێی گوت: ئەوە چ دەکەی؟! ژنەکەی گوتی: دەمەوێ شوێنەواری ددانەکانت لەسەر سێوەکە لابدەم، کە لێت خواردوە. یەکسەر پیاوەکەش لەسەر ئەو کارە تەڵاقی دا.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((اذا أكل أحدكم طعاماً، فلا يمسح يده

---

١) رواه مسلم.

حتی یَلْعَقها أو یُلعَقها))[1]، واتە: گەر یەکێك لە ئێوە خواردنێکی خـوارد، با دەسـتی نەسـڕێتەوە تـا پەنجـەکانی بـە زمـان دەلێـسێتەوە یـان بـۆی دەلێسنەوە. واتا خێزانەکەی بۆی بلێسێتەوە.

مەبەستی ئەم فەرمودە پیرۆزە ئاراسـتەدەرە ئەوەیـە کـە پیـاو داوا لـە خێزانەکەی بکات لەدوای خواردن پەنجەکانی دەستی بۆ بلێسێتەوە، گەر بۆ خۆی نەیلێسایەوە. گومانی تێدا نیە لێستنەوەی پەنجەکانی پیاو لە لایـەن خێزانەکەی گەمەو یاری‌و جنس بزواندنێکی زۆر جوان‌و چاکە، کە زۆر جار بە سەلامەتی کۆتایی نایەت، واتە جوتبون ئەنجام دەدرێ.

---

١) رواه مسلم

## یـاری کردن لەگـەڵ خێـزان
## بە کورت کردنەوەی نـاوەکـەی

بوخاری‌و موسلیم گێڕاویەتیانەوە کە پێغەمبەرﷺ بە خـاتو عـائیـشەی فـەرمو: ((**یا عائش! هذا جبریل یقرئك السلام، قالت عائشة: وعلیـه السلام ورحمة الله وبرکاته، وهو یری ما لا أری**)).

واتە: ئـەی عـەیـشۆك! ئەمـە جوبرائیلـە سـڵاوت لـێ دەکـات، خـاتو عائیشەش گوتی: سڵاو و ڕەحمەتی خوا لەویش بێ، ئەو شـتێ ئەبینی کـە من ناتوانم بیبینم[١].

١) لەم فەرمودەیەدا ئەوە بەدەردەکەوێ‌و لێـی وەردەگـیرێ، کـەوا بـەباش دەزانـرێ پیـاو خێزانەکەی خۆی بە کورتکردنەوەی ناوەکەی بانگ بکات وەك بڵێ: (شنە) لەجیاتی شنۆ یان (ئاڤە) ئاڤان یان (بەنە) لەجیاتی بەناز (سۆزە) لەجیاتی سۆزان... هتد. گەر وشـەی (خان)ی لەگەڵ بەکاربهێنی ئەوا باشتر‌و خۆشەویستی ژن‌و مێرد زیـاتر دەبێـت. ((بـەڵام بەداخەوە ئێمە لەکوێ‌و ئەم فەرمودەیە جوانە لەکوێ، ئێمـە لـەجیاتی دەربـڕینی سـۆز‌و خۆشەویستی بۆ خێزانەکانمان، ئێمە بە چاوێکی سوك‌و بەناوێکی سوکەوە بانگی ئـافرەت دەکەین‌و بەچاوی خزمەتکار‌و کۆیلە‌و ژێردەسـتە سـەیری دەکـەین کـە ئەوانـە هـەموی ئیسلام لێی بەرییە. -وەرگێڕ-

## بــەرز راگرتنـی یــاری لەگــەڵ خێـزان

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((كل شيء ليس من ذكر الله، لــهوٌ وَلَعِبٌ إلاّ أن يكون أربعـــة:

١- ملاعبة الرجل امرأتـــه.

٢- وتأديب الرجل فرســـه.

٣- ومشي الرجل بين الغرضين.

٤- وتعليم الرجل السباحة))(١).

واتە: هەمو شتێك كە دەكرێ و ئەنجام دەدرێ، گەر یادی خـوای لەگـەڵ نەبو ئەوا بێ‌ماناو بێ‌هودەیە تەنها چوار شت نەبێ:

١- كاتێك پیاو گەمەو یاری لەگەڵ خێزانەكەی دەكات.

٢- كاتێك پیاو مەشق و ڕاهێنان بە ئەسپەكەی دەكات.

٣- كاتێك پیاو لەنێوان دو نیشانەی تیر هاویـشتن دێ و دەچـێ. ئـەوەش پێشبڕكێ دەگرێتەوە.

٤- كاتێك پیاو فێری مەلەوانی دەبێ و خۆ فێر دەكات.

ئەم جۆرە (لەهو)ە حەڵاڵانە زۆر كاریگەرو گەورەن، كە میللەتی ئیسلام لەسـەر بـەهێزی و ئامـادەكردنی نـەوە (جیـل)ێكـی وەرزشـی سـەركەوتو ڕادەهێنێ.

لە مەسەلەی یاری و گەمەكردنی خێـزان چـەندەها ئاكـارو ئـادابی زۆر هەیە وەك خاوەنی كتێبی (التـاج الجـامع للاصـول) دەڵـێ: (بـە هێمنـی و

---

١) رواه النسائي (حديث صحيح).

لەسەرخۆیی ڕەفتارکردن لەگەڵ ژن‌و، ئارام گرتن لەکاتی جوتبون، تا ئەویش دەگاتە نەشئەو خۆشی بە پێویست دادەنرێ، هەروەها گاڵتەو گەمەو یاری کردنیش لەگەڵیدا، پێویستی‌یەکە بۆ بەردەوام بونی خۆشویستنی یەکتری)، وەك لە فەرمودەیەکدا هاتوە، کە سەنەدەکەی (صحیح) نیە، بەڵام ماناکەی (صحیح)ە، کە دەفەرموێ: ((لا يقع أحدكم على أهله كما تقع البهيمة. وَلْيَكُنْ بينهما رسول: القبلة والكلام!))، واتە: کاتێك یەکێك لە ئێوە دەچێتە لای خێزانەکەی بۆ جوتبون یەکسەر ڕاستەوخۆ وەك ئاژەڵ نەچێتە سەری‌و جوت نەبێ، بەڵکو دەبێ لە نێوان یەکتریدا نێردراو (رسول) هەبێ واتە: ماچ و قسەی خۆش.

پێوستە لەسەر ئەو کەسانەی بەزویی‌و خێرا ئاویان دێتەوە، با بۆ جوتبون پەلە نەکەن، با خۆیان دوا بخەن‌و لەسەرخۆ بن، تا ئەو کاتەی خێزانەکەی بۆ جوتبون ئامادە دەبێ، پێویستە خێزانەکەشی خۆی لە مێردەکەی کەمێك دور خاتەوە، تا ئەو کاتەی ئامادە دەبێ.

من ئامۆژگاری پیاوە دەکەم لەکاتی گەمەو یاری‌و قسەی خۆش‌و ئارەزو بزواندنی نێوانیان، ناوەناوە (زەکەری) بە ئاوی سارد بشوات، بۆ ئەوەی بە خێرایی ئاوی نەیەتەوە.

هەروەها ئامۆژگاریم بۆ ئافرەتان ئەوەیە کە داوێن (فەرج)یان بەباشی بە پارچە قوماشێکی خاوێن لە ناوەوە بسڕنەوە، چونکە لەم کاتەدا دەرهاوێژ (افرازات)ی ئاوی ئافرەتەکە دێتە دەرەوە.

ئەوەی باسکرا زۆر گرنگە پەیڕەو بکرێ، کە زۆر لە پیاوو ژن نایزانن‌و شارەزایی‌یان نیە. تەنانەت هەندێ پیاو دور دەکەوێتەوە لە ژنەکەی‌و وازی لێ دەهێنێ لەبەر ئەوەی ئەم ئامۆژگاری‌یە بەنرخ‌و گرنگە واز دەهێنێ‌و

کەمتەرخەمی دەکات، بێئەوەی چارەسەری بۆ دابنێن!

غەزالی لە کتێبی (الإحیاء)دا گوتویەتی: لە ئادابی جوتبون ئەوەیە: گەر پیاو لەگەڵ ژنەکەی جوت بو، گەیشتە خۆشیو ئاوی هاتەوە، با لەسەر ژنەکەی هەڵنەستێ، تا ئەویش دەگاتە چێژو خۆشی، چونکە هەڵسان لەسەری دەبێتە هۆی ئازاردانی.

هەروەها دەڵێ: هەبونی جیاوازی لە ئاوهاتنەوەو چێژو خۆشی، دەبێتە مایەی لێك دورکەوتنەوە، گەر ژن پێش پیاو بگاتە چێژو خۆشی، ئەوا بۆ مێردەکەی زیانی نیە.

ئنجا دەڵێ: گەر لە یەك کاتدا ژنو مێرد بگەنە چێژو خۆشی، ئەوا ژنەکە زیاتر لەزەتو خۆشی وەردەگرێ.

## چــەند هۆیەکـــی نــوێ بــۆ چارەســـەرکردنی ئــاو زو هــاتنەوە (ســرعــة القــذف):

لە گۆڤاری (طبيبك/١٢٠٤س١١) هاتوە، کە پوختەکەی ئەمەیە:

(رەنگە راستو دروست بێ بڵێین، زو ئاو هاتنەوە زۆرتـرین گرفتـەکانی جنسیە، کە لەنێو پیاوان بەربڵاوە، گەورەترین هۆی بەدبـەختی ژیـانی ژنو مێردایەتیە، زۆرینەی ئەو حاڵەتانەی ئاو زو هاتنەوەی تێـدا ڕودەدات، لـە ئەنجامی ئەوەیە ئەوکەسەی ئاوی زو دێتەوە زۆر هەستیارە..

رەنگە هەستیاریەکە جەستەیی بێ، کـەوا تـەنها بـە بەیـەك گەیـشتن، لەرزەی چێژو خۆشی ڕودەدات. رەنگەسۆزداری (عاطفي) بێت، ئەو پیاوەی زۆر عـاتیفی بێت و، ئەو پیاوەش کەمێك ترسی لە کـاری جنـسی هـەبێ، ئەوا هەریەك لەو دو جۆرە پیاوە، ناتوانێ خۆی لەبەردەم ورووژاندنی جنـسی بگرێ، مەگەر تەنها کەمێك خۆی بگرێت.

ئەو گەنجە نەوتەمەنانەی بەهۆی وروژانــی جنـسی بـەهێزەوە بـە زویـی ئاویان دێتەوە، ئەوانە توشی گرفتی راسـتەقینە نـەبون، چـونکە دەتـوانن دوای ماوەیەکی کەم، هێزی جوتبونیان بۆ بگەڕێتەوە، جوتبونی دوەمـیش بەشێوەیەکی گشتی بۆ ماوەیەکی درێژتر بەردەوام دەبێ.

بۆ دۆزینەوەی چارەسەری ئەو جۆرە کەسانە، هەوڵو کۆشش بەردەوامە، جا یەکێ لەو چارەسەرانە هەتوان (مرهم)ی سـڕکەرە، کـە بـۆ ئـەم جـۆرە پیاوانە شتێکی سودبەخشە، کەوا بەر لە جوتبون پیاو زەکەری بەم هەتوانە چەور دەکات، تاوەکو هەستیاریەکەی کەم کاتەوەو ماوەی لێخشاندن درێژە بکێشێ.

زۆر پیاو توانیویه‌تی چه‌ند فێڵێك بۆ خۆی بدۆزێته‌وه‌، بۆ ئه‌وه‌ی بیروهۆشی له‌كاری جنسی دوربخاته‌وه‌، تاوه‌كو زو نه‌گاته له‌رزه‌ی چێژو خۆشی.

كه‌سێك ده‌ناسم له‌كاتی جوتبون، مه‌سه‌له‌ی ماتماتیك به‌كاردێنێ‌و، ئه‌وه‌ی كه زه‌حمه‌ت‌و گرانه له بیرو زه‌ینیدا شی ده‌كاته‌وه‌، وه‌ك هۆیه‌ك به‌كاری دێنێ، تا زو نه‌گاته چێژو خۆشی!!

یه‌كێكی تر هه‌یه پیته‌كانی ئه‌بجه‌دی به وه‌رگه‌ڕاوه‌یی ده‌خوێنێته‌وه‌!

دكتۆر (جیمس)، كه یه‌كێكه له ماموٚستاكانی پزیشكی له زانكۆی (دیوك)، رێگه‌چاره‌یه‌كی بۆ چاره‌سه‌ركردنی زو ئاو هاتنه‌وه دۆزیه‌وه‌، ئه‌ویش بریتیه له‌وه‌ی پیاو داوا له ژنه‌كه‌ی بكات ده‌ست به زه‌كه‌ریدا بێنێ هه‌تا وای لێدێ ئاوی بێته‌وه‌، جا ئه‌وكاته داوا له ژنه‌كه‌ی بكات ده‌ست هه‌ڵگرێ، له‌و كاته‌ش كه هه‌ست كردن به ئاو هاتنه‌وه نامێنێ، دوباره ژنه‌كه ده‌ست بكاته‌وه به هه‌مان كردار.. دوباره‌كردنه‌وه‌ی ئه‌م كرداره ده‌رونی پیاو رادێ، تا وای لێدێ ده‌توانێ خۆی رابگرێ، جا به‌مه‌ش پیاو به زویی ئاوی نایه‌ته‌وه‌و هه‌ست ده‌كات ده‌توانێ نه‌هێڵێ زو ئاوی بێته‌وه‌.

دیاره به ته‌ڕبونی زه‌كه‌ر، به دره‌نگی ئاوی دێته‌وه‌و، به وشكی به‌زویی ئاوی دێته‌وه‌، جا ئه‌م ماموٚستای زانكۆیه ئامۆژگاری ده‌كات له‌كاتی جێبه‌جێكردنی كرده‌كه‌دا، هه‌ستیاریی كزو لاواز بكرێت.

دوا وته ئه‌وه‌یه‌، رێگه‌چاره‌ی زو ئاو هاتنه‌وه هیچ سودی نیه‌، مه‌گه‌ر له‌و حاڵه‌تانه نه‌بێت، كه زو ئاو هاتنه‌وه‌كه سروشتی بێت‌و له ئه‌نجامی خراپی ته‌ندروستی پیاو نه‌بێت، به چاره‌سه‌ركردنی ئه‌و نه‌خۆشیه‌" گرفته‌كه هه‌موی چاره‌سه‌ر ده‌بێ.

هەندێ پزیشك ڕێنمایی ئەوە دەکەن، کە چوك (زەکەر) بە هەتوانی (لیدۆکاین، یان زایلۆکاین) چەور بکرێت، تاوەکو حەساسیەتەکە کزو لاواز بکرێتو، ماوەی جوتبون درێژە بکێشێ.

بەبۆنەی قسەکردن دەربارەی زو ئاو هاتنەوە، ڕێنمایی و ئامۆژگاری ئەو کەسانە دەکەین، کە دوچاری زو ئاو هاتنەوە هاتون، نەهێڵن ژنەکانیان زۆر خۆیان بۆیان جوان بکەن، تاوەکو حەزی زو جوتبونیان کەم ببێتەوە.

گۆڤاری (طبیبك) لێکۆڵینەوەیەکی دەرهێناوە لەژێر ناونیشانی (پەلەپیتکەی لەرزەی چێژ لای ژن: زناد الأرتعاش عند المرأة) مەبەستی میتکەیە.

میتکە: ئەو پارچە گۆشتەیە، کە لە سەرەوەی هەردو شەفرە گەورەی فەرجی ئافرەتەوەیە، کە ئافرەت بەهۆی ئەوەوە لەزەتو خۆشی جنسی پێ وەردەگرێو بۆ لەزەتو خۆشی وەك زەکەری پیاو وایە. ئەم پارچە گۆشتەی کە بە فەرجی ئافرەتەوەیە دەماری زۆری تێدایەو، تۆڕێك لە دەماری وردو مولولەی خوێن پێکهاتوە، کە بەدەست لێدان (لمس) لەم میتکەیە ئارەزوی جنسی هەڵدەستێو، ئەویش پڕ دەبێ لە خوێنو قەبارەکەی گەورە دەبێ... لەبەر ئەوە میتکە خاڵی مەرکەزییە بۆ بزواندنی جنسی ئافرەتو، گەیاندنی بە لەزەتو خۆشی جوتبون. کاتێ میتکە ئەم گرنگییەی لە ژیانی ئافرەت هەبێ، دەبێو پێویستە لەسەر هەمو پیاوێك زانیاریو شارەزایی‌یەکی تەواوی هەبێ دەربارەی ئەو ڕۆڵە گرنگەی میتکە دەیبینێ لە بزواندنی جنسی ئافرەتدا. هەروەها پێویستە پیاو ئەمجۆرە زانیارییانە بزانێ، کە لەکاتی گەمەو یاریو قسەی خۆشی پێش جوتبون، دەبنە هۆی بزواندنو وروژاندنی ئەم میتکەیە. لەبەرئەوە پێویستە گرنگی بە میتکە بدرێ تا ئافرەت ئارەزوە جنسی‌یە حەڵاڵەکەی تێر ببێ.

وروژانــدنی میتکــە پێویــستە بــە لەســەرەخۆیی بکرێــت، چــونکە زۆر هەستیارە بەرادەیەك، کە عەقڵ باوەڕ ناکات هەستیاریەکەی چۆنە.

زۆربەی زۆری ئەو ئافرەتانــەی، کــە لەســەر سروشــتێکی ســاغن پــێش جوتبون، گەمەو یاری کردن بە میتکــەیان بــەلاوە خۆشــە. هــەروەها دوای جوتبونیش، وا چاکە میتکە یاری پێ بکرێ بۆ ئەوەی ئافرەتەکــە لــەزەت و خۆشی یەکەی تەواوو کامڵ بێ. هەندێ جــار وا ڕو دەدات، پیاوەکــە زوتــر دەگاتە خۆشی و ئاوی دێتەوە، ئافرەتەکەش ئێستا ئــارەزوە جنــسی یەکــەی دانــەمرکاوەو تێــر نــەبوە، مێردەکەشــی وازی لــێ دەهێنــێ و ڕوی لــێ وەردەگێڕێ، ئەو کاتەش ئافرەتەکە توشی نائارامی مێشك دەبــێ، چــونکە جنس پەیوەندی بە مێشکەوە هەیە. ئــەو جــۆرە ڕەفتــارو هەڵس وکەوتانــە زۆربەی پیاوە دڵ ڕەق و نەفامەکان بەو شــێوەیە لەگــەڵ ژنــەکانیان ڕەفتــار دەکەن.

کەواتە لەسەر مێرد پێویستە، میتکەی ژنەکەی بوروژێنێ و بیجــوڵێنی تا ئەو کاتەی ژنەکەی دەگاتە ئەوپەڕی لەزەتی جنسی و هەست بە لــەرزەی خۆشی دەکات، ئا لەوکاتەدا مێردەکەی لەگەڵی جوت ببێ.

## ماچ کردنی ژن لەلایەن مێردیەوە دەستنوێژ ناشکێنێ

خاتو عائیشە رەزای خوای لێبێ دەڵێ:

((إن النبّي ﷺ قبّل بعض نسائه، ثم خرج الى المصلّى ولم يتوضأ))[١]، واتە: پێغەمبەر ﷺ هەندێك لە خێزانەكانی ماچ كردوەو پاشان چوە بۆ نوێژو دەست نوێژی نەگرتۆتەوە.

١) رواه أحمد في المسند والترمذي والنسائي وابن ماجه وأبوداود (حديث حسن).

## ماچ کردن لەکاتی بەڕۆژوبوندا

((قبّل رجل امرأته، وهو صائم، فوجد من ذلك وجْداً شديداً، فأرسل امرأته تسأل عن ذلك، فدخلت على أمّ سَلمة أمّ المؤمنين فأخبرتها، فقالت أم سلمة: إن رسول الله يُقبِّل وهو صائم. فرجعت المرأة الى زوجها فأخبرته، فزاده ذلك شرّاً، وقال لسنا مثل رسول الله ﷺ، يُحلّ الله لرسوله ما شاء. فرجعتْ الى أم سلمة، فوجدتْ رسولَ الله عندها، فقال رسول الله: ما بال هذه المرأة؟ فأخبرته أمُّ سلمة، فقال: ألا أخبرَتها أنّي أفعل ذلك؟ فقالت أم سلمة قد أخبرتُها، فذهبْت الى زوجها، فأخبْرتُه، فزاده ذلك شرّاً، فقال لسنا مثل رسول الله، يُحّل الله لرسوله ما شاء، فغضب رسول الله ثم قال: والله إني أتقاكُم لله وأعلَمُكم بحدوده))، واتە: پیاوێك بەڕۆژو بو و ژنەکەی خۆی ماچ کرد، لە ئەنجامی ئەو ماچ کردنە هەستی بە ئازارو تاوانێکی زۆر کرد! لەبەرئەوە ژنەکەی نارد، تا دەربارەی ئەم ماچ کردنە بپرسێ، کە ئایا گوناهە یان نا، جا چوە لای ئوم سەلمەی دایکی مسولّمانانو پێی گوت شتێکی ئاوا رویداوە. ئوم سەلمەیش گوتی: پێغەمبەری خواﷺ بەڕۆژو بوەو ماچی خێزانیشی کردوە. جا ژنەکە چودوە لای مێردەکەی وەلامەکەی پێ ڕاگەیاند: کاتێك وەلامەکەی بیست هێندەی تر خراپتر بو و، گوتی: ئێمە ودك پێغەمبەری خوا نین، خوای گەورە بە ویستی خۆی شتی بۆ پێغەمبەرەکەی حەلاّل دەکات، ژنەکە گەڕایەوە لای ئوم سەلمە. ئەو کاتە پێغەمبەری خواﷺ لە لای ئوم سەلمە بو. پێغەمبەری

خواﷺ فەرموی: ئـەم ژنـە چـی دەوێـت؟ ئـوم سـەلەمەش پرسـیارەکەی بـە پێغەمبەر ڕاگەیاند. پێغەمبەریش فەرموی: پێی بڵێ من ئاوا دەکەم، واتە: ماچـی ژنم دەکـەم لـە کاتێکـدا کـە بەڕۆژومـە. ژنەکـە گەڕایـەوە لای مێردەکەیی و ئاوای پێ ڕاگەیاند. بەهەمان شێوە پیاوەکە هێندەی تر پێـی خراپتر بو و، گوتی: ئێمە وەك پێغەمبەری خوا نین، خوای گەورە بە ویستی خۆی شت بۆ پێغەمبەرەکەی حەڵاڵ دەکات. پێغەمبەری خواش تـوڕە بـوو پاشان فەرموی: بەخوا من لە هەموانتان زیاتر لەخوا دەترسـم و دەربـارەی سنورەکانی شەرعی خوا لە هەموانتان شارەزاترم[١].

ئیمام موسلیم گێڕاویەتیەوە، (( كان رسول الله ﷺ يُقَبِّـل وهـو صـائم، ويباشر وهو صـائم ...پێغەمبەرﷺ بەڕۆژو بوە خێزانی ماچ کردوە، هـەروا بەڕۆژو بوەو پێستی بە پێستی خێزانی کەوتوە))[٢].

---

١) ئیسلام چەند جوان و ئاسانکارە، ئەم فەرمودەیە لەکوێیە لە ئاست ئەو ژن و مێردانـەی دەستنوێژیان هەیەو دەستیان بەر یەك دەکەوێ، کە بەهۆیەوە کێشەو ناکۆکیان لەنێوانـدا دروست دەبێ.

٢) بە بۆنەی مەسەلەی ماچ کردن و ڕێگە پێدانی شەرع لەکاتی ڕۆژودا، ئێمە ئاگاداری ئەو پیاوە دەکەینـەوە، کـە ناتوانـێ لـەکاتی مـاچ کردنـدا خـۆی بگـرێ و یەکـسەر لەگـەڵ خێزانەکەی جوت دەبێ، ئەوا ئەو کاتە ڕۆژوەکەی بەتاڵ دەبێتەوەو دەبێ کەفارەت بـدات، کە دو مانگ بەڕۆژو بونە یەك لەدوای یـەك، گـەر نـەیتوانێ بـەڕۆژو ببـێ ئـەوا دەبـێ (شەست) هەژارو فەقیر نان بدات.

لەبەر ئەوە گەر کەسێك لەخۆی ترسا، کە لەکاتی ماچ کردندا خۆی بۆ نـاگیرێ، نابـێ خێزانەکەی ماچ بکات.

پێویستە مێرد کاریگەریی و شیکردنەوەی ماچ کردن بزانێ، تاکو ئەم کارەی لەبەرچاو ڕون بێ، گەر ویست و ئیرادەی کز و بێهێز بو، با لە ماوەی بەڕۆژوبونـدا واز لـە ژنەکـەی بێنێ و ماچی نەکات.

دکتۆر (أرنو) دەڵێ: لەوکاتەی گەنج ژنەکەی ماچ دەکات، چەند گۆڕانکارییەکی خێرای بەسەردا دێت، هەندێکی کیمیاویەو هەندێکی دی ئەندامی (عضوي)یە.

دیارە لەکاتی ماچ کردندا پیاو کە هەست بە سەرو چاو سوڕان دەکات، ئەو دیاردەیە نیشانەی ئەو گۆڕانکاریەیە، بەڵگەی ئەوەشە کە چەند کارلێکردنێکی جیاجیا هەیە لەکیانی خۆیدا کاردەکات.

یەکەم شت کە ڕوودەدات گلاندی مێشکی مادەیەك دەردەدات، کە کار لە گلاندی (أدرنالی) دەکات، کە کەوتۆتە هەردو گورچیلە، جا چالاکی دەکاتو کۆمەڵێك لە توخمی کیمیاوی دەردەداتو دەیهاوێتە ناو خوێن، لەبەر بەهێزی کارتێکردنی ماچ ئەو دیاردەیە بە خێرایی بروسکە ئاسا ڕوودەداتو سەرجەم ئەندامەکانی جەستە دەگرێتەوە. جا گوشاری خوێن بەرز دەبێتەوەو لێدانی دڵ خێراتر دەبێو سوڕی خوێن زیاتر چالاك دەبێت، خڕۆکەی سور لەخوێندا کەم دەکاتو خانەکانی پێست دەکرێنەوەو ئارەقەی لێ‌دەردەچێ.

لەوەی باسکرا بۆمان دەردەکەوێ لەبەر ئەو هۆیانەیە خوای گەورە قەدەغەی کردوە لەکاتی بەیەك گەیشتنو خواحافیزی، هاوڕێیان یەکتری ماچ بکەن، یان ئافرەت هاوڕێی خۆی ماچ بکات-کە بەداخەوە- ئەمە لەناویاندا زۆر بڵاوەو حەرامیشە. ئەوەی ڕێی پێدراوە تەنیا تەوقەکردنە، کە بەهۆیەوە گوناهەکانی پێ هەڵدەوەرێ.

پزیشکەکان سەلماندویانە ماچ، زۆر نەخۆشی دەگوازێتەوە وەك (سیل) و (سفلس) کە نەخۆشیەکی فەرەنگی یە، میکرۆبەکەش لەڕێی دەمەوە دەچێتە ناو خوێنو لەوێشەوە بۆ هەمو جەستەو دەبێتە هۆی شێت بونو مردن.

## جوتبـون لـه ڕۆژی ڕەمـەزان

((جاء رجل الى النبيﷺ فقال: يا رسول الله، هلكتُ. قـالَ: ومـا أهلكك؟ قالَ: وقعتُ على أهلي وأنا صائم، فقال رسول الله: هل تجـد رقبةً تُعتقها؟ قال: لا! قال: فهل تستطيع أن تصومَ شهرين متتـابعين؟ قال: لا؟ قال: هل تجد إطعامَ ستين مسكيناً؟ قال: لا؟ قال: فـأجلس! فبينما نحن على ذلك إذ أُتيَﷺ بعرْق فيه تمر، فقال: أين السائل. قـال: أنا. قال: خذ هذا فَتصدَّقْ به. قال: أعلى الأرض أفقرُ مني؟ فوالله ما بين لا بتَـيْها أهل بيت أفقر منا! فضحك رسـول اللهﷺ وقـال أطْعمْـهُ أهلك!))[١]، واته: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەرو گوتی: ئـەی پێغەمبـەری خوا، بەهیلاك چوم.

پێغەمبەر فەرموی: چ شتێك بەهیلاکی بردوی؟

گوتی: بەڕۆژو بوم و لەگەڵ خێزانەکەم جوت بوم.

پێغەمبەری خوا فەرموی: چ شتێکت هەیە عەبدێکی پێ ڕزگارکەی؟

گوتی: نەخێر!

پێغەمبەر فەرموی: ئایا دەتوانی دو مانگ یەك لەدوای یەك بەڕۆژو ببی؟

گوتی: نەخێر.

پێغەمبەر فەرموی: ئایا هیچت هەیە شەست فەقیری پێ نان بدەی؟

گوتی: نەخێر.

---

١) رواه البخاري ومسلم وغيرهما.

پێغەمبەر فەرموی: دانیشە!

دەڵێ: ئێمە بەو حاڵەتە ماینەوە، تا زەنبیلە خورمایەك هێنرا، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەو کەسەی پرسیاری کرد لە کوێیە.

دەڵێ گوتم: ئەوەتام لێرە.

پێغەمبەر فەرموی: لەبری ئەو کارەی کردوتە ئەمە وەرگرەو بیکە بەخێر.

ئەویش گوتی: لەسەر ئەم ئەرزە کەس لەمن هەژارتر هەیە؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی و فەرموی: کەواتە ئەم خورمایە دەرخواردی خێزانەکەت بدە!

## پێغەمبەر هاوسەری ڕوخۆش[1]

خاتو عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: ((بەخوا پێغەمبەرم ﷺ لەلای دەرگای ژورەکەم بینیو، حەبەشیەکانیش لە مزگەوتدا ڕمبازێنیان دەکرد، جا منی بە عەباکەی خۆی داپۆشی، تا لەنێوان گوێو شانی تەماشای حەبەشیەکان بکەم، پاشان لەبەر من ڕادەوەستا هەتا وەڕز دەبوم و دەڕۆیشتم، کەواتە ڕێزی کچی نەوتەمەن بگرن، کە حەزی لە گەمەو یاریە))[2].

هەروەها گوتویەتی: ((قال لي رسول اللهﷺ: إني لأعلم اذا كُنتِ عني راضيةً، واذا كنت عليَّ غَضْبَى.

فقلت: من أين تعرف ذلك؟!

فقال: اذا كنت راضية: فإنَّك تقولين: لا وربِّ محمد... واذا كنت عليّ غضبى، قلتَ: لا وربِّ ابراهيم.))[3]، واتە: پێغەمبەری خوا پێی فەرموم: من دەزانم چ کاتێك تۆ لەمن ڕازیو، چ کاتێکیش لەمن توڕەی.

دەڵێ: منیش گوتم: چۆن ئەوە دەزانی؟

پێغەمبەر فەرموی: کاتێ لە من ڕازی، بەمن دەڵێی: نەخێر بە پەروەردگاری محمد... کاتێکیش لەمن توڕە بی، دەڵێی: نەخێر بە

١) پێویستە پیاو لە ماڵەوە لەگەڵ خێزانەکەی ڕوخۆشو دەم بە پێکەنینو سوعبەت چی بێو، خۆشیو شادی بخاتە دڵی خێزانەکەیەوە، تا بارگرانایيو ناخۆشیەکانی ژیانو نیشوکار سوك بکات، ئەوەش یاریدەی بەهێزکردنی پەیوەندیو خۆشەویستی ژنو مێرد دەدات.

٢) رواه البخاري ومسلم.

٣) رواه مسلم.

پەروەردگاری ئیبراهیم.

خاتو عائیشە دەفەرموێ: ((قدم رسول اللهﷺ عن غزوة تبوك أو حنين، وفي صهوتي ستر، فهبت ريحٌ فكشفت ناحية الستر عن بنات لعائشة لُعَب. فقال: ما هذه يا عائشة؟ قالت بناتي! ورأى بينهنّ فرساً له جناحان من رقاع. فقال: ما هذا الذي أرى وسطهن؟! قالت: فرسي! قال: وما الذي عليه؟! قالت جناحان. قال: فرسٌ له جناحان؟! قالت: أما سمعتَ أن لسليمان خيلاً لها أجنحة؟ قالت: فضحك حتى رأيتُ نواجذه)) [١]، واتە: پێغەمبەرﷺ لە جەنگی تەبوك یان حونەین گەڕایەوە. لەو خانوە بچکۆڵەی هەم بو پەردەیەکی پێوە هەڵواسرابو. کاتێك بایەك هەڵی کرد، یەکسەر پەردەکە لادراو هەندێك بوکی یاری کردنی عائیشە بەدیار کەوت.

پێغەمبەر فەرموی: عائیشە ئەوە چیە؟

گوتی: کچەکانمن!

پێغەمبەر لەنێوان ئەو لەعابانە ماینێکی بینی، کە لە قوماش دروست کرابو دو باڵی هەبو.

پێغەمبەر فەرموی: ئەدی ئەوەی لە ناوەڕاستیان دایە چیە؟!

خاتو عائیشەش گوتی: ماینەکەمە!

پێغەمبەر فەرموی: ئەدی ئەوە چیە لەسەری؟!

ئەویش گوتی: دو باڵە.

پێغەمبەر فەرموی: ماینو باڵی هەبێ؟!

---

١) رواه أبوداود (صحيح).

عائیشە گوتی: ئەدی نەتبیستوە سولەیمان ئەسپێکی هەبوەو باڵی بـوە. دەڵێ: پێغەمبەر پێکەنی تا ددانەکانی بەدیار کەوت.

خاتو عائیشە (ڕەزای خوای لـێبێ) گوتویەتی: ((لە گەشتێکدا لەگـەڵ پێغەمبەری خوادا بوم ، دەڵێ: ئەوکاتە من لاواز بوم، پێغەمبەر بە یارانی فـەرمو: ئێـوە پێـشکەون، ئـەوانیش پێـشکەوتن، پاشـان فـەرموی: وەرە پێشبڕکێت لەگەڵدا بکەم! منیش پێشبـڕکێم لەگەڵدا کـردو لـێم بـردەوە.. دوای ئەمە —لەگێڕانەوەیەکدا- دەڵێ: خـۆی لـێ بـێدەنگ کـردم، هـەتا قەڵەو بوم‌و من ئەو پێشبڕکێیەم لەبیر کرد، جا لەگەڵیدا چـوم بـۆ سـەفەر، پێغەمبەر بە یارانی فەرمو: پێشکەون، ئەوانیش پێشکەوتن، پاشان گوتی: وەرە پێشبڕکێت لەگەڵدا بکەم، بـەڵام مـن ئـەوەی پێـشانم لـەبیر کردبـو، ئێستاش قەڵەو بوم. گوتم: ئەی پێغەمبەری خـوا! چـۆن مـن بـەو حاڵـەوە پێشبڕکێت لەگەڵدا بکـەم؟! پێغەمبـەر فـەرموی: هـەردەبێ بیکـەی، جـا پێشبڕکێمان[١] کردو پێغەمبەر لێی بردمەوەو دەسـتی کـرد بـە پێکـەنین‌و فەرموی: ئەمە بەرامبەر ئەوەی ترە (پاك لەپاك))[٢].

((كان رسول الله أفكــه النـــاس))[٣].

مەناوی لە (فيض القدير)دا لە ڕاڤەی ئـەم فەرمودەیـەدا دەڵـێ: واتـە: پێغەمبەری خوا، کە بگەڕابایەوە لای خێزانەکانی لە هەمو خەڵکێك زیاتر

---

١) ڕەنگە پێغەمبەر بە ئەنجامدانی ئەم پێشـبڕکێیە ژن‌و مێردان فێرە ئەوە بکات، کە هەر یەکەیان بە باشی بتوانێ لەگەڵ یەکتری، چێژ لە ژیانیان وەرگرن، کە پێکەوە بـە هەنـدێ شێوازی گەمەو لەهو و چاڵاکی هەسـتن، تـاوەکو هـەموو کـات ژیـانی ژن‌و مێردایـەتی لەسەر جدیەت بەردەوام نەبێ، نەبادا ئەو جدییەتە ببێتە مایەی بێزاری!

٢) ئیمام ئەحمەد لە مسنەدو ئەبوداودو نەسائی گێڕاویەتیانەوە، فەرمودەیەکی (صحيح)ە.

٣) رواه الحافظ العراقي.

گاڵتەو گەپو سوعبەتی دەکرد.

خاتو عائیشە فەرموی: ((إني لطخت وجه سودة بحريرة ولطخت سودة وجه عائشة، فجعل رسول الله ﷺ يضحك))، واتە: من (حريره)[1]م لە دەموچاوی سەودە هەڵسوی، سەودەش دەموچاوی عائیشەی هەڵسوی، جا پێغەمبەریش بەم کردەوەیان پێکەنی.

((كان أصحاب رسول الله ﷺ يتبادحون بالبطيخ، فإذا كانت الحقائق كانو هم الرجال)) [2]، واتە: یارانی پێغەمبەر شەڕە کاڵەکیان دەکرد، لە ڕاستیدا خۆ ئەوانیش پیاو بون.

---

١) نارد بە شیر یان بە چەوری دەکرێتە چێشت.

٢) رواه البخاري في الأدب المفرد.

# شـادیەکانی ژن هێنـان و داوەت کردن

## (داوەت و نـان دروسـت کردن پێویستە)

❁ بوورەیـدەی کـوڕی حـصیب گوتویـەتی: لـەو کاتـەی عـەلی خـوازبێنی فاطیمەی کرد ڕەزای خوایان لـێبێ، پێغەمبەر خـواﷺ فـەرموی: ((أنه لابد للعرس (وفي رواية للعروس) من وليمة))[١]، واتە: بۆ ژن هێنـان پێویستە وەلیمە هەبێت، واتە خەڵك دەعوەت کردن بۆ نان خواردنی ژن هێنان.

❁ ((رأى رسول اللهﷺ على عبدالرحمن بن عوف أثر صفرة، فقال: ما هذا؟ فقال: تزوجت امرأة على وزن نواة من ذهب، فقال: بارك الله لك! أَوْلِمْ ولو بـشاة))[٢]، واتـە: پێغەمبـەری خـواﷺ شـوێنەواری زەردایی بە عـبدالرحمن ی کوڕی عـەوف بینی، فەرموی: ئەمە چییە؟ گوتی: ژنێکم لەسەر کێشی یەك ناوکە زێڕ مارە بڕکردوە.

پێغەمبەر فەرموی: خوای گەورە لێـت پـیرۆز بکـات! وەلیمـەو داوەت بکە، با بە مەڕێکیش بێت.

---

١) رواه أحمد في المسند والطبراني والطحاوي. حديث صحيح.

٢) رواه الجماعة.

## پێویستی بەدەمەوەچونی وەلیمە (نـانی زەماوەنـد)[1]

خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَلَكِـنْ إِذا دُعِيـتُمْ فَـادْخُلُوا فَـإِذَا طَعِمْـتُمْ فَانْتَشِرُوا﴾ (الأحزاب- ٥٣)، واتە: بەڵام گەر داواتان لیٚ کرا بۆ نان خواردن ئەوا بچون، گەر خواردنتان خوارد بڵاوەی لیٚ بکەن.

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((فكوا العانــي، وأجيبوا الداعي، وعودوا المريض))[2]، واتە: گرێی گرفتاران بکەنەوە، بەدەم ئەو کەسەوە بچون کـە بانگتان دەکات. سەردانی نەخۆش بکەن.

هەروەها دەفـەرموێ: ((إذا دُعي أحدكم الى طعام فَلْيُجب، فان كان مفطِراً فليطعَم، وان كان صائماً فليدع))[3]، واتە: گەر یەکێك لە ئێــوە

---

١) لە گرنگترین مەبەستەکانی وەلیمە (نانی شایی) بەدیار خـستنی مێـردو، کۆبونـەوەی خزمو کەسو هاورێیانە بەبۆنەی بوك گواستنەوە، بۆ خستنە ناوەوەی خۆشیو شادی بـۆ دڵی گشتیو، موجامەلـەکردنی زاواو پیرۆزبـایی لێکردنیـەتی، کـە بەمـەش هـۆگریو خۆشەویـستی زیـاد دەکـات، کـە چـەند مانایـەکن خـوای گـەورە زۆر مکـورە لەسـەر بەجێهێنانی.

لەبەر ئەوە نابێ هیچ کەسێك، کە بۆ وەلیمە بانگ کرا دوا بکەوێت. (عبداللە ی کوڕی عومەر پیاوێکی بۆ نان خواردن بانگ کرد، پیاوێك لە قەومەکـە گـوتی: مـن ببەخـشە نایەم، ابن عمر گوتی: لەمەدا بەخشین نیە، هەڵسە! وەلیمە بـە هـەرچ خواردنێـك بێـت جائیزە، با گۆشتو نانی لەگەڵ نەبێت، هەروەها گەر مەڕیشـی تێدا نەبو. پێغەمبـەری خوا ﷺ لەو کاتەی (صفية)ی گواستەوە، خەڵکی بە خورماو رونو کەشکەك بانگ کرد، ئەوەبو خەڵکەکە تێریان خوارد.) بوخاری گێڕاویەتیەوە.

٢) رواه البخاري.

٣) رواه مسلم وأحمد في المسند.

نان خواردن بانگ کرا با بچێت. گەر بەڕۆژو نەبو با نان بخوات، گەر بەڕۆژو بو با نەیخوات[١].

(پێغەمبەری خواﷺ صەفیەی کچی حیی گواستەوە، لەو ڕۆژەدا خواردنێکیان دروست کرد، کە بریتی بو لە خورماو رونو کەشکەك)، پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: ((ئەو کەسانەی دەوروبەرت بانگ بکە)). ئا ئەمە بو زەماوەندو وەلیمەی پێغەمبەر لە ڕۆژی گواستنەوەی صەفیەدا) [٢].

## حەرامە تەنها دەوڵەمەندان بۆ نانی زەماوەند بانگ بکرێن

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((شر الطعام طعام الوليمة يدعى إليها الأغنياء، ويُمنعها الفقراء))[٣]!! ، واتە: خراپترین خواردن، خواردنی داوەتو وەلیمەیەکە، کە دەوڵەمەندی تێدا بانگ کرابێتو هەژارانی تێدا بانگ نەکرابێت.

---

١) لە کتێبی (المفصل فی أحکام المرأه) بەرگی شەشەم دا هاتووە، کە عبداللهی کوڕی عومەر گەر بۆ نانی زەماوەند بانگ کرابا، بە دەم بانگکردنەکەوە دەچوو، جا ئەگەر بەڕۆژو نەبا خواردنەکەی دەخوارد، گەر بەڕۆژوو با دوعای بۆ دەکردنو پیرۆزبایی لە خاوەن زەماوەندەکە دەکردو دەیگوت: (بارك الله لكم وعليكم)، پاشان دەڕۆیشت. -وەرگێڕ-

٢) رواه البخاري ومسلم.

٣) رواه البخاري ومسلم.

## ته‌نها پیاوی چاك بۆ نانی زه‌ماوه‌ند بانگ بكرێ

پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمویه‌تی: ((لا تصاحب الاّ مؤمناً، ولا يأكل طعامك الاّ تقي))[1]، واته: جگه له باوه‌ڕدار هاوڕێیه‌تی كه‌س مه‌كه‌، ته‌نها مرۆڤی پارێزكارو له‌خوا ترسیش خواردنت بخوات.

## با ده‌وڵه‌مه‌ند كۆمه‌كی نانی زه‌ماوه‌ندی هه‌ژاران بكات

ئه‌نه‌س ده‌رباره‌ی ژن گواستنه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌رﷺ كه (صفية)ی هێناوه ده‌ڵێ: ((ئوم سوله‌یم صه‌فیه‌ی بۆ پێغه‌مبه‌ر ئاماده‌كردو به‌شه‌و بۆی گواسته‌وه‌، جا پێغه‌مبه‌رﷺ به‌یانیه‌كه‌ی بو به زاواو فه‌رموی: هه‌ركه‌سێ شتێكی هه‌یه با بیهێنێ (له گێڕانه‌وه‌یه‌كی تردا: هه‌ركه‌سێ شتێكی له‌خۆی زیاده‌یه‌، با بۆمان بێنێ).

ئه‌نه‌س گوتی: رایه‌خێكی له پێست دروستكراوم راخست، جا پیاوی وا هه‌بو كه‌شك‌و په‌نیری ده‌هێنا، هه‌بو رۆنی ده‌هێنا، هه‌بو خورمای ده‌هێنا، جا هه‌مو ئه‌مانه‌یان تێكه‌ڵ كردو كردیانه خۆراكێك، ئنجا ده‌ستیان كردو به خواردنی‌و له ئاوی باران ئاویان ده‌خوارده‌وه‌، كه له‌و حه‌زانه دابو، كه له ته‌نیشتیان بوو ئه‌مه‌ش وه‌لیمه‌ی پێغه‌مبه‌ر بو ﷺ))[2].

---

١ رواه ابوداود والترمذي وأحمد في المسند والحاكم حديث صحيح.

٢) رواه البخاري ومسلم وأحمد في المسند والبيهقي، مع اختلاف الروايات.

بوردەيدە گوتی: لەوكاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە عـەلی كـوڕی ئەبوتاليب كرد، كە وەليمە بكات، بـەڵام ئـەو لـە توانايـدا نـەبو، سـەعد گوتی: من بەرانێك دێنم، فلانەكەس گوتی: ئەوەندەو ئەوەندە گەنمە شـامی دێنم، لە گێڕانەوەيەكی تردا: هەندێ لە ئەنـصاريەكان چـەند صـاعێك لـە گەنمەشامـيان كۆكردەوە.

## ئەو كەسـەی ئامـادەی نـانی زەماوەند دەبێـت

ئەو كەسەی ئامادەی نانی زەماوەند دەبێـت، پێويـستە بـە زاوا بڵێـت: (بارك الله لك، وبارك عليك، وجمع بينكما في خير)[١].

پاشان دوعا بۆ خاوەن وەليمەكە دەكات، بە يەكێك لەم دوعايانە:

١- (اللّهم اغفر لهم، وارحمهم وبارك لهم فيما رزقتهم)[٢].

٢- (اللّهم أطعم من أطعمني واسقِ من سقانـــي)[٣].

٣- (أكل طعامكم الأبرار، وصلّت عليكم الملائكة، وأفطـــر عنـــدكم الصائمون)[٤].

---

١) رواه ابو داود والترمذي حديث صحيح.
٢) رواه مسلم وابوداود وابن ابي شيبة.
٣) رواه مسلم والحاكم (حديث صحيح).
٤) رواه الحاكم والطحاوي (صحيح).

## بەهیوای بەیەکـەوە گونجان و کـوڕی بـە دوادابێ ئەمـە پیرۆزبـایی جاهیلانـە

(عن الحسن بن عقيل بن أبـي طالب أنه تزوج امرأة، فدخل عليه القوم فقالوا: بالرفاء والبنين[1]، فقالك لا تفعلوا ذلك! فإن رسول اللهﷺ نهى عن ذلك)[2].

لە حەسەنی کوڕی عقیل ی کوڕی ئەبو طالبـەوە، کـە ژنێکـی مـارەبڕ کردوە، جا قەومەکە هاتونەتە لای و گوتویانە: بەهیوای بەیەکەوە گونجـان و نانەوەی کوڕ، ئەویش گوتی: ئەوە مەڵێن، چونکە پێغەمبـەری خـوا ﷺ نەهی لەمە کردوە.

١) (ابن القيم) لە کتێبەکەیـدا (تحفـة المـودود بأحكـام المولـود) گوتویـەتی: لەسـەردەمی نەفامی لە پیرۆزبایی کردنی ژنهێنان دەیانگوت: (بالرفاء والبـنين)، بـەو هیوایـەی ئـەم زەواجە ببێتە مایەی یـەکگرتن و بەیەکـەوە گونجـان و کـوڕی بـەدوادا بـێ.. نابـێ پیـاو پیرۆزبایی ژنهێنان بەوە بکات، بڵێ کوڕت ببێ و کچی لەگەڵ نـەبێ، بەڵکـە دەبـێ بڵـێ بەهیوای بونی کوڕ وکچ، یان هەر واز لەو جۆرە پیرۆزبایی کردنـە بێنـێ، تـا خـۆی لـەم نەریتە نەفامیە دەرباز بکات، چونکە زۆربـەی نەفامـەکان پیرۆزبـایی نانـەوەی کوڕیـان دەکردو، هیوای مردنی کچیان دەخواست، کە هێشتا لەدایك نەبوە.

(ابوبکر بن المنذر) لە کتێبی (الأوسـط)دا دەڵێ: (لە حەسەنی بەصـری گێڕاویانەتـەوە: پیاوێك هاتۆتە لای، پیاوێکیش لەلای بوە، کە کوڕێکی لەدایك بـوە، جـا پـێی گـوت: سوارچاکت پیرۆزبێ، حەسـەنی بەصری پێی گوت: تۆ بە چ دەزانی سوارچاکە یان کەرە؟! کابرا گوتی: ئەدی چۆن بڵێین؟ گوتی: بڵێن: (بورك لك في الموهوب، وشكرتَ الواهب، وبلغ أشُدَّهُ، وَرُزِقتَ بِرّه والله أعلم).

٢) رواه إبن أبي شـيبة والنسائي وإبن ماجة وغيرهم (صحيح).

## بەباشی ڕەفتار کردن لەگەڵ خێزان

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((خیرُکم خیرُکم لأهله[1]، وأنا خیرکم لأهلي))[2]، واتە: باشترین کەستان ئەو کەسەیە، کە لەگەڵ خێزانەکەی بەباشی هەڵسوکەوتو ڕەفتار دەکات، منیش لە هەموانتان زیاتر لەگەڵ خێزانەکەم باشم.

هەروەها دەفەرموێ: ((أكمل المؤمنين ايماناً احسنهم خلقاً وخيارهم خيارهم لنسائهم)).[3]، واتە: تەواوترین باوەڕی باوەڕدار ئەو کەسەیە، کە ڕەوشتی لە هەموان باشتر بێو، باشترینیشیان ئەو کەسانەن، کە لەگەڵ ژنەکانیان بەباشی هەڵسوکەوت دەکەنو جوان ڕەفتارن.

ئەنەس ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: ((قدم رسول اللهﷺ من خيبر فلما فتح الله عليه الحصن ذُكِر له جمال صفية بنت حيي، وقد قتل زوجها، وكانت عروساً. فاصطفاها رسول اللهﷺ لنفسه، فخرج بها حتى بلغنا سدَّ الصهباء حلَّت، فبنى بها، ثم صنع حيساً في نطع صغير، ثم قال رسول اللهﷺ: (آذن من حولك). فكانت وليمة رسول اللهﷺ على صفية.. ثم خرجنا الى المدينة، فرأيت رسول اللهﷺ يُحَوِّي لَهَا وراءه بعباءةٍ، ثُمَّ يجلس عند بعيره فيضع ركبته، فتضع صفيةُ رجلَها على ركبته

---

١) یەکێ لە زانایان دەڵێ: گەر باشترین کەس ئەو کەسانە بێ، کە لەگەڵ خێزانیان باش ڕەفتارن، هەروەك لە فەرمودەدا هاتوە، کەواتە هەرکەسێ پێچەوانەی ئەمە بێ، ئەو کەسە خراپترین کەسە.

٢) رواه الطبراني (صحيح).

٣) رواه الترمذي وحسنه وهو كما قال.

حتى تركب!))[1] ، واتە: پێغەمبەرﷺ لە خەیبەر هاتەوە لەو کاتەی، کە خوای گەورە فەتحی خەیبەری پێ بەخشی. جا باسی ڕێك‌وپێکی‌و جوانی کردەوەی صەفیەی کچی حەیی کرا، کە مێردەکەی کوژرا بو و تازەبوك بو. پێغەمبەرﷺ صەفیەی هەڵبژارد بۆ ئەوەی ببێتە خێزانی. پێغەمبەر صەفیەی لەگەڵ خۆی بردە دەرەوە تا گەیشتنە (سد الصهباء)و لەوێ گواستیەوە. پاشان خواردنێکی لەسەر ڕایەخێکی بچوکی لەپێست دروست کراو ئامادەکرد، کە لە خورماو (کەشکەك)و ڕۆن پێك هاتبو. پێغەمبەرﷺ فەرموی: (ئەوانەی لە دەوروبەرتن بانگیان بکە).. ئا ئەوە بو خواردنی ڕۆژی ژن گواستنەوەی پێغەمبەر.

ئەنەس دەڵێ: لە دواییدا ڕۆیشتین بۆ مەدینە، پێغەمبەرم بینی بە عەبایەکەی پەنای لێ‌کردو لەلای حوشترەکەی دانیشت‌و چۆکی دادەنا، صەفیەش پێی لە سەر چۆکی پێغەمبەر دادەنا، تا سواری حوشترەکە ببێ.

کاتێك ئیمامی عەلی داخوازی فاطیمەی کچی پێغەمبەری کرد، پێغەمبەر پێی فەرمو: ((هي لك على أن تُحسن صُحْبَتَها))[2]، واتە: فاطیمە بۆ تۆیە، بەڵام بە مەرجێ لەسەرت پێویستە بە چاکی‌و بەباشی لەگەڵیدا ژیان ببەیتە سەرو مامەڵەی لەگەڵ دا بکەی.

خاتو عائیشە فەرمویەتی: ((کان رسول الله یکون في مهنة أهله،[3]

---

١ رواه البخاري ومسلم.

٢) رواه الطبراني (حديث صحيح).

٣) چەند شتێکی جوانە پیاوان پێغەمبەر بکەنە سەرمەشقی خۆیان‌و لەکاتی بەتاڵیدا یارمەتی ژنەکەیان بدەن لەکاروباری ماڵەوەدا، پێغەمبەری خوا منداڵەکانی هەڵدەگرت‌و گەمەی لەگەڵدا دەکردن.

فاذا حضرت الصلاة خرج الى الصلاة))[1]، واتە: پێغەمبەرﷺ لە خزمەتی خێزانەکەیدا بوەو خۆی پێڵاوەکانی پینە کردووەو بۆ خۆی خزمەتی خۆی کردوەو مەڕەکەشی دۆشیوە.[2]، لەو کاتەش کە کاتی نوێژ بهاتایە دەچو بۆ نوێژ.

---

١) رواه البخاري ومسلم.

٢) ئەبو نەعیم لە کتێبی (الدلائل) و (الواحدي) بە سەنەدێك دەریهێناوە لە خاتو عائیشەوە، کە گوتویەتی: ((ما کان أحد أحسن خلقاً من رسول اللهﷺ ما دعاه أحد من أصحابه ولا من أهل بيته الاّ قال: لبيك، لذلك أنزل الله ﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾))، واتە: هیچ کەسێك وەك پێغەمبەرﷺ ڕەوشتی جوان نەبوە. لە کاتێکدا هەر یەکێك لە هاوەڵەکانی، یان لە خێزانەکانی بانگیان بکردایە، لە وەڵام دا دەیفەرمو: لە خزمەت دام. لەبەر ئەوەش بو خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە کە دەفەرموێ: بەڕاستی ئەی محمد تۆ لەسەر ئاکارو ڕەوشتی هەرەبەرزو گەورەی. بڕوانە (تفسير وبيان مع أسباب النزول) للسيوطي لاپەڕە (٥٠١). (وەرگێڕ)

## چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو خێزانە دەکەی کە خۆشت ناوێ[(١)]

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً﴾ (النساء- ٣٤)، واتە: گەر ژن گوێڕایەڵی مێردەکەی بو لە هەمو ئەو شتانەی دەیەوێت، کە خوای گەورە بۆی حەڵاڵ کردوە، ئەو کاتە پیاو بۆی نیە لێی بداو سەرجێیی لەگەڵ نەکات.

تەواوی ئایەتەکەش هەڕەشەیە بۆ پیاوان گەر بەبێ هۆ زۆریان لەسەر بکەن.

﴿إِنَّ اللهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (النساء- ١).

واتە: خوا هەمیشە چاودێرە بەسەرتانەوە.

﴿وَعَسى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ (البقرة- ٢١٦).

واتە: ڕەنگە لە شتێك حەز نەکەن، بەڵام بۆتان وەخێرگەڕێ.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لا يَفْرَكْ مؤمنٌ مؤمنةً! إن كرهَ منها خُلقاً رضيَ منها آخرَ))[(٢)].

واتە: پیاوی بڕوادار با ڕقو کینەی بەرامبەر بە ئافرەتی بڕوادار نەبێت! گەر لە ڕەوشتێکی ناڕازی بێو شتێکی پێ ناخۆش بێ، ئەوە ڕەوشتێکی

---

١) حەسەنی بەسری دەڵێ: کچەکەت بەشو بدە بە دینداڕێك، گەر خۆشی ویست ڕیزی دەگرێ، گەر حەزی پێنەکرد ستەمی لێ ناکات.

٢) رواه مسلم وغيره.

تری بە دڵەو رازی دەکات[١].

---

١) ئەم فەرموده گەورەیە ئاماژە بۆ کارێکی گرنگ دەکات، کە پێویستە پیاو (مێرد) بیزانێ، هەروەها ژنیش. هەر یەکێك لە ژن و مێرد بڕوای بە پێویستی داواکردنی ژیانێکی بەختیاری و تێروتەواو لە یەکتری هەبێ هۆیەکە بۆ سەرکێش کردنی زۆربەی کێشەو گرفت.

ئەوەی غەریبە، ئەوەیە کە زۆر ژن و مێرد هەیە خۆپەرستە، داوای بەختیاری بۆ خۆی دەکات، بێ بیرکردنەوە لە بەختیاری هاوژینەکەی، ئەوە لەبیر کراوە، کە لە بەخشیندا بەختەوەریەك هەیە کە هیچی کەمتر نیە لە وەرگرتن! ئەو ژنە یان ئەو مێردە چەند بەختەوەرە، کە خۆی بە خۆڕاگری و ئارامگری دەڕازێنێتەوە. چونکە لە ژیانی ژن و مێردایەتیدا بەربەست و لەمپەر دێنە سەر ڕێی هەریەك لە ژن و مێرد، جا خۆڕاگریەکە دەبێتە هۆی زەلیل کردنی هەمو ئەو شتانە. بەڵام هەڵەشەیی زو هەڵچون ترسناکی زۆری تێدایە، کە زۆر بە خێرایی خێزان بەرەو لێك هەڵوەشاندن دەبات.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەم فەرموده‌یەدا ئاڕاستەی هەر یەکێك لە ژن و مێرد دەکات، بە تەساهول و ئاسان کردن مادام لە توانادایە بکرێ، گەر هەر یەکێکیان رقیان لە سیفەتێکی یەکتریان دەبێتەوە، ئەوە سیفاتی جوانی تر هەیە، کە دەبێتە تکاکار بۆ ئەو کەسە. بەمەش گونجاندن و یەکتری ویستن دروست دەبێت و خێزان پارێزراو دەبێت، بیر کردنەوە لە چارەنوسی منداڵەکان و ئازاری لێك جیابونەوە، هەمو ئەوانە دەبێتە مایەی تەنازول کردنی هەر یەکێك لە ژن و مێرد لە شتێك لەو بەختەوەری یەی، کە دەیەوێت، ئەمەش لە پێناوی بەردەوام بونی ژیانی هاوسەریەتی یە، ئەوەش ئەرکێکی ئایینی یە نەك تەنها رابواردن!!

لە کتێبی (صید الخاطر)ی ئیمام (ئیبن الجوزی) (٥٤٢/٣) چاپی (دار الفکر) دەربارەی ئەم مەسەلەیە شتێك نوسراوە، لەژێر سەردێڕی (چۆن مامەڵە لەگەڵ خێزانێك دەکەیت کە خۆشت ناوێت) کە گوڵبژێرێکی لێ باس دەکەین:

پیاوێك هاوسەرەکەی خۆش نەدەویست و سکاڵای دەکرد، گوتی: لەبەر چەند شتێك ناتوانم لێی جیا ببمەوە وەك: قەرزی زۆری بەسەرمەوە هەیە، من ئارامیم کەمە، زمانم لە سکاڵاکردن ڕاناوەستی، لەبەر چەند وشەیەك کە خۆی دەزانێ ئەوم خۆش ناوێت. پێم گوت: ئەمە بەو شێوەیە سودی نیە، دەبێ لە ڕێی دەرگاوە بچیتە ماڵەوە، پێویستە

ئوم کەلثومی کچی عوقبە گوتویەتی: ((ما سَمعتُ رسولَ الله ﷺ رخَّص في شيء من الكذب الاّ في ثلاث: الرجل يقول القول يريد به الإصلاح، والرجل يقول القول في الحرب، والرجل يحدِّث امرأته، والمرأة تحدِّث زوجها))[1]، واتە: گوێم لە پێغەمبەری خوا نەبوە لە هیچ شتێك ڕێگە بەدرۆ بدات، مەگەر لە سێ کات نەبێ: ١- پیاو قسەیەك دەکات بە مەبەستی چاکردنەوەی نێوان دو کەس، ٢- لەکاتی جەنگ دا،

---

بەخۆت دابێیەوە بزانیت ئەو ئافرەتە بەهۆی گوناهەکانتەوە بەسەرتدا زاڵ کراوە (زۆرجار ئاواش نیە چونکە خێزانی زۆر لە پیاوچاکان خراپن!) جا زۆر عوزر بێنەوەو تەوبە بکە، بەڵام ئاڕەزایی دەربڕینو ئازاردان هیچ سودێکی نیە، وەك حەسەنی کوڕی حجاج گوتویەتی: ئەوە سزایەکی خوای گەورەیە بۆتان دەنێرێ، ئێوە بە شمشێر بەرامبەر بەم سزایە مەوەستن، بەڵکو بە داوای لێخۆشبون پێشوازی لێبکەن.

ئەوەبزانە تۆ لە شوێنی ئەو کەسەدای، کە توشی بەلا بوە، بە خۆڕاگریت پاداشت وەردەگریت ﴿وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ ئارام بگرە لەسەر ئەوەی، کە خوای گەورە دەینێرێ، داوای دەروی ڕەحمەتی لێ بکە.

گەر داوای لێخۆشبونو تەوبەکردن لە گوناهو تاوانو ئارام گرتن، خوا بەسەرت دێنێو، کۆیکەیەوە، ئەوا سێ جۆرە هونەر لەخواپەرستی دەستەبەر دەکەیت، کە هەر یەکێکیان پاداشتی لەسەر وەردەگیرێ، ڕۆژگار بە شتێك بەسەر نەبەیت، کە بێسود بێت، واش گومان نابەیت کە ئەوەی لە قەدەر نوسراوە، دەبێ نرخەکەی بدەیت: ﴿وَإِنْ يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُ إِلَّا هُوَ﴾(الأنعام- ١٧).

بەڵام سەبارەت بە ئازاردانت بۆ ژنەکەت ئەوە هیچ پاساوی بۆ نیە، چونکە ئەو زاڵ کراوە، با سەرقاڵیت بە شتی ترەوە بێت.

پیاوەکە گوتی: ئەم ژنە منی لە ڕادەبەدەر خۆش دەوێ، لە خزمەت کردنم زیادەڕۆیی دەکات، کەچی بوغزو قینم بۆی لە سروشتمدا جێگیر بوە.

پێم گوت: داوا لە خوا بکە خۆڕاگربیت، کە بەهۆیەوە پاداشت بەدەست دێنی.

١) رواه مسلم.

٣- کاتێ پیاو قسە بۆ خێزانەکەی دەکات و، ژنیش قسە بۆ مێردەکەی دەکات.

وا دەبینم کە درۆ لە نێوان ژنو مێرددا جائیزە، گەر مەیلیان بەلای یەکتری‌یەوە نەبێت، کە هەر یەکەیان خۆشەویستی بۆ ئەوی تر دەربڕێت. ئەمەش لەپێناو لەنگەرگرتنی کەشتی ماڵو پەروەردەی منداڵانە.

رەنگە ئەو مەیلە لە ئەنجامی مومارەسەو سۆزی دەستکردە وە بگۆڕێ بۆ خۆشەویستی یەکی ڕاستەقینە.

(پیاوێك بە خەلیفە عومەری کوڕی خەتتابی گوت: من هاوسەرەکەم خۆش ناوێت! ئەویش گوتی: ماڵ بە تەنها لەسەر خۆشەویستی بنیات نانرێ!).

کەواتە پێویستە لەسەر پیاو واز لە منگەرایی(أنانیة)ی خۆی بێنێ، ئەوەش لەپێناو ئایندەی منداڵەکانیەتی، بەتایبەتی ئەگەر ئەم بوغزو خۆش نەویستنە لەدوای زەواجەوە دروست بوبێ‌و، خێزانەکەی خۆشی بوێ‌و بە هەمو مافەکانی هەڵبستێ.

## وا چاكە پیاو لەگەڵ هاوسەرەكەی نەرمو نیان بێ

((كان أزواج النبّي ﷺ يراجِعْنَهُ الكلامَ، وهَجُره إحداهن إلى اللّيل! وجرى بينه وبين عائشة كلام، حتى دخل أبوبكر حكماً بينه ﷺ وبينها، فقال لها رسول الله ﷺ : تكلمي أو أتكلم؟ فقالت: تكلم أنـت. ولا تقل إلاّ حقّاً! فلطمها أبوبكر رضي الله عنه حتى أدمى فاها وقال: أوَ يقول غـير الحق يا عدوة نفسها؟! فاستجارت برسول الله ﷺ وقعـدت خلـف ظهره!! فقال النبّـي ﷺ: إنا لم نَدْعُكَ لهذا، ولم نُرِدْ منك هـذا))[1]،
واتە: خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ گلەیی‌و گازاندەو نارەزایی‌یان دەردەبڕی، هەر یەكێك لە خێزانەكانی تا شەو قسەی لەگەڵ نەدەكرد.

ڕۆژێك لە نێوان پێغەمبەرو خاتو عائیشە دەمەقاڵێەك ڕویدا، كـە بـوە هۆی ناكۆكیەك، جا بانگی ئەبوبەكر كراو، بوە ناوبژیوان لە نێوانیاندا.

پێغەمبەر ﷺ بە عائیشەی فەرمو: تۆ یەكەم جار قسەی دەكەی یان من قسە بكەم؟

عائیشە گوتی: تۆ قسە بكەو بەلاّم ئەوەی ڕاست نەبێ نەیڵێی!

ئەبوبەكر بەهۆی ئەو قسەیە زللەیەكی لە عائیشە داو دەمـی بـەخوێن هات، گوتی: ئەدی لە حەقو ڕاستی زیاتر شتی تر دەڵێ؟!

جا عائیشە خـۆی پەنادایـە پـاڵ پێغەمبـەرو لـە پـشتیەوە دانیـشت. پێغەمبەریش بە ئەبوبەكری فەرمو: (ئێمە تۆمان بۆ ئەوە بانگ نەكردوەو، ئەوەشمان لە تۆ نەدەویست)).

---

١) رواه البخاري.

خاتو عائیشە گـوتی: ((مرة، وقد غضبت فقلت: أنت الذي تـزعم أنّك نبي؟! فتبسم رسول الله ﷺ واحتمـل[١] ذلـك حلماً))[٢]

١) لە کتێبی (الاسلام والحياة الجنسية)ی دکتۆر محمود بن الشريف کە مامۆستای تەفسیرو علومی قورئانە لە زانکۆی ئەزهەر، سەنعاداو نوسیویەتی: (جاء رجل الى عمر بن الخطاب يشكو اليه خلق زوجته فسمع امرأة عمر تستطيل عليه بلسانها -وهو ساكت- ورآه عمر متصرفاً فناداه: ما حاجتك يا أخي؟ قال: جئت أشكو إليك استطالة زوجتي عليّ، فسمعت زوجتك تستطيل عليك كذلك!! فأجاب عمر: تحملتها لحقوق لها عليّ: فإنها طباخة لطعامي، خبازة لخبزي غسالة لثيابي، مرضعة لولدي. وليس ذلك واجب عليها، ويسكن قلبي بها عن الحرام. قال الرجل: وكذلك زوجتي، فقال عمر له: تحملها اذن يا أخي فإنما هي مدة يسيرة والعهد قريب)، واتە: پیاوێك هاتە لای عومەری کوڕی خەتتاب، تا سکاڵای لە لا بکات سەبارەت بە هەڵس‌وکەوتی خراپی خێزانەکەی. پیاوەکە گوێی لە خێزانەکەی عومەر بو، کە لەسەر ئیمامی عومەر زمانی درێژدەکرد، ئیمامی عومەریش بێدەنگ بو. کاتێك پیاوەکەی بینی دەڕوات، بانگی کردو پێی گوت: براکەم! چیت دەوێ؟ ئەویش گوتی: هاتوم زمان درێژی خێزانەکەمت لە لا باس بکەم، کەچی گوێم لە خێزانەکەی تۆش بو زمان درێژی لەسەر تۆ دەکرد!!

عومەریش فەرموی: بۆیە تەحەممولم کردوە لەبەر ئەو مافانەی، کە بەسەرمەوەی هەیە: بۆتە چێشت لێنەر (طباخ) بۆ خواردنم، بوەتە نانەوا بۆ نانم، بۆتە جل شۆر بۆ جلەکانم، بۆتە دایەن بۆ شیردانی منداڵم، لە کاتێکدا کە ئەوانەی لەسەر پێویست نیە بیانکات. هەروەها بۆتە سوکنایی دڵم لە حەرام واتە دەم پارێزێ لە داوێن پیسی. پیاوەکە گوتی: خێزانەکەی منیش بەهەمان شێوە وایە.

عومەر فەموی: مادام وایە تەحەمولی بکە چونکە ئەوە ماوەیەکی کەمەو بەسەر دەچێ. (وەرگێڕ)

٢) ئەم تەوجیهەی پێغەمبەر ﷺ چەند جوانە، کە بەهۆی نەرم و نیانیەوە ماڵی کردە بەهەشت، کە ئاشتی باڵی بەسەردا کێشا، تا ژیانی ژن و مێردایەتی بەردەوام بێت. جا گەر هەریەکێك لە ژن و مێرد توڕەبو، پێویستە یەکێکیان خۆی ڕاگرێ و نەرم و نیانی بنوێنێ، چونکە حاڵەتی توڕە وەك سەرخۆش وایە، نازانێ چ دەڵێ و چ دەکات، شەیتان بەسەریدا زاڵ بوە. لەبەر ئەوە نابێ ببینە یاریدەدەری ئەم نەفرەت لێکراوە بۆ کەسی توڕەبو، چونکە دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی زیاتر دەکات، کە ڕەنگە ببێتە مایەی پچڕانی شیرازەی خێزان!

وکــــــرماً))[1]، واتە: جارێك تورە بوم بە پێغەمبــەرم گــوت، ئــەوە تــۆ خۆت بە پێغەمبەر دادەنێی؟!

پێغەمبەریش خەندەیەکی کردو بە ئارامیو نەرمو نیانیو ڕێزەوە خــۆی ڕاگرتو تەحەمولی قسەکەی کرد.

دیارە نــەرمو نیــانیو ئــارام گــرتن لەســەر ژن، وەرزشــێکی دەرونیــەو شکاندنی توڕەییو ڕەوشت جــوان کردنــە، چــونکە ئەوکەســەی بــە تــەنها خۆیەتی، ناتوانێ ئارامگری خۆی تاقی بکاتەوەو عەیبەکانی خۆی بزانــێو بە ئاشکرا بیبینێ، کەواتە ئەوکەسەی ڕێگەی ڕۆژی دوایی گرتبێتــە بــەر، گەر ڕوبەڕوی هەندێك لەمە ببێتەوە زیانی پێناگات، چونکە بە ئارام گرتن لەسەری، فێری خۆسازاندنو بەباشی مشورگێڕیو ڕوبەڕوبونەوەی حاڵەتەکان دەبێتەوە، کە دەرونی پێی ڕازیو بێگەرد دەبێ، ئەمــەش لــە ســودەکانی هاوسەرگرتن (زواج)ە.

جا هەرچەندە پێویستە پیاو دەرهەق بە هاوسەرەکەی نەرمو نیانی بــێ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ مــرۆڤ بەدەســت بەســتراوی بوەســتێو ژنەکــەی بەئارەزوی خۆی خراپەکاری بکات، پیاویش لە دڵی خۆیدا بڵێ: هــەر ئــارام دەگرم.. نەخێر.. ئەمە مەبەست نیە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە بــە نــەرمیو بەهێدی شتی پێ بڵێی، چونکە خراپە بە خراپە چارەسەر ناکرێ لە کاتێك، کە هەردوکتان لە حاڵەتی هەڵچوندان.

ئــالێرەدا دەبــێ ئــارام بگــریو هــێمن بــی، پاشــان گــەر خەفــەت و ناخۆشییەکە نەما، لە چرکەساتی بێگەردیدا هەل بقۆزەوەو بە حیکمەتــەوە بە ئاسانیو سانایی پێی دەڵێی، کە دەبوایە ئاوات ڕەفتار بکردایە.. جــا

---

١) (صحیح).

لەم چرکەساتانەدا نابێ سزای بدەی، نابێ توندوتیژ بی، بەڵکـە بـە نـەرمو نیانیو لەسەرخۆیی‌یەوە سەرزەنشتی بکەی.. گەر ئاوا بکەی ئەنجامگیریەکی باشی دەبێ، چونکە ئەم جۆرە ڕەفتارانە تاقی کراوەتەوەو هەرواشە.

# پـایەبـەرزی ئـافـرەت[١]

﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾(البقرة-٢٢٨)، واتە: ئافرەتان مافیـان هەیـەو بەشـیان هەیـە، وەك کـە مافیـان

---

١) ئیسلام جاری دا.. پێویستە کەرامەتی ئافرەت بپارێزرێ، کە خۆی دایکـە، هاوسـەرە، هاوبەشی ژیانە، لەبەر ئەوە ئافرەت بە پیاو نابەخشرێ بۆ هەندێ کات پـێی رابـوێرێ، پاشان فڕێی بداتە ئەم لاوە، ڕێگە نادرێ لە یەك کاتدا بۆ چەند پیاوێك بێـت! پێویـستە رێزی گەورەیی‌یەکەی بگیرێ، نابێ بکرێتە هاوسـەری یەکێك، کە خۆی پێی رازی نەبێت، کە لەگەڵیدا بە هاوبەشی دەمێنێتەوە، نەك تەنها بۆ خۆشی لـێ وەرگرتنی بێت..

(محمد رسول الحرية)ی شەرقاوی.

ئەم جۆرە سوکایەتیە پێش ئیسلام هەبو.

مامۆستا محمد غەزالی لە کتێبەکەی (رکائز الإیمـان بـین العقـل و القلـب) گوتویـەتی: ﴿ئیسلامی بەرزو گەورە، هاتو میهرەبانی‌یەکەی ژیانی ئافرەتی گرتەوە، ستەمی پیاوە دڵ رەقەکانی لەسەر هەڵگرت. مرۆڤایەتی ئـافرەتی بـە گیـانو جەسـتەوە رزگـار کـرد، لەوکاتەی رێگەی لەبەردەمدا خۆش کرد، کە زانیاری بـە ئـارەزوی خـۆی زیـاد بکـات، مافەکانی دارایی پاراست، ئافرەتی پەیوەست کرد بە پەیامی ئوممەی گـەورەو بانگـەوازە گشتی یەکەی، ئافرەت لە ئاشتیو جەنگدا، ڕەگەزێکی کاریگەرەو پشتێکی بەهێزە. لـە چوارچێوەی یاساکانی ئیسلامدا هۆشیاری ئافرەت هیچی کەمتر نیە لە هۆشیاری پیاو بە کێشەکانی دینو دنیا.

ئافرەتەکانی صەحابەو تابعین بە تێکۆشانی ئیسلام لە خاکی دورگە (جزیرة)دا دژی بت پەرستی نەزان نەبون، یان بە تێکۆشان دژی فارسو رۆمەکان نەزان نەبون.

بەڵام دابەشبونی بارگرانایی بەسەر هەردو رەگەز، بەشیان لە کولـە مـەرگی وەرگـرت بەبێ جەورو ستەم.

ئیسلام پێش هەمو شتێك ئافرەت وەك ئافرەتی ماڵەوە، وەك خێزانی پاڵەوانو دایکـی شەهید دەناسێ!... ئەوە ڕەت دەکاتەوە ئـافرەت بکاتـە سـەرباز بـۆ رابـواردن وەك لـە ئەوروپا لە جەنگە دوایی یەکەی کردی، وەك کە لەکاتی ئاشتی دەیکات﴾.

بەسەرەوە هەیە بە چاکە، پیاوانیش بە پلە یەك مافیان بەسەر ئافرەتانەوە هەیە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((إنما النساء شقائق الرجال))[1]، واتە: ئافرەتان لەتو نیوەی پیاوانن[2].

(عومەری کوڕی خەتتاب گوتی: بە خوا ئێمە لە جاهیلیەتدا هیچ شتێکمان بۆ ئافرەت دانەدەنا، هەتا ئەو کاتەی خوای گەورە ئایەتی دەربارەیان نارده خوارەوەو ئەوەی لە ماف هەیە بۆی دابەشکردن. دەربارەی کارێك قسەم وەردەگرت، خێزانەکەم پێی گوتم: گەر ئاوا بکەی ئاوا باشە!

منیش پێم گوت: تۆ چ پەیوەندیت بەمەوە هەیە؟ لە بارەی دینەوە تەکلیف کراوی؟!

ئەویش گوتی: کوڕی خەتتاب! جێی سەرسوڕمانە تۆ ناتەوێ قسە لە

---

١) رواه أحمد في المسند وأبو داود والترمذي حديث صحيح.

٢) لەو کاتەی کە ئیسلام پایەی ئافرەتانی بەرز کردەوەو کردنی بە نیوەی پیاوان. کۆنگرەیەك بەسترا لە فەرەنسا لە ساڵی (٥٨١) بە واتای لە سەردەمی کۆچی پێغەمبەردا، کە ئەندامانی ئەو کۆنگرەیە جیاوازیان هەبو سەبارەت بەوەی، کە ئایا ئافرەت ئادەمیزادە، یان نا. لە کۆتاییدا گۆنگرەکە بڕیاری دا ئافرەت ئادەمیزادە، بەڵام بۆ خزمەتی پیاوان دروست بوە! کەچی ئیسلام ئافرەتی کردە پاشای ماڵەوە بۆ هەڵسان بە ئەرکی پەروەردەکردنی منداڵ، کە ترسناکی پیرۆزە!

پیاو فەراهەم هێنراوە بۆ خزمەتکردنی لە ژیان دا.. کەواتە با کوێر بن ئەوانەی بە بیانوی داواکردنی مافەکانی ئافرەت داوای دەرچونی لە ماڵەوە دەکەن، بۆ ئەوەی ببێتە گاڵتەجاڕی ئارەزوی خۆیو ئارەزوی ئەوانو، ببێتە حەماڵو پێلاوسڕەوەو ئاودەست پاککەرەوە، کە ئەمە حاڵی زۆر لە ئافرەتانی ڕۆژئاوایە! دەرکردنی ئافرەت لە ماڵەوە ڕوخاندنی گەورەترین کارخانەی پێگەیاندنی پیاوانە. ئافرەت دروستکەری پیاو و دامەزرێنەری پاڵەوانانی جەنگە!

کارت بکرێ؟! خۆ کچەکەت قسە لە قسەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات، هەتا ئەو کاتەی کە ڕۆژەکەی بە توڕەیی دەباتە سەر.

ئیمامی عومەر فەرموی: عەبایەکەم هەڵگرت و چومە لای حەفصەو پێم گوت: کچەکەم! ئایا تۆ قسە لە قسەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەیت هەتا وای لێدێ کە ڕۆژەکەی بە توڕەیی بباتە سەر؟!

گوتی: ئێمە بە خوا قسە لە قسەی دەکەین)[1].

١) بوخاری گێڕاویەتیەوە

## بنەماکانی وەرگرتنی ئافرەت لە ئیسلامدا

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَنْ لاَ يُشْرِكْنَ بِاللهِ شَيْئًا وَلاَ يَسْرِقْنَ وَلاَ يَزْنِينَ وَلاَ يَقْتُلْنَ أَوْلاَدَهُنَّ وَلاَ يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلاَ يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللهَ إِنَّ اللهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾[1] (الممتحنة- ١٢) ، واتە:

---

١) یەکێ لە نوسەران لە میانەی راڤەی ئەم ئایەتەدا بەکورتی دەڵێ: (ئەم بناغانە بە راستی بنەما گەورەکانی بیروبڕوان، هەروەك کە بنەماکانی ژیانی نوێی کۆمەڵایەتیە، کە بریتیە لە بەرەهایی هاوبەش بڕیار نەدان بۆ خوای گەورە... هەروا نزیك سنورەکانی شەرعی خوا نەکەون وەك، دزیو زیناو، کچ زیندە بە چاڵ نەکردن وەك کە لە سەردەمی نەفامی ئەمە باوبوە... هەروا لە نێو نەبردنی ئاواتەکان... ئەویش ئاواتەکانی ناخیانە ﴿وَلاَ يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ﴾.

دوا مەرج: ﴿وَلاَ يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ﴾، ئەمەش بەڵێن بە گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ دەگرێتەوە لە هەمو ئەو شتانەی، کە فەرمانیان پێ دەکات... پێغەمبەریش ﷺ تەنها فەرمان بە چاکەکردن دەکات.

جا گەر پەیمانیان لەسەر ئەم چەند بنەما گشتگیری یە پێدایت، ئەوا پەیمانەکەیان قبوڵ کراوە- بە واتای پێش هاتنی ئەو ئافرەتانە بۆ ناو ئیسلام- جا پێغەمبەر ﷺ داوای لێخۆشبونی بۆ کردن لەو کردەوانەی پێشویان ﴿إِنَّ اللهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ خوای گەورە لێخۆشبو و لێبوردەیە.

ئەوەی لە پێشو باسکرا، کە قورئان لەسەر پەیمان (بیعة)ی ئافرەتی دوپات کردەوە، دەرك بە گرنگو بایەخو چاودێریو ئاراستەکردنی ئیسلام دەکەین بۆ ئافرەتو کۆششکردنی بۆ بەرزکردنەوەی، ئەمەش جێی سەرسورمان نیە، چونکە ئافرەت وەك یەکێك لە سەرکردەکان گوتویەتی: بێشکە بە دەستی چەپی رادەژێنێ، جیهانیش بەدەستی راستی، جا گەر ئافرەت فەرامۆش کراو، بەبێ راسپاردە وازی لێ‌هێنرا، ئەمە مەترسیە لەسەر خۆیو لەسەر ئومەتەکەی، شاعیریش دەڵێ:

ئەی پێغەمبەر ئەگەر ئافرەتـە بڕوادارەکـان هـاتن پـەیمانت بـدەنێ[1] کـە هاوبـەش بـۆ خـوا بڕیـار نـەدەن‌و دزی نەکـەن‌و داوێـن پیـسی نەکـەن‌و منداڵەکانیان نەکوژن، واتە کچەکانیان زینـدە بەچـاڵ نەکـەن‌و، کـردەوەی پیس‌و زۆر ناشیرین نەکەن وەك جارڕدانی ژن بەوەی کە ئەو منداڵەی بویەتی لە مێردەکەیەتی کەچی لە راستیدا لە مێردەکەی نیەو درۆ دەکەن کە ئـەو منداڵە هی مێردیەتی. هەروا ئەوەی فەرمانت پـێ‌کردون بـە چـاکەکردن‌و نەهی کردن لە خراپە، ئەوا پـەیمانیان لــێ‌وەرگرەو داوای لێخۆشـبونیان لـە خوای گەورد بۆ بکە، خوای گەورە بەخشندەو میهرەبانە.

خاتو عائیشە ڕەزای خوای لــێ بێ گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هـەر

---

الأم مدرسة إذا أعددتها أعددت شعباً طيب الأعراق

ئافرەت پێش ئیسلام هیچ کیان‌و بونێکی نەبوە، کە باس بکرێ وەك لە پێشەوە لەسەر زمانی عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لــێ بێ باسکرا.

ئەم بێ مویالاتی‌یە تـەنها لـە چـەرخە کۆنـەکان کـورت هەڵنـەهاتبو، تەنانـەت لـە سەردەمی ئێستاش -نوێ-، کە هەنـدێك نـاوی دەنـێن چـەرخی شارسـتانی‌و رونـاکی، ئافرەت وەك بوکەشوشە بۆ یاری پـێ‌کردنی بـەکاردەهێنرێت، تەنانـەت هەنـدێك گـەل‌و میللەت هەرگیز ئایینی فێر ناکەن!!

١) سەبارەت بەم مەسەلەیە ئەوە دەڵێیـن، کە ئەو حەدیسە هیچ (اصل)ی نیە کـە دەڵــێ: (شاورهن و خـالفوهن) واتە: ڕاوێژ بە ئـافرەت بکـەن بـەڵام بـە قـسەیان مەکـەن، وەك (سخاوي و مناوي) ئەو ڕاستی‌یەیان بەدیار خستوە. هـەروەها حەدیـسی (طاعـة المرأة ندامـة) بەقـسەکردنی ئـافرەت پەشـیمانی لەدوایـە، ئەمـە حەدیـسێکی هەڵبەسـتراو (موضوع)ە وەك (ئیبن عدي‌و أبوحاتم) گوتویانە: لە پێغەمبـەری خـواوە بـە (صـحیح)ی هاتوە، کە پێچەوانەی قسەی (أم سلمة)ی خێزانی رەفتاری نەکرد، لـەو کاتـەی کـە لـە (صلح الحديبيـة) بە پێغەمبەری گوت: برۆ لەبەردەم صەحابەکان قوربانی خۆت سـەرببڕە تاوەکو صەحابەکان چاوت لـێ‌بکەن‌و کارەکە جێ‌بەجێ بکەن.

ئافرەتێکی بڕوادار کۆچی بکردایە بۆ لای ئەو، بەم ئایەتە تاقی دەکـردەوە: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ – تا... غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾.

جا هەر کامێ لە ئافرەتە بڕوادارەکـان بـەم مەرجـە ڕازی بوایـە، ئـەوا پێغەمبەر خواﷺ پێی دەفەرمو: (قد بايعتك كلاماً) ئـەوا بـە قـسە پەیمانەکەتم لـێ وەرگرتی.

خاتو عائیشە گوتویەتی: ((ولا–والله– ما مست يده يد إمرأة في المبايعة قط، ما يبايعهن إلا بقوله: قد بايعتك على ذلك))[1]، واتـە: بـە خوا لە پەیمان وەرگرتندا پێغەمبـەر دەسـتی بـە دەسـتی هـیچ ئافرەتێـك نەکەوتوە، پەیمانی لـێ وەرنەگرتون مەگەر بە قسە نەبێت، کە فەرمویەتی: لەسەر ئەمە پەیمانم لـێوەرگرتی.

لە گێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی:

((فيما استطعن وأطقتن)) پەیمانتان لـێ وەردەگرم لەوەی کە لە تواناتان دایەو دەتوانن هەڵی گرن.

(قلن: الله ورسوله أرحم بنا من أنفسنا) گوتیان: خواو پێغەمبەرەکەی لە خودی خۆمان بە بەزەیی ترە.

(قلن: يا رسول الله ألا تصافحنا؟ قال: إني لا أصافح النساء))[2]، واتە: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا تەوقەمان لەگـەڵ ناکـەیت؟ فـەرموی:

١) رواه البخاري.

٢) رواه أحمد في المسند حديث صحيح.

من تەوقە لەگەڵ ئافرەتان ناکەم.[١]

لە گێڕانەوەیەکی تردا ئەمەشی لەگەڵە: ((ولا تغشّنَّ أزواجكنَّ، فقال امرأة: ما غش أزواجنا؟ قال: تأخذ ماله فتحابـي به غيره))، واتە: گزی لە مێردەکانتان مەکەن، ئافرەتێك گوتی: گزی لە مێردەکانمان چیە؟

---

١) سەبارەت بە تەوقەکردنی ئافرەت هەندێك کەس سەریان لەوە دەسوڕمێ‌و بە نامۆی دادەنێن، کە ئیسلام تەوقەکردنی پیاوی بێگانە لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم بە حەرام دادەنێ. ئەو کەسانە ئەوەیان لە بیر چوە کە زۆربەی زۆری هەڵگیرسانی ئاگر بە هۆی پریشکێك ئاگرەوە دروست دەبێ.

شاعیریش دەڵێ: نظرةٌ فابتسامةٌ فسلامٌ فكلامٌ فموعدٌ فلقاءُ!!

واتە: زەمینە خۆش کەری داوێن پیسی لەوەوە دەست پێ دەکات یەکەمجار لە بینینەوە، پاشان یەکسەر خەندەی بەدوادا دێ‌و سڵاو لە یەکتری کردن‌و دوایی قسە پێکەوەکردن‌و پاشان بەڵێن دانە بۆ کاتی بەیەکگەیشتن بەحەرامی.

لەبەر ئەوە بە هۆی گوشینی دەستەوە لە ڕێگای تەوقەکردندا نەفسی بەدکار رادەکێشێ، کە ببێتە نێچیرێکی چەور بۆ ئەنجامدانی کاری بەدکاریی.

بەم بۆنەیەوە ڕوداوێك دەگێڕینەوە، کە یەکێك لە زانا صاڵحەکان بۆ ئاهەنگێك بانگ کرابو. لەناکاو توشی ئافرەتێك بو لەبەردەم دەرگا پێشوازی لە خەڵك دەکرد. ئافرەتەکە دەستی تەوقەی بۆ زانا صاڵحەکە درێژ کرد، بەڵام زاناکە داوای لێبوردنی لێ‌کرد کە تەوقەی لەگەڵ ناکات.

ئافرەتەکە بەمە دڵناخۆش بو و زویری بە ڕووەوە دیار بو، پاش کەمێك زاناکە ئافرەتەکەی بانگ کردو پێی گوت: دەمەوێ بە ڕاشکاوی شتێکت پێ بڵێم، ئایا ڕێگە دەدەی؟ ئافرەتەکە گوتی: باشە چیت دەوێ بڵێیت؟ ئەویش گوتی: بە ڕاشکاوی پێت دەڵێم: گەر بهاتایە تەوقەم لەگەڵ تۆ بکردایە لەوانە بو هەستم بکردایە، کە دەستت لەدەستی خێزانەکەم نەرمترو جوانترە، ئەو کاتەش خێزانەکەم لەبەرچاو دەکەوت، تۆش بە هەمان شێوە گەر وا هەستت کرد، کە دەستی من لە دەستی مێردەکەت جوانترو نەرمترە، ئەوا مێردەکەت لەبەرچاو دەکەوت. بەڵام گەر هەردوکمان تەوقەمان نەکرد، ئەوا هەر یەکەی بە هاوسەرەکەی خۆی ڕازی دەبێ‌و ئەوەش بۆ هەموان وا باشترە، تا داوێن پاکی بپارێزین.

فەرموی: ماڵەکەی ببەی‌و کەسانی تر سودی لـێ وەرگرن.

لە گێڕانەوەیەکی تردا ئوم عطیە گوتویـەتی: ((بايعنا رســول الله ﷺ فقرأ: ﴿لاَ يُشْرِكْنَ بِاللهِ شَيْئًا﴾، ونهانا عن النياحة، فقبضت إمرأة يــدها قالت: أسعدتني فلانة، فأريد أن أجزيها، فما قال لها رسول الله شــيئاً، فانطلقت ورجعت فبايعها))[1]، واتە: پەیمانمان دا بە پێغەمبەری خـوا ﷺ ئەویش ئایەتی﴿لاَ يُشْرِكْنَ بِاللهِ شَيْئًا﴾ی خوێندەوەو، قەدەغــەی شـیوەن‌و ڕۆڕۆیی کردنی لـــێ‌کردین، ئافرەتێـك دەسـتی کێـشایەوەو گـوتی: فلانـە ئافرەت دڵی خۆش کردم، دەمەوێ پاداشتی بدەمەوە، پێغەمبەری خوا هیچ شتێکی پێ نەگوت، جا ئافرەتەکە ڕۆیشت‌و گەڕایەوەو پەیمانی لـێ‌وەرگرت.

هەروەها لە گێڕانەوەیەکی تری بوخاری لە ئوم عطیەوە، کە گوتویــەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی لـێ وەرگرتین کە شیوەن‌و ڕۆڕۆیی بـۆ مـردو نەکەین!

لە گێڕانەوەیەکی تردا: شیوەن نەکەیت‌و وەك لە سەردەمی جاهیلیــەتی یەکەم زینەت‌و جوانی خۆت بەدەر نەخەیت.

لە گێڕانەوەیەکی (ابن أبی حاتم)دا هاتوە، کـە پێغەمبــەری خـوا دوای خوێندنەوەی ئایەتەکە، فـەرموی: ((فإن وفيتم فلكم الجنّــة)) گـەر ئـەم مەرجانەتان لە بەیعەکەدا بەجێ هێنا، ئەوا بەهەشتتان بۆ هەیە.

دەفـەرموێ: ((لأن يُطعنَ في رأس رجُلٍ بمخيط من حديد خيْرٌ من أن

---

١) رواه البخاري.

يَمسَّ امرأةً لا تحلّ له))[1]، واتە: گەر بە دەرزی (شوژن)ێك لە سەری پیاوێك بدرێ لە دەست کەوتنی بە ئافرەتێك باشترە، کە بۆی حەڵاڵ نیە.

لە گێڕانەوەیەکیش کە لاوازی (ضعف)ی تێدایە دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ﴿وَلاَ يَزْنِينَ﴾ی خوێندەوە، (هند)ی خێزانی (ابوسفیان) گوتی: بۆ ئافرەتی ئازاد زینا دەکات؟! گوتی: نەخێر بە خوا ئافرەتی ئازاد زینا ناکات.

---

١) رواه الطبراني (حديث حسن)

## جوانی ئافرەتەکانی بەهەشت
## وەك کە قورئان وێنای دەکات

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ۞ حَدَائِقَ وَأَعْنَابًا ۞ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا﴾ (النبأ: ٣١-٣٣)، واتە: بۆ مرۆڤە لە خواترس و پارێزکارەکان جێی پیرۆزو بەهرەمەندی هەیە لە باخات و هەموو جۆرە ترێیەك و کچانی تازە مەمك کردوی هاو تەمەن، کە وەك هەنار وایەو شۆڕ نەبۆتەوەو قیت وەستاوە.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَاءً ۞ فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَارًا ۞ عُرُبًا أَتْرَابًا﴾ (الواقعة: ٣٥-٣٧) ، واتە: بەڕاستی ئێمە ئەو ئافرەتانەمان دروستکردوە بەبێ باوك و دایك، نەك لە ڕێگای زاوزێوە. واتە ئەو حۆریانەی کە ئافرەتی ئەم جیهانە نین بەو جۆرە دروستمان کردون و ئامادەمان کردون، هەروەها ئافرەتە مسوڵمانەکانی ئەم جیهانەیش هەر بەو جۆرە دروست دەکەین و دووبارەیان دەکەینەوە. ئینجا ئەو ئافرەتانەمان کردوەو دەیانکەین بە ئافرەتانی هەمیشە هاوتەمەن و یەکسانن لەگەڵ مێردەکانیانا لە تەمەن و گەنجیدا. خۆشەویستن لەلای مێردەکانیان و گوێڕایەڵی مێردەکانیانن.

دەفەرموێ: ﴿ فِيهِنَّ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَانٌّ ۞ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ۞ كَأَنَّهُنَّ الْيَاقُوتُ وَالْمَرْجَانُ﴾(الرحمن: ٥٥-٥٨).

خوای گەورە وەسفی ئەو ئافرەتانە دەکات کە لەو بەهەشتانەدا چەند

ئافرەتی حەڵاڵ‌و هاوسەر هەیە، کە چاویان بڕیوەتە مێردەکانیان‌و، جگە لەوان کەسی تریان ناوێ و، هەمویان کچن‌و هیچ کەسی تر نە ئادەمی‌و نە (جن) لە پێش مێردەکانیان لێیان نەکەوتون‌و نەچونەتە لایان، هەمویان لە ساف‌و لوسی‌و بێ‌گەردیدا، دەڵێی یاقوتن، لە سپێتی پێستدا دەڵێی مەرجانن، یان ساف‌و لوس‌و کوڵم سورن وەکو مرواری، پێست سپین وەکو مەرجان.

دەفەرموێ: ﴿فِيهِنَّ خَيْرَاتٌ حِسَانٌ﴾ (الرحمن- ٧٠)، واتە: لەو بەهەشتانەدا ئافرەتی حەڵاڵ‌و هاوسەر هەیە، کە خوڕەوشت چاك‌و شیرین‌و جوانن.

دەفەرموێ: ﴿حُورٌ مَقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ﴾(الرحمن – ٧٢)، واتە: لەو بەهەشتە ئەو ئافرەتانە چاو گەورەو چاوڕەشێکی وان، کە ڕەشێنەکەی زۆر ڕەشەو سپێنەکەی سپیەکەی بێ‌گەردە، کە ئەوپەڕی جوانی چاوە وە ڕاگیرکراون بە ڕێزو حورمەت لە خیوەتەکانا.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ، فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ، يَلْبَسُونَ مِنْ سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُتَقَابِلِينَ، كَذَلِكَ وَزَوَّجْنَاهُمْ بِحُورٍ عِينٍ﴾(الدخان: ٥١-٥٤)، واتە: تەقواداران لە بەهەشتدا، لە پلەوپایەی ئەمین دان، لە چەند باخێك‌و کانیاوێك، کە پۆشاکیان بریتیە لە ئاوریشمی تەنك‌و ئەستور، هەروەها ئەو حۆریانەیان دەدرێتێ کە چاو گەش‌و سپی‌و ڕەش‌و چاو گەورەن.

دەفەرموێ: ﴿فَهُمْ فِي رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ﴾(الروم- ١٥)، واتە: ئەوانەی لە زەوی‌یەکدا، کە دارو درەخت‌و کانیاوی وای تێدایە دەژین‌و تێیدا

دڵخۆش و شاد دەبن، کە شوێنەواری ئەو نیعمەتەیان بەسەردەوە دیار دەبێت.

دەفەرموێ: ﴿وَعِنْدَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ عِينٌ، كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَكْنُونٌ﴾ (الصافات: ٤٨،٤٩)، واتە: حۆریان لە لایە کە لە غەیری مێردەکانیان چاو نابڕنە کەسی تر، ئەو ئافرەتانە -وەك ئیبن عباس رەزای خوای لێ بێ گوتویەتی-: وەك مرواری شاراوە وان..

حەسەن دەڵێ: ﴿كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَكْنُونٌ﴾ مانای پارێزراون و دەستیان پێ نەکەوتوە، وەك ئەو هێلکەیەی بەرلەوەی کە توێکڵەکەی لێبکرێتەوە.[1]

گومانی تێدا نیە کە خوێنەر -هەروەها نوسەریش- لە باسکردنی حۆریەکانی بەهەشتدا، لیکی بەدەم دا دێتە خوارەوە، لە خوای گەورە داواکارین کە پێمان ببەخشێ، هەمو ئەمەش ئاسانە، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((**كل أمتي يدخلون الجنة إلا من أبى، من أطاعني دخل الجنة، ومن عصاني فقد أبى**))[2]، واتە: هەمو ئومەتم دەچێتە بەهەشت مەگەر کەسێك بۆ خۆی نەیەوێ، هەر کەسێك گوێڕایەڵیم بکات دەچێتە بەهەشت، هەر کەسێك سەرپێچی من بکات، ئەو کەسە نایەوێ بچێتە بەهەشت.

---

١) تفسير إبن كثير.

٢ رواه البخاري.

## سیفەتەکانی ئافرەتانی بەهەشت وەك کە فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ وێنای دەکات

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(إن أزواج أهل الجنّة لَيُغنينَ أزواجهم بأحسن أصوات، ما سمعها أحَدٌ قط، إن مما يُغنين به: نحن الخيرات الحسان، أزواجُ قومٍ كرام، ينظرن بقرّة أعيان وإن مما يغنين به: نحن الخالداتُ فلا نَمُتن، نحن الآمناتُ فلا نَخفْنَ، نحن المقيمات فلا نظعنّ)** **(رواه الطبراني- صحيح)**، واتە: ژنانی بەهەشت بۆ مێرەکانیان بە خۆشترین دەنگ گۆرانی دەچڕن، کە هەرگیز هیچ کەسێك گوێی لێ نەبووە، گۆرانیەکە بریتیە لە: ئێمە ئافرەتانێکی خووڕەوشت چاكو شیرین، هاوسەری کەسانێکی بەرێزین کە بە چاوڕونی دەڕوانن، ئێمەین، کە هەمیشەیین نامرین، ئێمەین دڵنیاکەرو ئاسودەکار، ئێمەین، کە دەمێنینەوەو ناڕۆین.

هەروەها فەرمویەتی: **(إن الحور العين لَيُغَنّين في الجنّة، يَقُلْنَ: نحن الحور الحسان، خُبئنا لأزواج كِرام)** **(رواه الطبراني- صحيح)**.

هەروەها دەربارەی سیفەتەکانی پیاو لە بەهەشتدا فەرمویەتی: **(إنَّ الرَّجل من أهل الجنّة لَيُعطى قُوَّة مئة رجلٍ في الأكل، والشرب، والشهوة، والجماع، حاجةُ أحَدِهم عَرَقٌ يفيض مِن جِلدِهِ...)** **(رواه الطبراني – صحيح)**، واتە: پیاوی بەهەشتیی لە خواردنو خواردنەوەی ئارەزوو جوتبوندا، هێزی سەد پیاوی پێدەبەخشرێ.

## لە سیفەتەکانی ئافرەتی چاك (صالحة)

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَعِنْدَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ عِينٌ﴾ (الصافات- ٤٨)، واتە: ژنانی چاو کەژاڵو چاودرشتو جوانیان لەلایە، کە تەنیا ئەویندارى مێردەکانی خۆیانن.

ئەم ئایەتە کە دو ئایەتەکەی بە دوادا دێن باسی حۆریەکانی بەهەشت دەکات، دەتوانرێ بۆ ناسینی هەندێ سیفاتی ئافرەتی چاك سودی لێ وەربگیرێ، کە بریتین لە:

یەکەم: ژن تەنها چاوی ببڕێتە مێردەکەی، لەبەر خۆشەویستی مێردەکەیو ڕازی بون بەو، جا با چاوی بۆ لای کەسی تر نەگێڕێ.

دوەم: ﴿مَقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ﴾ واتە لێیان قەدەغەیە، کە جوانیو ڕازاوەییان بۆ غەیری مێردەکانیان بێت، جا دەبێ ئەم ڕازاوەیی تەنها بۆ مێردەکانیان بێتو لە ماڵەوەیان دەرنەچن، تەنها ئەوانیان بوێ.

سێیەم: لە سیفەتەکانی ژنی بەهەشتی ئەوەیە، کە پاك کراوەتەوە لە وەسوەسەی شەیتانو ناخیان پاك کردۆتەوە لە غیرەو ئازاردانی مێردەکانیان، خوای گەورە لە چەند ئایەتێکدا باسی ئەو ئافرەتە چاکانە دەکات:

﴿حُورٌ مَقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ﴾(الرحمن- ٧١)، ﴿وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ (البقرة- ٢٥)، واتە: ژنەکانیان لەوێ زۆر پاكو خاوێنن، هەتاهەتایەش هەر لە بەهەشت دەمێنن.

﴿فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللهُ﴾ (النساء- ٣٤)، واتە: ئافرەتە چاکەکان وەك ئیبن عەبباس‌و غەیری ئەو گوتویەتی: ئەوانەن، کە گوێڕایەڵی مێردەکانیانن‌و لە کاتی ئامادەنەبونی مێرد لە ماڵەوە پارێزگاری لە ماڵ‌و نەفسی خۆی دەکات‌و مافەکانی دەپارێزێ.

﴿عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ مُسْلِمَاتٍ مُؤْمِنَاتٍ قَانِتَاتٍ تَائِبَاتٍ عَابِدَاتٍ سَائِحَاتٍ ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَارًا﴾ (التحريم- ٥)

ئەم ئایەتە لەسەر خێزانەکانی پێغەمبەر دابەزی، کە دەفەرموێ: گەر ئێوە تەڵاق بدات، تکا وایە کە خوای گەورە بە ژنی تر تۆڵەی بۆ بکاتەوە، کە لە ئێوە باشتر بن، کە ئەم سیفەتانەیان هەبێت: (کە مسوڵمان‌و بڕوادارو گوێڕیەڵ‌و تەوبەکارو خواپەرست‌و بەڕۆژو بن، جا چ بێوەژن بن یان کچ).

﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللهُ لَهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ (الأحزاب:٣٥)، واتە: پیاوو ژنی مسوڵمان‌و پیاوو ژنی بڕوادارو پیاوو ژنی فەرمانبەرو پیاوو ژنی قسەڕاست‌و پیاوو ژنی خۆڕاگرو پیاوو ژنی بێ‌فیزو خۆ بە زل نەزان‌و پیاوو ژنی سەدەقەدەرو پیاوو ژنی ڕۆژوەوان‌و پیاوو ژنی ناموس پارێزو پیاوو ژنێ، کە زۆر یادی خوا دەکەن، لە خوداوە لێخۆشبون‌و پاداشێکی گەورەیان بۆ دانراوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((ألا أخبرُكم بخير نساءكم في الجنّة؟ قلنا: بلى يا رسول الله، قال: كل ودود ولود، إذا غضب زوجها قالت:

هذه يدي في يدك لا أكتحلُ بِغُمْض حتى ترضـــى!!))[1]، واتـه: پێتـان ڕابگەیەنم باشترین ئافرەتانتان لە بەهەشـتدا کێیـە؟ گوتـان: بـەڵێ ئـەی پێغەمبەری خـوا، فـەرموی: هـەمو ئـافرەتێکی کـە خۆشەویـست بێـتو منداڵی ببێت، گەر مێردەکەی تورە بو بڵێ: ئەوە دەستم لە دەستت دایـە، کل لە چاوم ناکەم بە نوقاوی (واتە ناخەوم) هەتا ڕازی نەبیت.[2]

---

١) رواه الطبراني وهو (حديث صحيح).

٢) پیاوێك نامەیەکی بـۆ خـەزوری نوسـی، کـە تیایـدا سوپاسـی دەکـات لەسـەر چـاك پەروەردەکردنی کچەکەی، جا هەندێ سیفاتی باشی کچەکەی بـۆ بـاس دەکـاتو دەڵـێ: مامەی بەڕێزم، ئەی باوكو هاوڕێم:

من سوپاستان دەکەم، کە ئێوە کچە بەبەهاو بەڕێزەکەتان بەمن بەخشی، هەرچەند مـن لەسەری توندبم سکاڵا ناکات، بەڕاستی ئەو دڵسۆزەو هەڵدەستێ بە خزمەتکردنم، من لە میانەی ئەو چەند ساڵە درێژەدا، کە دور بوم لە کەس‌وکارمو نیشتمانم، هەستم بە ناخۆشیو دوره ولاتی نەکردوه، ئەمەش بە هۆی ئەوەوە، کە وای لە ژیانم کردوە نوێکاری بەردەوامی تێدا بێت. بەڕاستی ئەو یارمەتیم دەدات کە دروشمەکانی ئاینی بـەجێ بهێـنم. گـەر مـن دانەری کتێبی (تحفة العروس) أو (الزواج الأسلامي السعيد)م نەناسیبایە ئەوا دەمگـوت خێزانەکەم ئەم کتێبەی داناوە! چونکە هەمو ئەوەی لەو کتێبەدا هاتوە پیادەی دەکات.

لەبەرئـەوە پیرۆزباییتـان لـێدەکەم لەسـەر چـاك پـەروەردە کردنـی. ئـەوەی جـێی سەرسوڕمانە، کە مەدحکراو هەرچییەك بێت وای لـێناکات هەست بە لەخۆبایی بکات. ئەو لەگەڵ منداڵەکانی هەمان ڕەفتاری گرتوە، بۆ ئـەوەی ببنـە پیـاوی چـاكو سـەربازو سەرکردە لە داهاتودا. ئەو کاری دنیـاو ئـاخیرەتی پێکـەوە گرێـداوە، لەسـەر حیـسابی هیچیان زیادەڕۆیی ناکات، بەڕاستی من بە هاوسەرێتی ئەو دڵخۆشم، ئـەویش دڵـشادە، داواکارم ئێوەش دڵشاد بن. ئەو زۆر بایەخ بە منداڵەکانی دەداتو چاودێری تەندروستیو خواردنو پۆشاکو خـەوتنیان دەکـات، بـە بۆنـەی سـەرکەوتنیان لـە تاقیکردنـەوەکانی قوتابخانە، دیاریان پێشکەش دەکات. دراوسێکان زۆریان خۆشـدەوێ، چـونکە هاوبەشـی خۆشیو ناخۆشیان دەکات، لە بۆنەکان(مناسبات)دا دیاریان پێشکەش دەکات.

سوپاس بۆ خوا پشتیوانم بو، کە ئەم ئافرەتەی کردە هاوسەرم. ئەم ڕوداوەتـان بـۆ بـاس دەکەم: پیاوێك هاتە ماڵەوەم، کە موعامەلەکی لەلام بو، جا بەرتیلی پێدامو گوتی ئەمە

هەروا دەفەرموێ: ((**ما إستَفادَ المؤمن بعد تقوى الله، خيراً له من زوجةٍ صالحة، إن أمرَها أطاعته، وإن نظر اليها سرّته، وإن أقسم عليها أبرّته، وإن غاب عنها نصحته في نفسها وماله**))[١]، واتە: مرۆڤی بڕوادار لە پاش ترسان لە خوا، هیچ خێرێکی وەك هاوسەرێکی چاك بەدەست نەهێناوە، گەر فەرمانی پێکرد گوێ رایەڵی دەکات، گەر تەماشای کرد دڵی خۆش دەکات، گەر سوێندی لەسەر خوارد دەیگەیەنێتە جێ، گەر لێی دورکەوتەوەو چوە سەفەرێك ئامۆژگاری دەکات بە پارێزگاریکردنی ماڵیو نەفسی.

بە پێغەمبەری خوا ﷺ گوترا: کام ئافرەت خەیرو چاکە؟ فەرموی: ((**التي تَسُرُّه إذا نظر، وتُطيعهُ إذا أمر**[٢]**، ولا تخالفه في نفسها ولا ماله بما يكره**))[٣]، واتە: ئەو ئافرەتەی بە بینینی دڵت خۆش دەکات، گەر

---

دیارییە. جا خێزانەکەم گوتی: گەر موعامەلەت لەلای نەبا، ئا ئەم دیاریەت پێدەبەخشی؟ پیاوەکە لە وەڵامی خێزانەکەم واقی وڕما، ئاواتی خواست، کە سەردانی خوشکەکەی بکاتو ڕێنمایی بکات. جا پاش ساڵێك ئەم پیاوە داوای لێکردم کە لەلای کار بکەم.

خێزانەکەم هەردەم هانی دەدام لەسەر زەکات دانو زیادکردنی بە صەدەقەو خێر.

من ئەم چەند دێرە دەنوسم لە کاتێکدا کە فرمێسکەکان لە چاومدا تنۆك تنۆك دەکات، وەك نرخی خۆشەویستی، ئەمە حەقە بۆ ئێوەو بۆ دایکیو بۆ هەمو ئەوانەی بەشداری پەروەردەکردنیان کردوە.

لێرەدا من بەم ئەندازە نوسینە واز دێنم، گەر بمەوێ مافی خۆی بدەمێ لە وەسف کردنی سیفەتە چاکەکانی، ئەوا پێویستی بە چەند کتێبێكو کاتێکی زۆر دەکات، لەبەر ئەوە ویستم بەم چەند پارچە نوسینە وێنەیەکی بچوك کراوەی ژیانی ئەم مرۆڤە چاکەو هاوسەرە بروادارەتان بخەمە بەرچاو.

١) رواه إبن ماجة.

٢) بە مەرجێك فەرمانەکانی مێرد پێچەوانەی ئیسلام نەبێت وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق)).

٣) رواه أبو داودو النسائي باسناد حسن.

فەرمانی پێکرا گوێڕایەڵ بێت، بە پێچەوانەی ئەو نەکاتو دەست لە ماڵەکەی نەدات، کە ئەو پێی ناخۆشە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: **((عليكم بشواب النساء، فإنَّهنَّ أطيب أفواهاً، وأنتق أرحاماً، وأسخن إقبالاً))**[1]، واتە: ئافرەتی گەنج بکەنە هاوسەری خۆتان، چونکە زمان شیرنن‌و منداڵیان زۆر دەبێ‌و، بە گەرمی دێنە پێشوازی.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: **((خير نساءٍ ركبن الإبل صالحُ نساء قريش، أحناهُ على ولد في صِغره، وأرعاه على زوْج في ذات يده))**[2]، واتە: چاکترین ئەو ئافرەتانەی سواری حوشتر بون ئافرەتە چاکەکانی قورەیشن، زۆر بەسۆزن بۆ منداڵەکانیان لەکاتی ساوایی دا، زۆر چاودێرن لەسەر ماڵی مێردەکانیان.

قاسمی کوڕی عبدالرحمن گوتویەتی: **((كان عبدالله بن مسعود ﷺ يقرأ القرآن، فإذا فرغ قال: أين العُزَّاب؟ فيقول: أدنوا مني ثم قولوا: اللّهم ارزقني امرأة إذا نظرتُ اليها سرَّتني، وإذا أمرتُها أطاعتني، وإذا غبتُ عنها حفظتْ غيْبي في نفسها ومالي!))**، واتە: عبداللەی کوڕی مەسعود قورئانی دەخوێندەوە، جا گەر لە خوێندنەوەکەی بوبایەوە دەیگوت: بێژنەکان لە کوێن؟ دەیگوت: لێم نزیك ببنەوە پاشان بڵێن: خوایە ژنێکم پێ ببەخشە گەر تەماشام کرد دڵم خۆش بکات. گەر فەرمانم پێکرد گوێڕایەڵیم بکات، گەر دور بوم لێی خۆی‌و ماڵم لە خراپە بپارێزێ.

---

١) الشيرازي في (الألقاب) وسنده صحيح كما قال محقق صحيح الجامع الصغير.

٢) رواه البخاري.

## سیفەتەکانی ئـافـرەتی ڕەفـتـار نـاشـیـرین

جابر دەڵێ: ((شهدت مع رسول الله ﷺ الصلاة يوم العيد، فبدأ بالصَّلاة قبل الخطبة بغير أذان ولا إقامة، ثم قام متوكئاً على بلال، فأمر بتقوى الله، وحثَّ على طاعته ووعظ النَّاس وذكَّرهم، ثم قام حتى أتى النساء، فوعظهُنَّ وذكرهُن، فقال: (تصدَّقْنَ! فإن أكثركُنَّ حطبُ جَهنَّم!!) فقامت إمرأةٌ سَطَةَ النِّساء سفعاءُ الخَدَّين فقالت: لِمَ يا رسول الله؟! قال: (لأنكنَّ تُكثرنَ الشكاة وتَكْفُرن العشير). فجعلن يتصدقن من حُليهنَّ ويلقينه في ثـوب بـلال))[1]، واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوا لە نوێژی جەژن ئامادە بوم، پێغەمبەری خـوا بەر لە وتـار خوێنـدن دەسـتی کـرد بـە نوێـژ بێئـەوەی بـانگو قامـەت بخوێندرێ. پاشان دەستی خستە سەر شانی بیلال، فەرمانی کرد بە ترسـان لە خواو هانی ئەوەیدا، کە گوێڕایەڵی فەرمانی خوا بن، ئامۆژگاری کردنو یادی ڕۆژی دوایی بیر خستنەوە.. پاشان هەڵسا تا ئافرەتان هاتن بۆ گـوێ گرتن. پێغەمبەر ئامۆژگاری ئافرەتەکانی کردو فەرمانو یاسـاکانی خـواو ڕۆژی دوایی بیر خستنەوە.

پاشان فەرموی: ((خێرو چاکە بکەن! چونکە زۆربەتان سوتەمەنی ئاگری دۆزەخن!!))

یەکسەر ئافرەتێك لە ناوەڕاستی ئافرەتەکانەوە هەڵسا کە ڕومەتـەکانی ڕەنگی گۆڕابو ڕەش ببو بەلای سورداو گوتی: ئەی پێغەمبەری خـوا بۆچـی

---

١) رواه البخاري.

ئێمە سوتەمەنی ئاگری دۆزەخین ؟!

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((چونکە زۆر سکالاو گلەیی دەکەن‌و ناسوپاس گوزارن‌و چاکەو پیاوەتی پیاوەکانتان لەبەرچاو نیە!!))

کاتێك ئافرەتەکان ئەوەیان بیست یەکسەر خشڵ‌و زێڕەکانیان فڕێدایە ناو کراسی بیلال. واتە کردیان بە خێر.

هەروەها دەفەرموێ: ((چوار شت مایەی بەختیاریە: ئافرەتی چاك، خانوی گەورە، دراوسێی چاك، سواریی یەك سواری ببی، چوار شتیش مایەی بەدبەختیە: دراوسێی خراپ، ئافرەتی خراپ، سواریی خراپ، خانوی تەسك‌و گچکە))[1].

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لا ينظر الله تبارك وتعالى إلى امرأة لا تشكر لزوجها! وهي لا تستغني عنه))[2]، واتە: خوای گەورە تەماشای ئافرەتێك ناکات سوپاسی مێردەکەی نەکات! لە کاتێکدا ئەو ئافرەتە ناتوانێ دەستبەرداری بێت.

هەروەها دەفەرموێ: ((إثنان لا تجاوز صلاتهما رؤسهما: عبدٌ أبق من مواليه، وإمرأة عصت زوجها، حتى ترجع))[3]، واتە: دو کەس نوێژیان لە سنوری سەریان تێپەڕ ناکات: ئەو عەبدەی کە لە دەست گەورەکەی هەڵدێ بەبێ ئازادکردنی، ئەو ئافرەتەی کە سەرپێچی فەرمانەکانی مێردەکەی دەکات، تا ئەو کاتەی دەگەڕێتەوە ژێر فەرمانی مێردەکەی.

---

١) رواه ابن حبان (حديث صحيح).
٢) رواه النسائي والبزار (جيد).
٣ رواه الطبراني و الحاكم (صحيح).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((الشـــؤم في الدار، والمرأة والفَرَسِ))[١]، واتە: ڕەشبینی‌و شومی لە خانو و ئافرەت‌و سواری هەیە، جا چ ئەسپ بێ یان ماین یان ئێستر.

بۆ ڕونکردنەوەی ئەم فەرمودەیە شێخ علی محفوظ لە کتێبی (الأبـداع في مضار الأبتداع)دا دەڵێ: لەو شتانەی بـە (بیدعــە) دادەنـرێ ئەوەیـە، کـە مرۆڤ بیروباوەڕی وابێ خانوو ژنهێنان‌و میوان، مایـەی شـوم‌و نەگبـەتی‌و هێنانی خۆشی‌و بەرەکەتن. وەك کاتێك خانویـەك دەکـڕدرێ، لـەو کاتـەدا ڕوداوێك ڕودەدات وا بزانرێ بە هۆی کڕینی ئەم خانوە توشی بەڵا بـوە، بـە هەمان شێوە گەر یەکێك ژن بهێنێ یان ئۆتۆمبیل یان ماڵاتێك بکڕێ، یان میوانێك بێتە لای وا بزانێ بە هۆی ئەم شتانەوە توشـی بـەڵاو موسـیبەت بوە. ئەو خەڵکەش کە بەم جۆرە بیر دەکەنەوەو بەڕاستیـشی دەزانـن، ئـەم فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ دەکەنە بەڵگە، کـە پێـشتر باسمـان کـرد کـە بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

بەڕاستی بە هەڵە لەم فەرمودەیە تێگەیشتون، چونکە ڕیوایـەتێکی تـر هەیە، کە ئەم فەرمودەیەی پێشەوە شی دەکاتەوە: ((من حــــدیث أسمـــاء بنت عمیس قالت: قلت یا رسول الله ما شؤم الدار؟ قال: ضیق مساحتها وخبث جیرانها. قیل فما شؤم الدابة؟ قال: منعها ظهرها وسوء خلقها. قیل فما شؤم المرأة؟ قال: عقم رحمها وسوء خلقها))[٢]، واتـە: ئـەسمای کچی عومەیس گوتی: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا شوم‌و نەگبەتی خانو چیە؟ پێغەمبەر فەرموی: شوم‌و نەگبەتی خانو ئەوەیە ڕوبەر (مـساحة)ەکـەی

١) رواه البخاري.

٢) رواه الطبراني.

بچوك‌و تەسك بێ‌و دراوسێکەی خراپ‌و پیس بێ.

هەروەها بە پێغەمبەر گوترا: شومی‌و نەگبەتی چوارپێ چیە؟

فەرمووی: وڵاغێك کە نەهێڵێ سواری ببی‌و بە خراپی هەڵس‌وکەوت بکات‌و بجولێتەوە.

گوترا: شومی‌و نەگبەتی ئافرەت چیە؟

فەرمووی: ئافرەتەکە منداڵی نەبێ‌و کرداری خراپ بێ‌و بە خراپی رەفتار بکات.

## هاوسەری نمونەیی

ئەبو هورەیرە گوتویەتی: ((أَتى جبريلُ النبّي ﷺ فقال: يا رسول الله، هذه خديجة قد أتتك معها إناء فيه إدام (أو طعام أو شراب)، فإذا هي أتتك فاقرأ عليها السلام من ربّها عزوجل ومنّي، وبشّرها ببيت في الجنَّة من قَصَب -أي جوهر- لا صخَبَ فيه ولا نَصَب))[1]، واتە: جبریل هاتە لای پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە خەدیجەیە دێتە لات قاپێکی پێیە، پێخۆر یان خواردن یان خواردنەوەی تێدایە، جا کە هاتە لات سەلامی خوای گەورەو منی پێ بگەیەنەو مژدەی خانویێکی پێبدە لە بەهەشت، کە لە گەوهەرو مرواری دروست کراوە، هەراو چریکەو ماندوبونو نارەحەتی تێدا نیە.

خەدیجە، ڕەزای خوای لێ بێ، یەکەم خێزانی پێغەمبەر بو، ژیرترین ئافرەتی قورەیش و بە رەوشترین ئافرەتیان بو، پێش بونی بە پێغەمبەر لەبەر دەست پاکیو ڕەوشت بەرزی یەکەی پێغەمبەری هەڵبژارد ببێتە هاوسەری، جا بەسەر هەمو ئەو گەورە پیاوە عەرەبانەی، کە خوازیاری بون هەڵیبژاردو بە گەورەی دانا.

خاتو خەدیجە لەکاتی دابەزینی سروش (وحي) پاڵپشتی پێغەمبەری دەکرد، هانی لەسەر جێگیریو بەردەوام بون لە بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلامی دەداو هەمو سەروەتو سامانەکەی خستە بەردەستی پێغەمبەر، پێویستە هەمو هاوسەرێکی چاك ئەمە لەگەڵ مێردی چاك ئەمە ڕەفتاری

---

١) رواه مسلم.

بێ. لە هەڵوێستە پاڵەوانی‌یە گەورەکەی خاتو خەدیجە قسەکەی بو بۆ پێغەمبەر ﷺ، لەوکاتەی بۆ یەکەمجار وەحی بۆ هاتە خوارو شلەژاو گەڕایەوە ماڵەوەو بە خێزانەکەی گوت: داپۆشن داپۆشن، جا هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە ئەویش هانیداو پێی گوت: ((**والله لا يخزيك الله أبداً إنك تصل الرحم، وتحمل الكل، وتكسب المعدوم وتعين على نوائب الزمان**))[1]، واتە: بەخوای خوا ریسوات ناکات، تۆ سیلەی رەحم بەجێ دێنیو بارگرانایی خەڵك هەڵدەگریو یارمەتی نەدار دەدەی.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**خَير نسائكُم الوَلُود، والمواسيةُ، إذا اتَّقين الله. و شَرُّ نسائكم المتبرجات المتخيلات، و هُنَّ المنافقات، لا يدخُل الجنّة منهُنَّ إلاّ مثل الغُراب الأعْصم...**))، واتە: باشترین ئافرەتتان ئەوانەن کە منداڵیان دەبێو خۆشەویستنو دڵنەوایی‌کەرن، گەر لەخوا بترسن، خراپترین ئافرەتتان ئەوانەن کە جوانی خۆیان بۆ بێگانە بەدەردەخەنو شانازی بەخۆ دەکەن، ئا ئەوانە دوڕونو کەسێکیان ناچێتە بەهەشت مەگەر بە شێوەی قەلەڕەشی بەڵەك[2].

مێژو بۆمان دەگێڕێتەوە کە شورەیحی قاضي رۆژێك لەگەڵ شەعبی بەیەك گەیشتن، شەعبی سەبارەت بە ماڵەوەی پرسیاری ئەحواڵی لێ کرد، ئەویش گوتی:

لەوەتەی بیست ساڵە، خێزانەکەم تورەی نەکردوم، گوتی ئەمە چۆن وایە؟ شورەیح گوتی: لە یەکەم شەودا چومە لای خێزانەکەم بینیم زۆر جوانە، جوانی یەکی بێ‌هاوتا، لە دڵی خۆمدا گوتم: با دەستنوێژ هەڵگرمو دو رکعات

١) رواه البخاري و مسلم.
٢) رواه البيهقي (صحيح).

نوێژی سوپاسگوزاری بۆ خوا بکەم، کاتێك سەلامم دایەوە بینیم خێزانەکەم نوێژی لەگەڵ مندا دامەزراندوەو لەگەڵ من سەلام دەداتەوە، جا کە ماڵەکە چۆڵ بو لە خزمو کەسو هاورێ، چـومە نزیکـیـەوەو دەسـتم بـۆی بـرد، ئەویش گوتی: ئەبو ئومەیە لەسەر خۆت بە جارێ بوەستە، پاشان گوتی:

الحمد لله أحمده وَأستعينه، وَأصلي على محمد وَآله، من ئافرەتێکم نامۆ (غریب)م هیچ زانیاریم دەربارەی ڕەوشتت نیە، جا چیت پێخۆشە پێم بڵێ، تاوەکو بۆت جێبەجێ بکەم، چیت پێ ناخۆشە تاوەکو نەیکەم، گـوتی: لـە قەومەکەی تۆ ئافرەتتان هەبوە، کە بیکەیە هاوسەر، منیش لە قەومەکەی خۆم پیاو هەبوە کە هاوشانم بێت، بەڵام کە خوای گەورە کـارێکی هێنایـە پێش دەبێ ببێ، ئەوا بوم بە هی تۆ و چی خوای گەورە فەرمانی پێکردوی ئەوە بکە، جا یان هێشتنەوە بە چاکە، یان دەست بەردان بـە چـاکە، أقـول قولي هذا وَأستغفر الله لي وَ لك.

شوردیح گوتی: بە خوا شەعبی! لەم شوێنەدا ناچـاری کـردم، کـە وتـار بخوێنم!!

جا گوتم: أحمد الله و أستعينه، و أصلي على النبّـي وآله وأسـلم، وبعـد، بەڕاستی تۆ قسەیەکت گوت گەر لەسەری بمێنیەوەو جێگیـربی ئەمە بەشت دەبێت، گەر وازی لـێ بێنی ئەوە دەبێتە بەڵگە لەسەرت. من حـەز بـەوەو بەوە دەکەم، حەز بەمو بەوە ناکەم، گەر چاکەیەکت بـینی بـڵاوی بکـەوە، کە خراپەیەکت بینی داپۆشە!

ئەویش گوتی: حەزت لە سەردانو هاموشۆی کەسو کارم هەیە؟

گوتم: حەز ناکەم خەزورانم بێـزارم کـەن، گـوتی: حـەز بـەکام دراوسـێ دەکەیت، کە بێتە ماڵەکەت بۆ ئەوەی ڕێگەی پێبدەم بێتە ماڵ، حـەز بـە

کامەیان ناکەیت، تا نەهێڵم بۆ ماڵ بێت.

گوتم: بەنی فلان قەومێکی چاکن، بەنی فلانیش قەومێکی خراپن.

شوردیح گوتی: ئەم شەوە خۆشترین شەو بو، کە لەگەڵی مامەوە، ماوەی یەك ساڵ لەگەڵی ژیام هیچ شتێکم لێ نەبینی کە پێم ناخۆش بێ، کە سەری ساڵ هات لە (مجلس القضاء) هاتمەوە، بینیم فلانە ئافرەت لە ماڵەوەیە.

گوتم: ئەم ئافرەتە کێیە؟ گوتی: ئەمە دایکی خێزانەکەتە.

ئەویش ئاوڕی داوە لێم و پرسیاری لێ کردم: خێزانەکەت چۆنە؟

گوتم باشترین هاوسەرە؟ گوتی: ئەبو نومەیە، ئافرەت لە دو حاڵەت باری خراپ نابێ: گەر کوڕی ببێ، یان بەختی لەلای مێردەکەی هەبێت، بەخوا پیاو لە ماڵەوە خراپترین شت، کە دەستی کەوتبێت ئافرەتی بە نازو نوزە، جا کەوابێ بە ئارەزوی خۆت پەروەردەی بکە.

ئەوا بیست ساڵە لەگەڵم ماوەتەوە تائێستا گلەییم لە هیچ شتێکی نیە جگە لە جارێك نەبێت کە ستەمم لێ کرد!!

جا ئافرەتان با بەو شێوەیە بن!!

## پێغەمبەر هاوسەری بەوەفایە

خاتو عائیشە دەگێڕێتەوە، کە پیرەژنێـك هاتـە لای پێغەمبـەر ﷺ و پێی فەرمو: تۆ کێی؟

گوتی: جثامەی موزنی.

پێغەمبەر فەرموی: تۆ حەسانەی! ئێوە چۆنن؟ ئەحواڵتان چـۆنە؟ پـاش ئێمە، ئێوە ئەحواڵتان چۆن بو؟

گوتی: دایك و باوکم قوربانت بێ، باشین!

کاتێك ڕۆیشت خاتو عائیشە فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە چۆنە بەجۆرە پێشوازی‌یە، پێشوازیت لەم پیرەژنە کرد؟! فـەرموی: لەسـەردەمی خەدیجەدا هاموشۆی دەکردین!

باش بەجێهێنانی عەهدو پەیمان لە بڕوادیە[1].

خاتو عائیشە گوتویەتی: ((ما غِرْتُ على أحد من نساء النبي ﷺ ما غرت من خديجة، وما رأيتها قط! ولكن كان الرسولُ يُكثـرُ ذِكرهـا، وربما ذبح شاةً ثم يقطِّعها أعضاءَ، ثم يبعثُها الى صدائقِ خديجة!

وربما قلت له: كأن لم يكن في الدنيا إمرأة إلا خديجـة! فيقـول: إنْ كانت وكانت، وكان لي منها ولد! "خير نسائها مريم بنـت عمـران، وخير نسائها خديجة" وأشار الى الـسماء والأرض))[2]، واتـە: غـیرەم بەرامبەر هیچ خێزانێکی پێغەمبەر نـەبوە، وەك ئەوەنـدەی بەرامبـەر بـە

---

١) رواه الحاكم و صححه و وافقه الذهبي.

٢) رواه البخاري و مسلم و الترمذي.

خەدیجەم هەبوە، کە هەرگیز نەم بینیوە! بەڵام پێغەمبەر زۆر باسی دەکرد، کاتێ مەڕی سەردەبڕی و لەت لەتی دەکرد، بۆ هاوڕێکانی خەدیجەی دەنارد!

بە پێغەمبەرم فەرموو: وەك بڵێی لە دنیا کەسی تێدا نەبوبێ تەنها خەدیجە نەبێت!

ئەویش فەرموی: کەوا بێ هەر ئاواشە، چونکە منداڵم لێی هەبوە! جا بە پەنجەی ئاماژەی بۆ ئاسمان و زەوی کرد، کە باشترین ئافرەت مەریەمی کچی عومرانە و باشترین ئافرەتی زەوی خەدیجەیە.

هەروەها گوتویەتی: ((ما غرت على امرأة قط ما غرت على خديجة من كثرة ذكر النبي ﷺ إياها، ولقد ذكرها يوماً فقلت: ما تصنع بعجوز حمراء الشِّدْقين؟! قد أبدلك اللهُ خيراً منها؟! فقال والله ما أبدلني الله خيراً[1] منها: آمنت بي حين كفر الناس، وصدَّقتني إذ كذَّبني

---

١) دکتۆر نظمي لۆقای مەسیحی لەمەڕ وەفای پێغەمبەری خوا ﷺ لە رسالەکەی (محمد في حياته الخاصة) لاپەڕە ٥٤-٥٥ دەڵێ: ((ئەمە چ کردەوەیەکە، وا لە پیاو دەکات دوای مردنی هاوسەرەکەی بە چەندەها ساڵ بەوەفا بێت بۆی و، بە دڵ نەرمی و بەبەزەیی و ستایش کردنەوە باسی دەکات.

ئایا مرۆڤی بە ویژدان ئەوە لە بیر دەکات، کە لە جەنگی (بەدر)دا ڕویدا، کە (عاص بن ربیع) مێردی زەینەبی کچی پێغەمبەر بە دیل گیرا، کە ئەو کاتە لەسەر ئاینی باوکی بو بێبڕوا بو، داوا لە ئەبو العاص کرا فدیە بدات، جا زەینەبی خێزانی عاص هات، ملوانکەیەکی دایکی پێ بو، هی خەدیجەی کچی خوەیلید، وەك بڵێی بۆ ئەوەی هێنا، تا چاکەی خەدیجەی بهێنێتەوە بەرچاو کە چەند لەسەر ئەوە شێوەنی بەرکەوتوە، چەند نیعمەتی حەسانەوەی پێ بەخشراوە لە ناخۆشی یەکانی جیهادو کولەمەرگی و بانگەوازی، کە توشی توندی و زەحمەت و ناخۆشی دەبێت.

جا پێغەمبەر ئاوڕی دایەوە بەلای هاوەڵەکانی و داوای لێکردن، کە ملوانکەکە بگەڕێننەوە بۆ زەینەب و مێردە دیلەکەی ئازاد بکەن، لەبەر ڕێزی ئەو بیرەوەری یە خۆشە..

الناس، و واستني بمالها إذ حرمنـــي الناس، ورزقني منها الله الولد دون غيرها من النساء))[١]، واتە: غیرەم بەرامبەر هیچ ئافرەتێـك نـەبوە، وەك ئەو غیرەیەی بەرامبەر خەدیجەم هەبوە، ئەمـەش لەبـەر زۆر بـاس کردنـی پێغەمبەر ﷺ بوو، رۆژێك باسی کرد، منیش گوتم: ئەرێ ئـەوە چ ئیـشت بەو پیرەژنە لـوت لالفـاوە سـورە ددان لـەدەما نەماوەیـە، هێنـدە باسـی دەکەیت! خوای گەورە بە یەکێکی باشتری بۆ گۆڕییەوە؟!

پێغەمبەر فەرموی: بە خوا بە باشتری بۆ نەگۆڕیمەتەوە، ئەو بـڕوای پـێ

---

ئەبو العاص کوڕی ربیع کێیە؟ ئایا کوڕی خوشـکی خەدیجـە نـەبو؟ کـە خەدیجـە وەك کوڕی خۆی دادەناو، بە مێردەکەی گوت پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر زەینـەب بـدات پێی،. ئەم ئیعجابە گەورەیەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بەرامبـەر بـە خەدیجـە بەڵگـەی جوامێری‌و خانەدانی‌و ڕەوشت بەرزییەتی‌و، رێز گرتنی یەتی بۆ عەقڵی ڕاسـت‌و جوامێریی خەدیجە وێڕای گەورەیی تەمەنی، کە لە تەمەنی چـل سـاڵی دا بـوەو پێغەمبـەریش لـە تەمەنی بیسـت‌و پێنج ساڵی، جا جـوانی‌و شـارەزایی عائیـشە هـەمو ئەوانـەی لـە بـیر نەبردەوە کە بە درێژایی تەمەنی بەوەفایی مایەوە، وێڕای تەمەن گەورەییشی ژنی بەسەر نەهێنا، تا ئەو کاتەی گیانی سپارد.

دکتۆر نظمـي لە هەمان کتێبدا لاپەڕە ٥٦ دەڵێ: پاش ئەم کێـشەیە عائیـشە نـەیوێرا باسـی خەدیجە بە زمانی دابێت، لە کاتێکدا عائیشە ژنێکی گەنج‌و جحێـل بـوەو خـاوەن بەش‌و بەختدار بوە.

کێ وەك محمد ﷺ دەتوانێ ئەم کردەوەیە بنوێنێ، ئاوا بەم جۆرە وەفایی‌یـە بەرامبـەر خەدیجە بەوەفا بێت، جا حەق وایە پێغەمبەر بکرێتە نمونەی پیـاو (مێـرد)و نمونـەی پـێ بهێنرێتەوە بە پیاو و ئافرەتەوە!

دەبینی ئەو ڕەفتارەی بۆ ئەو کەسە نواند، کە مردوە، ئەو کەسەش کە لەگەڵی دەژیێ‌و خۆشی دەوێ، تورە دەکات؟!

سەبارەت بەم بەوەفایی یە چ دەگوترێ، کە دنیا پڕە لە نمونەی دڵ ئـازاردەرو سـپڵەیی‌و ناپاکی کردن لە عەهدو پەیمان؟!

١) رواه البخاري مختصراً و أحمد و الطبراني كما أشار اليه ابن حجر في (الفتح).

هێنام لە کاتێك خەڵك بێ بڕوا بون، بەڕاستگۆی دانام کە خەڵك بە درۆیـان دەخستمەوە، بە ماڵو سامانەکەی یارمەتیدام کە خەڵك بێ بەشیان کـردم، خوای گەورە تەنها لەو منداڵی پێ بەخشیم نەك لە ژنەکانی تر.

## مــاف و ئەركــەكــان

### مافـی ژن لەســەر مێردەكـەی[١]

١) لەوكاتەی ئیسلام بە تەواوی مافی ئافرەتی دا، بۆ یەكەمجار لە مێژو كۆمەڵگەی (ماكۆن) كۆبونەوە، بۆ توێژینەوە لەوەی ئایا ئافرەت تەنها جەستەیەو گیانی تێدا نیە؟! یان گیانی هەیە؟ ئەوە بو لە دواییدا بڕیاریاندا، كە ئافرەت لە سزای دۆزەخ ڕزگاری نابێ، جگە لە مەریەم، لەوكاتەی نەتەوەكانی ڕۆژئاوا هاتنە ناو نەصرانیەت، پیاوانی ئایینی ڕوانگەیان سەبارەت بە ئافرەت گۆڕی، ئەوە بو فەرەنسیەكان لە ساڵی ٥٨٦ی زایینی (واتە لەسەردەمی پێغەمبەر) كۆنگرەیەكیان گرێدا، بۆ لێكۆڵینەوە لەوەی: ئایا ئافرەت ئادەمیزادە یان نا؟ ئەوەبو لە دواییدا بڕیاریاندا ئافرەت ئادەمیزادە، تەنها بۆ خزمەتی پیاو بەدیهێنراوە.

شیاوی گوتنە یاسای ئینگلیزی تا ساڵی ١٨٠٥ ڕێی بە پیاو دەدا ژنەكەی بفرۆشێ، نرخەكەشی دیاری كردبو، كە شەش بنس (نیو لیرەی سوری) بو، چەند ساڵێك بەر لە ئێستا، پیاوێكی ئیتاڵی ژنەكەی بە قیست فرۆشت، جا كە كڕیار قیستەكەی كۆتایی نەدا، مێردی یەكەمی ژنەكە پیاوی كڕیاری كوشت (المرأة بين الفقه والقانون باختصار ٢٠-٢١).

لە كتێبی (الحجاب)ی مەودودی لاپەڕە (٢٥) هاتوە: دیدی باوكەكانی مەسیحی یەكەم ئەوەیە، ئافرەت كانگاو سەرچاوەو بنەڕەتی گوناهو تاوانە، بۆ پیاو وەك دەروازەیەكی دۆزەخە، چونكە ئافرەت پاڵنەرو سەرچاوەی گوناهی پیاوە، هەر ئافرەتە، سەرچاوەی بەڵاو كارەساتی گشت خەڵكی، لەبەر ئەوەی ئافرەت دەبێ لە جوانیو قەشەنگی شەرم بكەیت، چونكە چەكێكی كوشندەیە، پێویستە لەسەری بەبەردەوامیو بێ پچڕان كەفارەت بدات، چونكە ئەو بۆتە هۆی نەگبەتیو ناخۆشی بۆ خەڵك.

ڕەنگە كەسێك بڵێ: ئێمە چیمان داوەتە ڕابردوی ڕۆژئاواییەكان؟ خۆ ئێستا وا نین، ئەمڕۆ نرخی ئافرەت دەزانن و مافیان بە تەواوی داوەتێو، پلەو پایەیان بەرزكردۆتەوەو ڕێزیان گرتوە!!

منیش دەڵێم: ڕۆژئاواییەكان پاڵیان بە ئافرەتەوە نا بێتە مەیدانی كاركردن، تا لە بژێوی دانی ڕزگار بن، منداڵیان لە چاودێریو سۆزو خۆشەویستی دایكی بێبەش كرد، لە ئەنجامی ئەوەش نەوەیەكی ڕوخێنەر دروست بو، كە بوە مایەی هەڕەشەی لەناوبردنی

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ (البقرة:٢٢٨)، واتە: ئافرەتان حەقو مافیان هەیە، کەوا چۆن لەسەریانە مافەکانی پیاو بەجێ بهێنن بەلاّم بە چاکە، پیاوانیش پلەیەکیان بەسەر ئافرەتانەوە هەیە ئەوەش بە هۆی نەفەقەدانو کۆشش کردنیان.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ (النساء:١٩)، واتە: لەگەلّ ژنەکانتان بەچاکی گوزەران بکەنو هەلّسوکەوتیان لەگەلّ دا بکەن.[1] کاتێکیش شتێکتان لێ بینی، کە بە دلّتان نەبو چاوپۆشی لێ

شارستانیەتی رۆژئاوایی، بەهۆی بلاّوکردنەوەی تاوانو خراپەکاریو نەخۆشیو دەردەداری، ئافرەت بەهۆی -بەناو- پێدانی مافی خۆی، کرایە هۆ و وەسیلەیەك تا لەسەر شەقامو کۆگاکانو سەماگەو بارەکان بۆ پیاوان رابنوێنرێو بخرێتە رو، لە پێناو بەدەستهێنانی پارەو پول، فلیمی بێرەوشتیو لەش فرۆشیان پێ دەرکرد.. تا ئەو کاتە ئافرەتیان ویست کە گەنج بو، بەلاّم کە گەنجێتی لەدەست داو جوانی نەما، ئینجا فرێ یان داو کردیانە پێلاّو سڕەوەو پاککەرەوەی رێگاو ئاودەستەکان، ئایا ئەوە مافی ئافرەتە، یان خیانەتو ناپاکیە! یەکێ لەو مامۆستا بەرێزانەی سەردانی رۆژئاوایان کردبو بۆی گێرامەوە، کە لە کۆرێکی ئافرەتاندا دەربارەی مافی ئافرەت لە ئیسلام دا قسەی کردبو، کە ئیسلام چ بایەخێکی گەورەی بە ئافرەت داوە، ئافرەتی کردوە بە گەورەی مالّو شاژنی خێزانو جلّەوی پەروەردەی پێداوە، جا هەندێ لە ئافرەتەکان دەستیان کردوە بە گریانو ئاواتخواز بون لە رۆژهەلاّت لەناو مسولّمانان بژیابان و، لە دۆزەخی شارستانیەتی رۆژئاوا دەرباز بوبان !

١) ئەم ئایەتە بەلّگەیە بۆ ئەوە کە ئافرەت مافی زۆری هەیە بەرامبەر بەو مافانەی پیاو بەسەر خێزانی هەیە، جا هەرچەندی مافی پیاو زۆر بێ بەرامبەر بەوەش مافی ژن بەسەر مێردەکەی زۆر دەبێ، بەلاّم جگە لە پلەداری (درجە). رەنگە یەکێك بلێ: گەر وایە ئەدی بۆچی لە میراتدا فەزلّی پیاو بەسەر ژندا دراوە، کەوا نێرینە دوبەشی مێیینە دەبات؟

بکەن بە ئومێدی ئەوەی، کە زۆر شت هەیە مرۆڤ پـێی ناخۆشـە، بـەڵام خوای گەورە بە هۆیەوە خێرێکی زۆر دەنێتەوە.

((قال رجـــــلٌ من الصحابة: یا رســـــول الله! ما حق زوجـــة أحدنا علیـــــه؟ قال: أن تطعمهـــا إذا طَعمْــتَ، وتکـســــوها إذا اکتسیت ولا تـــضـــــرب الوجـــه، ولا تقـبِّح[1] ولا تهجُــر إلا في

---

منیش دەڵێم: ئەم جۆرە بەش بردنە مانای ئەوە نیە پیاو فەزڵی زۆرترە بەسەر ژن، بەڵکە ئەمە بەرەنجامی ڕۆڵی هەر یەکێکیانە لە ژیاندا، چـونکە پیـاو کـار دەکـات و زەحمـەت دەکێشێ، کەواتە پێویـستی بە ماڵ و دارایی هەیە، پیاو ئەرکبار (مکلف) کراوە مارەیی بدات بە ژنەکەی و بژێوی بدات و بژێوی دایك و خوشـکی بـدات گـەر هـەژار بـن، بـەڵام ئافرەت وانیە، بۆ هیچ لەمانە ئەرکبار نیەو داوای لێنەکراوە، بەڵکە ئـافرەت سـەرەڕای میرات وەرگرتن مارەییش وەردەگرێ، ئەو کاتە ماڵەکەی لە ماڵی براکەی زۆرتـر دەبـێ! بەر لە ئیسلام ئافرەتی ڕۆژئاوایی هەرگیز میراتی نەگرتوە، لـە ئینگلتـەرا لـە سـەدەی یازدەم ئافرەت دەفرۆشرا، لە سـاڵی ١٥٦٧ لە ئەدوەی نیابی (لاسلندا) بڕیارێـك دەرچـو، نابێ ئافرەت دەسـەڵاتی بەسەر هیچ شتێکدا هەبێ، لە ئیـسلام دا لـە هەنـدێ حاڵەتـدا ئافرەت چەند جارەی پیاو دەبات، وەکو لە حاڵەتی پیاوێك بمرێ کچێك و دە کوڕی لـەدوا بەجێ بمێنێ، ئا لەوکاتەدا کچەکە نیوە دەبات و هەمو براکانی تری نیوەکەی تر دەبەن!!

١) لاتقبّح: واتە گوتەی ناشیرینی پێ نەڵـێی و جنێوی پێنەدەی، قـسەیەکی وای بە گوێی دامەدە، کە پێی ناخۆ بێ.

لەم ئاراستەو تەوجیهاتانەی پێشوی پێغەمبەرﷺ ئەوەی دەفامرێتەوە، کـە پێویـستە ڕیزی کەسایەتی ژن بگیرێ و بە وتەی ناشیرین سوکایەتی پێنەکرێ.

لە ڕاستیدا پێغەمبەری خوا ﷺ نمونەی هاوسەری چاك بووە لە ڕیزگرتنی خێزانەکانی و گوێگرتن لە ڕایەکانیـــــان و ئارام گرتن لەسەر هەڵەکانیان. پێویـستە ئـەوەش بـزانین، کە سوکایەتی کردن بەژن سەرەنجامی خراپی لـێدەکەوێتەوە!

(ماری سـتۆپ) دەربـارەی حـەزەکانی هاوڕەگـەزی خـۆی دەڵـێ: ((ڕیزگرتنـی ژن لـە گرنگترین کارەکانە، چونکە ئەو ژنەی هەسـت بەوە بکـات لاواز و بێدەسـەڵاتە، جۆرەهـا کاری خراپ فێردەبێت، وەك درۆ ناپاکی و دوڕوویی و شتی تریش.

البيـــت))[١] ، واتـە: پياوێـك لـە هاوەڵـەكانی پێغەمبـەر گـوتی: ئـەی پێغەمبەری خوا مافی خێزانی هەر یەكێكمان بەسەر ئێمەوە چیە؟

پێغەمبەرﷺ فەرموی: مافەكە ئەوەیە، كـە خـواردنی بـدەیتێ و جـلو بەرگی بۆ بكەی و نابێ لە دەم و چاوی بدەی[٢] و نابێ قسەی ناشـیرینی پـێ بڵێی، تەنانەت لەسەر جێگای خەوتن پشتی تێ مەكەو جێگەت مـەگۆڕەو نەچیە ژورێكی تر بخەوی.

پێغەمبەر ﷺ دفـەرموێ : ((المقسطون يوم القيامة على منابر من نور على يمين الرحمن (وكلتا يديه يمين) الذين يعدلون في حكمهم وأهلـيهم وماولوا))[٣]، واتە: دادگەران لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر چەند چرایەكن لـە لای دەستەڕاستی خوا (هەردو دەسـتی خـوا ڕاسـتەیە) جـا ئـەو كەسـانە ئەوانەن، كە لە فەرمانڕەوایی و خێزانیـان و ئـەوەی دەكەوێتـە بەردەسـتیان دادگەری دەكەن.

ئیبن عـەباس گوتیـەتی: ((إني أحب أن أتزين للمرأة كما أحـــب أن

---

بەڵام گەر ڕێزی كەسایەتی ئەومان لە دەرونیدا چاندو، ڕێزی ئەم كەسایەتیەمان گـرت و پارێزگاری كەرامەتیمان كرد، ئەوا بە هۆی ئەمەوە كەسایەتی ژنەكـە بـەهێز دەكـەین و دەیكەینە هێزێكی تواناداركە بە ڕوی تەوژمە توندەكان بوەستێ و خۆی ڕابگرێ، كە لـە ژیانیدا ڕوبەڕوی دەبێتەوە، جا بەم ڕێزگرتنەی پیاوی بۆی دادەنـێ، بەسـەر لاوازی خـۆی زاڵ دەبێ و سـەردەكەوێ، كە ناتوانرێ فێڵی لـێ بكرێ و ئەویش ناكەوێتە زەلكاوی گوناهو كاری ناپەسـەندەوە.

١) رواه أحمد في المسند و أبو داود (حديث حسن).

٢) نابێ لە دەم و چاو بدرێ چونكە شوێنی هەستیارە، كە گوێ و چاوە، ڕەنگە ببێتە هۆی زیان پێگەیاندنی، هەروەها دەم و چاو شوێنی جوانی و ڕێزداریە.

٣) رواه مسلم و غيره.

تتزيَّن لـــي))، واتە: پێم خۆشە خۆم بۆ ژنەکەم جوان بکـەمو برازێنمـەوە، هەروەك پێم خۆشە خۆی بۆم جوان بکاو برازێنێتەوە.

(زانایان دەڵێن: چۆن پێویستە پیاو پارە بـۆ خێزانەکـەی خـەرج بکـاو جلو بەرگی بۆ بکات، بە هەمان شێوە لە سەری پێویستە بە باشی لەگـەڵ ژنەکەی جوت ببێو بە باشی هەڵسوکەوتی لەگـەڵ دا بکـات بـە چـاکی جوتبونو مافدان بەم جوتبونە، بە کۆڵەگەی گوزەران باشیو هەڵسو کەوت چاکی لەگەڵ خێزان دادەنرێ!

خوای گەورەش فەرمانی کردوە کە دەبێ پیاو لەگەڵ ژنەکەی بـە باشـی ژیان بباتە سەرو گوزەرانیَ لەگەڵدا بکاتو رەفتاری چاکی لەگەڵ دا بکات، جوتبونیش لەم خۆشگوزەرانیو هەڵسوکەوت چاکییەیە!)

(هەروەها زانایان دەڵێن: پێویستە لەسەر پیاو چۆن پێویـستە لەسـەری ژنەکەی تێر نان بکات بـە هـەمان شـێوە لەسـەریەتی لـە جوتبـون تێـری بکات)[1].

---

١) روضة المحبين باختصار ص١٢٤-١٢٦.

## نـابێ پیـاو بۆ مـاوەیەکـی درێـژ لە خێـزانەکـەی بە دور بێـت !

جارێك لەو جارانەی کە عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لـێ بێ بە مەبەستی پاسەوانی لە مەدینە دەسوڕایەوە، بە بەردەمی ماڵێکدا ڕۆیشت، کە تەنها ژنێك لە ماڵەکە بو، ئەم شیعرەی دەگوت:

تطاول هذا الليل وازورَّ جانبُهُ ... وأرَّقني أن لا ضـجيع أُلاعبــه

ألاعبُــه طوراً وطوراً كأنــما ... بدا قمراً في ظُلمة الليل حاجبــه

يُسَرُّ به مَن كان يلهو بقُرْبِــه ... لطيف الحشا لا يَحتويه أقاربُــه

فوالله لولا الله لا شيء غيــره ... لحُرِّكَ من هذا السرير جوانبُــه

ولكنني أخشى رقيباً موكّــلاً ... بأنفسنا لا يفتُر الدهــرَ كاتبــُه

مخافةُ ربّي والحيــاء يصدنــي ... وإكرامُ بعْــلي أن تُنال مواتبــه[1]

ئیمامی عومەر دەربارەی ئەم ژنە پرسیاری کرد، پێـیـان گـوت: ئەمـە فلاّنە ئافرەتە، مێردەکەی لەلای نیەو لە جیهادە، ئەویش بە دوای مێـردی ژنەکەیدا نارد، تا بگەڕێتەوە لای هاوسەرەکەی، پاشان ئیمام عومەر چـوە لای حەفـصە گـوتی: کـچەکەم!... ژن تـا چـەند دەتوانـێ ئـارام لەسـەر مێردەکەی بگرێ؟..

---

١) کورتەی ماناى شیعرەکە ئەوەیە، کە ئەم ئافرەتە مێردەکەی ماوەیەکی زۆرە لێی دورە، ئەویش خۆی گرتوە لە توش بون بە خراپەکاری. جا دەڵێ گەر لە ترسی خوا نەبایە ئـەوا ئێستا لەسەر ئەم قەروێڵەیە یەکێکی تری لەسەر دەبو یاریم لەگەڵ دا دەکرد، بـەڵام لـە ترسی خواو شەرمو شکۆو لەبەر ڕێزی مێردەکەم ئارام دەگرم. (وەرگێڕ)

ئەویش گوتی: سبحان الله، پیاوی وەك تۆ دەربارەی ئەمــە پرسـیار لــە من دەکا؟

گوتی: بۆیە پرسیارت لــێ دەکەم دەمەوێ بۆ مسوڵمانان دەرکەوێ.

حەفصە گوتی: پێنج مانگ.. شەش مانگ.

جا بۆ ئەو کەسەی دەچوە غەزا ماوەی شەش مانگیان بۆ دادەنـا.. کــە یەك مانگ بەڕێوە دەبن‌و، چوار مانگیش دەمێننەوە، مانگێکیش بــەڕێوە دەبن بۆ گەڕانەوە![1]

١) ئیمام مالك لە (الموطأ) ئەم چیرۆکەی لە عبدالله بن دینار گێڕاوەتەوە.

# ژن هـاوڕێو هـاوسـەرە

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ (البقرة- ٢٢٨).

دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾[1] (الروم- ٢١)

---

١) هەندێك كەس تەنها بە چاوێكی جنسی دەڕوانێتە هاوسەرەكەی، بەمەش ژیانی خۆیو ژیانی هاوسەرەكەی تەنگو ناخۆش دەكات.

بەڕاستی مێردی بەختەوەر ئەو كەسەیە، كە خێزانەكەی بە هەمو مانایەكەوە دەكاتە هاوڕێ، ئەم ئایەتەش دوپاتی هاوڕێیەتی ژنومێردی كردۆتەوە، كە بە(مودة) ناوی بردوە!

بەڕاستی ئەو كەسە باشی گوتوە، كە دەڵێ: (ئەو هاوسەرێتییەی تەنها بۆ رابواردنی جنسییە، حەق نیە پێی بگوترێ هاوسەریەتی (زواج). بەختەوەری ژیانی هاوسەری، بە زۆری بەردەوام دەبێتو گەر تەنها بریتی نەبێت لە پەیوەندی جنسی.

گەر هاوسەرێتی زیاتر لەسەر پەیوەندی جەستەیی دانەمەزرابێ، ئەوا ئەو هاوسەرییە سەرچاوەی نازارو ئێشە. لەبەرئەوە هەر دەبێ هاوسەریی لەسەر بناغەی قوڵ ترو پتەوترو دورتر لەمەدا دامەزرابێ، بۆ ئەوەی گیان لێی تێر ببێ، پێش تێربونی جەستە.

یەكێكی تر گوتویەتی: (پێویست بەو قسەیە ناكات كە دەگوترێ ئافرەت ئامێرێك نیە بەدەست پیاوەوە، بۆ ئەوەی تەنها چێژی لـێ وەرگرێ، چونكە هەر لە سـەرەتای رۆژانـی خوازبێنییەوە خۆشەویستی ئافرەتەكەی لەسەر عەرشی دڵی مێردەكەی دادەنیشێ، جـا پیاوەكە رێزی دەگرێ.

ئەی چی دەڵێی لەوكاتەی كە دەبێتە هاوسەریو هاوڕێی ژیانیو هاوبەشی لە پێكهێنانی وەچەكانی. ئەو مێردەی كە بەختەوەری هاوسەرەكەی بەلاوە گرنگە، بێگومان بەختەوەری ئەویش بە ویەوە بەندە، پێویستە هەست بەوە بكات كە ئەو بەختەوەرییە لە چێژی هەستیارەكان تێپەڕ دەكات بۆ یەكگرتنی دڵەكانو سۆز گۆڕینەوە، لەسەریەتی كە سۆزو حەنانبداتە هاوسەرەكەی تاوەكو متمانەی زیاتری هاوسەرەكەی دەستەبەر بكات).

ئای چەند جوانە ژنو مێرد هاوڕێی یەكتر بن، چەند ناشیرینە ژیانی ئەو ژنو مێـردەی، كە لەسەر شانۆی ماڵەود ژیانی ئاژەڵی دەنوێنن!

## مـافی پیـاو لەسـەر ژنەکـەی

پێغەمبەر ﷺ دەفـەرموێ: ((لو كنت آمراً أحداً أن يسجد لأحـد، لأُمرتُ المرأة أن تسجد لزوجها))[1]، واتـە: گـەر فـەرمانم بکردایـە بـە کەسێك کە سوجدە[2] بۆ یەکێکی تر ببات، فـەرمانم بـە ئـافرەت دەکـرد سوجدە بۆ مێردەکەی ببات.

((جاءت امرأة الى النبي ﷺ فقالت: يا رسول الله! أنا وافدة النساء إليك، هذا الجهاد كتبه الله على الرجال، فإن يصيبوا أُجروا، وإن قُتلوا كانوا أحياءً عند ربّهم يُرزقون، ونحن معاشر النساء نقوم عليهم فما لنا من ذلك؟! فقال رسول الله ﷺ: أبلغي من لقيت من النساء: أن طاعة المرأة الزوج وإعترافها بحقه[3] يعدل ذلك، وقليل منكن من يفعلـه!))،

---

١) رواه الترمذي (حديث حسن).

٢) سوجدەی ڕێزو پێزانین.

٣) مافی مێرد بەسەر هاوسەرەکەی ئەوەیە، کە ڕێزی دایك و باوکی ئەو بگرێ، ڕەفتارو مامەڵەیان لەگەڵ باش بکات و هانی بدات لەسەر زیادە چاودێری کردنیان، هەروەها لەسەریەتی خۆڕاگری خراپەکانیان بێت بەرامبەر بەو، بە تایبەتی دایك و باوك، چونکە ئاگر بە ئاگر دانامرکێتەوە، بەڵکو بە ئاو دەکوژێتەوە!

لەسەر ژن پێویستە زاڵ بێت بەسەر خۆپەرستی خۆی و زەبتی عاطیفەی خۆی بکات، بەمەش ڕەزامەندی خوای گەورەو پاداشتی باش بەدەست دێنێ، لەبەرچاوی مێردەکەی گەورە دەبێت و، ڕێزو خۆشەویستی ئەو بەدەست دێنێ.

با هەردەم ئەوەی لەبیر بێت، کە دایك و باوکی مێردەکەی، مێردەکەی ئەویان بەخێو کردوەو گەورەیان کردوەو فێری خوێندنیان کردوە، ئەویش وەك ئەرکێك دەبێ قەرزەکەیان

بداتـەوە، جـا ئافرەتەکـەش بـە دەوری خـۆی هەسـتێ بـە یاریـدەدانی مێردەکـەی بـۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە پیرۆزە.

با ژن بزانێ خوای گەورە نامرێ، لەگەڵ خەڵك چۆن بی بە هەمان شت تـۆش رەفتـارت لەگەڵ دەکرێتەوە، جا گەر مامەڵەی لەگەڵ دایكو باوکی مێردەکـەی بـاش بێـت، ئـەوا ئەوکاتە خێزانی کورەکانی بە هەمان شێوە لە تەمەنی پـیری دا مامەڵـەی بـاش لەگـەڵ ئەودا دەکەن، خوای گەورەش پاداشتی چاکەکاران بە فیڕۆ نادات.

ئەم ئامۆژگاریانە زێر ئاسان، کە فـەرامۆش کردنیـان چـۆن بۆتـە مایـەی روخانـدنی خێزانو عەقدی هاوسەریی، یان پیاو هەڵساوە بە تورەکردنی دایكو بـاوکی، کـە دەبێتـە مایەی بەدبەختی دنیاو ئاخیرەتی، هۆی یەکەمی تورەکردنەکەش ژنە!!

هەروەها لە مافی پیاو بەسـەر هاوسـەرەکەیەوە ئەوەیـە، کـە منداڵـەکانی پـەروەردە بکات، بۆ ئەم پەروەردەیەش لەسەر ژن پێویست دەکـات کـە هـەوڵێکی زۆر بـدات بـۆ چاودێریکردنێکی زۆرو لێکۆڵینەوەیەکی فراوانو پیادەکردنی هۆشیاری، بەتایبـەتی لـەم سەردەمەی ئێستادا، کە زانستە پەروەردەیی یەکانو دەرونـی یـەکان بـەرەوپێش چـونو فراوانبون دەچن. بەرامبەر بەوەش بە هـەمان شـێوە ئـەرکی مێـردە، کـە رێـزی خـزمو کەس‌وکاری هاوسەرەکەی بگرێ، بە تایبەتی دایكو باوکی، چونکە جـوانترینو باشـترین دیاری، کە جەرگیانە پێشکەشی ئەویان کردوە، لەبەر ئەوە لەسـەریەتی بـە بـەردەوامی مامەڵەی چاکیان لەگەڵ بکاتو خۆشەویستیان بۆ بنوێنێو بەشداریان بکـات لـە کـارە گرنگەکانی، کە بە هۆی بێئاگابون لەمەدا، زۆر قەیرانی دروست کردوە!

بەم بۆنەوە نامەیەکی ناسك نەقڵ دەکەین، کە زاوا بۆ خەسوەکەی دەنێـرێ، ئەمـەش دەقەکەیەتی:

{دایکم... ئەی خۆشەویسترین دایك.. چۆن بانگت ناکەم دایکم، کە تۆ خۆشەویسترین مرۆڤت پێشکەش بە دڵم کردوە...؟!

چۆن بە دایکم بانگت ناکەم، کە تۆ ئەم ئافرەتەت هێناوەتە بون... ئەو هاورێیەی، کە ژیانی داگرتوم... من بەختیارترین مرۆڤی دنیام... ئەوەنـدە بەختەوەرییـەم بەسـە، کـە هەمو ژیانم لەگەڵ ئەم کچە دەبەمەسەر کە چەندەها ساڵە لێی دەگـەرێم... لەگـەڵ ئـەو کچەی تۆ، کە بوە بە هاوسەرمو دایکی منداڵەکانم بەم نزیکانە... تۆ کـچەکەت داوەتـە من... بەڵام من دڵو گیانم داوەتێ..} کورت

لە وتاری مامۆستا منیر نصیف لە گۆڤاری العربی وەرگیراوە.

واتە: ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من نوێنەری ئافرەتانم و هاتومە لای جەنابت، ئەو جیهادەی خوای گەورە لەسەر پیاوانی فەرز کردوەو پاداشتیان بۆ دەنوسرێ، گەر بکوژرێن ئەوا شەهیدن و زیندون و لەلای خوای بەخشندە رۆزیان دەدرێتێ.. ئێمەی کۆمەڵی ئافرەتانیش هەڵدەستین بە خزمەت کردنیان، جا ئێمە لەوەدا چیمان بۆ هەیە؟!

پێغەمبەری خوا فەرموی: گەر بە هەر ئافرەتێك گەیشتی ئەوەی پێ رابگەیەنە، کە گوێڕایەڵی کردنی ژن بۆ مێردەکەی و داننان بە مافی مێردەکەی، وەك ئەو جیهادە خێرو پاداشتی بۆ دەنوسرێ. کەم کەس لە ئێوەش گوێڕایەڵی مێردەکانیان دەکەن!

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((لا ينظر الله تبارك وتعالى الى امرأةٍ لا تشكُرُ لزوجها وهي لا تستغني عنه))[1].

هەروەها ((اثنان لا تجاوز صلاتهما رؤوسهما :...، وامرأة عصتْ زوجَها حتى ترجع))[2].

حەصینی کوڕی محصن گوتویەتی: ((حدثني عمتي قالت: أتيتُ رسول الله ﷺ في بعض الحاجة، فقال لي: أي هذه! أذات بعل؟ قالت: نعم، قال: كيف أنت له؟ قالت: لا آلوهُ إلا ما عجزْتُ عنه، قال: فانظري أين أنت منه، فإنه هو جنّتُك ونارُك!!))[3] ، واتە: پورم بۆی باسکردم و گوتی: چومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ هەندێ پێویستی.

١) رواه النسائي والبزار ( حديث صحيح ). (پێشتر لێکدراوەتەوە).
٢) رواه الطبراني و الحاكم. حديث جيد، (پێشتر لێکدراوەتەوە).
٣) رواه الترمذي بسند صحيح.

پێغەمبەر ﷺ پێی گوتم: فلان! مێردت هەیە؟

گوتم: بەڵێ.

پێغەمبەر فەرموی: تۆ بۆ ئەو چۆنی؟

ئافرەتەکە گوتی: کەمتەرخەمی ناکەم لە گوێڕایەڵی و خزمەتکردنی تەنها ئەوە نەبێ کە لە توانامدا نەبێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: کەواتە تەماشا کە تۆ لە کوێی ئەویت، مێردەکەت بەهەشت و دۆزەختە[1]

---

١) (مەبەست لە بەهەشت و دۆزەختە ئەوەیە گەر ئافرەت گوێڕایەڵی مێردەکەی بێ، ئەوا دەچێتە بەهەشت، بە پێچەوانەوەش گەر سەرپێچی فەرمانەکانی مێردەکەی لە چاکە بکات ئەوا دەچێتە دۆزەخ. (وەرگێڕ).

## ژن بەبێ ئیــزنــی مێردەکــەی نابێ ڕۆژوی سـوننەت بگـرێ

پێغەمبەر ﷺ دەفـەرموێ: ((لا يحل لإمرأة أن تصوم (وفي رواية: لا تَصُمِ المرأةُ) وزوجها شاهدٌ إلاّ بإذنه (أي غير رمضان)، ولا تأذن في بيته إلا بإذنه)) [١]، واتە: ژن بۆی حەڵاڵ نیە بـەبێ ئیزنـی مێردەکـەی بـەڕۆژو ببێ، ڕۆژوی سوننەت، بەبێ ئیزنی ئەو نەهێڵێ کەسێك بێتە ماڵی.

ئەبو سەعید گوتویەتی: ((جاءت امرأة إلى رسول الله ﷺ ونحن عنده فقالت: زوجي صفوان بن المعطل يـضربنـي إذا صـلّيتُ ويفطرنـي إذا صمتُ، ولا يُصلّي الفجر حتى تطلع الشمس!

قال: وصفوان عنده. فسأله عما قالت؟

قـال: يارسـول الله: أمـا قولُهـا: يـضربنـي إذا صـلّيتُ، فإنهـا تقـرأ بسورتين! وقد نهيتها.

فقال لها رسول الله ﷺ: ولو كانت سورة واحدة، لكفت النـاس.

قال: وأما قولها: يفطرني إذا صمت: فإنها تنطلق تصوم، وأنـا رجـل شاب! فلا أصبر!!

فقال رسول الله ﷺ: لا تصوم إمرأة إلا بإذن زوجها!.

واما قولها: إني لا أصلي حتى تطلـع الـشمس؟ فإنـا أهـل بيـت قـد عرفت عنا ذاك، لا نكاد نستيقظ حتى تطلع الشمس.

---

١) رواه البخاري ومسلم وابوداود.

قال: فإذا إستيقظت يا صفوان فَصلِّ!))[1]، واته: ئافرەتێك هاته خزمەت پێغەمبەری خواو ئێمەش له خزمەت پێغەمبەر ﷺ بوین.

ئافرەتەکە گوتی: کاتێك نوێژ دەکەم صەفوانی کوڕی مەعتەلی مێردم لێم دەدا، گەر بەڕۆژو بم پێم دەشکێنێ، هەروەها نوێژی بەیانی ناکات تا خۆر هەڵدێ!

ئەبی سەعید دەڵێ: صەفوانیش ئەوکاتە له خزمەت پێغەمبەر بو.

پێغەمبەر ﷺ پرسیاری له صەفوان کرد سەبارەت بەوەی، کە خێزانەکەی باسی دەکات؟

صەفوان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کە دەڵێ: کاتێك نوێژ ئەکەم لێم دەدات، لەبەر ئەوەیە، چونکە ئەو له نوێژەکە دو سوردت دەخوێنێ! منیش پێم گوتوە ئەوە نەکات.

پێغەمبەری خوا بە ئافرەتەکەی گوت: گەر یەك سورەتیش بێ دروستە.

هەروەها صەفوان گوتی: کە دەڵێ: گەر بەڕۆژو بم پێم دەشکێنێ. ئەوەش لەبەر ئەوەیە من پیاوێکی گەنجم! ناتوانم لەسەر جوتبون ئارام بگرم!

پێغەمبەری خوا فەرموی: (ژن بەبێ ئیزنی مێردەکەی نابێ بەڕۆژو بێ) مەبەست له ڕۆژوی سوننەتە.

صەفوان گوتی: کە دەڵێ: تا ئەو کاتەی خۆر هەڵنەیێ نوێژی بەیانی ناکات، ئێمە لە ئەهلی بەیتین، ئەوەش دەزانی کە ئێمە تا خۆر هەڵنەیێ له خەو هەڵناستین.

پێغەمبەرﷺ فەرموی: (صەفوان! گەر له خەو هەڵسای نوێژەکە یەکسەر ئەنجام بدە!).

---

١) رواه أبو داود و إبن ماجه (صحيح).

## نەبەخشینی ماڵ بەبێ ئیزنی مێرد

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لا تنفق إمرأة شيئاً من بيت زوجها إلا بإذنه، قيل: يا رسول الله ولا الطعام؟! قال: ذلك أفضل أموالنا))(١)، واتە: نابێ ژن هیچ شتێك لە ماڵی مێردەکەی ببەخشێ، تەنها بە ئیزنی ئەو نەبێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا خواردەمەنیش بەبێ ڕەزامەندی مێرد نابێ ببەخشرێ؟!

پێغەمبەر فەرموی: خۆراك باشترین سەرمایەمانە.

هەروەها دەفەرموێ: ((إذا تصدقت المرأة من بيت زوجها؛ كان لها أجر ولزوجها أجر، لا ينقص كل واحد منهما عن أجر صاحبه شيئاً. له بما كسب ولها بما أنفقت)) (أي إذا كان برضائه)(٢)، واتە: گەر ژن بە ڕەزامەندی مێردەکەی شتێك بکاتە خێرو سەدەقە، ئەوا بۆ ژنەکە پاداشت دەنوسرێو بۆ مێردەکەشی پاداشت دەنوسرێ، پاداشتی هیچ کامێکیشیان کەم ناکات. جا بۆ پیاوەکە پاداشت هەیە لەوەی، کە پەیدای دەکاتو بۆ ژنەکەش پاداشت هەیە لەوەی، کە دەیبەخشێ.

---

١) رواه الترمذي (حديث جيد).

٢) رواه الترمذي (صحيح).

## بەخشینی ماڵو سامانی ژن بۆ مێردی هەژار

زەینەبی سەقەفی خێزانی عبداللهی کوڕی مەسعود ڕەزای خوایان لێ بێ، گوتویەتی: ((قال رسول الله ﷺ : تصدقن يا معشر النساء ولو من حليكن، قالت: فرجعت الى عبدالله بن مسعود، فقلت: إنك رجل خفيف ذات اليد، وإن رسول الله ﷺ قد أمرنا بالصدقة، فأتِهِ فاسألْهُ، فإن كان ذلك يُجزيءُ عَنِّي وإلا صرفْتها الى غيركم. فقال عبدالله: أئتيهِ أنت.
فانطلقتُ، فإذا امرأة من الأنصار بباب رسول الله ﷺ حاجتُها حاجتي. وكان رسول الله ﷺ قد ألقيتْ عليه المهابةُ، فخرج علينا بلال ﷺ فقلنا له: أئتِ رسول الله ﷺ فأخبره أن امرأتين بالباب تسألانك: أتُجزئُ الصدقة عنهما على أزواجهما، وعلى أيتام حجورهما، ولا تخبره من نحن.
قالت: فدخل بلال على رسول الله ﷺ فسأله، فقال له رسول الله ﷺ! ((من هما)) ؟
فقال: امرأة من الأنصار و زينب.
فقال رسول الله ﷺ: ((أي الزيانيب؟))
قال: امرأة عبدالله بن مسعود.
فقال رسول الله ﷺ: ((لهما أجران، أجرُ القرابة، وأجرُ الصدقة))[١]، واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ئەی کۆمەڵی ئافرەتان خێرو چاکە بکەن، گەرچی خشڵو زێڕەکانیشتان بێت.
زەینەب گوتی: گەڕامەوە لای عبداللهی کوڕی مەسعودو گوتم: تۆ

---
١ رواه البخاري ومسلم.

دەستت کورتەو پێغەمبەریش فەرمانی پێکردوین خێرو سەدەقە بکەین. تۆش برۆ خزمەت پێغەمبەرو لێی بپرسە، گەر بێتو خێرەکە بۆ تۆ شیاو بێ، ئەوا لەسەرمە خێرەکە بدەم بە تۆ، ئەگینا ئەیبەخشمە یەکێکی تر.

عبداللە گوتی: تۆ بچۆ خزمەت پێغەمبەر.

زەینەب چوە خزمەت پێغەمبەرو بینی ئافرەتێکی ئەنصاری لەبەر دەرگای پێغەمبەری خوا وەستا بو، کە ئەویش هەمان پرسیاری هەبو.

بیلال هاتە دەرەوەو پێمان گوت: بچۆ خزمەت پێغەمبەری خواو هەواڵی پێبدە دو ژن لەبەر دەرگا وەستاون‌و پرسیارت لێ دەکەن، ئایا دەبێ‌و دروستە خێرو سەدەقە بدەینە مێردەکانمان‌و ئەو هەتیوانەی، کە لە ماڵەکانیشمان دان؟ بەڵام بە پێغەمبەر مەڵێ ئێمە کێین.

زەینەب دەڵێ: بیلال چوە خزمەت پێغەمبەری خواو لێی پرسی، پێغەمبەریش بە بیلالی فەرمو: ئەم دو ژنە کێن؟

بیلال گوتی: ژنێکی ئەنصاری‌و زەینەبە.

پێغەمبەری خوا فەرموی: کامە زەینەب؟

بیلال گوتی: ژنی عبداللەی کوڕی مەسعود.

پێغەمبەری خوا بۆ وەڵامی پرسیارەکەیان فەرموی: دو پاداشتیان هەیە: پاداشتی خزمایەتی، کە ژن‌و مێردایەتیەو پاداشتی خێرو سەدەقەکەیان بۆ هەیە.

## ترساندنی ئەو ژنانەی داوای تەڵاق بە ناحەق دەکەن

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((أيما امرأة طلبت من زوجها الطلاق من غير بأس، فحرام عليها رائحة الجنّة!))[1]، واتە: هەر ژنێك داوای تەڵاق بەبێ هیچ هۆیەکی حەقدار لە مێردەکەی بکات، ئەوا بۆنی بەهەشتی لەسەر حەرامە. واتە ناچێتە بەهەشت.

## بەرگری کردنی حۆری لە پیاوی چاك (صالح)

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((لا تؤذِيَنَّ امرأةٌ زوجَها في الدنيا إلا قالت زوجته من الحور العين:[2] لا تؤذيه قاتلك الله: هو عندك دخيل يوشك أن يفارقكِ إلينا!))[3]، واتە: لەو کاتەی ژن لە دنیادا ئازاری مێردەکەی دەدات ئەوا حۆری بەهەشت کە بۆ ئەو پیاوە دانراوەو هاوسەریەتی دەڵێ: خوا بت کوژێ! ئازاری نەدەی! ئەم پیاوە لای تۆ میوانەو هێندەی نەماوە تۆ بەجێ بهێڵێ و، بێتە لای ئێمە.

---

١) رواه احمد في المسند والترمذي (حديث صحيح).

٢) سەبارەت بە حۆری بەهەشتێ، پرسیارێك دێتە بیرو زهنی زۆر کەس ئەویش ئەوەیە: پێغەمبەر ﷺ بەڵێنی بە پیاوی بڕوادار داوە، کە چەند حۆریەکی پێ دەبەخشرێ، بەڵام ئافرەتان ئەوەیان بۆ نیە؟

وەڵام: سروشتی پیاو وایە دەتوانێ سۆزو عاتیفەو دڵی دابەش بکاتو، بیبەخشێتە زۆر ئافرەتان، بەڵام ژن ناتوانێ ئاوا بکات مەگەر ئەو ژنە ڕیزپەڕ(شاذ)و لاڕێ (منحرف) بێت! لەبەر ئەوە چۆن لە دنیا تەنیا چاوی لە مێردەکەیەتیو ئارەزوی کەسی تر ناکات لە بەهەشتیش بەهەمان شێوە.

٣) رواه الترمذي وحسنه.

## پاداشـتی گـوێـڕایەڵـی ژن بۆ مێـردەکـەی

پێغەمبەر ﷺ فەرمویـەتی: ((المرأة إذا صلّت خمسَها، وصـامت شهرها، وأحصنت فرجها، وأطاعت زوجها، فلتدخل من أي أبـواب الجنّـة شاءت))(١)، واتە: گەر ژن پێـنج نوێـژە فـەرزەکانی بـەجێ‌هێناو، مـانگی ڕەمـەزان بـەرۆژو بـو، داوێـنی خـۆی لـە خراپـەکاری پاراسـتو فەرمانبەری مێردەکەی بکات لـە چـاکە، ئـەوا بـا لـە هـەر دەرگایـەکی بەهەشت دەچێتە ژور، کە خۆی ئارەزوی لـێ‌یەتی، با بچێت.

هەروەها دەفەرمویّ: ((أيما امرأة ماتت وزوجها عنها راض، دخلـت الجنة))(٢)، واتە: هەر ژنێك بمرێو مێردەکەی لێی ڕازی بـێ ئـەوا دەچـێتە بەهەشت. (بەڵام بە مەرجێ مێردەکەی دروشمەکانی ئیسلام بەجێ بهێنـێو لەخوا ترس بێ).

((عن حصين بن محصن أن عمة له أتت النبّي ﷺ فقال لهـا: أذات زوج أنت؟ قالت: نعم!

قال: فأين انت منه؟! قالت: ما آلـوه، إلا ما عجزت عنه!

قال: كيف كنت لـه! فإنه جنّـتك ونارك!))(٣)، واتە حصين کـوڕی محصن گوتویەتی: پورم بـۆی باسـکردم گـوتی: چـومە لای پێغەمبـەر بـۆ هەندێ پێویستی.

---

١) رواه أبو نعيم في الحلية وله شواهد يرقى بها الى درجة الحسن والصحة.

٢) رواه الترمذي بدرجة صحيح.

٣) رواه أحمد في المسند والنسائي وغيرهما وهو حسن الإسناد.

پێغەمبەر ﷺ پێی گوتم: ئەی فلانە مێردت هەیە؟

گوتی: بەڵێ.

پێغەمبەر فەرموی: تۆ بۆ ئەو چۆنی؟

گوتی: کەمتەرخەمی لە گوێڕایەڵی و خزمەتکردنی ناکەم مەگەر ئەوەی کە لە توانام نەبێ.

پێغەمبەر فەرموی: دە کەواتە: بزانە تۆ لە کوێی ئەویت، مێردەکەت بەهەشت و دۆزەختە.

## ڕاسپارده سه‌باره‌ت به ئافره‌ت

((من خطبة النّبي ﷺ في حجة الوداع: ((... ألا واستوصوا بالنِّساء خيـــراً!

اتقوا الله في النساء فإنكم أخذتموهنَّ بأمان الله واستحللتم فـــروجهُنَّ بكلمة الله ولكم عليهِنَّ أن لا يُوطِئن فُرُشكم أحداً تكرهونه، فإن فعلنَ ذلك فاضربوهن ضرباً غيـــر مبرح ولهن عليكم رزقُهُـــنَّ وكـــسوَتُهُنَّ بالمعروف. وقد تركتُ فيكم ما لن تضلّوا بعده إن اعتصمتم به: كتاب الله: وأنتم تسألون عنـــي، فما أنتم قائلون؟

قالوا: نشهد أنك قد بَلَّغت وأدَّيت ونصحتَ.

فأشار بأصبعه السبابة يرفعها الى السماء وينكُسُهَا الى الناس ويقول: اللّهم اشهد! اللّهم اشهد ثلاث مرات))[١] ، واته: له حه‌جی ماڵ ئاوایی پێغه‌مبه‌ر ﷺ له وتاره‌كه‌ی ئه‌وه‌ی فه‌رمو:

((... پێتان راده‌سپێرم، كه له‌گه‌ڵ ئافره‌تان به چاكه ره‌فتاریان له‌گه‌ڵ دا بكه‌ن!

ده‌رهه‌ق ئافره‌تان له خوا بترسن (زوڵمیان لـێ نه‌كه‌ن)! چونكه ئافره‌تـان ئه‌مانه‌تی خوان له‌لای ئێوه‌و به‌هۆی وشه‌ی خـوای گـه‌وره فـه‌رجیان بۆتـان حـه‌لاڵ كـراوه. ئێـوه‌ش مافتـان له‌سـه‌ریان ئه‌وه‌یـه، كـه كـه‌س نه‌یه‌تـه ماڵتانه‌وه‌و له شوێنی خۆتان دابنیشێ، كه خۆتان پێتان ناخۆشـه بـێن بـۆ ماڵتان. گه‌ر به فه‌رمانیان نه‌كردن ئه‌و كاته بـه لێـدانێكی سـوك لــێیان

---

١) رواه مسلم.

بدەن ئەوەش پاش ئامۆژگاری کردنیان بە گوتەی شیرین یان سەرجێیی نەکردن، ژنەکانیشتان مافیان لەسەرتان هەیە کە رۆزیان بۆ پەیدا بکەنو بە باشی پۆشتەیان بکەن. کیتابی خوا کە قورئانە بۆم بەجێ هێشتون، گەر دەستی پێوە بگرن هیچ کاتێك گومراو سەرلێشێواو نابن، ئێوەش دەربارەم دەپرسن، ئێوە چی دەڵێن؟!

ئەوانەی لەوێ ئامادەی وتارەکە بون گوتیان: گەواهیو شایەتی دەدەین ئەوەی کە لەسەرت بو گەیاندتو بەجێت هێناو ئامۆژگاریشت کرد.

جا پەنجەی شایەتمانی بەرزکردەوە بەرەو ئاسمانو بەلای خەڵکەکەی لادەداو دەیفەرمو: خوایە شایەت بە، خوایە شایەت بە سێ جار ئەمەی فەرمو.

لەبارەی حەز نەکردنی پیاو بە دانیشتنی یەکێکی تر لە شوێنەکەی ئەودا، دکتۆر نظمی لۆقا لە کتێبەکەیدا لاپەڕە ٣٦ دا دەڵێ کە ئەمە کورتەکەیەتی:

(...مێژو هەرگیز ئەوەی لە بیر ناچێتەوە، کە ئەبو سوفیانی سەرۆکی قورەیش چوە لای ئوم حەبیبەی کچی، کە خێزانی پێغەمبەر بو، بە نهێنی یەوە چوە لای، تا لە کاتی فەتحی مەککەدا لە خەشمو توڕەیی پێغەمبەر بیپارێزێ، ئەبو سوفیان لەبەر لوت بەرزی، چاوەڕوانی ئیزنی کچەکەی نەکردو یەکسەر چوە سەر جێگەو شوێنی دانیشتنی پێغەمبەر، تا لەوێ دابنیشێو قسە لەگەڵ کچەکەی بکات، وەکو قسەکردنی باوکێکی خۆ بەزل زانو لوت بەرز.

ئوم حەبیبە کە بۆ ماوەی چەند ساڵێك بو باوکی نەبینیبو، هیچ نەرمی بۆ نەنواند، بەڵکو یەکسەر ئەو فەرشەی، کە پێغەمبەر لەسەری دادەنیشت

لەبەر دەستی لای دا، تا لەسەری دانەنیشێ. جا ئەبو سوفیان پێی گوت: ئەمە لەبەر من فەرشەکەت لادا، یان لەبەر فەرشەکەت بو؟

ئوم حەبیبە وەڵامێکی توندی دایەوەو گوتی: ئەمە فەرشی پێغەمبەری خوایە لەسەری دادەنیشێ، تۆش پیاوێکی هاوبەش پەرستی! نامەوێ لەسەری دابنیشی!).

خوێنەری خۆشەویست: دەبینی پەیوەندی ئیمان چەند بەرزە، کە لە سەروی هەمو پەیوەندی یەکانەوەیەو لە سەروی سۆزو عاتیفەیە. کردەوەکەی ئوم حەبیبە ئەم راستی یە دەسەلمێنێو راستی یەتی ئەم فەرمودەیەش دەسەلمێنێ:

((لایؤمن أحدکم حتی أکون أحب إلیه من ولده ووالده، والناس اجمعین))، واتە: ئیمانی هیچ کەسێکتان تەواو نابێ، تا منی لە منداڵو دایكو باوکی خۆشتر نەوێ، هەروەها لە هەمو خەڵکیش.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إن للإسلام صویً و مناراً کمنار الطریق، منها: أن تؤمن بالله ولا اشرك به شیئاً، وإقام الصلاة وإیتاء الزکاة، وصوم رمضان، وحج البیت، والأمر بالمعروف، والنهي عن المنکر، وأن تُسَلّم علی أهلك إذا دخلت علیهم (وکذلك إذا خرجت) وأن تسلّم علی القوم إذا مررتَ بهم، فمن ترك من ذلك شیئاً فقد ترك سهماً من الإسلام، ومن ترکهن کلّهن فقد وَلّی الإسلام ظهرَه))(رواه الحاکم و غیره، و سنده صحیح، واتە: ئیسلام چەند نیشانەو روناکی بەخشێکی هەیە وەك رێ روناك کەرەوە، لەوانە: بڕوات بە خوا هەبێو هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەیو، بەرپاکردنی نوێژو زەکات دانو، گرتنی رۆژوی

ڕەمەزانو، حەج کردنو، فەرمان بە چاکەو، ڕێگری لە خراپە، هەروا گەر چویە ماڵەوە سەلام لە خاوو خێزانت بکەی ( هەروەها کە لە ماڵ دەردەچی) و سەلام لەو کەسانە بکەیت، کە بەلایاندا تێپەڕ دەبیت، جا هەرکەسێ شتێ لەمانە وازبێنێ، ئەوا بەشێك لە ئیسلامی وازهێناوە، هەر کەسێکیش هەموو ئەمانە وازبێنێ، ئەوا پشتی لە ئیسلام کردووە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**إستأمروا النساء في أبضاعهن. قيل: فإن البكر تستحي أن تتكلّم، قال: سكوتُها إذنُها**)) (رواه النسائي وأحمد في المسند (صحيح)، واتە: بۆ بەشودانی ئافرەتان قسەیان لێ وەربگرن، گوتیان: کچ شەرم دەکات قسە بکات، فەرمووی: کە بێدەنگ بوو، ئەوە ئیزنو مۆڵەتی کچەکەیە، کە ڕازیە.

## خێزانەکەت بە پارە مەزەندە ناکرێ

ئایا ڕۆژێك ئەوەت بە دڵدا نەهاتوە، کاغەزو قەڵەمێك بێنیو بزانی خێزانەکەت مانگی بەچەند مەزەندە دەکرێو، چەندی پارەو خەرجی شایەستەیە بەرامبەر بەو کارانەی، کە ڕۆژانە ئەنجامی دەدات.

ئەوەش لە کاتێکا گەر بتەوێ مافی خۆی بەرچاو بگریو مافی خۆی بدەیتێ؟ ئەوەی ڕاستی بێ نەخێر، جا مادام وایە ئەم سەروتارە بخوێنەرەوە:

لە وەڵامی پرسیاری یەکەم، کە خێزانەکەت مانگی چەندی خەرجی دەوێ، ئەوەیان بۆ ویژدانو مەزەندەت لێ‌گەڕێ، بە مەرجێ ژنەکەت بڕوادارو بە بیروهۆش بێ، نەك نەخۆش بێ بە نەخۆشی خۆچواندن بە ئافرەتی بێگانەو چاولێکەریو حەز بە هەبونی جلوبەرگی زۆر. بێگومان خەرجیی ئەو جۆرە ژنە زۆر زۆرە.

با سەیرکەین ژن مانگی چەندی شایستەیە بیدەیتێ لە بری ئەو کارانەی کە هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی. گەر یەکێك بێنیو بەکرێی بگری، تا خزمەتی خۆتو منداڵەکانت بکات وەك، کە خێزانەکەت ئەنجامی دەدات، پێویستە چەندی خەرجی بدەیتێ؟ لێرەدا پشت بە سەرژمێریو ئامار دەبەستین:

پاسەوانی منداڵەکان لە هەر کاتژمێرێك (٣٠٠٠) دیناری دەوێ، جا گەر وامان دانا خێزانەکەت هەڵدەستێ بە پاسەوانی منداڵەکانت بە درێژایی (٢٤) کاتژمێر لە ڕۆژێکدا دەبێ (٧٦٠٠٠) دیناری بدەیتێ.

ئەگەر چێشت لێنەر مانگی (٢٥٠٠٠٠) دینار وەربگرێ، ئەوا خێزانەکەت ئەم پارەیەی شایستەیە، جگە لەو کارانەی کە پێی هەڵدەستێ،

وەك پاكو خاوێنی ماڵ، كە هەر ڕۆژەی (٥٠٠٠) دینـاری دەوێ، شـتنی جلو بەرگو ئوتـوكردنو درونـەوەو چـاككردنی جـلو بـەرگ هـەر ڕۆژەی (١٠٠٠٠) دیناری دەوێ. جا بۆ ئەوەی سەرت بەم حیسابە نەیەشـێ ئـەوا كورتەكەی ئەم سەرژمێری‌یەت دەدەینێ كە هەفتەی (٥٠٠٠٠٠) دینـاری دەوێ بەواتاكـەی مـانگی (٢,٠٠٠,٠٠٠) دینـار. ئـەوەش شایـستەی خێزانەكەتە، گەر لەبری ئەو كارانە بیدەیتێ.

لە ڕاستیدا ئەم بڕە پارەیە، كە بەزۆر دێتە پێش چاو كەمـە لـە ئاسـت ئەو ئافرەتە بەڕێزو نەرمو نیانەی كە هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی دەیەها كـار لـە ماڵەكـەمان، كـە هـیچ پـەروەردیارێك یـان چێـشت لێنـەرێك، یـان سكرتێرەیەك ناتوانێ ئەنجامی بدات،... هەروەها لە زۆر حاڵەتدا بە كـاری پزیشكیو پارێزەری هەڵدەستێو لـە سـەروی هـەمو ئەوانەشـەوە ئـەركی پەروەردەو پێگەیاندنی منداڵ.

خێزانەكەت ئەو كەسەیە، كە بـە دەسـتی ڕاسـتی بێـشكە ڕائـەژێنێو جیهانیش بە دەستی چەپیەوە، وەك كە یەكێك لە بیـریاران وای گوتوە.

كاتێك ئێواران بە خەمو پەژارەیەكەوە دەگەڕێیتەوە ماڵەوە، كە خۆشـت نازانی هۆكەی چیە، ئەوا سكالآت لە لای خێزانەكەت دەكەی، ئەویش كـە دەزانێ تۆ پەژارەو گیروگرفتت هەیە، یەكسەر هەڵدەستێ بـە خـستنە ڕوی پێشنیاركردنو دەست پێشخەری كارێكی خـەم ڕەوێنـەو (تـەرفیهی) وەك: گەمەو یاری كردن لەسەر جێگەی سەرجێییداو یادخستنەوەی ئەو شتانەی، كە دەبێتە هۆی لادانی خەمو ماندو بون، یان چـونە دەرەوە بـۆ یـەكێ لـە باخەكانی نزیكی ماڵتانو پێشبڕكێی تیا دەكـەن، یـان سـەردانی كردنـی خزمانی هەردولا، یان گێڕانەوەی چیرۆكی پێغەمبەرانو هاوەڵە بەڕێزەكانی

پێغەمبەر ﷺ، کە چۆن ئارامیان گرتودو خۆڕاگر بون، یان باسکردنی بەهەشت بەو شتانەی کە لێیەتی. ئەمانە هەموی دەبێتە هۆی لادان‌و نەهێشتنی خەم‌و پەژارەو، کەمکردنەوەی ناخۆشی‌یەکان‌و ماندوبونی دنیا.

هەر لەو کاتەی دڵت تەنگە یەکسەر پیاڵە چایەکت بۆ ئامادە دەکات، تا مێشکت هێدی‌و هێور ببێتەوە، هەر لە هەمان کاتیشدا لەوانەیە شتێکی خۆش، یان نوکتەیەکت بۆ باس بکات.

لە هەمو ئەم حاڵەتانەدا، گەر هەر یەکێك لەو بەرنامانە هەڵبژێری، هێندەی پێ ناچێ هەست بە باش بونی رۆحی مەعنەویت‌و نەمانی خەم‌و خەفەت دەکەیت.

ئەوەش بە هۆی چییەوەیە؟ بە هۆی لێزانینی ئەو هاوڕێیە خۆشەویستەوەیە، کە دەزانێ چۆن دڵ‌و دەرونت ئارام دەکات‌و پەژارەو ماندو بونت لێ دور دەخاتەوە.

پیاوی بەڕێز! کەواتە ئێستاکە پێم بڵێ، پزیشك لە بری چاك بونەوەو یارمەتی دانت، بۆ چارەکردنی نەخۆشی، چەند وەردەگرێ، کە هێندەی خێزانەکەشت هەوڵ‌و کۆشش نادات؟

هەروەها ژن بۆ مێرد زۆرجار، رۆڵی پارێزەری دەبینێ لە کاتی بونی گێروگرفتێکی دەرەوەی ماڵ، کە بەرگری لە پیاوەکەی دەکات‌و لەسەری بەوەڵام دێت، لەوانەیە بە مێردەکەی نەکرێ.

هەروا لەو ئەرکانەی تر، کە ژن بەبێ تێچونی پارە پێیەوە هەڵدەستێ، ئەرکی راوێژکاری دارایی (المستشار المالي)یە کە لەوانەیە چەند جار توشی قەیرانی دارایی بوبی‌و نەتتوانیوە لێیەوە دەرچی، گەر خێزانەکەت بە پەلە بەهاناتەوە نەهاتایەو نەیگوتبایە: چەندت پارە پێ دەوێ، من ئەو برە

پارەیە لە خەرجی‌یەکانی ماڵەوە هەڵئەگرم‌و لـێی ئەگێڕمەوە.

ئێمەی پیاو، با دان بەوە دابنێین ژنـی چـاك‌و دڵسۆز بـەپارە مەزدنـدە ناكرێ، بەر لە هەمو شتێك گەر ژن نەبێت، سەدان جار زیاتر بارگران دەبین‌و خەرجیمان دەکەوێتە سەر، کە ئەو شایستەیەتی بیدرێتێ، بـا ئـەوە لـەلای خۆمان هەڵگرین، بـا هەوڵـدەین لـە بـری پـارە بـژاردن بـۆی، بـە سـۆزو خۆشەویستی‌و ڕێزلێنان قەرەبوی بۆ بکەینەوە، با لـە کاروبـاری ماڵـەوەی هاریکاری‌و بەشداریان بکەین، لە یـەکێ لـە خێزانـەکانی پێغەمبـەر ﷺ دەربارەی ژیانی ماڵەوەی پێغەمبەر ﷺ پرسیار کـرا، خێزانەکـەی گـوتی: ((پێغەمبەر لە خزمـەتی خێزانەکەیدایـە، کراسـی خـۆی بـۆ خـۆی پینـە دەکات‌و بۆ خۆی مەڕەکەی دەدۆشێ)).

زۆر جار ژن دەبێتە ڕاوێژکارێکی چاك، پێغەمبەر ﷺ هەندێ کات بـە ڕای خێزانەکانی کردوە. ئەو حەدیسانەش کە پێـچەوانەی پیـادەکردنی ڕای ژنە، ڕاست نیەو هیچ ئەصلی نیـە کـە دەڵـێ: (ڕاوێـژیان پـێ بکـەن‌و بـە قسەیان مەکەن)، (بە قسەکردنی ژن پەشیمانی بە دوایە). بـەڕای مـن لـە زۆر حاڵەتدا ئافرەت‌ئیلهامی بۆ دێ‌و بیروڕای ڕاست‌و پێکاو دەخاتە بەرچاو، من دان بەوە دادەنێم لە لایەنی مادەو مەعنەویـەوە، کـە بـە هەنـدێ ڕای خێزانەکەم نەکردوە، زیانم لێکەوتوە، ئەو کردو کۆشەی ژن دەیکات، تـەنها بۆ مێردەکەی نیە، بەڵکە بۆ خێزانە، بۆ نەتەوەیە، لەپێناو خوای گەورەیـە، بە مەرجێ مەبەستی بەمە فەرمانبەریی بێت، دیارە پیاویش کـردو کـۆش دەکات، بەڵکە لەویش زیاتر ئەنجام دەدات‌و بە ئەرکی زۆرتر هەڵدەستێ، لە مەیدانی ژیانـدا زەحمـەتی زۆر دەبینـێ، کەواتـە بـا هاریکـاری هـەبێت، دڵڕاستی هەبێت، قوربانیدان هەبێت... بەهەشتیش بۆ خۆپارێزانـە چ ژن چ پیاو، بۆ کارکارانە، بـۆ خـەباتکارو کۆشـشکارانە، ئـەو بەهەشـتەی ئـەو

شتانەی تێدایە کە نەفس ئارەزومەندێتی‌و، بەدڵی هیچ کەسێکدا نەهاتوە.

﴿وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ...﴾.

دیارە ژن دەیەوێ چەند هەلێك بەدەست بێنێ بۆ دیراسەکردنی لاپەڕەی پەروەردەیی، تا ببێتە یارمەتیدەری بۆ ڕێنمایی کردنو پەروەردەکردنی منداڵەکانی.. هەروەها سەربردەو بەسەرهاتی پێغەمبەرانو یارانی پێغەمبەر ﷺ دەخوێنێتەوە، تا لەکاتی گونجاودا بە تایبەتی بەر لە نوستن بۆیان بگێڕێتەوە.

بەم بۆنەیەوە پێویستە وەبیر ژن بێنینەوە، کە پیاو لە ژیاندا زەحمەتی ژیان دەکێشێ‌و، ئەو گرفتانەی دێتە ڕێ، لە کۆششی ئەو کەمتر نیە، گەر زیاتر نەبێت.

هەموو ئەمانە لەسەری ئاسان دەبێ، گەر بزانێ، بەر لە هەموو شتێك کە هاوسەرگیری (الزواج) ئەرکێکی مرۆیی‌و ئاینیە.

# بەرپرسیتی ژن و میرد

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلاَئِكَةٌ غِلاَظٌ شِدَادٌ لاَ يَعْصُونَ اللهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾(التحريم- ٦)، واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، خۆتانو خێزانتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە سوتەمەنی‌یەکەی خەڵكو بەردە، ئەوانەی سەرپەرشتی ئەو ئاگرە دەکەن چەند فریشتەیەکی توندو تیژن، کە سەرپێچی خوا ناکەن لەو فەرمانانەی، کە پێیان دەدرێو لەوەی فەرمانیان پێ دەکرێ ئەنجامی دەدەن.

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((ألا كلكم راع، وكل راع مسؤول عن رعيته[1]، فالأمير الذي على الناس راع وهو مسؤول عن رعيته،

---

١) بەرپرسێتی پیاو دیارە، لەم کتێبەدا لە زۆر بۆنەدا باسمان کردوە. کەواتە دەبێ بەرپرسێتی ژن چ بێ؟! ژن بەرپرسێتی گەورەی لەسەرە، وێڕای پەروەردەکردنی منداڵەکانی بە پەروەردەیەکی ئیسلامی پتەو-وەك یەکێ لە ئافرەتە پەروەر دیارەکان- گوتویەتی: ژن سەرچاوەی خۆشەویستی‌یە، کانگای سۆزو نازە لە ماڵدا، بەڕاستی ژن مایەی سۆزو خۆشەویستیو نازی مێردەکەیەتی، ژن چراو ڕوناکیو بەختەوەری خێزانە، پیاو کاتێ بەختەوەرو شادمانە، کە شادیو بەختیاریی لەسەر لێوی ژنەکەی بەدی دەکات، کاتێکیش تەماشای چاوەکانی دەکات، ڕوانینێکی گەرمو سۆزدار لە هەردو چاوی بەدی دەکات، ئەوەش ئەرکێکی گەورەیە کەوتۆتە سەر شانی ژن، بە شێوەیەکی گشتی ژن لەم جۆرە کاروبارەدا لە پیاوی بردۆتەوە، لە گشت حاڵەتەکاندا ژن (هاوسەر) کۆڵەگەو پاڵپشتی خێزانە، چەندەها بەرپرسیارێتی کەوتۆتە سەرشانی. بەرپرسێتیشی دەرهەق بە مێردەکەی ئەوەیە، کە بەرپرسە لە چاکردنی هەڵەکانی، پاشانیش ڕێنمایی کردنی، چاکردنی ڕەفتارە خراپەکانی، ڕەنگە لە هەندێ حاڵەتدا زەحمەت بێ ژن پیاو بهێنێتە سەر ڕێی ڕاست، چونکە پیاو لەپێناو چێژو لەزەتی خۆی شت خەرج دەکات، کاتێ ژن بە

والرجل راع على أهل بيته، وهو مسؤول عنهم، والمرأة راعية على بيت بعلها وولده[١] وهي مسؤولة عنهم، والعبد راع على مال سيده، وهو مسؤول عن رعيته))[٢]، واتە: هەموتان بەرپرسيارن، هەمو بەرپرسێك ئەو كەسانەی، كە لە ژێر دەستی دايە لـێيان بەرپرسيارە، ئەو ئەميرەی بەسەر كۆمەڵێك خەڵكانەوەيـە، بەرپرسـيارە لـێيان، پيـاو بەسـەر خێزانەكـەی بەرپرسيارەو لەبارەی چۆنيەتی پەروەردە كردنيان لـێی دەپرسـرێتەوە، ژن بەرپرسيارە بەسـەر مـاڵی مێردەكـەیو بەسـەر منداڵـەكانیو مافـدانیو پەروەردەی منداڵەكانی بەرپرسيارە. ئـەو عەبـدەی لـە لای گەورەكەيـەتی بەرپرسيارە لەسەر ماڵی گەورەكەیو لـێی دەپرسرێتەوە.

هەروەها دەفەرموێ: ((إن الله تعالى سائل كل راع عما استرعاه، أحفظ

---

مەردايەتیو بە عەزمەود بەرەو ڕوی ئـەم جـۆرە هەڵوێـستە دەوەسـتێو، هـەوڵ دەدات مێردەكەی بێنێتەوە سەر ڕێی ڕاستو، ئينجـا هەوڵـدان بـۆ بـەردەوام بـونی پاراسـتنی خێزانەكەی لە بەڵاو كارەساتی ڕۆژگار، ئا لەو كاتەدا كەسايەتی ژن بەدەردەكەوێ، بـەڵام گەر ژنەكەش گيانی تۆڵەسەندنەوەو غيرەی هەبێ، ئەوكاتە هەردولا ژيانيان تـاڵ دەبـێو كەڕو لە كاول بون دەكات.

١) هەندێ خەڵكی سادە گومـان دەبـەن كـە ئـەركی ژنو كـاركردنی ماڵـەوەی ئاسـانەو، پێويستی بە يەكلابونەوە (تفرغ)ی درێژايی ڕۆژ نيە... ئەم گومانە ئەوپەڕی نەفامی‌يـە، مادام گەورەترين بارگرانايی پەروەردەی منداڵ كەوتۆتە سەر ئافرەت، كـە پێويـستی بـە چەندەها لێكۆڵينەوەو تێبينی زۆر هەيـە، بـۆ سـەركەوتن لـە ئەنجامـدانی ئەركەكـەیو هەڵسان بە بەرپرسياريەتەكەی، كە فەرمودە پيرۆزەكەی پێغەمبەر ئاماژەی پـێ كـردوە، سەرەڕای ئەوەی پێويـستی بە مانەوە بە دڵنيايیو حەسانەوەی مێشك هەيە، كە دور بێت لە هەمو هەڵچونێك، كە بەپەلە دەگوێزرێتەوە بۆ كۆرپەلەو منداڵی شـيرەخۆر، ئەمـەش دەبێتە هۆی خراپترين شت وەك كە ئەزمونەكانی دەرونناسيی ئاماژەيان پێ كردوە.

٢) رواه البخاري و مسلم.

ذلك أم ضيعه؟ حتى يسأل الرجل عن أهل بيته))[1]، واتە: خواى بالآ لـە هەمو ليپرسراويك دەپرسيتەوە، لە بارەى ئەو كەسانەى كە لەژير دەستيدا كار دەكەن، ئايا مافى ئەو كەسانەى پاراستوە، يان مافەكانيانى پيشيل كردوەو خواردويەتى؟ تەنانەت پياو سەبارەت بە مالو منداڵو ژنى لـێى دەپرسريتەوە، كە ئايا وەك ئيسلام دەيەوێ ئاوا پەروەردەى كردونە يان نا؟.

((كلكم راع، وكلكم مسؤول عن رعيته))[2]، واتە: هەموتان بەرپرسيارو شوانن، هەر بەرپرسيارو شوانيك بەرپرسە لەبەركارەكەى.

١) رواه النسائي وابن حبان.

٢) رواه البخاري و مسلم.

## مەبەستەکانی ژن هێنان
## لە بارەی سیاسی و عەسکەری یەوە

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ﴾(الأنفال- ٦٠) واتە: ئەوەندەی هێزو تواناتان هەیە، بۆ دوژمنانتان ئامادەی بکەن.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((تزوجوا الولود الودود، فإني مكاثرٌ بكم الأمم))[١]، واتە: ئافرەتی وا بخوازن کە منداڵی ببێ و خۆشەویست بێ، چونکە من بە زۆریتان لە ناو ئوممەتەکانی تر شانازی دەکەم.

((جاءت أمرأة الى النبّي ﷺ فقالت: يا رسول الله ذهب الرجال بحديثك، فاجعل لنا من نفسك يوماً نأتيك. فتعلِّمُنا مما علمك الله، قال النبّي ﷺ: إجتمعن يوم كذا وكذا في موضع كذا وكذا. فاجتمعن فأتاهن فعلَّمهن مما علَّمه الله، ثم قال: (ما منكن من امرأة تقدَّمُ ثلاثة من الولد إلا كانوا لها حجاباً من النار!) فقالت إمرأة: وإثنين؟ قال رسول الله ﷺ وإثنين!))[٢]، واتە: ژنێك هاتە لای پێغەمبەری خواو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا پیاوان فەرمودەی تۆیان گوێ لێ بو ڕۆیشتن، تۆش ڕۆژێکمان بۆ دیاری کە، تا ئەوەی خوای گەورە فێری کردویت فێرمان بکەیت.

پێغەمبەر فەرموی: فلانە ڕۆژ کۆببنەوە لە فلانە شوێن.

جا ئافرەتەکان کۆبونەوەو پێغەمبەر چوە لایان و ئەوەی خوای گەورە

---

١) رواه أبو داود والنسائي وابن حبان (حديث صحيح).

٢) رواه البخاري و مسلم.

فێری کردبو فێری کردن.

پاشان فەرموی: هەر ئافرەتێك لە ئێوە سێ منداڵی بمرێت ئەوا منداڵەکان بۆی دەبن بە پەردە لە ئاگری دۆزەخ.

ئافرەتێك گوتی: ئەدی گەر دو منداڵ بێت؟

پێغەمبەری خوا فەرموی: گەر دوانیش بێت.

لە ڕاستیدا بەرزیو عیزەتی میللەتانو نەتەوە لەسەر زۆری دانیشتوانیو چەکداری کردنیان بە هێزی ماددیو مەعنەوی وەستاوە. ئیسلام هانی هەمو ئەوانەی داوەو هانی زۆرکردنی وەچەی داوە. چونکە زۆریی دانیشتوان بەو هێزە دادەنرێ، کە خوای گەورە فەرمانی بە ئامادەکردنیانی کردوە بۆ ترساندنی دوژمنان، کە لە ئایەتەکەی سەرەوە ئاماژەی بۆ کرا.

پێغەمبەری خوا ﷺ هەڕەشە لەو کەسانە دەکات کە نەخشە دادەنێن تا ژن نەهێنن وەك دەفەرموێ: ((من رغب عن سنتي فليس منّي!)).

واتە: هەر کەسێك واز لە ڕێو ڕێبازو شوێنکەوتنم بێنێ لە من نییە.

هەروەها ئیسلام هانی ئەوەی داوە، کە ئوممەت خۆی بە باوەڕ بە خواو بە ئارام گریو خۆڕاگریو ئازایەتیو دەستگرتن بە ڕەوشتە بەرزەکان برازێنێتەوە، تا میللەتو نەتەوە نەوە (جیل)ێکی بەهێزی بۆ بەدەست بهێنرێ، کە سیفەتەکانی چەندیو چۆنیەتی بەیەکەوە تێدابێت، چونکە زۆریی (الكثرة) بە بێباوەڕی ڕاستو دروستو ڕەوشتی بەرز، هیچ سودو ئاکامێکی نابێت. لە فەرمودەی (صحیح)دا هاتوە، کە باسی خراپیو ناشیرینی زۆرییو گەرەلاوژەیی دەکات، کە لە هێزی مەعنەوی داماڵراوە وەك خۆشەویستی مردنو بایەخ نەدانە بە خۆشیو رابواردنی دنیا وەك دەفەرموێ:

((يوشك ان تداعى عليكم الأمم من كل جانب تداعي الأكلة على

قصعتها. قالوا: أو من قلة نحن يومئذ يا رسول الله؟ قال لا ولكنكم غثاء كغثاء السيل وليترعن الله من صدور عدوكم المهابة منكم وليقذفن في قلوبكم الوهن. قال قائل: يا رسول الله! وما الوهن؟ قال: حب الدنيا وكراهية الموت))[1]، واتە: هێندەی نەماوە کە نومەتەکان لە هەمو لایەکەوە بۆتان بێن، وەك چۆن چەند کەسانێك لە یەك قاپ خواردن کۆدەبنەوەو لە هەمو لایەکەوە دەستی بۆ ئەبەن بۆ خواردنی.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەو رۆژە ئێمە لەبەر کەمی ئاوامان لێ دێ؟

فەرموی: نەخێر: بەڵکو ئێوە زۆرن وەك کەفی سەر دەریا! خوای گەورە سامو هەیبەتی ئێوە لە دڵی دوژمنان ناهێڵێ‌و، دایدەماڵێ‌و (وەهن) دەخاتە دڵی ئێوە.

یەکێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا: (وەهن) چیە؟

ئەویش فەرموی: وەهن بریتییە لە خۆشەویستی دنیاو رِق بونەوە لە مردن.

١) رواه أبو داود و البيهقي وهو صحيح.

## ژیانی ژن‌و مێردایه‌تی[1] ته‌نها ڕابواردن نی‌یه

خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێ: ﴿ يَانِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِنَ النِّسَاءِ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلاَ تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلاً مَعْرُوفًا ۞ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلاَ تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الأُولَى وَأَقِمْنَ الصَّلاَةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللهَ وَرَسُولَهُ إِنَّمَا يُرِيدُ اللهُ لِيُذْهِبَ عَنْكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ۞ وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَى فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللهِ وَالْحِكْمَةِ إِنَّ اللهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا﴾ (الأحزاب:٣٢-٣٤). ،

واته: ئه‌ی هاوسه‌رانی پێغه‌مبه‌ر! ئێوه وه‌ك ژنانی تر نین" ئه‌گه‌ر خۆتان ئه‌پارێزن، زۆر به ناسکی‌و خاوی قسه مه‌که‌ن" نه‌وه‌ك که‌سێ غه‌ره‌زێکی له

---

١) پێویسته ژن‌و مێردی بڕواداری چاك، ئاسۆیه‌کی فراوانیان هه‌بێت، که له میانه‌ی ده‌ست به‌تاڵیاندا، زۆر بخوێننه‌وه‌و دیراسه‌یه‌کی قوڵی ئیسلام بکه‌ن‌و، کۆشش بکه‌ن بۆ بڵاوکردنه‌وه‌ی له‌نێو مسوڵمانان به پیاوو ئافره‌ته‌وه! هه‌روه‌ها پێویسته له‌سه‌ریان منداڵه‌کانیان به ڕۆشنبیری‌یه‌کی ئیسلامی نوێ ڕۆشنبیر بکه‌ن، با به‌به‌رده‌وامی له حه‌سانه‌وه‌و یاری‌و له‌هوکردن نه‌بن، با قه‌ناعه‌تیان به خوێندنی منداڵه‌کانیان هه‌بێت، که له قوتابخانه‌کان ده‌خوێندرێ.

چه‌نده به‌هۆی به‌زایه‌دانی ڕۆشنبیرکردنی منداڵه‌کان به ئیسلام، بۆته مایه‌ی نه‌گبه‌تی‌و هۆی هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌ی منداڵه‌کانیان‌و ده‌رچونیان له ئیسلام، به‌داخه‌وه! ئه‌و جۆره باوکانه چه‌ند به‌دبه‌ختن.

خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێ: ﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ﴾، واته: ئێمه ئه‌و کرده‌وانه‌ی کردویانه ده‌ینوسین‌و شوێنه‌واریشیان ده‌نوسین. منداڵ له گه‌وره‌ترین شوێنه‌واری دایك‌و باوکه، که له‌ژیان‌و مردندا پێیان ده‌گه‌ن.

پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رموێ: ((إذا مات ابن آدم انقطع عمله إلا من ثلاث: صدقة جارية، أو علم ينتفع به، أو ولد صالح يدعوا له)).

دڵدا بێ‌و ئاره‌زوی خۆشکا، هه‌رچۆن په‌سنده ئاوا قسه بکه‌ن، له ماڵی خۆتان ده‌رمه‌که‌ون‌و وه‌ك ده‌ورانی زه‌مانی نه‌زانی پێشو، خه‌مڵ‌و خشڵی خۆتان نیشان مه‌ده‌ن. نوێژ بکه‌ن‌و زه‌کات بده‌ن، له فه‌رمانی خوداو پێغه‌مبه‌ر ده‌رمه‌چن. ئێوه که خه‌ڵکی ئه‌م ماڵه‌ن، خوا گه‌ره‌کیه چه‌په‌ڵیتان له‌سه‌ر لاباو پاك‌و خاوێنتان ڕاگرێ، هه‌رچی له نیشانانی خواو له کارزانی له ماڵتاندا بۆ ئێوه ده‌خوێنرێته‌وه فێری بن‌و بیلێنه‌وه. خوا هه‌مو شتی لێ دیاره‌و ئاگاداره.

ئه‌م ئایه‌ته پیرۆزانه ئاماژه‌ی ئه‌وه ده‌که‌ن که ده‌بێ ئافره‌ت خۆی به ئاداب‌و چه‌ند سیفاتێك برازێنێته‌وه وه‌ك قسه‌کردن به جدی‌و به ڕه‌قی له‌گه‌ڵ پیاوی بێگانه گه‌ر ناچار بو قسه له‌گه‌ڵ پیاوان بکات. یه‌کێکی تر له‌و ئاداب‌و سیفاتانه‌ی ده‌بێ ئافره‌ت پێوه‌ی پابه‌ند بێ جێگیر بونیه‌تی له ماڵه‌وه‌و نه‌چونه ده‌ره‌وه به‌بێ پێویستی. چونکه ماڵه‌وه (وڵاتی ئافره‌ته) که به‌ده‌ستی چه‌پی بێشکه ده‌هه‌ژێنێ، به‌ده‌ستی ڕاستیشی جیهان ده‌هه‌ژێنێ. جا به‌مه به‌سه‌ر چاره‌نوسی میلله‌تدا زاڵ ده‌بێ. هه‌روه‌ها زاڵ ده‌بێ به‌سه‌ر چاره‌نوسی هه‌مو ئاده‌میزاد به‌گشتی، به‌ڵام به‌مه‌رجێك گه‌ر په‌روه‌رده‌ی کچ‌و کوڕه‌کانی به په‌روه‌رده‌یه‌کی ئیسلامی به‌هێز په‌روه‌رده بکات‌و پێیان بگه‌یه‌نێ.

یه‌کێ له په‌روه‌ردیاران ده‌ڵێ: (جله‌وی په‌روه‌رده‌م بده‌نێ‌و بۆم مه‌یسه‌ر که‌ن، من ده‌بم به که‌فیل‌و ده‌سته‌به‌ر، که ڕوی جیهانتان بۆ بگۆڕم!)

له گرنگترین ئه‌رك‌و پێویستی‌یه‌کانی ئافره‌ت، که له ئایه‌ته‌کانی پێشه‌وه باسکران ئه‌وه‌یه، که ئافره‌ت ده‌بێ‌و پێویسته یارمه‌تی مێرده بانگه‌واز کاره‌که‌ی بدات‌و، بیروڕاو گه‌یاندنی به خه‌ڵکی بپارێزێ. تا به‌م شێوه‌یه ئافره‌ت بۆ پیاو ته‌نها هاوسه‌رو ته‌نها بۆ سه‌رجێیی نی‌یه، به‌ڵکو پارێزه‌ری

نهێنی پیاوە، وەك (سكرتێری) پیاوە یارمەتی دەدات و هانی دەدات لەسەر ئەو كارەی دەیكات.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((رحم الله رجلاً قام من الليل فصلّى وأيقظ امرأته، فإن أبتْ نضح في وجهها الماءَ، ورحم الله امرأة قامت من الليل، فصلت وأيقظت زوجها، فإن أبى نضحَتْ في وجهه))[١]، واتە: ڕەحمەتی خوا لە پیاوێك بێ، كە شەو هەڵدەستێ بۆ نوێژو ژنەكەشی هەڵدەستێنێ، گەر ژنەكەی هەڵنەستا ئاو بە ڕوی خێزانەكەی دەپڕژێنێ. ڕەحمەتی خوا لەو ژنە بێت كە بەشەو هەڵدەستێ بۆ نوێژو مێردەكەشی هەڵدەستێنێ، كە مێردەكەی هەڵنەستا ئاو بە ڕوی مێردەكەی دەپڕژێنێ.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إذا أيقظ الرجل امرأته من الليل فصليا ركعتين، كانا تلك الليلة من الذاكرين الله كثيراً والذاكرات))[٢]، واتە: گەر پیاو بەشەو ژنەكەی لەخەو هەڵبستێنێ و هەردوكیان پێكەوە دو ركات نوێژیان كرد، ئەوا ئەو شەوە لەو كەسانە دادەنرێن، كە یادی خوا زۆر دەكەن.

(ئیمام ابن القيم دەڵێ: شەونوێژ ڕوخساری مسوڵمان جوان دەكات و ڕۆشنایی پێ دەدات. هەندێك ئافرەت شەونوێژیان زۆر دەكرد، لەمبارەوە پرسیار لە ئافرەتێك كرا. ئەویش گوتی: بۆیە شەونوێژ دەكەم، چونكە ڕوخسار جوان دەكات. منیش دەمەوێ ڕوخسارم جوان بێ)[٣].

ئەمە شتێكی نامۆو غەریب نی یە، چونكە شەو هەڵستان لە خەو، دەبێتە

---

١) رواه أبو داوود و النسائي (صحيح).
٢) رواه أبو داود والنسائي والبيهقي.
٣) روضة المحبين ص:٢٢٠

هۆی بزواندنو جوڵەیی لەشو وەرزش کردن، دوای ئەوەی لەش بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك لە جمو جۆڵ کەوتوە.کە لەوانەیە بە هۆی لە جمو جۆڵ کەوتن، لەش دوچاری رەقی دەمارەکان ببێ. هەروەها دەستنوێژ هەڵگرتن رۆژی چەند جارێك، دەبێتە هۆی چالاکبونی سوڕی خوێن لە لەشدا.

## لەسەر جێگەی زاوایی بەرەو مەیدانی جیهاد

قال رسول الله ﷺ عند قتل حَنْظَلَة بن أبي عامر، بعد أن التقى هو وأبو سفيان بن الحارث، ثم علاه شدَّاد بنُ الأسود بالسَّيف فقتلهُ، فقال رسول الله ﷺ: ((إن صاحبكم تغسله الملائكة))، فسألوا صاحبته: فقالت: إنه خرج وهو جنب لما سمع الهائعة (منادي الجهاد)[1]، واتە: پاش ئەوەی حەنظەلەو ئەبوسوفیانی کوڕی حارس لە شەڕدا کەوتنە بەرامبەری یەکتری، پاشان شەددادی کوڕی ئەسوەد بە شمشێر بەرزبۆوە سەر حەنظەلەو کوشتی، جا لەوکاتەی (حنظلة) کوژرا، پێغەمبەر فەرموی: (هاوڕێکەتان فریشتەکان دەیشۆن)، لە خێزانەکەی پرسیار کرا حەنظەلە چۆن چۆتە دەرەوە: خێزانەکەی گوتی حەنظەلە کاتێك، کە گوێی لە بانگی جیهاد بو بە لەشی پیسەوە چوە دەرەوە.

سەرنج بدەن: ئەم هاوەڵە بەڕێزە چ کارێکی گەورەی ئەنجامدا کاتێ، کە بانگی جیهاد دەدرێو شەهیدبونی لە لا خۆشترو بەرزترە، لە خۆشیو ڕابواردنی هاوسەرایەتی!

ئا بەم جۆرە دڵو دەرونە گەل سەردەکەوێو میللەتی پێ بە عیزەتو نەفس بەرز دەبێ.

---

١) رواه الترمذي وابن حبان (حديث صحيح).

## لە بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((یكون في آخر أمتي رجال، یركبون علی سُرج كأشباه الرحال! وینزلون علی أبواب المساجد، نساؤهم كاسيات عاريات علی رؤسهن كأسنمة البُخْت العجاف، إلْعَنوهنَّ! فإنَّهن ملعونات!))[1]، واتە: لە کۆتایی ئومەتەکەم پیاوانێك پەیدا دەبن، سواری جۆرە سواریەك (ئۆتۆمبیل) دەبن کە لەبەر دەرگای مزگەوتەکان دادەبەزن، ئافرەتەکانیشیان پۆشتەن‌و ڕوتیشن، قژیان تۆپەڵە دەکەن، وەك بەرزایی پشتی حوشتری لاواز، ئێوە لەعنەت لەو ئافرەتانە بکەن، چونکە ئەوانە بەر لەعنەت کەوتون.

ئەم فەرمودەی پێغەمبەر چەند جوانەو موعجیزەکەی چەند گەورەیە، هەواڵی ئەوە دەدات، کە زۆر لە دەوڵەمەندانی ئێستا، ئەوانەی ئۆتۆمبیلە گەورەکانیان لە بەردەمی مزگەوتەکان دەوەستێنن، جا پێغەمبەری خوا ناوی لەو ئۆتۆمبیلانە ناوە (أشباه السرج) کە بریتی یە لە (زین) ئەوەی کە دەخسترێتە سەر ئەسپ‌و ماین بۆ دانیشتن.

پاشان ئەمانە دەچنە مزگەوت بۆ نوێژکردن، کەچی ئافرەتەکانیان ڕوتن‌و جوانی‌و ڕازاوەیی‌یان بۆ خەڵکی دەخەنەڕو، قژیان لەسەر سەریان کۆدەکەنەوە وەك پشتی حوشتر، کە ئێستا ئەمە باوە.

ئەم فەرمودەیە گلەیی‌و گازاندەیە بۆ ئەو دەوڵەمەندانەی، کە کەسایەتیان لە دەست داوەو دەسەڵاتیان نەماوە، نوێژەکان ئەنجام دەدەن، کەچی

[1] رواه ابن حبان والحاكم حديث صحيح.

ئافرەتەکانیان لە ڕێگا بە پۆشتەیی‌و بە ڕوتی دەڕۆن بەڕێوە. گەنج‌و لاوان توشی فیتنە دەکەن‌و، ئومەت‌و نیشتمانەکەیان توشی کارە ناشیرین‌و خراپەکان‌و فیتنەییەکان دەکەن.

# ئیسلام بە پەروەردەی بەهێز ئافرەت پەروەردە دەکات

لە سیرەی ئیبن هشام هاتوە: ((ئوم سەعدی کچی سەعدی کوڕی رەبیع گوتویەتی: ئوم عەمارە هاتە لاموو پێم گوت: پورێ (خوشکی دایکی) باسی حاڵی خۆتم لە جەنگی ئوحود بۆ بکە.

ئەویش گوتی: لە بەیانیەوە دەرچوم کوندە ئاوێکم پێ بو دەمڕوانیە پیاوان جەنگیان دەکرد، جا چومە لای پێغەمبەر ﷺ کە لەناو هاوەڵەکانی بو، ئەو کاتە هێزو سەرکەوتن بەدەست مسوڵمانان بو، کاتێك مسوڵمانان بەزین، پاڵمدا بەلای پێغەمبەر خواو دەستم کرد بە جەنگ کردن، شمشێرم لەسەر پێغەمبەر لادەدا، تیرم دەهاویشت هەتا ئەو کاتەی، کە بریندار بوم.

ئوم سەعد گوتی: برینێکی وشکم لەسەر شانی بینی، گوتم کێ برینداری کردی؟

گوتی: إبن قمئة، خوای گەورە زەبونی بکات. لەو کاتەی، کە خەڵك پشتیان لە پێغەمبەری خوا کرد، هاتە پێشەوە دەیگوت: محمدم پیشان بدەن لە کوێیە، رزگار نەبم گەر رزگاری ببێ، منو موصعەبی کوڕی عومەیرو چەند کەسێکی تر، کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بوینو بەرەنگاری بوینەوە، جا لێی دام، منیش چەند جارێکم لێدا بەڵام ئەم دوژمنی خوایە دو کراسی ئاسنینی لەبەربو.

((ئەبو موسای ئەشعەری-هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر- فەرمانی بە کچەکانی کرد، کە بە دەستی خۆیان قوربانی سەر ببڕنو قاچیان بخەنە

سه‌ر قوربانیه‌که‌و الله أكبـرو بسم الله بلێـن))[1].

ئـیبن هـشام گوتویـه‌تی: ئـیبن ئیـسحاق گوتویـه‌تی.. صـه‌فیـه‌ی کـچی عبدالمطلب له‌ناو قه‌ڵای حه‌ســــانی کـوڕی سـابت بـو -حه‌سـان نـه‌خۆش که‌وت- صه‌فیه گوتی: پیـاوێکی جوله‌کـه بـه‌ده‌وری قه‌ڵاکـه ده‌سـوڕایه‌وه، ئه‌وکاته بـه‌نو قـوره‌یظـه جـه‌نگیان له‌گـه‌ڵ پێغه‌مبـه‌ر هـه‌بو، پێغه‌مبـه‌رو هاوه‌ڵه‌کانی له ئێمه دوربون که‌سێك نه‌بو، که بێت لێمـان لادات، چـونکه ئه‌وان سه‌رقاڵی دوژمن بون‌و بواری هاتنیان نه‌بو بۆ لامان بێن.

ده‌ڵێ گوتم: حه‌سان! ده‌بینی ئه‌و جوله‌که‌یـه ده‌وری قه‌ڵاکـه ده‌دات، بـه خوا دڵنیا نیم‌و ئه‌مین نیم لـێی له دواوه جوله‌که بێنێـت‌و بمـانگرن، ئـه‌وه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ و هاوه‌ڵه‌کانی سه‌رقاڵن برۆ بیکوژه!

حه‌سانیش عوزری هێنایه‌وه به‌وه‌ی، که نه‌خۆشه ناتوانێ. پاشان صه‌فیه گـوتی: جـا کاتێـك ئه‌مـه‌ی گـوت، خـۆم تونـدکردو شیـشه‌یه‌کی ئاسـنم هـه‌ڵگرت، پاشـان لـه قه‌ڵاکـه‌وه بـۆی دابـه‌زیم‌و بـه شیـشه‌که لێـیم داو کوشتم!...

(به کورتی وکه‌مێك ده‌سکاریه‌وه).

---

١) أخرجه ابن رزين و علقه البخاري.

# سوربونی ئافرەت لەسەر زانیاری و پاداشت وەرگرتن

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((نعم نساء الأنصار لم يمنعهن الحياء في أن يتفقهن في الدين))[1]، واتە: باشترین ئافرەت، ئافرەتە ئەنصاریەکانن، شەرم کردنیان نەبۆتە هۆی ئەوەی لە ئایین شارەزا نەبن.

١) رواه البخاري.

## سیفەتی ئافرەتی سەرکردەکان

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِـيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُـرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَـرِّحْكُنَّ سَـرَاحًا جَمِـيلاً، وَإِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ اللهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ فَإِنَّ اللهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِـنْكُنَّ أَجْـرًا عَظِيمًـا﴾(الأحـزاب: ٢٨-٢٩)، واتـە: ئـەی پێغەمبـەر ﷺ بـە خێزانەکانت بلێ، گەر ژیانی دنیاو ڕازاوەیی‌و جوانی دنیاتان دەوێ، وەرن با مافەکانی خۆتانتان بدەمێ‌و بە چاکی‌و بەبێ زەرەرو زیان، تەڵاقتان دەدەم‌و دەستان لـێ بەردەدەم. گەر ئێوە خواو پێغەمبەری خواو دواڕۆژتـان دەوێ، ئەوا خوای گەورە بۆ هـەر یـەکێك لـە ئێـوە، گـەر کـردەوەی بـاش بکـا، پاداشتێکی گەورەی ئامادە کردوە.

لەهەمان سوردتدا دەفەرموێ: ﴿يَانِسَاءَ النَّبِـيِّ مَنْ يَأْتِ مِنْكُنَّ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ يُضَاعَفْ لَهَا الْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ وَكَانَ ذَلِكَ عَلَـى اللهِ يَـسِيرًا، وَمَـنْ يَقْنُتْ مِنْكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ وَتَعْمَلْ صَالِحًا نُؤْتِهَا أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا﴾ (الأحزاب: ٣٠-٣١)، واتە: ئەی ئافرەتـانی پێغەمبـەر ﷺ: هەر یەکێك لە ئێوە تـاوانێکی گـەورە بـە ئاشـکرا بکـات، ئـەوا ئـازارو ئەشکەنجەی دو هێندە ئەدرێ، ئەوەش لەلای خوا ئاسانە. هـەر یـەکێك لـە ئێوە بەردەوام بێ لەسەر گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەری خواو پێغەمبـەری خـواو کردەوەی باش بکات، ئـەوا پاداشـتی دو هێنـدە دەدەینـەوەو ڕزق‌و ڕۆزی یەکی زۆری بۆ ئامادە کراوە.

هەروەها خـودا دەفەرموێ: ﴿يَانِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِنَ النِّسَاءِ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلاَ تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلاً مَعْرُوفًا﴾(الأحزاب- ٣٢)، واتە: ئەی ئافرەتانی پێغەمبـەر، هـەروەها ئـەو تەوجیهە خێزانی مسوڵمانەکانیش دەگرێتەوە، ئێـوە وەك ئافرەتـانی تـری بێگانەو دور لە ئیسلام نـین گـەر قـسەتان لەگـەڵ پیـاوان کـرد، ئـەوا بـا قسەکانتان نەرمی‌و ناسکی‌و نازی تێدا نەبێ، چونکە لەوانەیە ئـەو پیـاوە دڵو نیازی پیس‌و خراپ بێ بەرامبەر بە ئافرەت‌و، مەیلی بەلاتانەوە بـێ. قسەی وا بکەن بە جۆرێك، کە نـە زۆر ڕەق بـێ‌و، نـە زۆر نـەرم‌و نیـانی‌و ناسك بێ.

خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلاَ تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الأُولَى وَأَقِمْنَ الصَّلاَةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللهَ وَرَسُولَهُ﴾(الأحزاب:٣٣)، واتە: ئەی ئافرەتە مسوڵمانەکان!بەبێ پێویستی لە ماڵ مەچنە دەرەوە.

ئیبن کثیر دەڵێ: واتە خۆتان بە ماڵەوە بگرن‌و بـەبێ پێویـستی مەچـنە دەرەوە. دەڵێ: لەو شتانەی کە پێویستی شەرعین، نوێژکردن لە مزگەوتـە. لە ڕیوایەتێکی تردا (وبیوتهن خیـر لهن) واتە: ماڵ بۆ ئافرەت باشترە، کە تیایا بمێنێتەوە چونکە دەتوانێ زانیـاری بەسـود وەربگـرێ، وەك قورئـان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەرو بنچینەکانی پەروەردەی ئیسلامی، تا نەوەیـەکی گەورەو بەرز بەدی بهێنێ.

خوای گەورە لەم‌ئایەتەدا دەفەرموێ: ئافرەتان ڕازاوەیی‌و جـوانی خۆیـان بـەدیار نەخـەن، وەك کـە ئافرەتـانی سـەردەمی نـەفامی یەکـەم خۆیـان

بەدەردەخست، نوێژ بکەن و زەکات بدەن گوێڕایەڵی و بە فەرمانی خواو پێغەمبەر بکەن.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ۞ وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَى فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا﴾(الأحزاب: ٣٣-٣٤)، واتە: ئەی خێزانەکانی پێغەمبەر، بەڕاستی خوای گەورە دەیەوێ پیسیی خراپەکاری و تاوانی نەفامێتیان لەسەر لابدات، دەیەوێ بە پاك کردنەوەیەکی چاك پاکتان بکاتەوە لە گوناهو تاوان، ئایەتەکانی خوا لە ماڵەکانتان بخوێننەوەو باسی بکەن و حیکمەت و لێزانی بەکاربێنن. خوای گەورە بە لوتف و ئاگادارە بە هەمو شتێك.

خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَةَ نُوحٍ وَامْرَأَةَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلاَ النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ ۞ وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً لِّلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَةَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ (التحريم: ١٠-١١)، واتە: خوای گەورە نمونەی ئافرەتی کافر دەهێنێتەوە، کە ژنی نوح و ژنی لوطە، ئەم دو ژنە لە پەنای دو عەبدی من بون لە عەبدە چاکەکان. ئەم دو ئافرەتە ناپاکی کوفرو دژایەتی مێردەکانیان دەکرد، جا مێردەکانیان نەیانتوانی هیچ شتێکیان بۆ بکەن لە لای خواو، پێیان گوترا هەردوکتان بچنە نێو ئاگر لەگەڵ ئەو کەسانەی، کە دەچنە نێو دۆزەخەوە.

هەروەها خوای گەورە نمونەی ئافرەتی بڕوادار دەهێنێتەوە کە ژنی

فیرعەونە، کە گوتی: خوایە خانوێکم لە بەهەشت لە لای خۆت بۆ دروست بکەو لە فیرعەون و کردەوەکەی رزگارم بکە.

لە تەفسیری (إبن الجوزی)دا دەڵێ: لە وشەی (وعملە) دوو قسە هەیە: یەکێکیان: واتە لە جوتبون لەگەڵیدا!! قسەی دوەمیش: واتە: لە شیرك و کوفری فیرعەون!!. هەروا لە قەومی ستەمکاران رزگارم بکە.

((لما نزل الوحي على رسول الله ﷺ في غار حراء رجع يرجف فؤاده حتى دخل على خديجة بنت خويلد فقال: زمِّلوني! زمِّلوني! فزمَّلوه حتى ذهب عنه الروع، ثم قال لخديجة: أي خديجة! مالي؟! وأخبرها الخبر، ثم قال لقد خشيتُ على نفسي.

قالت خديجة (تشجعه وتطمئنه): كلا! أبشر فوالله لا يُخزيك الله أبداً! إنك لتصلُ الرَّحِمَ، وتَصْدُقَ الحديثَ، وتحمِلُ الكُلَّ وتُكسِب المعدوم، وتقري الضيف، وتعين على نوائب الحقِّ))(١)، واتە: لەو کاتەی سروش (وحی) لە ئەشکەوتی (حەرا) بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ دابەزی یەکسەر پێغەمبەر بە دڵێکی لەرزیو بۆ لای خەدیجەی خێزانی گەڕایەوە ماڵەوەو، فەرموی: دام پۆشن دام پۆشن. جا دایانپۆشت تا ئەو ترسە لە دڵی دا نەما. پاشان بە خەدیجەی فەرمو: خەدیجە! دەزانی چیمە؟!

جا ڕوداوەکەی بۆ گێڕایەوە. پاشان فەرموی لە خۆم ترسام، کە شتێکم توش ببێ، وەك بڵێی جنۆکە دەستیان لێ وەشاندبێ.

خەدیجەش بۆ دڵنەوایی کردنی و هاندانی گوتی: نەخێر! مژدەت لێ بێ، بە خوا هەرگیز خوای گەورە تۆ ڕیسواو زەبون ناکات! چونکە تۆ سیلەی

---

١) رواه البخاري .

رەحم بەجێ دەهێنی و ڕاستگۆی لە قسەکردندا، بارگرانایی خەڵك هەڵدەگری، یارمەتی نەبو دەدەی و ڕیزی میوان دەگری و، پشتگیری حەق دەکەی[1].

((هاجت في نفوس المسلمين خيبةُ الأمل، وعَراهم وجومٌ ثقيل للأتفاق الذي تم بين الرسول والمشركين في صُلح حادثة الحديبية المذكورة في السيرة النبوية، فلما فرغ الرسول من قضية الكتاب قال لأصحابه: قوموا فانحروا ثم احلقوا- ليتحللوا من عمرتهم ويعودوا الى

١) خاتو خەدیجە ئەم هەڵوێستەی چەند گەورەو بەرزە، نەك هەر ئەم هەڵوێستە، بەڵکە گشت هەڵوێستەکانی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەرزو گەورە بوە، کەوا خۆڕاگرو قوربانیدەرو هاندەری پێغەمبەر بوە، بە وێنەی خاتو خەدیجە، پیاو سەرفرازی و گەورەیی بەدەست دێنێ، بە بۆنەی قسەکردنمان دەربارەی سەرۆك و سەرکردەکان، کاتێ کە لەلای زۆربەی ئافرەتەکانمان باس دەکرێن، بە داخەوە یەکسەر پارەی زۆرو ناوو شۆرەت و خۆشگوزەرانی و خزمەتکاری زۆرو زێڕو زیوو جل و بەرگی نوێ دێتە خەیاڵ، ئەم هەمو گەورەیی و کەش و فشە چیە، لە ڕاستیدا بەرزۆری بە دزی و ناپاکی بەدەست هێنراوە، گەورەیی ڕاستەقینە، خەباتکردن لەپێناو خوار، چاکسازی و نوێخوازی بە قوربانیدان و ئازایەتیەو، ڕوبەڕوبونەوەی کارەسات و ناخۆشیەکان و، خۆڕاگرتن لەبەردەم قسەو قسەلۆك و ئازاردانی نەفام و گەمژەو گێژانە، گەورەیی ڕاستەقینە خۆڕاگرتن لەبەردەم چەوسانەوەو ئەشکەنجەدانی ستەمکارو زاڵمانە، وتەیەك هەیە دەڵێ: لە دوای هەر پیاوێکی گەورە ژنێکی گەورە هەیە، بەڕاستی ئەم قسەیە ڕاستە، چونکە ژن هانی پیاو دەدات و کارە ئەستەم و کۆسپەکانی لەبەردەم سوك دەکات و، لە هەمو بارێکەوە هێمنی دەکاتەوە، لە بەرامبەریشدا دەکرێ و ڕاستە بڵێین هەر پیاوێکی فاشیل و سەرنەکەوتو، ژنێکی لە دواوەیە... ژنێکی نەفام و نەزان، یان ژنێکی خوێندەواری بەدڕەفتار، گەر لە کۆندا کارەسات و بەلا بە هۆی نەفامی ژن بوبێ، ئەوا ئێستا بە هۆی ژنی خوێندەوارەوەیە، کە بەلاڕێی زانستی وەرگرتوە، گەر لە سەردەمەکانی دواکەوتو ژن خورافات و شتی وەهم و خەیاڵ لە مێشکی چەسپی بو، ئەمڕۆ ژنی خوێندەوار لەخۆبایی و نەفامیی ئاوێتەی بوە، توشی دڵەڕاوکێ و مۆدەو مۆدەکاری جل و بەرگ و ڕق و قینە هەڵگرتن، دەرهەق بە هەمو داب و نەریتە ڕەسەنەکانی ئیسلامی بوە، وەك بڵێی دەیەوێ ببێتە پارچە کانزایەك لەناو ڕۆژئاوا بتوێتەوە.

المدينة- فلم يقم منهم رَجلٌ! حتى قالها ثلاث مرات!

فلما لم يقم منهم أحد، دخل على زوجه أم سلمة، فذكر لها ما لقي من الناس، فقالت أمّ سلمة! يا رسول الله أتحب ذلك، أخرج، ثم لا تكلِّم أحداً منهم كلمةً حتى تنحَر بُدنك -أي ضحيتك- وتدعوا حالقك فيحلقك، فخرج فلم يكلم أحداً منهم حتى فعل ذلك، فلما رأى المسلمون ما صنع النبّي، قاموا -عجلين- ينحرون هَدْيَهم ويحلقون))[١]، واته: لەو کاتەی ڕێکەوتنەکەی نێوان پێغەمبەرو موشریکەکان لە ڕێکەوتنی حودەیبیە ئەنجام درا، کە لە ژیاننامەی پێغەمبەر باس کراوە، مسوڵمانەکان دڵیان زۆر پێی گران بو و پێیان ناخۆش بو. کاتێك پێغەمبەر لە نوسینی ڕێکەوتنەکە تەواو بو، بە هاوەڵەکانی فەرمو: هەڵسن قوربانیەکانتان سەربڕن‌و سەرتان بتاشن -ئەمەش بۆ ئەوە بو تا عومرە نەکەن‌و بگەڕێنەوە بۆ مەدینە- بەڵام کەس بە قسەی پێغەمبەری نەکردو هەڵنەستان بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە! تا پێغەمبەر سێ جار ئەم قسەیەی دوبارە کردەوە.

جا کە کەس هەڵنەستا، پێغەمبەر چوە لای ئوم سلمەی خێزانی‌و ڕوداوەکەی بۆ گێڕایەوە، کە لەگەڵ خەڵکەکە چی ڕویداوە، ئوم سلمە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا پێت خۆشە ئەم کارە پەیڕەو بکرێ، تۆ بچۆ بۆ دەرەوەو قسە لەگەڵ کەس مەکە، تا قوربانی‌یەکەت سەر دەبڕی‌و سەرتاشەکەت بانگ بکە سەرت بتاشێ. پێغەمبەر ﷺ بە قسەی ئوم سەلەمەی کردو چی پێ‌گوترا ئەوەی ئەنجامدا. کە مسوڵمانەکان بینی‌یان وا پێغەمبەر قوربانی‌یەکەی خۆی سەر دەبڕێ‌و سەری دەتاشێ، ئەوانیش

---

١) رواه البخاري بنحوه.

بە پەلە هەستان قوربانی یەکەیان سەربڕی‌و سەریان تاشی..[١]

لە کتێبی (الأستیعاب)ی أبن عبدالبرّ (١٨٢٧/٤)دا هاتوە کە ئەوە کورتەکەیەتی‌و دەڵێ: لە جەنگی قادسیەدا خەنساو چوار کوڕەکەی ئامادەی جەنگەکە بون. شەوی دەستپێکردنی پێکدادان، هەر چوار کوڕەکەی کۆکردەوەو پێی گوتن[٢]: کوڕەکانم! ئێوە بە ملکەچی‌یەوە

---

١) ئەم فەرمودە ڕاست (صحیح)ە لە کوێ، کە پێغەمبەر بە ڕەئی خێزانەکەی کرد، لەگەڵ ئەو فەرمودە هەڵبەستراوانەی، کە هیچ راستی یەکی نیە، وەك (شاورهن و خالفوهن) واتە: پرس‌و ڕا بە ژنان بکەن، بەلاّم بە قسەیان مەکەن. ( ئەوە قسەی پێغەمبەر نیە).
هەروەها (طاعة المرأة ندامة) واتە: بە قسەکردن‌و بە فەرمان کردنی ژن پەشیمانی یە. هەروەها چەندەها فەرمودەی هەڵبەستراوی تر، کە پێغەمبەر نەیفەرموە. بەڵکو بە زمانی پێغەمبەر گوتراوە، کە دوژمنانی ئیسلام کردویانە وەسیلەیەك، تا ئافرەت هان بدەن دژی دینەکەی بوەستێ!

٢) ئەمەش نمونەیەکی تری ژیانی ئافرەتێکی صەحابی یە تێکۆشەرو موجاهیدەکانە باسی دەکەین، تا وەکو ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ ئافرەتی سەرکردەکانمان: ئەسمای کچی ئەبوبەکر یەکێکە لەو کەسانەی، کە لە سەرەتاوە مسوڵمان بو، باوکی لە میانەی کۆچکردنی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بە نهێنی بۆ مەدینە بۆ مەترسیترین کاری هەڵبژارد، ئەسماء ڕۆڵێکی گرنگی تێدا بینی، کەوا خواردن‌و ئاوی بۆ پێغەمبەرو هاوەڵەکەی دەبرد، لەکاتی خۆشاردنەوەیان لە ئەشکەوتەکەدا، نهێنی هەڵوێستی سەرکردەی قورەیشی یەکانی بۆ دەهێنان، کە بە نیازی کوشتنیان بە دوایاندا بون.
جارێك ئەو سەرکردانە، پاش دەرچونی باوکی لەگەڵ پێغەمبەر لە مەککە هاتن پرسیاریان دەربارەی باوکی لێ‌کرد، گوتی: نازانم! جا ئەبوجەهل زللەیەکی لێ‌دا، کە گوارەکەی لە گوێ کەوت، ئەسماء لەسەر ئەم ئازارە لە پێناوی خوادا ئارامی گرت...
بە ڕاستی مێژو هەڵوێستە ترسناکەکەی تۆمارکردوە، کە لە ژیانی دایکان نمونەی نیە، ئەویش ئەوەیە کاتێك عبداللە ی کوڕی، کە دەکاتە عبداللەی کوڕی زبێر هاتە لای، لە میانەی شۆڕشەکەی لە دژی ئەمەویەکان لە حجاز ئەوانەی کە حەجاج بە سوپایەکی گەورەوە ناردی بۆ جەنگ کردنی، جا چوە لای ئەسمای دایکی پاش ئەوەی لایەنگرەکانی دوای جەنگێکی تاڵ‌و درێژخایەن وازیان لێ‌هێنا بو ڕاوێژی بە دایکی کردو پێی گوت:

مسوڵمان بون بە ویستی خۆتان کۆچتان کردوە. ئێوە کوڕانی یەك پیاون. وەك کە کوڕانی یەك ئافرەتن، باوکتان ناپاکی نەکردوەو نە خاڵیشتان شتێکی وای کردوە، مایەی ریسوایی بێت. ناوبانگتان ناشیرین نەبوەو رەچەڵەکیشتان نەگۆڕاوە.

جا خەنسا ئایەتەکانی خوای بۆ خوێندنەوە، کە باسی بەڵێنی پاداشت دانەوە بۆ ئەو کەسانەی، کە خۆ راگرو ئارامگرن لە سەنگەری جەنگ دا،

---

ئەی دایەگیان! خەڵك ریسوایان کردم تەنانەت کوڕو ئەهلەکەشم، چەند کەسانێکی کەمم لەگەڵ ماوە، کە ئەوانیش توانای یەك کاتژمێر بەرگری یان هەیە، ئەوەی لە دنیادا هەیە گەر بمەوێ ئەمەویەکان دەمدەنێ تۆ رات چی‌یە؟

ئەسمای دایکی گوتی: بە خوا کوڕەکەم تۆ خۆت باشتر دەزانی، گەر دەزانی تۆ لەو بانگەوازەی کە بۆی دەکەیت لەسەر حەقی، ئەوا بەردەوام بە، هاوڕێکانیشت لەسەری کوژراون... گەر تۆش دنیا ویستی، ئەوا تۆ خراپترین بەندەی! خۆت بە هیلاك بردوە، ئەوانەش لەگەڵتن بە هیلاکت داون! گەر گوتت لەسەر حەق بوم، ئەمەیان نە کردەوەی شۆڕشگێڕانە وە نە ئەهلی دینە! لە دنیا چەندت ماوە بژی؟! کوشتن باشترە، بە خوا بە شمشێر لێت بدرێ لە حاڵەتی سەربەرزی‌و بە غیرەتی بە لامەوە باشترە لە لێدانی قامچی لە حاڵەتی زەبونیدا.

گوتی دەترسم کە منیان کوشت لەشم بشێوێنن‌و ئەتکم بکەن!

دایکی گوتی: کوڕەکەم! مەڕ کە سەربڕا بە کەوڵ کردنی زیانی پێ ناگات!

جا عبداللە چو بۆ جەنگ‌و جەنگی کرد، تا کوژرا، و پاش چەند رۆژێك دایکیشی مرد. دایك دەبێت ئاوا بێت!

ئەمە دەڵێم لە کاتێکدا کە دەزانم عبداللە‌ی کوڕی زوبێر رەحمەتی خوای لێبێ بۆ جەنگ کردنی لە دژی بەنی ئومەیە ئیجتیهادی کردبو، وە پاداشتی موجتەهیدی بۆ هەیە. بەڵام ئایا لەمەدا پێکاویەتی؟ گومان نابەم: واللە أعلم.

نوسەر دەڵێ بڕوانە تەحقیقەکەم لەسەر کتێبی (العواصم من القواصم) کە کتێبێکە شایستەی ئەوەیە لە هەمو ماڵێکی مسوڵمان هەبێت، کە بەدرۆ خەرەوەی ئەو درۆیانەیە، کە دەربارەی هاوەڵە بەرێزەکان گوتراوە!

پیێی گوتن: خوا پشتیوان بێ گەر بەیانی داهاتو ساغو سەلامەت بون، یەکسەر برۆن بۆ کوشتنی دوژمنەکەتان بە چاوێکی کراوەوە. کاتێك توشی شەڕ بون خۆ گورجو گۆڵ بکەنو، تەیەموم بکەن سەرکەوتو دەبنو دەگەنە بەهەشت، لە لانەی هەتا هەتایی ڕێزتان لێ دەگیرێ.

کاتێ بەیانیان بەسەر داهات، چونە شوێنی خۆیانەوەو دەستیان کرد بە جەنگ کردن، تا هەر چواریان شەهید کران. کاتێك هەواڵی شەهید بونیان بە خەنسای دایکیان درا، خەنسا گوتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی، کە بە هۆی شەهید بونیانەوە منی بەرزو گەورە کرد، داوا لە خوای خۆم دەکەم لەگەڵ ئەوان دا، لە بەهەشت کۆم بکاتەوە.

## سەرپەرشتیار (قِوامة)ی پیاو بەسەر ئافرەت

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ﴾ (النساء- ٣٤)، واتە: پیاوان بەسەر ژناندا دەسەڵاتیان هەیەو سەرپەرشتیارن بە سەریاندا، کە خوا هێندێکی لە هێندێ هێژاتر بەدی هێناوە، دیارە پیاوان ئەرکی بەرێ چونی ماڵیان لەسەر شانە[1].

---

١) وا بەباش زانرا هەندێ بەوردی باسی سەرپەرشتیاریەتی پیاو بەسەر ئافرەت بکرێ، چونکە شارەزابونو پێزانینی سەرپەرشتیاری دان بە پیاو، زۆربەی زۆری گیروگرفتی نێوان پیاوو ژن چارەسەر دەکات، هەندێ پیاو ئەو سەرپەرشتیاری یە (القوامة) بەوە تێگەیشتوە، کە دەبێ پیاو سالاریو کوێخاییو دەسەڵات نواندنو بەرای خۆ کردنو چاو سورکردنەوەو خۆ بە گەورەزانی بەسەر ژنەکەیدا بسەپێنێو، بەجۆرە تێگەیشتنە هەڵەو خراپە رەفتار دەکەن.
بە هەمان شێوە هەندێك ژنیش بێئاگاو ناشارەزایانە، سەبارەت بە مانی سەرپەرشتیاریەتی پیاو هیچ حسابێك بۆ مێردەکەی ناکات، ئەوەش دەبێتە هۆی نانەوەی ئاژاوەو ناکۆکیو دژایەتیو لێك جیابونەوە...
گەر هەر یەکێك لە پیاو و ژن، سنورو مافو ئەرکەکانی یەکتری بزانن ئەوکاتە بە بەختیاریو ئاسودەییو بەبێ ئاژاوەو ناکۆکی، ژیان دەبەنە سەر.
زانایەکی کۆمەڵناسی گوتویەتی:
ژیانی ژنو مێردایەتی بە ئۆتۆمبیلێك دەچێ کە دوو کەس تێیدا سەرنشینو یەك ئامانجیان هەیە: هەر دەبێ یەکێکیان سوکانی ئۆتۆمبیلەکە بگرێتە دەست، خۆ ناکرێ هەردوکیان پێکەوە لێی بخورن.
جا گەر پیاو ئەم ئەرکەی گرتە ئەستۆ -کە ئەمەش باری سروشتیە- ژن دەتوانێ بە رۆڵی سروشتی خۆی هەڵبستێ، لە بلاوکردنەوەی متمانە بەخۆبونی مێردەکەیو هاندانی کەمکردنەوەی بارگرانی ژیان، بەلاّم گەر ژن ئەرکی سەرپەرشتیاریتی گرتە ئەستۆ، ئەوا پیاو هەڵوێستی رەخنەگرییو سەیرکردن وەردەگرێ، جا ئەو کاتە هێندەی پێناچێ لەبەر

بارگرانی ژیان، کە بە تەنها خۆی پێی هەڵدەستێ بەبێ هاندان، مێشکی توشی داروخان دەبێ‌و دادەڕمێ.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللّٰهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ﴾(النساء- ٣٤)، واتە: پیاوان سەرپەرشتیار ترن بەسەر ئافرەتان بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری خێزان، بەوەی کە خوای گەورە بە چەند شتێك بەسەر یەکتری دا فەزڵ‌و چاکەی پێ بەخشیون، کە پیاو توانای ئامادەیی جێبەجێ‌کردنی کاروباری قورس‌و گرنگیان هەیە. هەروەها پیاو سەرپەرشتیارە بەسەر ئافرەت، چونکە نەفەقەو پارە پەیداکردن‌و منداڵ بەخێوکردن لەسەر پیاوە لەو ماڵەی کە هەیەتی.

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بۆ یاسایەك لە یاسا نەگۆڕەکانی خوای گەورە دەکات، کە سەرپەرشتیاری پیاوە بەسەر ژن. خوای پەخشندە کە بەمجۆرە باسی پیاودەکات لەبەر دو هۆی ڕون‌و دیار:

**یەکەمیان:** ئەوەیە خوای باڵا سروشتی پیاوی وا دروست کردوە، کە جیاوازی لەگەڵ سروشتی ئافرەت هەبێ. ئافرەت فەزڵ‌و چاکەو گەورەیی هەیە بەرامبەر بە پیاو، لە بەڕێوەبردنی کاروباری ناو ماڵەوەو پەروەردەکردنی منداڵان‌و هەڵسان بەکارە پێویستی یەکانیان، کە لەسەر ئەو سۆزو نەرم‌و نیانە دروست بوە. جەستەی ئافرەت بە شێوەیەکی لاواز دروست بوە لە ڕوی ئەندامەکانی جەستەیدا، وەك لاوازی کۆئەندامی دەمارەکان، کە بە هۆی ئازارەکانی سك پڕی‌و منداڵ بونەوە (هەست کردنی بە شت) کەم دەبێتەوەو وای لێ‌دەکات لە هەمان کاتدا لەوانەیە دوچاری نەخۆشی ببێ‌و زو هەڵچێ‌و تورە ببێ، کە کار دەکاتە سەر سەلامەتی تەقدیرو دروستی تێگەیشتن.

ئافرەت توانای لە پیاو کەمترە لەسەر ڕوبەڕوبونەوەی نەبونی‌و نەداری‌و خۆگرتن لەبەردەم کۆسپ‌و تەگەرەکانی ژیان. بەڵام پیاو فەزڵ‌و چاکەی بەسەر ئافرەتەوە هەیە، کە لە پێشەوە باسکرا.

پیاو هێزو جەستەی لەشی پتەوترو بیرو فیکری تیژترەو، تەقدیرکردنی شتی لە لا باشترە، لەبەر ئەوە پیاو دادەنرێ بۆ هەوڵ‌و تێکۆشان‌و چارەسەرکردنی جیاوازی‌و دژایەتی کردن‌و، هەوڵ دان بۆ نان پەیداکردن بۆ گوزەرانی خێزانی. هەروەها توانای پاراستنی قەوارەی خێزان‌و دورخستنەوەیان لە مەترسیدا هەیە.

**هۆی دوەم:** کاتێك ئەم سەرپەرشتیاری یە دراوەتە پیاو، کە دەبێ پیاو نان پەیدا بکات‌و خێزانەکەی بەخێو بکات، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ لە بوارەکانی دین‌و دنیادا پیاو

باشترە لە ژن. بەڵکو خوای گەورە هەردوکیانی لە کردەوەی چاك دا وەك یەك دانـاون، وەك دەفەرموێ: ﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ﴾ (آل عمران- ١٩٥)، واتە: پەروەردگار وەڵامی دانەوە، کە من کردەوەی هیچ کامێکتان لە نێر یان لە مێ ون ناکەم، هەندێکتان لە هەندێك. هەروەها خوای باڵا دەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَاللهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (البقرة- ٢٢٨)، واتە: ئافرەت چیان لەسەرە، کە مافی پیـاو بـەجێ بهێنن، بە هەمان شێوە ئەوانیش مافیان هەیەو بەشیان هەیە بەسەر پیاو لـە چـاکەدا. پیاویش پلەیەکی بەسەر ئافرەتانەوە هەیە لەبەر ئەوەی زیاتر ماندوترو هـەوڵ و کۆشـش ترەو، نان پەیدا دەکات.

ئەم سەرپەرشتیاری (قوامة)یە قاعیدەیەکی رێکخستنە، کە پێویستی بـە ئەنـدازیاری کۆمەڵگەو جێگیری بارودۆخە لە ژیانی دنیادا، ژیانیش بێ زیان نابێ، گەر پێیەوە پابەند نەبێت. کە بە قیوامەی سەردارەکان و ئەمیرەکان دەچێت.

(لە کتێبی حصوننا مهددة من داخلها، نوسەرەکەی دکتۆر محمد محمـد حـسێن لاپـەڕە ١٣٩-١٤٢ بەکورتی گواستراوەتەوە).

## (قـِوامة) یەکـەم داواکـردنی یەکسـانی یە

بۆچی ئیسلام سەرپەرشتیاری خێزان دەداتـە پیـاو، لـەو کاتـەی قورئـان دەفـەرموێ: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ﴾، وەڵامەکەی ئەوەیە: ئیسلام لەم بابەتـەدا، شـتێکی نـوێی فـەرز نـەکردوەو شتێکی هۆگری نەگۆڕیوە.

سروشتی ئافرەت هەر لە سەرەتای مێژوە ئەوە بوە، کە لە تەنیشت پیاو نەبێ، هەسـت بە هێمنی و ئاسایش ناکات، هەردەم پاراستنی خۆی و پاراستنی منداڵەکان دەخاتە سـەر ئەستۆی پیاو، هەوڵی تێکۆشان و کۆشش و هەڵگرتنی بارگرانایی بۆ پیـاو بـەجێ دێڵـێ، هەتاکو ئێستاش ئافرەت هەر ئەمەی لە پیاو دەوێـت، چـونکە سروشـتی شـتەکان بـەم شێوەیە... پیاو بە جەستە بەهێزو ماسولکە بەهێزیی دروسـت کـراوە، تـاوەکو زاڵ بـێ بەسەر هەمو کارە زەحمەت و ناخۆشەکان، ئافرەتیش بـە جەسـتە لاوازو هەسـت ناسـك و

خۆنەگری دروست کراوە. کەواتە ئیسلام گوناهی چیە لەوکاتەی دان بە واقیـع دابنـێ‌و، حەقیقەت بێنێتە کایەوەو وا دابنێت، کە پیاوان سەرپەرشتیار ترن بەسەر ئافرەتانەوە؟

ئایا لەم سەردەمەی ئێستادا، ئافرەت دەیەوێ ئەو ببێتە سەرپەرشتیار..!

سەرپەرشتیاری (القوامة) مانای بەرپرسی یەتی یە، ماناکەی زاڵ بونە بەسەر هەڵگرتنی زەحمەت‌و هەستان بـە ئـەرکی بـارگرانی، بەڕاسـتی ئەمـە تەکلیفـە نـەك بـەرزدانان‌و گەورایەتی.

سەماکەرانی ئافرەت دەڵێن سەرپەرشتیاری پیاو بەسەر ئافرەت کاتێك بو، کە پیاو لـە بەرهەم هێناندا دەسەڵاتدار بو، کە بە کەسابەتەکەیەوە سـتەمی دەکـرد، بـەڵام ئێـستا ئافرەت خۆی شت بەدەست دێنێ‌و وەك پیاو بەرهەم دێنێ، هیچ مانایەکی نـی‌یـە پیـاو سەرپەرشتیاری بێت.

بەڵام واقیعی جیهانی رۆژئاوا ئەم گومانەی بەدرۆخستەوە، ئافرەت لەوێ کـاری کـردو شتی بەرهەم هێناو سەربەخۆ بـو، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا پێویـستی بـە زاتـی پیـاو و سەرپەرشتیاری‌یەتەکـەی هەیـە، کـار دەکـات لەسـەر ئـەوەی، کـە بێتـەوە ژێـر ئـەم سەرپەرشتیاری یە، لەژێر سێبەری پیاو نەبێت هەست بـە دڵنیـایی‌و ئاسـایش ناکـات.. بەراستی خوای گەورە راستی فەرموو درۆزنان درۆیان کرد.

(الأسلام و المشكلة الجنسية ١٩٦-١٩٨)

# مەترسی کاتەکانی دەست بەتاڵی[1]

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِذا فَرَغْتَ فَانصَبْ﴾ (الأنشراح- ٧)، واتە: کە لە کارێك بویتەوە خۆت ماندو بکە بە خەریك بون بە کارێکی ترەوە.

---

١) کاتی بەتاڵ چەند ترسناکە، شاعیریش گوتویەتی:

إن الشباب و الفراغ و الجد          مفسدة للمرء أيُّ مفسده!

زۆربەی سەرەتای داڕوخانی خێزان بە بەسەربردنی کاتە بەتاڵەکانەوە دروست دەبێ، ئەویش بە روانینی فلیمە ڕوتو تاوانکاریەکان، کە هەر یەکێك لە ژنو مێرد بەرەو فجور دەباتو، منداڵەکان فێری تاوانکاری دەکات!

خێزان ئەو کاتانە بە شەوانە (سەهرات)ی تێکەڵاوی، کە پێی دەڵێن: (خێزانی) دەبەنە سەر، کە بەڕاستی پاچی ڕوخێنەری کیانی خێزانە، چەند ڕوداوی دڵتەزێن لە ئاکامی ئەو سەهراتانە ڕو دەدات، تەنانەت بۆتە مایەی ژەهراوی کردنی مێرد، بۆ ئەوەی لەگەڵ عاشقەکەی ڕاببوێرێ، واتە: هاوڕێی خێزان، جا ئایا پەند وەردەگیرێ؟!!

یان کات بەسەر بردن لە چایخانەکان، لەنێو زریکەی گەرسۆنو ژاوەژاوی زاری طاوڵەو دوکەڵی ئەرگیلەو جگەرەی زیانبەخش بە تەندروستی ئەو کەسەش، کە نایکێشێ، بەڵام لە ڕێگەی هەناسەدانو مژینی پێستەوە زیانی پێ دەگات. یان کات بەسەربردن لەو پێشوازی یە بێماناو پوچانەی، کە تەنها قسەی بێ سودو باسی جلو بەرگی ئافرەتە تێکدەرەکانی بێگانەی تێدایە.

لەنێو چایخانەو ئەو جۆرە مەجلیسە بێ هودانە، منداڵان پەرتەوازە دەبنو لە جادەو سینەماکاندا فێری تاوانکاریو خراپە دەبن. (منکرات الأفراح)

ئافرەتی هۆشیار، ئەو ئافرەتە زیرەکەیە، کە بە ژیری تەواوو گیان بەرزی خۆی، ماڵەکەی دەکاتە بەهەشت، کە مێردەکەیو منداڵەکانی ڕادەکێشێو وایان لێ دەکات جار ناجار بچن بۆ ڕەزو باخەکانی دەوروبەریان، بۆ هەڵمژینی هەوای پاكو ئەنجامدانی هەندێك وەرزش. هەروەها لە ماڵەکەیدا پەرتوکخانەیەکی جوانو بەسود دروست دەکات، بۆ ئەوەی کاتە بەتاڵەکانی خێزان بە شتی بەسودو چاك ببەنە سەر.

(کتاب نحو أسرة إسلامية)ی (نوسەر)

هەروا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا﴾(الفرقان- ٧٢)، واتە: هەر کە بەلای کاری نالەباردا رابوردن، مەردانە خۆی لێ لادەدەن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((دونكم يا بني أرفدة لتعلم اليهود أن في ديننا فسحة))[١]، واتە: ئەی بەنی ئەرفەدە! وەریگرن با جولەکە بزانن دینەکەمان کراوەیی تێدایە[٢].

هەروا فەرمویەتی: ((كل شيءٍ ليس من ذكر الله فهو لغو ولعب إلا أن يكون أربعة: مشي الرجل بين الغرضين وتأديبه فرسه، وملاعبته أهله، وتعلم الرجل السباحة))[٣]، واتە: جگە لە چوار شت، گەر یادی خوای لەگەڵ نەبێ، ئەوا پوچو بێماناو بێهودەیە: یەکێك لە نێوان دو

---

١) رواه البخاري ومسلم وغيرهما.

٢) لەو کاتەی حەبەشیەکان لە رۆژی جەژندا لەناو مزگەوت بەنێزەکانیان یاریان دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمون: ((دونكم يا بني أرفدة لتعلم اليهود أن في ديننا فسحة)).

ئەم فەرمودەیە لە کوێ لە بەرامبەر ئەو فەرمودە (ضعيف)و (موضوع)انەی، کە چونی منداڵ بۆ مزگەوت حەرام دەکات، وەك کە قسەی مویاحی حەرام کردوە، تەنانەت نەفامو نەزانان، مزگەوت بە گرتوخانە دێتە پێش چاویان، بەڵکو ئەمە لە گرتوخانەش ناخۆشترە، چونکە بەندکراو لە گرتوخانەدا ئازادی قسەی پێ دراوە.

بەراستی پێویستە مزگەوتەکانمان لەژێر تیشکی فەرمودەی یاریکردنی حەبەشی یەکان لە مزگەوتدا هێلێکی نوێ بگرێتەبەر!!

گەر شتێکم بەدەست بایە، لەسەر تیشکی دەقی ئەم فەرمودەیە، لە نهۆمی دوەمی مزگەوتدا مەلەوانگەو یانەی تیرهاوێژیو وەرزشە جۆراو جۆرەکانم دروست دەکرد، سەرەرای نوێژکردن تێیدا، مزگەوتم دەکردە ناوەندێکی رۆشنبیریو کۆمەڵایەتیو وەرزشی، کە لە چەند نهۆمێك پێك بێت، نەك یەك نهۆم، دیارە کە ئەمە نەکراوە زیانێکی گەورەیەو نیشانەی کەم هۆشیاری یە!!

٣) رواه النسائي (حديث صحيح).

نیشان بێ‌و بڕوا، یه‌کێك مه‌شق بـه مـاینه‌کـه‌ی بکـات، پیـاو کـه یـاری‌و دەستبازی له‌گه‌ڵ خێزانی ده‌کات، پیاو خۆی فێری مه‌له‌وانی بکات.

هه‌روا ده‌فه‌رموێ: ((لا تزول قدما عبد يوم القيامـة حتـى يـسأل عـن أربع: عن عمره فيما أفناه، وعن جسمه فيما أبـلاه، وعـن علمـه مـاذا عمل به، وعن ماله أيـن أكتـسبه، وكيـف أنفقـه!))[1]، واتـه: لـه ڕۆژی قیامه‌ت هه‌ردو قاچی عه‌بد تێناپه‌ڕێ، تاوه‌کو چوار پرسیاری لـێ نـه‌کرێ: ده‌رباره‌ی ئه‌و ته‌مه‌نه‌ی که به‌سـه‌ری بـرد، ده‌ربـاره‌ی جه‌سـته‌ی، کـه بۆچـی به‌کاری هێناوه، ده‌رباره‌ی زانیاری‌یه‌کـه‌ی، کـه چـۆن کـاری پـێ کـردوه، ده‌رباره‌ی ماڵ‌و سامانه‌که‌ی له کـوێ‌ی به‌ده‌سـت کـه‌وتوه، چـۆنی سـه‌رف کردوه.

١) حديث صحيح لشواهد.

## پێغەمبەر وەك هاوسەرێكی توند

خوای گەورە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلاً ۞ وَإِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ اللهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ فَإِنَّ اللهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنْكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا﴾(الأحزاب: ٢٨-٢٩)، واتە: ئەی پێغەمبەر! ژنەكانی خۆت بدوێنە: ئەگەر ژین‌و خشڵی دنیاتان دەوێ، دەسا وەرن تا هەقی خۆتان بدەمێ‌و بەبێ گازندەو بە خۆشی ڕاهیتان كەم. ئەگەریش خواو پێغەمبەرو ماڵی دواڕۆژتان گەرەكە، خودا بۆ كار چاكەكانتان پاداشی گەورەی داناوە[1].

---

١) قەیرانێك لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ

ئەم ئایەتە دەربارەی خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ دابەزی، كاتێ داوای زیادكردنی بژێوی (نفقە)یان لێكرد، ئەویش نەیدەتوانی بۆیان زیاد بكات، لەبەرئەوە ماوەی مانگێكی تەواو بە توندی خۆی لێ دابڕاندن، ئنجا خوای گەورە ئەو ئایەتانەی بۆ دابەزاند، كە خێزانەكانی پێغەمبەری تێدا سەرپشك كردن، ئایا لەگەڵ پێغەمبەر بەوجۆرە ژیانە دەگوزەرێنن‌و ئارام دەگرن، هەتا خوا دەرو دەكاتەوە، یان دەچنەوە لای كەس‌وكاریان..
خێزانەكانی پێغەمبەریش خواو پێغەمبەرو ڕۆژی دواییان هەڵبژارد، ژیانیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بردە سەر، بۆ ئەوەی ڕۆڵی گرنگیان لە دابینكردنی بەختەوەریی‌و دڵنیایی بۆ پێغەمبەر بەجێ بێنن‌و، هاوكاری بن لە گەیاندنی ئیسلام بە خەڵكی. ڕوداوەكەش بەم شێوەیە بو:
موسلیم لە كتێبی (صحیح)ی خۆیدا (١١٠٤/٢) گێڕاویەتیەوە، جابری كوڕی عبداللە گوتویەتی: لە بەردەمی ماڵی پێغەمبەر ﷺ، خەڵك دانیشتبون، ڕێگە بە هیچیان نەدرابو بچنە ژورەوە، ئەبوبەكر هات‌و مۆڵەتی خواست بچێتە خزمەت پێغەمبەری

خواﷺ، جا مۆڵەتی پێدراو چوە ژورەوە، پاشان عومەر هات‌و ئەویش داوای مۆڵەتی چونە ژورەوەی کرد، مۆڵەت بەویش درا، جا بینی پێغەمبەرﷺ دانیشتوە و خێزانەکانی بە کش‌و مات‌و بێدەنگی بە دەوریەوەن، عومەر گوتی: ئێستا قسەیەك دەڵێم تا پێغەمبەر پێ‌بکەنێ! جا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! گەر کچی زەید -ژنی عومەر- داوای بژێویم لێ بکات لە ملی دەدەم.. پێغەمبەریش پێکەنی‌و ددانەکانی بەدەرکەت، فەرموی: ((ئەوە دەیانبینی داوای بژێویم لێ دەکەن)).

ئنجا ئەبوبەکر هەستا ملی عائیشەی گرت‌و، عومەریش هەستا ملی حەفصەی گرت، هەردوکیان دەیانگوت: پێغەمبەری خوا کە نیەتی، ئێوەش داوای بژێوی لێ دەکەن؟! پاشان پێغەمبەر ماوەی مانگێك، یان بیست‌و نۆ رۆژ خۆی لێیان کەنارگیر کرد. ئنجا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلاً ۞وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا﴾(الاحزاب- ٢٨،٢٩).

## سەرنجێك لە سادەیی ژیانی پێغەمبەر ﷺ

ئیبن مەسعود دەڵێ: ((دخلت على رسول الله ﷺ وقد نام على حصير، وقد أثر في جنبه فقلت: يارسول الله لو اتخذنا لك وطاءً، تجعله بينك وبين الحصير، يقيك منه! فقال: ما لي وللدنيا! ما أنا والدنيا إلا كراكب استظل تحت شجرة ثم راح وتركها))[١]، واتە: چومە خزمەت پێغەمبەری خوا، بینیم لەسەر حەسیرێك خەوتوە، كە شوێنەواری حەسیرەكە بە لەشی پێغەمبەرەوە دیار بو. ئیبن مەسعود دەڵێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، با شتێك دابنێین لە نێوان حەسیرو خۆتدا، تا لە رەقایی حەسیرەكە بتپارێزێ. پێغەمبەر فەرموی: چ كارم بە دنیایە! منو دنیا وەك رێبوارێك وایە، لە كاتی ماندوبون خۆی دەخاتە ژێر سێبەری دارێك، پاشان دەرواتو بەجێی دەهێڵێ.

ئەبو ئومامەی ئەنصاری گوتویەتی: ((ذكروا عند النبي ﷺ الدنيا فقال: ألا تسمعون؟ ألا تسمعون! إن البذاذة من الإيمان، إن البَذاذة من الإيمان!))[٢]، واتە: لە لای پێغەمبەر باسی دنیا كرا ئەویش فەرموی: ئایا گوێتان لێ نی یە؟! ئایا گوێتان لێ نی یە! خۆ بەكەم گرتن لە جلو بەرگو وازهێنان لە رازاوەیی دنیا لە باوەڕەوەیە، خۆ بەكەم گرتن لە جلو بەرگو وازهێنان لە رازاوەیی دنیا لە باوەڕەوەیە.

ئیبن عەبباس گوتویەتی: ((دخل رسول الله ﷺ يوم فتح مكة على أم

١) رواه الترمذي و إبن ماجة والحاكم وأحمد في المسند وغيرهم بسند صحيح.

٢) رواه أحمد في المسند والنسائي حديث صحيح.

هانيء وكان جائعاً فقال لها: أعندك طعام آكله؟ فقالت إن عندي لكسراً يابسة، وإني لأستحي أن أقدمها إليك! فقال: هلميها فكسرها في ماء، وجاءته بملح، فقال: ما من إدام؟ فقالت: ما عندي إلا شيءٌ من خل! فقال: هلمي. فلما جاءت به صبه على طعامه. فأكل منه، ثم حمد الله وأثنى عليه، ثم قال: نِعْمَ الإدام الخل يا أم هانيء، لا يُقْفِر بيتٌ فيه خلٌّ))، واتە: لە رۆژی رزگارکردنی شاری مەککەدا پێغەمبەری خوا برسی بو، چوە لای (ئوم هانیٔ)و پێی فەرمو: هیچ خواردنێکت لەلا هەیە تا بیخۆم؟ ئوم هانیٔ گوتی: پارچە نانێکی ڕەقمان هەیە، بەلاّم لە ڕوم نایێ بۆت بێنم بیخۆی. فەرموی: بیهێنە، جا نانەکەی لەناو ئاودا ورد کردو ئوم هانیٔ خوێی بۆ هێنا، فەرموی: پێخۆرت لەلا نیە؟ ئەویش گوتی: هیچی ترم نیە، تەنها کەمێك سرکە نەبێ. فەرموی: بیهێنە، کە بۆی هێنا سرکەکەی بەسەر نانەکەدا کردو لێی خوارد، پاشان سوپاس و ستایشی خوای گەورەی لەسەر ئەم خواردنە کرد. پاشان فەرموی: ئوم هانیٔ! باشترین پێخۆر لەگەڵ خواردن سرکەیە، هەر ماڵێك سرکەی تێدا بێ ئەو ماڵە بێ خواردن نیە.

ئا ئەمە بو خواردنی پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژێکی ئاوا، کە رۆژی رزگارکردنی شاری مەککە بو، کە موشریکەکان لەم رزگارکردنەدا شکان و بەزینیان بەسەردا هات.

لە ڕاستیدا هیچ شتێکیش نەبو رێگری پێغەمبەر بکات بۆ سەربڕینی سەدەها، بەڵکو هەزارەها مەڕ، کە دەعوەتێکی گەورەی پێ ساز بدات.

کەچی ئێستا سەرۆکەکان بۆ سادەترین بۆنە (مناسبة) بە پارەو سامانی میللەت، دەعوەت و دەعوەتکاری ئەنجام دەدەن، کەچی میللەتەکە لە برسانا هاوار هاواریەتی!

## پێویستە ژن لەسەر هەژاریی مێردەکەی ئارام بگرێ

خاتو عائیشە بە عوروەی گوت: ((یا أبن أخي! إنا كنا ننظر الى الهلال ثم الهلال، ثلاثة أهلة في شهرين، وما أوقدت في أبيات رسول الله نار! فقلت: يا خالة ما كان عيشكم؟! قالت: الأسودان التمر والماء! أنه كان لرسول الله ﷺ جيران من الأنصار لهم منائح وكانوا يمنحون رسول الله ﷺ من ألبانها فيسقينا))[1]، واتە: کورە براکەم! لە ماوەی سێ مانگ لە ماڵەکانی پێغەمبەری خوا، ئاگر بۆ چێشت لێنەکراوەتەوە! عوروە گوتی: پورێ خواردنتان چی بو؟! ئەویش گوتی: خورماو ئاو! بەڵام ئەوە نەبێ کە پێغەمبەر ﷺ دراوسێیەکی ئەنصاری هەبو مەڕیان هەبو دەیاندا بۆ خواستن (الأستعارة)، تا سود لە شیردکەی وەرگرن. جا لە شیری مەڕەکان بەشی پێغەمبەریان ئەدا، پێغەمبەریش شیری بە ئێمە دەدا.

خاتو عائیشە گوتویەتی: ((ما شبع آل محمد من خبز الشعير يومين متتابعين حتى قبض))، واتە: ماڵو خێزانی پێغەمبەر، تا ئەو کاتەش، کە پێغەمبەر گیانی سپارد، دو ڕۆژ بە دوای یەك لە نانی جۆ تێر نەبون.

((سئل سهل بن سعد: هل أكل النبـي النقي؟ فقال: ما رأى رسول الله النقي منذ ابتعثه الله حتى قبضه))[2]، واتە: پرسیار لە سەهلی کوڕی سەعد کرا: ئایا پێغەمبەر نانێکی وای خواردوە، کە ئاردەکەی شتێکی

---

١) رواه البخاري.

٢) رواه البخاري.

تری تیا نـەبێ، واتـە وەك گـەنمی ڕوت بـێ. گـوتی: لـەو کاتـەی بـو بـە پێغەمبەرو، تا گیان سپاردنی، نانێکی ئاوای نەبینی.

ئەنەسی کوڕی مالك، خزمەتکاری پێغەمبـەر ﷺ گوتویـەتی: ((ما أعلم النبّي ﷺ رأى رغيفاً مرققاً حتى لحق بـالله! ولا رأى شـاة سميطـاً بعينه قط))[1]، واتە: نەمزانیوەو نەمبینیوە، پێغەمبەر ﷺ نانی نـەرمی بینیبێ‌و خواردبێتی، تا ئەوکاتـەی بـە خـوای خـۆی گەیـشت، هـەروەها هەرگیز مەڕی سورکراوەی نەبینیوەو نەخواردوە.

پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمو: ((اللّهم إجعل رزق آل محمد كفـافاً، وقيل قوتاً))[2]، واتە: خوایە ڕزق‌و ڕۆزی ماڵی خێزانەکانی محمد هـەر ئەوەنـدە بێ، نە زیاد لە پێویستی بێ‌و نە کەمیش، هەروەها گـوتراوە فەرمویـەتی: خواردنی ماڵی محمد نە زیادو نەکەم بێ.

فاطیمە چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، تا سکاڵای ئەوەی لـەلا بکـات، کە بەهۆی دەستاڕەوە دەستی تلۆقاوە، پێشی گەیشتوە، کە پێغەمبەر ﷺ کۆیلەی بۆ هاتوە، تا کۆیلەیەکی بداتێ ئیشی بۆ بکات، بـەڵام پێغەمبـەر لەوێ نەبو، ئەمەی لەلای خاتوعائیـشە باسـکرد، خـاتو عائیـشەش ئـەم هەواڵەی بە پێغەمبەر ڕاگەیاند.. ئیمام عـەلی رضي الله عنه دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ هاتە ماڵمان، ئێمەش ڕاکشابوین، جـا کـە هـات هەسـتاین، پێغەمبـەر فەرموی: هەڵمەستن هەر لە شوێنی خۆتان بن، ئینجا لەنێوان من‌و فاطیمە دانیشت، هەتا ساردایی پێیەکانی لەسەر سکم هەست پـێ‌کرد، پێغەمبـەر

---

١) رواه البخاري

٢) رواه البخاري ومسلم.

فەرموی: شتێکتان لەوە چاکتر پێ بڵێم؟ ئەگەر چونە سەر جێگەی خەوتنو ڕاکشان (٣٣) جار بڵێن سبحان الله، (٣٣) جار بڵێن الحمدلله، (٣٣) جار بڵێن الله اکبر، ئا ئەم ویردانە بۆ ئێوە لە خزمەتکار باشترە!!

لێرەدا پرسیارێك لەوانەیە بکرێو بڵێن: باشە بۆچی ژیان بەم شێوە ڕەقو هەژاری‌یە ببرێتە سەر؟ وەڵامەکەی ئەوەیە: گەر ئوممەتێك بیەوێ بە نەمریو سەربەرزی بژی، بیەوێ لاپەڕەکانی لە مێژودا پڕشنگدارو رونـاك بێت، دەبێ سەرکردەکانی ژیانێکی وایـان نـەبێ، کـە خـەڵك برسـی بـنو خۆیـشیان تێـر. ئەمـە فێـری سـەرکردەکان و لێپرسـراوەکان دەکـات کـە بەرامبەر ماڵو سامانی گەل، خۆیان پاك رابگرن، کە وا ڕاهاتون بە ناحەق ئەو ماڵو سامانەی گەل بخۆن. چۆن دەبێ پێغەمبەرو خێزانەکانی لەوپەڕی خۆشیو تێری دابن، هەژارانی مسوڵمانانیش بە برسـی‌یـەتی ژیـان ببەنـە سەر. خۆ پێغەمبەر دەیتوانی بە هۆی ماڵی مسوڵمانانەوە لـە غەنیمەتـدا خۆی دەوڵەمەند بکات، بەڵام ئەمە سیفەتی پێغەمبەر نەبو.

دەبا کوێر بن ئـەو سـەرکردانەی خۆشـیو بـەختیاری ژیانیـان، لەسـەر حیسابی نەبونیو نەداریو برسی‌یەتیو خراپـی گـوزەرانی گەلەکـەیان بـە دەست دێنن.

هەروەها ئەمجۆرە ژیانەی پێغەمبەر، مسوڵمانانی فێـری ژیـانی سـادەو ساکار کرد، تا دور بن لە زیادەڕۆییو دەستبڵاوی.

پێغەمبـەر ﷺ زۆرجـار، کـە دەچـوە ماڵـەوە داوای خـواردنی لـە خێزانەکانی دەکرد، گـەر خواردنیـان نەبوایـە پێغەمبـەر دەیفـەرمو: مـن بەڕۆژوم! ڕۆژوی (تطوع). ڕۆژوی فەرز دەبێ لە پێش فـەجردا نیـەتی دڵـی لەگەڵ دابێ.

عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لێ بێ، چوەماڵەوە داوای لە خێزانەکەی کرد خواردنی بۆ بێنێ، خێزانەکەی گوتی: هیچ شتێکمان نی یە تەنها چەند پارچە نانێکی ڕەق نەبێ. جا عومەر کەمێك ئاوو سرکەی بەسەر پارچە نانەکاندا کردو خواردی تا تێر بو، پاشان گوتی: ((لا بارك الله بمن أدخله جوفه الى النار))، واتە: بەرەکەتی خوا لەو کەسە نەبێ، کە بە هۆی گەدەیەوە دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە. واتە: بە پەیداکردنی پارەی حەرام گەدەی تێر دەکات.

کە باسی ژنو مێردی ئیسلامی دەکەین، چەندە پێویستیمان بەوە هەیە، کە ئەوەی باسکرا وەبیر ژن بێنینەوە، کە چەندە پێویستە ژیانی سادەو ساکارو، پلان دانان بۆ بەڕێوەبردنی دارایی ماڵ، چونکە زێدەڕەوی لە خەرجکردن بۆتە هۆی ماڵ وێرانی خێزان لەژێر قەرزێکی زۆرەوە، کە بۆتە هۆی جیابونەوەی ژنو مێرد، لە ئەنجامی دەست بڵاویی لە ڕادە بەدەرو بۆ ڕەزامەندی خەڵكو دەرکردنی ناوو شۆرەتو شانازی کردن.

## هـانـدان بۆ نـەفـەقـەدانـی ژن

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((دينار أنفقته في سبيل الله، ودينار أنفقتـه في رقبة، ودينار تصدقتَ بـه علـى مـسكين، وديـنـار أنفقتـه علـى أهلـك، أعظمها أجراً الذي أنفقته على أهلك!!))[1]، واتە: دینارێك لە پێناو خوا ببەخشی، دینارێك ببەخشی بۆ رزگارکردنی بەندەیەك، دینارێـك ببەخـشی بە هەژارێك، دینارێك ببەخشیو بیکەیە بژێوی بۆ خێزانەکەت، ئەوەی لـە هەمویان پاداشتەکەی گەورەترە ئەوەیە، کە بۆ خێزانەکەت دەکەیە بژێوی.

هەروەها دەفەرموێ: ((إذا أنفق الرجل على أهله نفقة، وهو يحتـسبها كانت له صدقة))[2]، واتە: گەر پیاو شـتێك ببەخـشێو بـۆ خێزانەکـەی خەرج بکاتو بزانێ لەسەری پاداشت وەردەگرێ، ئەوا بۆی بە خێرو چـاکەو سەدەقە دەنوسرێ.

هەروا دەفەرموێ: ((ما أطعمتَ نفسَكَ فهو لك صدقة، وما أطعمـتَ ولدك فهو لك صدقة، وما أطعمت زوجتك فهو لك صدقة))[3]، واتـە: هەر خواردنێك دەرخواردی خۆت بدەی، بۆت بە خێرو چاکە دەنوسرێ، هەر خواردنێك دەرخواردی منداڵەکەت بدەی، بۆت بە خێرو چاکە دەنوسرێ، هەر خواردنێك دەرخواردی خێزانەکەت بدەی، بۆت بە خێرو چاکە دەنوسرێ.[4]

---

١) رواه مسلم

٢) رواه البخاري ومسلم والترمذي والنسائي.

٣) رواه أحمد في المسند حديث صحيح

٤) لەم فەرمودانەدا بۆمان بەدەردەکەوێ کە پێغەمبەرﷺ چەند بایەخ و گرنگـی داوە بـە چاك بەخێوکردنیماڵو منداڵو خێزان، کە بە هۆیانەوە پاداشتی خوای پـێ وەردەگـیرێ، نەك رژدیو رەزیلی بکرێ بۆ ماڵو منداڵو منەتیان لەسەر بکرێ. (وەرگێڕ)

## هەڕەشەکردن لەو کەسانەی دەرهەق بە خێزانیان ڕەزیلن

خوای گەورە لە مەدحکردنی عەبدەکانیدا دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَامًا﴾(الفرقان- ٦٧)، واتە: ئەوانەشن کە لەکاتی ماڵ بەخشینا، نە یەکجاری دەست بڵاون، نە تەواویش دەست قوچاون، هەر لەو ناوەندە ماون.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((كفى بالمرء إثماً أن يُضَيِّع من يقوت))[1]، واتە: مرۆڤ ئەوەندە گوناهەی بەسە، کە بژێوی ئەوانە نەدات، کە لەسەریەتی بیانژێنێ.

هەروەها دەفەرموێ: ((إن الله سائلُ كلَّ راعٍ عمّا استرعاه، حفظ أم ضيَّع، حتى يُسأل الرجلُ عن أهل بيته))[2]، واتە: خوای گەورە لە هەمو لێپرسراوێك دەپرسێتەوە دەربارەی ئەو کەسانەی کە لە ژێر دەستی کار دەکەن، کە ئایا مافی ئەوانی پاراستوە، یان مافەکانی خواردوەو بە فیڕۆی داوە، تەنانەت پیاو دەربارەی خێزانەکەی لێی دەپرسرێتەوە، ئایا چۆنی پەروەردە کردوەو بەخێوی کردوە؟.

---

١) رواه مسلم

٢) رواه ابن حبان في صحيحه

## پاداشت وەرگرتن لەسەر بەخێوکردنی منداڵ

کەعبی کوڕی عوجرە گوتویەتی: ((مرَّ على النبّي ﷺ رجل، فرأى أصحاب رسول الله ﷺ مِن جَلَدِه ونشاطه، فقالوا: يا رسول الله! لو كان هذا في سبيل الله! فقال رسول الله ﷺ: إن كان خرج يسعى على ولده صغاراً فهو في سبيل الله، وإن كان خرج يسعى على أبوين شيخين كبيرين، فهو في سبيل الله، وإن خرج يسعى رياءً وتفاخراً فهو في سبيل الشيطان))[١]، واتە: پیاوێك بەلای پێغەمبەردا تێپەڕی، هاوەڵەكانی پێغەمبەری خوا ئەو پیاوەیان بینی چوستو چالاكو بەهێزو توانایە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەگەر ئەوە لە پێناوی خوا بوایە! پێغەمبەر فەرمووی: گەر ئەو پیاوە لەماڵەوە دەرچوبێ، تا منداڵە بچوكەكانی بەخێو بكات، ئەوا ئەوە لە پێناوی خوایە، ئەگەر لە ماڵەوە دەرچوبێ، بۆ هەوڵدان بۆ بەخێوكردنی دایكو باوكی پیری بەساڵاچو، ئەوا ئەوە لە پێناوی خوایە، گەر لە ماڵەوە دەرچوبێ، بۆ ئەوەی ڕوبینی (ریاء) بكاتو شانازی بەسەر خەڵكدا بكات، ئەوا لە پێناوی شەیتانە.

هەروا دەفەرموێ: ((إن المعونة تأتي من الله على قدر المؤنة، وإن الصبر على قدر البلاء))[٢]، واتە: كۆمەكیو یارمەتی خوا بە ئەندازەی توێشوو بژێوی دێت، خۆڕاگریش بە ئەندازەی بەڵاو موسیبەتەوەیە.

هەروەها دەفەرموێ: ((ما من يومٍ يُصبحُ العِبادُ فيه إلا مَلَكان ينزلان

---

١) رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح .

٢) رواه البزار وسنده حسن.

فيقول أحدهما: اللّهم أَعْطِ مُنفقاً خلفاً! ويقول الآخر: اللّهم أعط ممسكاً تلفاً))[١]، واتە: هەمو رۆژێك كە بەندەكان ڕۆژی تیا دەكەنەوە، دو فریشتەی خوا بانگ دەكەن، یەكێكیان دەڵێ: خوایە بەو كەسە ببەخشە، كە ماڵی بەخشیوە بە هەژاران، زیادی پێ ببەخشە. ئەوی تریان دەڵێت: خوایە لەو كەسە بگرەوە، كە نەیبەخشیوە تا ماڵەكەی تیا بچێ.

١) رواه البخاري ومسلم وغيرهما.

# حوكمی ميردی ره‌زيل

((قالت هند امرأة أبي سفيان: يا رسول الله .... إن أبا سفيان رجل شحيح ليس يعطيني ما يكفيني وولدي إلا ما أخذتُ منه وهو لا يعلم.فقال: خذي ما يكفيك وولدك بالمعروف))[١]، واته: هندی ژنی ئه‌بوسوفيان گوتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا! ئه‌بوسوفيان پياوه‌كی ڕه‌زيله[٢]،

---

١) رواه البخاري وغيره .

٢) به بۆنه‌ی قسه‌كردن ده‌رباره‌ی پياوی ڕه‌زيل ئه‌م شته خۆشه باس ده‌كه‌ين: ژنێك له‌به‌ر ڕه‌زيلی مێرده‌كه‌ی كێشه كه‌وته نێوانيانه‌وه.

ژنه گوتی: به‌خوا له‌به‌ر خۆشه‌ويستی نيشتمان نه‌بێ، مشكيش له ماڵت نامێنێته‌وه، كه له ماڵی دراوسێكان بژێوی خۆی په‌يدا ده‌كات!!

هه‌روه‌ها هه‌ر سه‌باره‌ت به مێردی ڕه‌زيل‌و زۆر لێپرسينه‌وه‌ی ژنه‌كه‌ی ئيمام ئيبن جه‌وزی له كتێبه‌كه‌ی (الأذكياء) باس ده‌كات:

موغيره‌ی كوڕی شوعبه‌و لاوێكی عه‌ره‌ب داخوازی ژنێك ده‌كه‌ن، لاوه‌كه جوان ده‌بێت، جا ژنه‌كه به دوای هه‌ردوكياندا ده‌نێرێ.

پێی گوتن: هه‌ردوكتان داخوازی منتان كردووه، به‌ڵام من وه‌ڵامی هيچ كامێكتان ناده‌مه‌وه، به‌بێ ئه‌وه‌ی نه‌يبينم‌و گوێم له قسه‌ی نه‌بێ، گه‌ر ويستتان ئاماده‌بن، ئه‌وانيش ئاماده‌بوون به شێوه‌يه‌ك كه ئه‌وانی ده‌بينی‌و گوێی له قسه‌كانی ئه‌وان ده‌بوو.

كاتێ موغيره ته‌ماشای جوانی‌و لاوێتی‌و قه‌دو باڵای گه‌نجه‌كه‌ی كرد، له ژنه نائومێد بوو، زانی كه ژنه‌كه ئه‌و به‌سه‌ر ئه‌و گه‌نجه هه‌ڵنابژێرێ.

به گه‌نجه‌كه‌ی گوت: جوانی‌و شۆخ‌و شه‌نگينت پێدراوه، ئايا جگه له‌مه شتی ترت هه‌يه؟

گوتی: به‌ڵێ، چاكه‌كانی خۆی ژماردو بێده‌نگ بوو.

موغيره پێی گوت: حسابت چۆنه؟

گوتی هيچ شتێكم لێ‌هه‌ڵناوه‌رێ، تۆزقاڵێكی لێ‌ده‌گرمه‌وه! (واته ڕه‌زيله).

ئەوەندەم ناداتێ بەشی خۆمو منداڵەکەم بکـات، تەنها ئەوە نـەبێ کـە بـۆ مەسرەفی ماڵەوە، بەبێ ئاگاداری ئەو پارەی لـێ دەبەم.

پێغەمبەر فەرمووی: ئەوەندەی بەشی خۆتو منداڵەکەت دەکات، پـارەی لـێ ببە، بەڵام بە پێی پێویست بێو بۆ مەسرەفی ماڵەوە بێ.

---

موغیرە پێی گوت: تورەگەی پارەکەم لە سوچێکی ماڵەکەم دادەنێم، کە خێزانەکەم بە پێی پێویستی خۆیان لـێی خەرج دەکەن، ئەو کاتە دەزانم پارەکە تەواو بووە، کـە داوام لـێ دەکەن.

ژنەکە (لە دڵی خۆیدا) گوتی: بەخوا ئەم پیردم بە لاوە باشترە، کە موحاسەبەم ناکـات، لەو گەنجەی کە لەسەر تۆزقاڵێك لێم دەپرسێتەوە. جا ژنەکە شوی بە موغیرە کرد.

# هـاندانی زۆرکردنـی منداڵ

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ﴾ (یس- ١٢)، واتە: هەر کارێکی بە زیندویی کردویانە، شوێنەواریان گشت دەنوسین.

﴿وَقَدِّمُوا لأَنفُسِكُمْ﴾(البقرة- ٢٢٣)، واتە: تێشویەکیش وەپێش خۆخەن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((تزوجو الودود الولود، فإني مكاثر بكـم الأمم))[١]، واتە: ئافرەتی وا مارە بکەن، کە ڕوخۆش بێو منـداڵی ببـێ، چونکە من بە زۆریتان شانازی دەکەم.[٢]

---

١) رواه أبوداود والترمذي (صحيح) .

٢) ئەم ئاڕاستەیەی پێغەمبەر لە کوێ، سەبارەت بە هاندانی زۆرکردنی منـداڵو ژمـارەی دانیـشتوان، کـە سـودی ئـابوریو سـەربازیو سـیاسـی هەیـە، بەرامبـەر بـە جـاڕدانی سـنورداركردنی منـداڵ (تحديـد النـسل) لـەناو گەلـە تازەپێگەیـشتوەكان، کـە لەلایـەن زوڕناژەنانی داگیرکەران جاڕدەدرێ؟! بیانوی جاڕدانەکەیان بریتیـە لـەوەی، ئـەو گەلانـە خۆراکیان کەمەو نەبادا توشی برسیەتی بن..

بەڕاستی ئەمە وشەیەکی گەورەیەکە لە دەمیانەوە بـە درۆ دەردەچـێ، چـونکە زۆربـەی زەوی وڵاتــە تازەپێگەیـشتوەكان بەرهـەم نـەهێنراون، گـەر ئـەو داگیرکەرانـە یاریـدەی خەڵکەکەیان لەسەر چاککردنی زەوی یەکەو بەرهەم هێنانی بدایە، وێڕای چەندانەی ژمـارە زۆریان، بەشی هەموانی دەکرد، وەك چۆن هاوکاری (جولەکە)یان کرد لە چاك کردنی زەوی یەکانی فەڵەستینو، هەستان بە ناردنی زۆرینەی بەرهەمەکانی بۆ جیهان، سەرەڕای زۆریـی دانیشتوانەکەی، ئەوەش لە ڕێگەی کۆچی جولەکەوە بو، کە لە سـەرتاپای جیهانـەوە، بـە تایبەتی لە یەکێتی سۆڤیەتەوە کۆچیان بۆ دەکرد!

کۆماری مصری عەرەبی بە نمونە دەهێنینـەوە، گۆیـە بـەهۆی زۆربـونی دانیـشتوانیەوە توشی برسیەتی بون، میصر ٩٨٪ی روبەرەکەی بۆ کشتوکاڵ سازو لەبارە، ئێستاکە تـەنها

٤./ی بەرهەم دەهێنرێ، هەروەك جمال عبدالناصر بۆ ئاژانسی (أسوشتد برس)ی ڕاگەیاند، ئەو زەویەی ماوەتەوە وازیان لێ‌هێناوەو بەکاریان نەخستوە.

(صوت الإسلام عدد/٨٤/ ربيع الثاني/١٣٧٨) (تشرين أول-أكتوبر ١٩٥٩)

ئەوەی نامۆو جێی شەرمەزاری یە ئەوەیە، کە دائیرەکانی داگیرکەران کاتێك جاڕی میسر دەدەن بۆ سنوردارکردنی منداڵ بون (تحديد النسل)، کە چڕی دانیشتوان لە هەر کیلۆمەتر چوارگۆشەیەکیدا لە (١١) کەس زیاتر نابێت‌و، کۆی دانیشتوانەکەی ٣٧ ملیۆن کەسە.. کەچی لە ولاتەیەکگرتوەکان کە ژمارەی دانیشتوانی زیاتر لە ٢٠٠ ملیۆنەو چڕی دانیشتوان لە هەر کیلۆمەتر چوارگۆشەیەکدا (٢٥) کەسە، یان لە ئینگلتەرا، ژمارەی دانیشتوانی (٥٥) ملیۆن کەسەو چڕی یەکەی (٢٢٥) کەسە لە یەك کیلۆمەتر چوارگۆشەدا، یان لە روسیای ئەوروپی، کە دانیشتوانەکەی (١٨٠) ملیۆن کەسەو چڕی یەکەی (٣٥) کەسە لە یەك کیلۆمەتر چوارگۆشەدا، جاڕی سنوردارکردنی منداڵ بون نادەن؟!

بۆ زانیاری، ئەو دەوڵەتانەو هاوویّنەیان، کە هانی زیادکردنی منداڵ دەدەن‌و پاداشتی دارایی بۆ ئەمە تەرخان کراوە، کە بوار نیە بە درێژی باس بکرێت، جا بۆ شارەزایی دەربارەی ئەمە بڕوانە کتێبی (أهداف الأسرة في الإسلام والتيارات المضادة)ی مامۆستا حسێن محمد يوسف، کە ئەو زانیاریانەمان لەو وەرگرت.

لە ڕاستیدا ئەوەی لە دواوەی جاڕی منداڵ نەبون، یان سنوردارکردنیەتی، کەمی خۆراك نیە، بەڵکو ترسانی داگیرکەرانە لە زیاد بونی دانیشتوانی ولاتە تازە پێگەیشتوەکان، کە مەرامەکانیان پوچەڵ دەکاتەوە، جا ئەوان تەنها بە پڕوپاگەندەی مەبەستدار واز ناهێنن، بەڵکە بۆ دەستەبەرکردنی ئەمە، دەست دەکەن بە بەکارهێنانی هێزو هۆیەکانی ناچارکردن‌و زۆر لێکردن‌و هەستان بە کرداری کوشتنی بە کۆمەڵ، وەك داگیرکەران لە خواروی ئەفریقیا لە دژی دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئەوێ ئەنجامی دەدەن، هەڕەشەی بڕینی هاریکاری ئابوری دەکەن، گەر زۆربونی دانیشتوان نەوەستێنێ.. ئای لەو خیانەتە.

ڕایەکی تر هەیە کە (ولیم شوکلی) مامۆستای زانکۆی (استانفۆرد) لە شیکاغۆ ئاشکرای کرد، کە تێی دا بەراشکاوی داوای نەزۆك کردنی ڕەش پێستەکانی کرد، بەرامبەر بە پێدانی پاداشتی دارایی لە لایەن میری یەوە. نەزۆك کردنیش مانا واقیعی یەکەی حوکمی ئیعدامە لەسەر ڕەگەزی ڕەش پێست لە ئەمریکادا.

گەر هەردو ئەمریکا ئینسافیان هەبوایە -بەلام لە کوێیان بو-، دەبوایە حوکمی بەندکردنی هەمیشەیی، یان ئیعدام بەسەر ئەو مامۆستایەدا بدەن، لەبەر نەبونی سۆزی مرۆڤایەتیو ئەمانەتی زانستی.

ولاتە یەکگرتوەکان بە بەلایین دۆلاری خەرج کردوە بۆ سنوردارکردنی منداڵبون لە ولاتە تازەپێگەیشتوەکان، وەك دابەشکردنی ئامێرو داودەرمانی منداڵ نەبون بە خۆڕایی‌و، ئەنجامدانی نوژداری لەبارچواندن (عمليات الإجهاض) بە نهێنی یەکی تەواو.

دەوڵەتە داگیرکەرەکان، سەرەڕای ترسناکی حەبی منداڵ نەبون لەسەر تەندروستیو بونی منداڵ بە شێواوی، ئەم کارە هەر ئەنجام دەدەن.

گەر ئەم دەوڵەتە گەورانە لە جاڕدانەکەیان ڕاست دەکەن، خزمەت بە مرۆڤایەتی دەکەن، دەبو یارمەتی پێویست پێشکەش بە دەوڵەتە تازەپێگەیشتوەکان بکەن، کە لە ژیانێکی تەنگ دەژیەن، نەك لەبەر زۆریی دانیشتوان، بەڵکو لە ئاکامی ئەو قەیرانە ئابوریانەی، کە ولاتە داگیرکەرەکان لە ولاتە هەژارەکان دروستی دەکەنو نەداری بلاودەکەنەوە.. لەکاتێکدا ئەو ولاتانە بەلایین دۆلار خەرج دەکەن، بۆ بەخێوکردنی ملیۆنەها سەگ، کە هەر یەکەی مانگانە (٢٠) جونەیهی پێ دەدرێ، کە زیانە دروستی یەکەشی بە دیار کەوتوە، هەروەها بلیۆنەها دۆلار خەرج دەکەن بۆ داهێنانی چەکی ڕوخێنەر، بۆ بەهیلاك دانی مرۆڤایەتی‌و، هەندێکی دەفرۆشنە ئەو گەلە هەژارانەی، کە دوای وروژاندنی فیتنەو ئاشوبو دوژمنایەتی، بە نێو یەکتری دەکەون؟ هەمو ئەمانەی لە بری یاریدەدانیەتی لەسەر چاك کردنی زەویەکانی.

ئایا دەزانی ڕێژەی داهاتی تاکێك لە ولاتە دەوڵەمەندەکان دەگاتە ٨٧٪، کەچی لە گەلە تازە پێگەیشتوەکان دەگاتە ٥,٧٪ .

لەوەی ڕابورد هەست دەکەینو بۆمان دەردەکەوێ، کە جاڕدانی سنوردار کردنی منداڵ بون، کە دەوڵەتە گەورەکان جاڕی بۆ لێدەدەن، نەخشەیەکی ئیمپریالیزمە، کە بە پلەی یەکەم خزمەتی جولەکە دەکات... جا با لەسەر ئەمە بە حەزەر بینو فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ بخەینە بەرچاوو بەر دڵمان، کە دەفەرموێ: ((تزوجوا الودود الولود فإني مكاثر بكم الأمم)). ئەمەش لە ئیعجازی فەرمودە زانستی یەکانی پێغەمبەرە.

((إذا مات ابن آدم انقطع عمله إلاّ من ثلاث: صدقة جارية، أو علم ينتفع به، أو ولد صالح يدعوا له)).[1]، واتــە: گــەر ئـادەمیزاد مــرد لــە کردەوەکەی دادەبڕێ، مەگەر لەسێ شـت نـەبێ: خێرێکـی بـەردەوام، یـان زانیاریەك بلاّو بکاتەوە سودی لێوەربگیرێ، یان منداڵێکی صاڵح و چـاك دوعـای بۆ بکات.

١) رواه مسلم .

## بـانـگ دان بە گـوێی منداڵی تازە لە دایـك بو

ئەبو رافع گوتویەتی: ((رأيت رسول الله ﷺ أَذَّنَ في أُذُنِ الحسن بن علي حين ولدته فاطمة رضي الله عنهم جميعاً))[1]، واتـە: لـەو كاتـەی حەسەنی كوڕی عەلی لە دایك بو، ڕەزای خوایـان لـێ بـێ، پێغەمبـەری خوام بینی، بانگی بە گوێی حەسەن دا خوێند.

## لـەو كاتەی منـداڵ لە دایـك دەبێ وا باشـە شتێكی شیرینی بەدەم بكرێو دوعای بۆ بكرێ

ئەبو موسا گوتویەتی: ((ولد لي غلام، فأتيت به الى النبّي ﷺ فسماه إبراهيم وحنكه بتمرة ودعا له بالبركة ودفعه اليّ))[2]، واتە: كوڕێكم لـەدایك بـو، بـردم بـۆ لای پێغەمبـەر، ئـەویش نـاوی نـا (ئیـبراهیم)، خورمایەكی لە ناو دەمی نەرمو شل كردەوەو دەمی منالەكەی پـێ شـیرین كردو دوعای بۆ كرد، كە بەرەكەت بكەوێتە ژیانو تەمـەنی یـەوە، پاشـان منداڵەكەی پێدامەوە.

---

١ رواه أبوداود والترمذي حديث صحيح

٢) رواه البخاري ومسلم .

## پێویستە هۆزەبانەو خەتەنە بۆ منداڵ بکرێ

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((مع الغلام عقيقة، فأهريقوا عنه دماً، واميطوا عنه الأذى))[١]، واتە: کوڕ لەو کاتەی لە دایك دەبێ دەتوانرێ هۆزەبانە(عقيقة)ی بۆ بکەن بە سەربڕینی مەڕو، سەرتاشینی.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((كل غلام مرتهن بعقيقته، تذبح عنه يوم سابعه، ويسمى فيه، ويحلق رأسه))، واتە: هەمو منداڵێك کە لە دایك دەبێ، مەڕ سەربڕینەکەی دەبێتە بارمتەی ئەو، لە هەفتەمین ڕۆژدا دەکرێو، ناو لە منداڵەکە دەنرێو سەری دەتاشرێ[٢].

هەروەها دەفەرموێ: ((عن الغلام شاتان مكافئتان وعن الجارية شاة))[٣]، واتە: بۆ کوڕ دوو مەڕ سەردەبڕدرێو دەکرێتە قوربانیو بۆ کچیش یەك مەڕ.

((أجعلوا مكان الدم خلوفاً يعني في رأس الصبي يوم الذبح له))[٤]، واتە: لەو ڕۆژەی کە هۆزەبانە دەکرێ، لە جیاتی خوێن لەسەری منداڵ هەڵبسوڕێ، بۆنی پیادا بکەن.

خاتو عائیشە گوتویەتی: لە سەردەمی نەفامیدا گەر هۆزەبانەیان

---

١) رواه البخاري ومسلم

٢) ئێمە تاقیمان کردۆتەوەو کەسانی تریش تاقیان کردۆتەوە، کە ئەم سەرتاشینە باشترین ئاکامی بوە، وەکو: زۆریو چڕی قژو ڕەونەقداری. بەڵام سەرتاشینەکەی بە گوێزان، دەبێ زۆر بە هێدیو هێمنیو لەسەرخۆیی ئەنجام بدرێ.

٣) رواه أحمد في المسند والترمذي حديث صحيح.

٤) رواه ابن حبان (حديث صحيح)

بکردایە، لۆکەیان بەخوێنی هۆزەبانەکە دەکرد، جا گەر سەری منداڵەکەیان بتاشیبایە، لۆکە خوێناویەکەیان لەسەر منداڵەکەیان دادەنا، جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((أجعلوا مكان الدم خلوفاً أي طيباً...)).

((عقَّ رسول الله ﷺ عن الحسن والحسين وختنهما لسبعة أيام))[1]، واتە: پێغەمبەری خوا هۆزەبانەی بۆ حەسەن‌و حوسێن کردوە، لە هەفتەمین ڕۆژی لە دایك بونیان خەتەنەی کردون.

جا لەبارەی خەتەنە کردن، لە کتێبی (حياتنا الجنسية)ی دکتۆر صبری القبانیدا هاتوە: خەتەنەکردن کارێکی تەندروستی زۆر چاك‌و بەرزە، خاوەنەکەی لە زۆر دەردو نەخۆشی دەپارێزێ، خەتەنەکردن چەند سودێکی هەیە کە ئەمانەن:-

١- بە بڕینی قوڵفەی سەری چوك (زەکەر)، خاوەنەکەی لەو ماددە ڕۆنی‌و چەوری یەکان رزگاری دەبێ، کە لەم شوێنەوە دەردەچێ، کە دەبێتە هۆی دڵ تێکدان‌و قێز لێبونەوە، جا ئەم بڕینە دەبێتە مایەی بۆگەنی نەبون.

٢- بە بڕینی قوڵفەی سەری چوك مرۆڤ رزگاری دەبێ لە مەترسی نەکشانی چوك.

٣- خەتەنەکردن دوچاربون بە نەخۆشی شێرپەنجە (سرطان) کەم دەکاتەوە. دەرکەوتوە ئەم جۆرە شێرپەنجەیە لە لای ئەو کەسانەی، کە قولفەیان تەسکە زۆر ڕو دەدات. ئەوەش لەناو ئەو گەلانەی دروشمەکانی دین بەجێ دەهێنن زۆر کەمە.

٤- گەر لە خەتەنەکردنی منداڵ پەلە بکەین، ئەوا دەتوانرێ دور بخرێتەوە لە توشبونی میزەچڕکەی شەو، یان میز بەخۆداکردن. زۆربەی منداڵ،

---

[1] ) رواه البيهقي (حديث صحيح).

کـە لەسـەر جێگاکـەی میـز بەخۆیـدا دەکـات بـەهۆی پێـچەوانەیی دەمارەودیە، کـە سەرچـاوەکەی قوڵفـەی چـوکەکەیە، کـە لـە پێـستی خوارەوەی بە درێژی دەمێنێتەوە.

٥- بە خەتەنەکردنی منداڵ، مەترسی زۆرکردنی دەستپەڕ (العادة السرية) کەم دەکاتەوە، چـونکە بـونی قوڵفـەو مـاددەی چـەوری، دەمارەکـانی دەورەی چـوك دەبزوێنـێ، وا لـە هـەرزەکار (مراهـق) دەکـات، کـە بیخورێنێو زیاد لە پێویست گەمەی پێ بکات.

٦- خەتەنەکردن کاریگـەری‌یـەکی ناڕاسـتەوخۆی هەیـە لەسـەر بـەهێزی ئارەزوی جنسی، چونکە لە هەندێك پەیانگای زانستیدا دەرکەوتوە، کە سەرژمێریان کردوە ئەو کەسانەی خەتەنەکراون، ماوەی جوتبونیان پێش ئاوهاتنەوە درێژە دەخایەنێ، زیاتر لەو کەسانەی خەتەنە نەکراون. لەبەر ئەوە ئەوانە زیاتر چێژو خۆشی لەمە وەردەگرنو زیاتریش چـێژو خۆشـی بە ژن دەدات.

هەر لەم بـوارەدا، لـەژێر ڕۆشـنایی فـەرمودەی پێغەمبـەر ﷺ باسـی خەتەنەکردنی ئافرەت دەکەینو، دەپرسـین ئایـا دروسـتە ئـافرەت خەتەنـە بکرێ؟

ئوم عەطیە گوتویەتی: ((أن امرأة كانت تختن النساء في المدينة، فقـال لهـا رسـول الله ﷺ: لا تنهكـي!! فـإن ذلـك أحظـى للمـرأة وأحـب للبعل))[1]، واتە: لە شاری مەدینە ئافرەتێك هـەبو، خەتەنـەی ئافرەتـانی دەکرد، جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمو: لە خەتەنەکردندا ئاگادار بـە زۆری

١) رواه أبو داود وسنده صحيح

مەبڕە، چونکە (بظر)[1] باشترین خۆشیو چێژ وەرگری ئافرەتەو بۆ پیاویش واتە (مێرد) خۆشترو باشترە.

لە گێڕانەوەیەکی تردا کە (رزین) گێڕاویەتیەوەو سەنەدەکەشی (صحیح)ە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ بەو ئافرەتەی فەرموە: ((أشمي ولا تنهكي! فإنه أنور للوجه! وأحظى عند الرجل))، واتە: لە خەتەنەکردنی ئافرەتاندا کەمێکی لێ ببڕەو زۆری لێ مەبڕە، چونکە ئەمە ڕۆشنایی ڕوخسار زیاتر دەکاتو لەلای پیاویش خۆشترە.

خەتەنەکردنی ئافرەتان بریتی یە لە بڕینو جیاکردنەوەی بەشێك لە میتکە، نابێ لە ناوچە ساردو فێنکەکاندا ئافرەت ئەم بەشەی لێ ببڕدرێ، واتە نابێ خەتەنە بکرێ. بەڵام لە وڵاتە گەرمەکاندا دروستەو پێویستیشە ئافرەت خەتەنە بکرێ، چونکە لە شوێنە گەرمەکاندا میتکە گەشە دەکاتو، ئارەزوی جنسی ئافرەت بە شێوەیەکی ناسروشتی زیاد دەکات، کە لەوانەیە بەرەو لاڕێیی ببات.

میتکە هەندێك جار بە شێوەیەکی وا گەورە دەبێ، کە ڕێگەی جوتبون لە پیاو دەگرێ. لەبەر ئەوەی ڕۆڵێکی گرنگی لە جوتبوندا هەیە. وەك بەدەرکەوتوە، بە تایبەتی لەلای ئافرەت، کاریگەرییەکی زۆری هەیە بۆ خۆشی وەرگرتن لە کاتی جوتبوندا. بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە خەتەنەکاری ئافرەتان کردوە کەمێکی لێ ببڕێ، چونکە زۆر بڕین دەبێتە

---

١) البظر- میتکە: ئەو پارچە گۆشتەیە کە بە سەروی ناوەوەی فەرجی ئافرەتەوە کە ئەرکی بریتی یە لە چێژو خۆشی وەرگرتن لە لای ئافرەت.

هۆی ساردیی و کزی ئارەزوی جنسی[1] لەلای ئافرەت و نەبونی ئارەزوی جوتبون و نەگەیشتنە پلەی لەزەت و خۆشی وەرگرتن.

---

١) بۆیە لە کوردستانی خۆمان، بە تێنەگەیشتن لە فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ و بە نەزانینەوە، خەتەنەی کچانیان کردووە، کە تا ئێستاش لە هەندێ شوێن هەر بەردەوامەو بەناوی دینەوە دەکرێ. بەڵام با بزانرێ ئەم فەرمودەیە لە روانگەی زانستیەوە بۆ وڵاتی ساردی ئێمە پیادە ناکرێ، تەنها بۆ شوێنە گەرمەکانە،چونکە وەك لە سەرەوە باسکرا لە شوێنی ساردو فێنك میتکە گەورەو زیاد ناکات. جا گەر گەورە نەبێت و لێی ببڕێ، یان لە ڕیشەوە ببڕێ، دەبێتە هۆی بێبەشبونی ئافرەتان لە چێژی جنسی و دوچاربون بە کزی جنسی، کە کێشەوگرفت لە نێوان ژن و مێرد دروست دەکات. وەك دکتۆرێکی ئافرەتانی سلێمانی گوتویەتی: ((٩٥٪ی ئافرەتانی کوردستان دوچاری کزی جنسی بوون، هۆیەکەشی بڕینی ئەو شوێنەیە))... (وەرگێڕ)

## گەر منداڵ زمانی کرایەوە با بە (لا إله إلا الله) زمانی پاراو بکرێ

ابن القیم لە کتێبەکەیدا دەڵێ: ((گەر منداڵ لە قسە کردن نزیك بوّوە، تۆش بتەوێ قسەکردنی لەلا ئاسان بکەیت، با زمانیان شیرین بکرێ بە هەنگوین و خوێ (الآندراني). چونکە هەنگوین و ئەم جۆرە خوێیە زمان قورسی و قسەنەکردن لا دەدەن. کاتێکیش زمانیان دەکرێتەوە، با پێیان بڵێن: (لا إله إلا الله، محمد رسول الله)، با یەکەم شت بێ بە گوێیان دابدرێ با وشەی (الله) و یەکخواپەرستی بێت، بۆ نمونە: بڵێ: خوای گەورە لەسەر عەرشەکەیەتی و تەماشایان دەکات، گوێی لە قسەکانیانە، لە هەر شوێنێك بن خوا لەگەڵیانە)).

بە واتای: ئاوا فێری منداڵەکەی بکات، وەك ئیبن عەبباس و غەیری ئەویش لە هاودڵەکانی، لە تەفسیری فەرمودەی خوای باڵا ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾ گوتویانە: بە هیچ شێوەو حاڵێك دروست نیە بوترێ، خوای گەورە بە زاتی خۆی لە هەمو شوێنێکە، وەك هەمو زانایانی پێشو دەڵێن: خوای گەورە لەسەر عەرشی خۆیەتی، هیچ شتێك وێنەی ئەوی نیەو خودا بیسەرو بینایە.

بۆ ڕاستی ئەوەش، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَأَمِنتُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ﴾ و﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ و، فەرمودەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئوممەتەکەی کە ئیمانیان تاقی دەکاتەوە: (أین الله) خوا لە کوێیە؟ وەڵامی دایەوە کە لە ئاسمانە. هەر کەسێ بڵێ: خوا لە هەمو

شوێنێکە، ئەوا کوفری کردوە، پەنا بە خوا.

لەبەر ئەوە ئەو منداڵەی، کە گەیشتە تەمەنێکی وا، کە چاکەو خراپەی جیا دەکردەوەو فامی دەکرد، بنەماو بنچینەکانی یەکخواپەرستی پێ بگوترێ، هەروەك لەم فەرمودەیەدا دەدرەوشێتەوە:

ئیبن عەبباس گوتی: ((كنت خلف رسول الله ﷺ فقال يا غلام: إني معلمك كلمات: إحفظ الله يحفظك، إحفظ الله تجده تجاهك، وإذا سألت فاسأل الله وإذا استعنت فاستعن بالله، واعلم بأن الأمة لو اجتمعت على أن ينفعوك لم ينفعوك إلاّ بشيءٍ قَد كتَبَهُ الله لك. رُفِعت الأقلام وجفّت الصُّحف))[١]، واتە: ڕۆژێك لە سواری وڵاخ لە دواوەی پێغەمبەر بوم، پێی گوتم: ڕۆڵە من چەند وشەیەکت فێر دەکەم: خوا بپارێزە، واتە دینی خوا لە فەوتاندن بپارێزە، خوا دەتپارێزێ. خوا بپارێزە هەمیشە بۆ بەهانا هاتن بەرەو ڕوت دێت. گەر داوای شتێکت کرد، کە لە توانای تۆدا نەبوو بەخەڵکی جێبەجێ نەدەکرا، وەك هیدایەتو چاکبونەوەی نەخۆشیو فراوانی ڕزقو ڕۆزی، ئەوا هەر لە خوا داوا بکە، تەنها پشت بە خوا ببەستە. ئەوەش بزانە گەر هەمو خەڵك کۆببنەوەو لەسەر ئەوە بن کە سودێکت پێ بگەیەنن، بەڵام خوای گەورە نەینوسیبێو ویستی لەسەر نەبێ، ناتوانن ئەو سودەت پێ بگەیەنن، قەزاو بڕیاری خوا نوسراوەو بڕاوەتەوە.

ئەم فەرمودەیە گەورەترین بنەماکانی خوا بە یەك زانین بەدەردەخات، کە ئەویش بە فەرمانی کردنی خواو داوا نەکردنو پشت نەبەستن بە غەیری

---

١) رواه أحمد في المسند والترمذي (حديث صحيح).

خواو، تەنها پشت بەستن بە خواو بڕوابون بە قەزاوقەدەری خوایە. کە نەفس بەرزیو هاتنەپێشەوەو کارکردنو بەس لەخواترسان لەدڵو دەرون دەوروژێنێ. بەڵام مسوڵمانان ئێستا لە کوێن لە ئاست ڕێنماییەکانی پێغەمبەر، کە زۆربەیان لە سوێند خواردنو قوربانیو داواکردنو نەزرکردندا مەبەستیان خوا نیە، دەچنە سەر مەزاری پێغەمبەرانو پیاوچاکانو لێیان دەپاڕێنەوەو داوایان لێ دەکەن، لە کاتی خۆشیو ناخۆشیو نەخۆشیو موسیبەت دا، داوای پێویستییەکانیان لێ دەکەن، لە کاتێکدا ئەو کەسانەی ئەوان لێیان دەپاڕێنەوە هیچیان پێ ناکرێ، نەدەتوانن سود بگەیەنن، نە زەرەرو زیان، تەنانەت بە زیندوییش نەیانتوانیوە، چ جای بە مردویی! ئەو کارەش هەموی شیرکو نەفامیو وێڵیو گەمژەیی یە. پێغەمبەر ﷺ بە کچەکەی خۆی فەرمو، کە خۆشەویستی دڵی بو:

((یا فاطمة لا أغني عنك من الله شيئاً!!))[1]، واتە: فاطمە! من لە لای خوا ناتوانم هیچ شتێکت بۆ بکەم.

لێرەدا چەند ئایەتێکی قورئان باس دەکەین، کە خوای گەورە گاڵتە بەو کەسانە دەکات، کە لە غەیری ئەو داواو نزاو پاڕانەوە دەکەنو هەڕەشەشیان لێ دەکات، بە خراپترینو دژوارترین چارەنوس وەك دەفەرموێ: ﴿**يَدْعُوا مِنْ دُونِ اللهِ مَا لاَ يَضُرُّهُ وَمَا لاَ يَنْفَعُهُ ذلِكَ هُوَ الضَّلاَلُ الْبَعِيدُ، يَدْعُوا لَمَنْ ضَرُّهُ أَقْرَبُ مِنْ نَفْعِهِ لَبِئْسَ الْمَوْلَى وَلَبِئْسَ الْعَشِيرُ**﴾ (الحج: ١٢-١٣)، واتە: لە غەیرەز خوا، هانا بۆ شتی وا دەبا، کە

---

١) حديث صحيح .

نە زیانی لێدەدا نە قازانجیشی پێدەدا، ئەوەیە لەڕێ هەڵەبون، هانا بۆ کەسێ وا دەبا، زیانەکەی لە قازانجی نزیکترە، ئای چ یارێکی بەدکارەو، چ هاودەمێکی نالەبارە.!

هەروەها دەفەرموێ:﴿إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُم!!﴾ (الأعراف- ١٩٤)، واتە: ئەو کەسانەی، کە ئێوە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، یان داواو نزاو پاڕانەوەیان لێ دەکەن هەروەك ئێوە بەندەن.

﴿إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوْ اجْتَمَعُوا لَهُ﴾ (الحج- ٧٣)، واتە: ئەوانەی هانای پێ دەبەن، ئەگەر هەموویان وەکو بن، ناتوانن مێشێ ساز بدەن.

﴿مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللهِ أَوْلِيَاءَ كَمَثَلِ الْعَنكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتًا وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنكَبُوتِ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾(العنكبوت- ٤١)، واتە: ئەو کەسانەی غەیرەز خودا دۆسگەلێکیان بۆ خۆیان پەیدا کردوە -گەر بزانن- وەکو کاکڵەموشان (جاڵجاڵۆکە)یان بەسەر هاتوە، کە خانوی بۆ خۆی تەنیوە، دیارە خانوی کاکڵەموشان لە هەمو ماڵان سس ترە.

## لە کاتی نان خواردن چی فێری منداڵەکەت دەکەی؟

لەسەر خوانی نانخواردن پێویستە منداڵەکەت بەو شێوەیە فێر بکەی وەك، کە ئەبو حەفصی کوڕی خێزانی پێغەمبەری خوا دەڵێ: لە کاتی نان خواردن دەستم ئەگێڕا بەم لاو ئەولای قاپی خواردنەکە، پێغەمبەریش فەرموی:

((یا غلام: إذا أکلت فقل: بسم الله وکل بیمینك وکل مما یلیك))[١]، واتە: ڕۆڵە! گەر خواردنت خوارد بڵێ: بەناوی خودا (بسم الله)، بە دەستی ڕاستت بخۆو لە پێشەوەی خۆت بخۆ، واتە دەستت مەگێڕە بۆ شوێنی تر.

ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە تەنها بڵێی بسم الله.

لە فەرمودەی عائیشە هاتوە بە مەرفوعی، کە پێغەمبەر فەرمویەتی: ((إذا أکل أحدکم طعاماً فلیَقل: بسم الله، فإن نسي في أوله، فلیقل: بسم الله أوله وآخره))[٢]، واتە: ئەگەر یەکێکتان نانی خوارد با بڵێ: بسم الله. گەر لە بیری چو سەرەتا ناوی خوا بێنێ، با بڵێ بە ناوی خوا لە سەرەتاو لە کۆتایی خواردنەکەوە.

١) رواه الطبراني (حدیث صحیح) .
٢) رواه الترمذي (حدیث صحیح) .

## فیتنـەی منـدالان

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾(الأنفال- ٢٨)، واتـە: بـزانن کـە مـاڵو سـامانو منداڵەکانتان جێی تاقیکردنەوەن بۆ ئێوە، واتە گەر لە پێناوی خوا بـەکار نەهێنرێن ئەوا فیتنەیە بۆ ئەو کەسە[1]، خوای گەورەش پاداشتی گـەورەی لە لایە.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ﴾ (التغابن- ١٤)، واتە: لە خێزانەکانتانو منداڵەکانتان، هەیـە دوژمـنن بـۆ ئێوە، حەزەریان لـێ وەرگرن.

﴿قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ

---

١) ئەم فیتنەیە کاتێك ڕو دەدات گەر منداڵو ژن ئاگایان لە خوا نەمێنێ، کـە بـە هـۆی ئەوانەوە زۆر سور بێت لەسەر چێژو خۆشیەکانی دنیا، ئەوەش بە زۆر کۆکردنەوەی مـاڵو شانازی کردن دەبێت. هەر شتێك لە خوا بێ ئاگـات بکـات، وەك مـاڵو منـداڵ، ئـەوا شومە بۆ خاوەنەکەی، ئەوەش مانای ئەوە نیە کە ماڵو منداڵ یاساغ کـراون، بـەڵام زۆر قوڵبونەوە لەمەداو زۆر داواکردنی دنیا، کە شەوو ڕۆژ خۆی پێ سەرقاڵ بکاتو ئاخیرەت لەبیر بکاتو خۆی بۆ ئامادە نەکات، یاساغ کراوە.

پوختەی قسان ئەوەیە، مرۆڤ پێویستە بە خودی خۆی ئاگادار بێ، دەرك بـە ئـەحواڵی خۆی بکات، خێری دینوو دنیای خۆی بناسێ، بە حەڵاڵی پارە پەیدا بکاتو کـاریش بـۆ ئاخیرەت بکات.

وَاللهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ (التوبة- ٢٤)، واتە: بڵێ گەر باوك و دايك و منداڵ و خوشك و براكان و خێزان و عەشيرەتتان و، ئەو ماڵ و سامانەی كۆتان كردۆتەوەو، ئەو كەلوپەلی بازرگانی یەی دەترسن لەبردو كەوێ و، ئەو خانوبەرەی حەزتان لێیەتی، لاتان لە خواو پێغەمبەرەكەی و جیهاد لە پێناوی خوادا خۆشەویسترە، ئەوا چاوەڕوانی فەرمانی خوا بن، خوای گەورەش ڕێنمایی فاسقان ناكات.

پێغەمبەر ﷺ فەرمويەتی: ((إن الولد مبخلة، مجبنة، مجهلة، محزنة))[1]، واتە: منداڵ مایەی ڕەزیلی و ترسنۆكی و نەزانی و خەمبارییە.

---

١) حديث صحيح.

## لوتف و لەسەرخۆیی پێغەمبەر بۆ منداڵ

((كان رسول الله ﷺ لَيُدْلِعُ لسانَه للحسن بن علي رضي الله عنه فيرى الصبيّ حمرةَ لسانه فيهبسُ اليه))[1]، واته: پێغەمبەری خوا بۆ حەسەنی کوڕی عەلی زمانی دەردەهێنا، بە نیازی گەمەو یاری کردن. حەسەنیش کە سورایی زمانی پێغەمبەری دەبینی، یەکسەر بە پەلە بۆی دەچو.

((كان رسول الله ﷺ يصلي، فإذا سجد وثب الحسن والحسين على ظهره، فإذا أرادوا أن يمنعوهما، أشار إليهم أن دعوهما! وذلك في المسجد، فلما قضى الصلاة وضعها في حجره وقال: من أحبني فليحب هذين))[2] ، واته: پێغەمبەر ﷺ له مزگەوت نوێژی دەکرد، کاتێك کە سوجدەی دەبرد حەسەن و حوسەین دەچونە سەر پشتی پێغەمبەر بازیان ئەدا، هاوەڵەکانی پێغەمبەر ویستیان قەدەغەیان بکەن، بەڵام پێغەمبەر ئاماژەی بۆ کردن وازیان لێ بێنن. جا کە پێغەمبەر نوێژەکەی ئەنجامدا، هەردوکیانی لەسەر کۆشی داناو فەرموی: هەرکەسێك منی خۆشدەوێت، با ئەم دووەی خۆش بوێ.

((جاء أعرابي الى الرسول ﷺ فرآه يقبل الحسن أو الحسين فقال: أتقبلون الصبيان؟! فما نقبلهم. فقال النبي ﷺ: أو أملك أن نزع الله من قلبك الرحمة؟!))[3] ، واته: پیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەت

---

١) رواه أبن حبان (حديث حسن).

٢) أخرجه أبو يعلى وإسناده حسن.

٣) رواه البخاري ومسلم.

پێغەمبەر، بینی پێغەمبەر حەسەن، یان حوسەین ماچ دەکات، دەشتەکی یەکە گوتی: ئێوە منداڵ ماچ دەکەن؟! ئێمە منداڵ ماچ ناکەین. پێغەمبەر فەرموی: من چی بکەم خوای گەورە ڕەحمو بەزەیی لە دڵتا داماڵیوە.

ئەبو هورەیرە گوتویەتی: ((قبّل النبّي ﷺ الحسن بن علي ﷺ وعنده الأقرع بن حابس التميمي جالساً، فقال الأقرع: إن لي عشرة من الولد ما قبلت منهم أحداً فنظر إليه رسول الله ﷺ ثم قال: من لا يرحم لا يرحم))[١]، واتە: پێغەمبەر ﷺ حەسەنی کوڕی عەلی ماچ کرد، لەوکاتە ئەقرەعی کوڕی حابسی تەمیمی لەلابو. ئەقرەع گوتی: من (دە) منداڵم هەیە، تا ئێستا یەکێکیانم ماچ نەکردوە. پێغەمبەر تەماشای ئەقرەعی کردو فەرموی: ((هەرکەسێ بەبەزەییو بەرەحم نەبێ، ڕەحمو بەزەیی پێ ناکرێ)).

لێرەدا لەبارەی بەسۆز جوڵانەوەو ڕەفتارکردن لەگەڵ منداڵدا، دەبینین زۆربەی باوکان گەمەو یاری کردنیان لەگەڵ منداڵەکانیان فەرامۆش دەکەن. بە پێچەوانەشەوە زۆر بە دڵ رەقانە ردفتاریان لەگەڵ دەکەنو دەیانترسێننو لە جوڵەو یاری کردنو گەمەکردن قەدەغەیان دەکەن، نایەڵن بە سەربەستی بجوڵێنەوە، وا لەو منداڵانە دەکەن ژیانیان ببێتە دۆزەخ. ئەم جۆرە باوکانە بەو شێوە پەروەردە هەڵەیە وا لە منداڵەکانیان دەکەن، کە ڕقو قینە بەرامبەر بە باوکیان هەڵگرنو هەوڵ بدەن لە ماڵ رزگاریان ببێ.

پێغەمبەری خوا لە ژیانیدا، چەند نمونەیەکمان دەداتێ سەبارەت بە گەمەو یاری کردن لەگەڵ منداڵو بە لوتف ڕەفتارکردن. لەبەر ئەوە پێویستە

---

١) رواه البخاري ومسلم.

لەگەڵ منداڵەکانماندا بەو شێوەیە بین، کە پێغەمبەر ڕەفتاری کردوە. هەروەها لەگەڵ منداڵەکان بچین بۆ دەرەوە بۆ پیاسەو ژیانیان بەختەوەرو شاد بکەین.

(لەسەر ریوایەتەکەی، کە ئەبو یەعلا دەری هێناوە، کە حەسەن‌و حوسەین لە کاتی سوجدەدا چونەتە سەر پشتی پێغەمبەر...) دەڵێین:

ئەم کارەی پێغەمبەر لە کوێ‌و ئەوەی ئێستا لە کوێ، کە زۆربەی بێئاگایان لە دین دەیکەن، دڵ ڕەقانە ڕەفتار دەکەن لەگەڵ ئەو منداڵانەی دێن بۆ مزگەوت، بە تایبەتی کاتێك کەمێك یاری‌و گەمە دەکەن. جا دەست دەکەن بە سەرکۆنەو سەرزەنشت کردنیان‌و دەرکردنیان لە ماڵی خوا، ئەوەش زەرەرێکی زۆرە بۆ دینی خوا. هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر لقە خورمایان هەڵدەواسی بۆ ئەوەی منداڵ‌و گەورەش لە مزگەوت بیخۆن. لەبەر ئەوە گەر شتێکم بەدەست بوایە، بۆ هەر مزگەوتێك مەلەوانگە (مسبح)و یانەیەکی نیشان هاویشتنم تیا دەکردەوە، کە لە پێداویستی یەکانی ئیسلامن‌و پێغەمبەر ﷺ داوای فێربونی کردوە، کە دەبێتە هۆی بەهێزکردنی جەستەو لەشی منداڵ‌و خۆشەویست کردنی ماڵی خوا.

هەندێك نەفام‌و تێنەگەیشتو بە بەڵگەی ئەو فەرمودە (ضعیفە) منداڵ لە مزگەوت دەردەکەن کە دەڵێ: (جنبوا مساجدکم صبیانکم ومجانینکم)، واتە: منداڵەکانتان‌و شێت، لە مزگەوت دوورخەنەوە.. کەچی فەرمودەی (صحیح) بە پێچەوانەی ئەوە هەیە.

پێویستە مزگەوت لە چەند نهۆمێك دروست بکرێ، بۆ ئەوەی هەمو جۆرە چالاکی‌یەکانی کۆمەڵایەتی‌و ئیسلامی‌و پەروەردەیی، بۆ گەورەو بچوکی تێدا ئەنجام بدرێ.

## ئەو کەسانەی بە بوونی کچ دڵتەنگ دەبن

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ، يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِنْ سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ أَلاَ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ (النحل: ٥٨-٥٩)، واتە: هەرکاتێکیش مژدەی کچ بۆ یەکێك لەمانە بدرێتێ، ڕوخساری ڕەش هەڵدەگەڕێ و لەبەرخۆیەوە پیش دەخواتەوە، لە مەینەتی ئەو هەواڵەی پێی دراوە، لە هۆزی خۆی تەرە دەبێ، ئاخۆ بە سوکایەتی بەخێوی بکا، یان دە ناخی ئاخی ڕاکا؟ ئای چەند خراپ پێڕادەگەن!

هەروەها دەفەرموێ: ﴿لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ إِنَاثًا وَيَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ الذُّكُورَ،أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا وَيَجْعَلُ مَنْ يَشَاءُ عَقِيمًا إِنَّهُ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾(الشورى: ٤٩-٥٠)، واتە: لەو ئاسمانانەو زەمینە فەرمانڕەوا هەر خودایەو چی بخوازێ دروستی دەکا" بە یەکێ کچ دەبەخشێتو بەیەکێ کوڕ" ئیتر بە مەیلی خۆیەتی، یان دوانەیەکی کوڕو کچیان دەداتێ، هێندێکیشیان کە مەیلی لێبێ، نەزۆك دەکا. هەر خۆی زانایەو توانایە.

((كان رجل عند ابن عمر وله بنات، فتمنى موتهن، فغضب ابن عمر فقال: أنت ترزقهن؟!))[1]، واتە: پیاوێك لە لای ئیبن عومەر دەبێو چەند کچێکی دەبێ، ئاواتی مردنیان بۆ دەخوازێ. ئیبن عومەریش تووڕە بو

---

١) کتێبی الأدب المفرد للبخاري.

گوتی: تۆ ڕزق و ڕۆزی ئەو کچانە دەدەی؟![1]

١) کچ بەخششی خوایە دەیبەخشێ، هەرکەسێ بە بونی کچ دلتەنگ بێ، ئەوا دژی ویستی خوا دەوەستێو نیشانەی نارەزایی یە بەرامبەر بە خوا، چونکە کورو کچ هەردوکیان دروستکراوی خوانو خوای گەورەش بە مرۆڤی داناون. لەبەر ئەوە ئەو کەسەی ئەم رەفتارەی لێ ڕو بدات خۆی توشی خەشمو تورەیی و عەزابی خوا دەکات.

ئەوەی جێی داخە لە کۆمەڵگەکەمان ئەم دیاردەیە بڵاوەو تەشەنەی کردوە، کە پێچەوانەی یاسای خواو سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ. ئەم دیاردەیەش، کە لەناو ئێمە بە شێوەیەکی زەق دەبینرێ، نیشانەی نا ئاشنایی و دوریانە لە ڕاستەڕێی ئیسلام. ئەگینا کچ و کوڕ لە مرۆڤایەتیدا جیاوازیان چی‌یە؟ کاتێك کە کچ بە پەروەردەیەکی ئیسلام پێ دەگەیەنی، لەوانەیە لە کوڕەکەت زیاتر بەکەڵك خۆتو کۆمەڵگەکەت بێو ئافرەتێکی لەخواترسو تەقوادارو خاوەن ڕەوشتو ئاکار بەرزی لێ دەربچێ. لەلای خوای گەورە سەنگی مەحەك لەخواترسانە نەك کوڕ یەتی.

لە مێژوی ئیسلام دا چەندەها ئافرەتی زاناو داناو قورئان لەبەرو شەرع زانو قوربانیدەرو ئازا دەرکەوتن. تەنانەت سورەتێك بە ناوی ئافرەتان دابەزیوە، سورەتێکیش بە ناوی یەك ئافرەت دابەزیوە، کە خاتو (مریم)ەو خوای گەورە بە ڕێزەوە باسی دەکات.

-وەرگێڕ-

# پاداشتی بەخێوکردنی کچ

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((من عال جاريتين حتى تبلغا جاء يوم القيامة أنا وهو -وضم أصابعه-))[١]، واتە: هەر کەسێك دو کچ بەخێو بکات، تا دەگەنە حەددی بلوغ، ئەوا ئەو کەسە لە ڕۆژی قیامەت دێت، منو ئەو ئاوەها پێکەوەین- پێغەمبەر پەنجەکانی دەستی پێکەوە نوساند-[٢].

هەروەها دەفەرموێ: ((من عال جاريتين دخلت أنا وهو في الجنة كهاتين -وأشار بأصبعيه السبابة والتي تليها-))[٣]، واتە: هەرکەسێك دو کچ بەخێو بکات، ئەوا منو ئەو لە بەهەشت وەك ئەو دو پەنجە واین - پێغەمبەر ئاماژەی بۆ پەنجەی شایەتمانو ئەوی تەنیشتی کرد-.

هەروا دەفەرموێ: ((من عال ابنتين أو ثلاثة أو أختين أو ثلاثة حتى يسن أو يموت عنهن، كنت أنا وهو في الجنة كهاتين -وأشار بأصبعين السبابة والتي تليها-))، واتە: هەر کەسێك دو یان سێ کچ، یان دو یان سێ خوشك بەخێو بکات، تا تەمەنی گەورە دەبێ، یان لە لایان دەمرێ، ئەوا منو ئەو لە بەهەشتدا، وەك ئەو دو پەنجە واین-ئاماژەی بۆ پەنجەی شایەتمانو تەنیشتی کرد-.

١) رواه مسلم .

٢) ئەم مژدەیە گەورەیە تایبەتە بە کچ نەك کوڕ، کەواتە با دایكو باوکان بەبونی کچ دڵخۆش بن، نەك بە پێچەوانەوە دڵتەنگ بن. خوایە بەهۆی دینەکەتەوە شارەزامان بکە.

٣) رواه أبن حبان والترمذي (حديث صحيح) .

# پێویستە کچ بخوێنێ

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ (الزمر- ٩)، واتە: ئایا ئەو کەسانەی دەزانن، وەك ئەو کەسانە یەکسانن کە نازانن؟ لە ڕاستیدا نەخێر.

هەروەها دەفەرموێ:

﴿اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ ۞ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ۞ عَلَّمَ الإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ (العلق: ٣-٥)، واتە: بخوێنە، پەروەردەگارت لە هەمو کەس بەخشندەترە، ئەوەی کە ئادەمیی فێری نوسین کردوە بە قەڵەم، ئادەمیی زاناکردوە بەو شتانەی کە نەیدەزانی.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((النساء شقائق الرجال))[١]، واتە: ئافرەتان خوشكو نیودو هاوشانو هاووێنەی پیاوانن لە خووڕەوشتو سروشتدا.

ئەم فەرمودەیە ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە هەر چ شتێك مسوڵمان فەرمانی پێ دەکرێ، لەوانەش داواکردنی زانیاری، ئافرەتیش دەگرێتەوە، تەنها ئەو شتانە نەبێ کە تایبەتمەند دەکرێ.

((قال النبي ﷺ لإحدى الصحابيات وكان إسمها الشفاء: ألا تعلمين هذه -يريد حفصة- رقية النملة كما علمتيها الكتابة))[٢]، واتە: یەکێك لە ئافرەتە صەحابییەکان، کە ناوی (شیفاء) بو، پێغەمبەر ﷺ پێی

---

١) رواه أحمد في المسند وأبوداود والترمذي (حديث صحيح)

٢) رواه أبوداود (حديث صحيح)

فەرمو: (حەفصە) فێری (رقیة النملة)[1] ناکەی، وەك چۆن فێری نوسینت کرد.

لە گەورەیی کاری پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە، خۆی نەخوێندەوار بوەو فەرمانی بە فێربونی نوسین کردوە بۆ حەفصەی خێزانی، لە کاتێکدا حەفصە بە تەمەنیش بو. لەمەدا وانەیەکی کاریگەر دەبینرێ بۆ ئەو پیاوانەی خێزانەکانیان بە نەخوێندەواری دەهێڵنەوە، وازیان لێ دێنن فێر نەبن! کە بەهۆی نەخوێندەوارییەوە بۆشاییەکی زۆریان بۆ پەیدا دەبێ، بە هۆی نەخوێندنەوەی پەرتوکە بەسودەکان، هەروەها دەبێتە هۆی ئەوەی شەیتان وەسوەسە بخاتە دڵیانەوە!! یان ببنە هۆیەك بۆ یارمەتی نەدانو هاوکاری نەکردنی منداڵەکانیان بۆ خوێندن.

ئەم ئایەتو فەرمودانەی پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە فێربونی ئافرەتان باسکران، قسەی ئەو کەسە مێشك وشکانە بە درۆ دەخاتەوە، کە دەڵێن نابێ ئافرەت فێری خوێندنەوەو نوسین ببێ. بەڵگەشیان ئەم فەرمودە هەڵبەستراو(موضوع)ەیە کە دەڵێ: ((لا تسکنوهن الغرف، ولا تعلموهن الکتابة)). واتە: ئافرەتان لە ژورەوەیان نیشتەجێ مەکەنو فێری نوسینیان مەکەن. ئەمجۆرە فەرمودە هەڵبەستراوە چۆن بۆتە هۆی نەفامی ئافرەتو نەفامی منداڵەکانمان.

---

١) (رقیة النملة): (رقیة) واتە دوعاخوێندنو نوشتەی شەرعی.

(النملة): ابن القیم لە (زاد المعاد)دا دەڵێ: (النملة) چەند برینێکە لە هەردو لاتەنیشتەوە دەردەچێ. بۆیە پێی دەڵێن (نملة) چونکە ئەو کەسەی دوچاری بوە، وا هەست دەکات کە مێرولە بەسەر شوێنی برینەکەدا دەڕواو دەیگەزێ.. بڕوانە (مفصل أحکام المرأة والبیت المسلم في الشریعة الإسلامیة)ی د. عبدالکریم زیدان، بەرگی سێیەم، ل٢٥٠. (وەرگێڕ)

یـەکێك لـە وتاربێـژی مزگەوتـەکان پـێی گـوتم: لـە لادێیەکـدا قوتابخانەیەکی کچانی داخستوە، وای زانیوە ئەم فەرمودەیە (صحیح)ە!!

فێربونی ئافرەت بە خوێندنەوەو نوسین، کارێکی هەستیارو خەتەرناکـە، چونکە گەر ئافرەت خوێندنو نوسینی بۆ کاری بـاشو چـاکە بـەکارهێنا، وەك ئەوەی خواو پێغەمبـەر دایـان نـاوە، ئـەوا بـەرزترینو کاریگـەرترین سەرەنجامو ئاکامی دەبێت. هەروەها سودی بۆ ئافرەتەکـەو میللەتەکەشـی دەبێت، چونکە خوێندنو نوسین دەبێتە یارمەتیدەری بۆ چاکتر بەجێهێنانی ئەرکی سەر شانی، کە بریتی‌یە لە هاوسەریەتیو دایکایـەتیو پـەروەردەی چەند نەوەیەكو بەڕێوەبەریی ماڵەوە.

ئەوانەش پێویستیان بە لێکۆڵینەوەیەکی فراوانی عەقیـدەو بنـەماکانی ئیسلامو مێژوی ئیسلامو پەروەردەی ئیسلامیو ژیانی ئیـسلامیو مـاڵی ئیسلامی هەیە.

لە ڕاسـتیدا کۆمەڵگـەی ئیـسلامی فێرکردنـی ئافرەتـانی بـە خراپـی بەکارهێنا، دەرەنجامەکەشی دەبینین بریتی یە، لە بەرهەڵدایی خوڕەوشـتو پەروەردە، کە قەوارەی نەتەوەو نیشتمان دەخاتە مەترسیەوە، کە نـە وەکـو پیاو بە ئەرکی خۆی هەستێو، نە وەك ئافرەت بتوانێ بە ئەرکی پـەروەردە هەستێ.

پێویستە ئەوە بزانین موبەشـیرەکانو ڕۆژهەڵاتناسـەکان (المستـشرقین)، ئەوانەی هەوڵو کۆشش دەدەن بـۆ داڕوخـانی مـاڵی ئیـسلامیو، گەنـدەڵ کردنی خێزانی ئیسلامی، کە بەراییە بـۆ لـەناوبردنی هێـزی مـسوڵمانان، چەندەها ساڵە بە بەردەوامی پلانو نەخشە دادەنێن بۆ ئەو کودەتایەی، کە گومانم نیە گەیشتونەتە ئامانجە پیسو ڕوخێنەرەکەیان، کە لەژێر پـەردەی

هەبونی غیرد لەسەر ئافرەتی مسولمانو هەولدان بۆ فێربونی، خۆی حەشارداوەو خۆی گۆڕیوە.

ئا ئەوانە چ فێربونێکیان مەبەستە؟

فێربونێکی فەرەنجیان مەبەستە، دەیانەوێ ئادابە بەرزو جوانەکانی ئیسلامی بگۆڕنو، لەژێر پەردەی زانستو زانیاریدا ژەهری خۆیان بلاوبکەنەوە.

خوێنەری بەڕێز! ئەمەش ڕاڤەی پلانی تەبشیرو داگیرکەرانە سەبارەت بە ئافرەتان.

لە کتێبی (الغارة على العالم الإسلامي) لاپەڕە (٤٧)دا هاتوە:

((پێویستە موبەشیرەکان نائومێد نەبن، کە دەبینن بە گاورکردنیان بۆ مسولمانان کزە، چونکە بەدلنیاییەوە مسولمانان لەدلیاندا ئارەزوویەکی زۆریان بۆ زانستەکانی ئەوروپیو رزگارکردنی ئافرەت گەشەی کردوە - مەبەستیان لەمەدا فەلسەفەو تیۆرە رەوشتە بەرەڵلاییەکانە-)).

لە لاپەڕە (٨٨-٨٩) راپۆرتێك سەبارەت بە کارو بڕیارەکانی کۆنگرەی (لکنو)و (قاهیرە) هاتوە، کە کۆنگرەی بەگاورکردن(تبشیری)نو لە سالی ١٩١١ گرێدرا، بەرنامەی کاری بریتی بو لە چەند کارێك:

یەکەم: دیراسەکردنی حالی ئێستا.

دوەم: هەلسانەوەی ویستو هیمەتەکان، بۆ فراوانکردنی فێرکردنی تەبشیریی لە فێرکردنی ئافرەتاندا.

ئا بەم چەشنە لە کۆنگرەی موبەشیرەکان، بەناو رزگارکردنی ئافرەتی مسولمان دەستی پێکرد.

ئەرێ بەخوا! موبەشیرە خاچپەرستەکان بانگەوازی دەکەنو کاردەکەن، بۆ

بەناو رزگارکردنی ئافرەتی مسولمان، دیارە دەپرسی بۆچی؟!

ئــەوەش وەلام: (مــورو برجــر) کــە بابایــەکی جولەکــەی ئــەمریکی هاوچەرخە، لە کتێبەکەیدا (العالم العربي اليوم) دەڵێ:

((ئــافرەتی مــسوڵمانی خوێنــدەوار، لەگــشت تــاکێکی کۆمــەڵگــە لــە ڕێنماییەکانی ئایینەوە دورترە، بەتواناترین تاکی کۆمەڵگەشە، بــۆ ئــەوەی هەمو کۆمەڵگە لە ئیسلام دور بخاتەوە[١]!

لە کتێبی (التبشير والاستعمار)دا هاتوە، کە ئەمە پوختەکەیەتی:

کاتێ موبەشیرەکان هاتنە جیهانی عەرەبیەوە، دەرکیــان کــرد ئــافرەت زیاتر لە پیاو کاریگەری لە پەروەردەکردندا هەیە، لەبەر ئەوە لە پێــشەوەی بایەخ پێدانیان دانا، ڕۆژهەڵاتناس (جیــب) دەڵــێ: قوتابخانــەی کــچان لــە (بێروت)دا بیلبیلەی چاومە..

هەر لەبەر ئەمەش بــوئەمریکیــەکان لــە ســاڵی (١٨٧٠)دا داوای ســی هەزار دۆلاریان لە قوتابخانەیەکی دینی لە (بێروت)کرد، پاساوی داواکەیان بریتی بو لەوەی، کــە ئــافرەت لــە ژیــانی ماڵەوەیــدا نرخــی هەیــە، ئــەو قوتابخانەش لە ئاییندەدا یاریدەی بە گاورکردنی سوریایە.(٨٦-٨٧).

---

١) جاهلية قرن العشرين، ص ٣٣٢-٣٣٣.

## ســـوربونی پێغـەمبــەران
## بۆ داوا کـردنی منداڵی صــاڵح

خوای گەورە لەسەر زمانی زەکەریا دەفەرموێ: ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾(آل عمران- ٣٨)، واتە: پـەروەردگارم لــە لایەن خۆتەوە منداڵو وەچەیەکی باشم پێ ببەخشە، بەڕاستی تـۆ بیـسەری دوعاو نزاو پاڕانەوەی.

هەروەها لەسـەر زمـانی ئیـبراهیم دەفـەرموێ: ﴿رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلاَةِ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ﴾ (أبراهيم- ٤٠) ، واتە: پەروەردگارم سەرکەوتوم بکەی بۆ بەجێ هێنانی مەرجەکانی تەواوی نوێـژو بـەردەوامی یەتی، هەروەها بۆ منداڵەکانیشم، خوایە... پەروەردگارمان ئەم داواو نزایە گیرا بکە.

هەروەها لەسەر زمانی زەکەریا دەفەرموێ:

﴿رَبِّ لاَ تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنْتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ﴾، (الأنبياء-٨٩)، واتـە: پەروەردگارم داوات لـێ دەکەم، کە بە تەنهایی ئـەم هێڵـی بـە بـێ بـونی منداڵ، تۆش باشترین وارسی.

## سور بونی ئیسلام بۆ پارێزگار کردنی تەندروستی ئافرەت و منداڵەکەی بە نەگرتنی ڕۆژو لە مانگی ڕەمەزاندا

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾(البقرة- ١٨٤) ، واتە: ئەو کەسانەی ناتوانن رۆژو بگرن لەسەریانە فدیە بدەن، کە نان دانی هەژارانە .

ئەبو داود لە عیکرەمەی وەرگرتوە، کە ئیبن عەبباس دەربارەی فەرمودەی خوای گەورە ﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ﴾ گوتویەتی: ئەم ڕوخسەت و ڕێگەدانی رۆژو نەگرتنە، بۆ بەساڵاچوو پیرەو بۆ ئافرەتی بەتەمەنە. کە لە بری هەر رۆژێك هەژارێك نان بدەن. ئافرەتی سك پڕو شیردەر، گەر لە خۆیان، یان لە منداڵەکەیان بترسن، کە بە بەرۆژوبون توشی مەترسی دەبن، ئەوا بۆیان هەیە بەرۆژو نەبن و فدیە بدەن، کە تێرکردنی یەك هەژارە لە هەر رۆژێکدا[١].

لە کۆتاییدا ئەوەشی زیاد کردوە دەڵێ: ئیبن عەبباس بە دایکی کوڕەکەی دەگوت: (تۆ لەو کەسانەی، کە زۆر بەزەحمەت ڕۆژوی بۆ دەگیرێ. لەبەر ئەوە لەسەرت پێویستە فیدیە بدەی و قەزا نەکەیەوە)[٢].

لە (نافع)ەوە کە ئیبن عومەر سەبارەت بە ئافرەتی دوگیان پرسیاری لێکرا، کاتێك گەر بەرۆژو بێ، بەڵام لەوە بترسێ منداڵەکەی توشی مەترسی ببێ، ئەویش گوتی: با بەرۆژو نەبێ و لە شوێنی هەر ڕۆژێك یەك

١) (بەزار) گێڕاویەتیەوە.

٢) دار القطني ئیسنادەکەی بە (صحیح) داناوە .

(مُد) واتە: (یەك مشت گەنم) بدات بە هەژاران[1].

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((إن الله وضع عن المسافر الصوم وشطر الصلاة، وعن الحبلى والمرضع الصوم))[2] ، واتە: خوای بەخشندە رۆژوگرتن و نیوەی نوێژی لەسەر ڕێبوار(مسافر) هەڵگرتوە، هەروەها بۆ ئافرەتی دو گیان و شیردەریش.

لەم باردیەوە چەند ئایەتێك هاتوە، کە دەبێ نەخۆش‌و ڕێبوار، رۆژو بگرنەوە. بەڵام لەسەر ئافرەتی دو گیان‌و شیردەر پێویست نەکراوە. ئەم حوکمە شەرعی‌یە چەند ئاسانە، کەچی -بەداخەوە- لەنێو زۆربەی مسوڵمانانەدا شاراوەو نادیارە، نەزانراوەو بوەتە هۆی ئەوەی ئافرەتی دو گیان‌و شیردەر منداڵەکەیان تیا بچێ، یان نەخۆشی ڕوی تێ بکات.

ئافرەت کاتێك دەزانێ دەبێ رۆژوەکە بگرێتەوە، ناچار ڕۆژو دەگرێ‌و خۆیی‌و منداڵەکەشی توشی زەرەرو زیان دەکات!

نازانم ئافرەتی دو گیان، یان شیردەر کەی کاتێکی بۆ دەلوێ‌و دەگونجێ، کە ڕۆژوەکەی بگرێتەوە، چونکە ئافرەت بە تایبەتی لە یەکەم ساڵی شوکردنیدا لە نێوان سکپڕی‌و شیردان دایە!

ئیبن عومەرو ئیبن عەبباس دەڵێن: ((الحبلى والمرضع إذا أفطرتا عليهما الفدية ولا قضاء عليهما!!))، واتە: ئافرەتی دو گیان‌و شیردەر، گەر بە ڕۆژو نەبون، لەسەریانە فدیە بدەن‌و قەزایان لەسەر نی‌یە .

قسەکانی ئیبن عەبباس‌و ئیبن عومەر حوکمەکەی (مرفوع)ە. چونکە

---

١) مالك و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە.

٢) رواه أبوداود والترمذي وأبن ماجة (سنده جيد).

وانابینریٚ ئەم دو زانایە لە خۆیانەوە قسە بکەن.

هەندێك لە ئیمامی مەزهەبەکان لەسەر ئافرەتی دوگیانو شیردەریان بە واجب داناوە، رۆژو بگرنەوە.

بێگومان ئەم ئیمامانە -ڕەحمەتی خوایان لێبێ- ئەم بەڵگانەیان نەدیتوە، ئەگینا نەیاندەتوانی موخالەفەی بکەن. لە کاتێکدا گشتیان گوتویانە گەر فەرمودەیەکی (صحیح) هەبو ئەوە مەزهەبی منە.

## چەند ڕێبازێكی پەروەردەیی بەرز

### هاندان بۆ پەروەردەكردنی منداڵ

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ﴾[1](یس- ١٢)، واتە: هەر كارێكی بە زیندویی كردویانەو شوێنەواریان، گش دەنوسین.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلاَئِكَةٌ غِلاَظٌ شِدَادٌ لاَ يَعْصُونَ اللهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾(التحريم- ٦)، واتە: ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە، خۆتانو خێزانو منالّتان بپارێزن لەو ئاگرەی، كە سوتەمەنی یەكەی خەڵكو بەردە، چەند فریشتەیەكی توندو تیژو تورە سەرپەرشتی ئەو ئاگرە دەكەنو، سەرپێچی خوا ناكەن لەو كارانەی پێیان دەسپێردرێ.

پاراستنی ژنو منداڵ لەم ئاگرە بریتی یە لە پەروەردە كردنو فێركردنێكی ئیسلامی، ئەوەی كە خواو پێغەمبەر ﷺ فەرمانیان پێ داوە.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا

---

١) ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بەوە دەكات، خوای گەورە تەنها كردەوەكانی مرۆڤ تۆمار ناكات، بەڵكو ئەوەی دوای مردنی خۆی بەجێی دێڵێ، ئەویش دەنوسێ، جا چاكە بێت، چاكە دەنوسرێ، خراپە بێت، خراپە دەنوسرێ، دیارە منداڵیش لە گەورەترین شوێنەواری مرۆڤە، لەبەرئەوە، كردەوە باشەكانی منداڵەكان بۆ دایكو باوك دەنوسرێ بەبێ ئەوەی لە كردەوەی منداڵەكان كەم بكات، بە هەمان شێوە، گەر دایكو باوك پەروەردەی منداڵەكانیان فەرامۆش كردبێ، ئەوا كردەوەی خراپەكانی منداڵەكانیان بۆ دەنوسرێ.

وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ (الفرقان- ٧٤)، واتە: ئەو کەسانەی دەڵێن پەروەردگارمان لە خێزانەکانمانو وەچەکانمان ڕۆشنایی چاومان پێ ببەخشەو، بمانکە بە پێشەوا بۆ لە خوا ترسان.

لە ڕاستیدا بڕواداران هۆشیارو هۆشمەند، وەك ئایەتەکە ئاماژەی پێکرد، سورن لەسەر صالح بونو چاك بونی منداڵەکانیان، تا ببنە مایەی ڕۆشنایی‌و بینایی چاویانو، ببنە زەخیرە بۆ ژیانو مردنیان. ئەو کەسانەش کە پەروەردەی کورو کچەکانیان فەرامۆش کردوە چەند ماڵ وێرانو چارەڕەشن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((إذا مات ابن آدم انقطع من عمله إلا من ثلاث: صدقة جارية، أو علم ينتفع به، أو ولد صالح يدعوا له))[1]، واتە: گەر ئادەمیزاد مرد لە کردەوەکانی دادەبڕێو پەیوەندی دەپچڕێ، تەنها لە سێ شت نەبێ: خێرێکی بەردەوامی هەبێ، وەك مزگەوت دروست کردن یان پڕۆژەی ئاوەدان کردنەوە یان پارە(وەقف) کردن بۆ موجاهیدان. یان زانیاری یەك بڵاوبکاتەوە خەڵك سودی لێ وەرگرن، هەروەها کوڕێکی مسوڵمانو صاڵحی هەبێ دوعای خێری بۆ بکات.

هەروەها فەرمویەتی: ((كلكم راعٍ وكلكم مسؤل عن رعيته: الإمام راعٍ و مسؤل عن رعيته، والرجل راعٍ في أهل بيته و مسؤل عن رعيته، والمرأة راعية في بيت بعلها و ولده و مسؤلة عن رعيتها، والخادم راعٍ في مال سيده و مسؤل عن رعيته)) (رواه البخاري ومسلم)

پێغەمبەر دەفەرموێ: ((إن الرجُل لترفع درجته في الجنة فيقول: أنّى لي هذا؟ فيقال باستغفار ولدك لك! أما أبوك فلو كان أقر بالتوحيد،

١) رواه مسلم.

فَصُمْتَ وتصدقتَ عنه، نفعه ذلك))[1]، واتە: لە بەهەشت پیاوی وا هەیە پلەیەکی بەرزی دەدرێتێ، ئەویش دەڵێ: من ئەم شوێنە پلە بەرزەم بۆ هەیە؟ جا پێی دەڵێن: ئەم پلە بەرزە بە هۆی داوای لێخۆش بونی کوڕەکەتە بۆ تۆ! بەڵام گەر باوکت یەکخواپەرست بوایەو تۆش لەجیاتی ئەو بەرۆژوبای‌و خێرو چاکەت بۆ کردبا، ئەوا ئەو خێرو چاکەیە سودی بۆی هەبو.

ئایەتە پیرۆزو فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ کە باس کران، ئەوە بە دەردەخەن، کە چەند کارێکی گرنگ‌و کاریگەرە، دایکان‌و باوکان گرنگی بە پەروەردەی منداڵەکانیان بدەن، کە بە هۆی ئەم پەروەردەیەوە پاداشتی زۆر بەدەست دەهێنن لە ژیان‌و مردندا.

پەروەردەکردن هونەرێکی گرنگ‌و ترسناکە، پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە، تەنها خۆشەویستی‌و سۆزی دایکایەتی‌و باوکایەتی نابێتە تەواومەندی پەروەردە، چونکە بەهۆی هەڵەو فەرامۆشکردنی پەروەردەوە، خێزان بەرەو هەڵدێر دەبات. زۆر کەس وا گومان دەبەن، کە پەروەردەکردن تەنها بە تەمبێ کردن‌و سەرزەنشت کردن‌و لێدان تەواو دەبێت، کە لە ڕاستیدا ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە.

بۆ ئەمەش هەر کەسێ دەیەوێ ڕۆشنبیریی پەروەردەی منداڵی زیاد ببێ، با لەمبارەیەوە چەند پەرتوکێك بخوێنێتەوە، وەك: (کیف أربي طفلي)، (نقائص الأطفال و طریقة إصلاحها)، (التربیة الجنسیة علی المکشوف)، (أطفالنا ضحایانا)و، لێدوان لەسەر کتێبی (لفتة الکبد في تربیة الولد)و (عبقریة الإسلام في التربیة).

---

١) رواه أحمد في المسند.

## منداڵ هان بدرێ زو فێری نوێژ بێت

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((مُرُوا أولادكم بالصلاة لِسَبْعٍ واضربوهم عليها لِعَشْرٍ، وفَرِّقوا بينَهُم في المضاجع))[1]، واتە: بە منداڵەکانتان بڵێن لە تەمەنی حەوت ساڵیدا نوێژ بکەن، لەسەر نوێژ نەکردن لە تەمەنی (دە) ساڵیدا لێیان بدەن، جێگەی نوستنیان لە یەکتری جیا بکەنەوە[2].

---

١) رواه أحمد في المسند وأبو داود (حديث صحيح)

٢) گەر دایکان و باوکان بە گشتی ئەم فەرموودەیان پەیڕەو بکردایە، لەوانە بو حاڵمان بەو حاڵەی ئێستا نەگەیشتایە. چونکە گەر هەر کەسەو لەلای خۆیەوە ئەم فەرموودەی پەیڕەو کردایە، ئەوا کۆمەڵگەیەکی ڕەوشت پاک و دەست پاک و داوێن پاکمان بۆ دروست دەبو. بۆچی؟ چونکە نوێژ کردن، وەك خوای گەورە دەیەوێ، مرۆڤ لە خراپەکاری و بەدڕەوشتی دەپارێزێ، لەسەر ئەو بنەمایەش، کەم کەس وا دەبو لەسەر حسابی ڕەش و ڕوتان، گیرفانی پڕ کات و ناپاکیی بکات. —وەرگێڕ—

# گۆڕینی ناوە ناشیرینەکان

((كان رسول الله ﷺ يغير الأسم القبيح))[1]، واتە: پێغەمبەری خوا ناوی ناشیرینی دەگۆڕی[2].

---

١) رواه الترمذي (صحيح)
٢) ئەمەش لە کاردانەوەی ناوە لەسەر خاوەنەکەی.
ئەبو داود گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی (عاصیو عزیزو عتلەو شیطانو حکمو غرابو حبابو شهاب)ی گۆڕی شەهاب بۆ هشام، حرب بۆ سلم -واتە ئاشتی-، مضطجع بۆ منبعث. ناوی عفرەی گۆڕی بۆ خضرة، شعب الضلالة بۆ شعب الهدی، ناوی بنی مغويەی کردە بنی رشدە.
خطابی گوتویەتی: پێغەمبەر بۆیە ناوی عاصی (یاخی) گۆڕی، لەبەر کەراهیەتی مانای عصیان، چونکە سیفەتی بڕوادار: گوێڕایەڵیو ملکەچی یە بۆ خوا.. عتلە: مانای توندوتیژی، سیفەتی بڕواداریش نەرمو نیانیو سانایی‌یە. شیطانیش: لە شطن هاتوە، واتە دور لە خێرو چاکە، کە ناوی ماردی پیسە لە جنۆکەو ئادەمیزاد.. حَکَم: ئەو حاکمەیە کە حوکمەکەی رەد ناکرێتەوە، ئەم سیفەتەش تەنها لایەق بە خوای گەورەیە، کە یەکێك لە ناوەکانی (الحکم)ـە.
غراب: لە (غرب) وەرگیراوە واتە: دور، هەروا ئاژەڵێکە کە خواردنەکەی پیسە (قەلەڕەش)، کە پێغەمبەری خوا رێی بە کوشتنی داوە، لە کاتی حەج دابێ یان کاتی تردا. (حباب) جۆرێکە لە ژیان، ریوایەت کراوە کە شەیتانە. شهاب: پارچەیەکە لە ئاگر، ئاگریش سزای خوایە..
بەڵام عفرە: ئەو زەوی‌یەیە کە شتی لێ سەوز نابێت، ناوی نا(خضرة) لەسەر مانای گەشبینی تا سەوز دەبێت! باشترین ناوی ئافرەت: ناوی ئافرەتە صەحابیەکانە.
ناونانی کوڕ بە نورالدینو رکن الدینو بدرالدین ئەوە هەرگیز جائیز نی‌یە.
لەوەی رابورد مەترسی ناونانی کوڕو کچمان بۆ دەرکەوت.
ئێمە بۆمان دروست نیە لاسایی خەڵکی نەفام بکەینەوە، کە ناوی سەیر لە منداڵەکانیان دەنێن، وەك هەندێك لە باوکان کردویانە بە عادەت، بە داخەوە ناو لە

((عن ابن عمر بن الخطاب ان ابنة له كان يقال لها عاصية، فسماها رسول الله ﷺ جميلة))[1]، واتە: ئیبن عومەری کوڕی خەتتاب کچێکی هەبو ناوی (عاصية) بو، واتە: (یاخی)، پێغەمبەری خوا ناوەکەی گۆڕی بۆ (جميلة) واتە: (جوان).

((إن زينب بنت أبي سلمة، كان إسمها برّة، فقيل تزكي نفسها! فسماها رسول الله ﷺ زينب))[2]، واتە: زەینەبی کچی ئەبی سلمە، پێشتر ناوی (برّة) بو، واتە چاکەکار، جا خەڵك دەیانگوت ئەوە پاکانەی نەفسی خۆی دەکاتو خۆی بە بێگوناهـ دادەنێ، پێغەمبەری خواش ناوەکەی گۆڕی بۆ زەینەب.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((... لا تسمين غلامك يساراً ولا رباحاً، ولا نجيحاً ولا أفلح، فإنك تقول أثمّ هو؟ فلا يكون))[3]، واتە: کوڕەکەتان ناو مەنێ چەپو قازانج کەرو سەرکەوتوو سەرکەوت، چونکە تۆ شتێك دەڵێی، ئایا ئەو کەسە ئەوەی تێدایە؟ نەخێر ئەو کەسە ئەوە نی یە.

---

کچەکانیان دەنێن شەیدایی عیشق ...(هیام)و (غرام) و، ناوی ئافرەتە صەحابیەکانیان لەبیر کردوە، کە بە زانستو ئەدەبو جیهاد ناویان دەرکردبو.

١) رواه الترمذي وهو صحيح الأسناد.

٢) رواه البخاري ومسلم وغيرهم .

٣) رواه أحمد في المسند وغيره (صحيح).

## مەترسی سپاردنی پەروەردەو فێرکردنی منداڵ بە غەیری پیاوچاکان

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((كل مولود يولد على الفطرة فأبواه يمجسانه أو يهودانه أو ينصرانه))[١]، واتە: هەمو منداڵێك لەسەر سروشتی خواناسی لە دایك دەبێت، جا دایكو باوكی دەیكەنە ئاگرپەرست، یان جولەكە، یان گاور.

١) رواه البخاري.

## حوکمی درۆ لەگەڵ منداڵ

عبدللەی کوڕی عامر گوتویەتی: ((دعتني أمي يوماً –و رسول الله ﷺ قاعداً في بيتنا– فقالت: تعال أُعطك، فقال لها رسول الله ﷺ: ما أردتِ أن تعطيه، قالت: أردتُ أن أعطيه تمراً، فقال لها: أما إنّكِ لو لم تعطيه شيئاً كُتِبَتْ عليك كذبة))[1]، واتە: ڕۆژێك دایکم بانگی کردم‌و پێغەمبەریش لە ماڵمان دانیشتبو. دایکم گوتی: وەرە شتێکت بدەمێ.

پێغەمبەر بە دایکمی فەرمو: دەتویست چی بدەیتێ؟

دایکم گوتی: ویستم خورمای بدەمێ.

پێغەمبەر فەرموی: گەر بهاتایەو هیچ شتێکت پێ نەدایە، ئەوا درۆیەکت بۆ دەنوسرا[2].

---

١) رواه أبو داود (حديث صحيح)

٢) ئێمەی مسوڵمان‌و هەڵگری مەشخەڵی ڕێبازی ڕاست‌و ڕاستگۆیی، دەبێ منداڵەکانمان لەسەر ڕاستی‌و ڕاستگۆیی‌و درۆنەکردن لەگەڵیاندا پەروەردە بکەین، تا لەنێوان یەکتریدا متمانە دروست ببێ‌و بڕوا بە یەکتری بکرێ. لەبەر ئەوە منداڵ لە هەر تەمەنێك دابێ نابێ درۆی لەگەڵ دا بکرێ، ئەگەر بە گاڵتەش بێ. هەموانیش سەرەنجام‌و ئاکامی درۆکردن لەگەڵ منداڵ، بە تایبەتی‌و گەورە بە گشتی، دەزانێ‌و دەریشکەوتوە چ مەترسی یەکی سامناکی هەیە. (وەرگێڕ)

## پێویستە لەنێو منداڵاندا یەکسانیی پەیڕەو بکرێ

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِ آيَاتٌ لِلسَّائِلِينَ ۞ إِذْ قَالُوا لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَى أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ ۞ اقْتُلُوا يُوسُفَ أَوِ اطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا مِنْ بَعْدِهِ قَوْمًا صَالِحِينَ﴾(يوسف: ٧-٩)، واتە: چیرۆکی یوسفو براکانی پەندو وانەو ئامۆژگارین بۆ ئەو کەسانەی کە دەپرسن. کاتێ براکانی یوسف کۆبونەوەو گوتیان: دیارە یوسفو براکەی لەلای باوکمان لە ئێمە خۆشەویستترە، لە کاتێکدا ئێمە کۆمەڵێکین -بەبێ ئەوانیش دەتوانین خزمەتی باوکمان بکەین- بێگومان باوکمان ئاشکراو ڕونە کە گومڕا بوە لەو کارەی دەیکات. براکانیان گوتیان: یوسف بکوژن یان لە زەوی‌یەك لە شوێنێکی دور فڕێی بدەن، کە نەتوانێ بگەڕێتەوە لای باوکی، ئەو کاتە سۆزو خۆشەویستیو چاودێری باوکتان تایبەت دەبێ بە ئێوە، لە دوای یوسف ئێوەش دەبن بە قەومێکی چاكو ساڵح.

نوعمانی کوڕی بەشیر گوتویەتی: ((أعطاني أبي عطية، فقالت أمي، لا أرضى حتى تُشْهِدَ رسول الله ﷺ. فذهب أبي الى النبي ﷺ وقال له: لقد أعطيتُ إبني عطية، فأمَرَتني أمه أن أُشهدك يا رسول الله، فقال النبي ﷺ: أعطيتَ سائرَ وَلَدِك مثل هذا؟! قال: لا!. فقال رسول الله ﷺ: إعدلوا بين أولادكم! ولا تشهدني، فإني لا أشهد على جورٍ))[1]،

---

١) رواه البخاري.

واتە: ئەبی عەطیە شتێکی دا پێم، دایکم گوتی: من ڕازی نابم تا پێغەمبەر ﷺ نەبێتە شایەت. دەڵێ: باوکم چوە خزمەت پێغەمبەرو پێی گوت: شتێکم بە کوڕەکەم بەخشیوە، دایکی دەڵێ دەبێ تۆ ببیت بە شایەتی ئەمە.

پێغەمبەر فەرموی: وەکو ئەمەت داوە بە هەمو منداڵەکانت؟!

ئەویش گوتی: نەخێر!

پێغەمبەری خوا فەرموی: لە شت بەخشیندا بە دادگەری (عەدالەت) بجولێنەوەو بەشی هەموان بدەن. منیش مەکە بە شایەتی ئەوە، چونکە من نابمە شایەت لەسەر شتێك، کە ستەمی تێدا بکرێ.

ئەنەس دەگێڕێتەوە: ((أن رجلاً كان عند النبي ﷺ فجاء ابن له فقبّله وأجلسه على فخذه، وجاءت إبنةٌ له، فأجلسها بين يديه، فقال رسول الله ﷺ ألا سَوَّيتَ بينهما؟!))[1]، واتە: پیاوێك لە خزمەت پێغەمبەر بو، کوڕێکی ئەم پیاوە هاتە لای. پیاوەکەش کوڕەکەی ماچ کردو لەسەر ڕانی دانا، هەروەها کچێکی هەبو ئەویش هاتە لای، ئەویش هێنای لەبەردەمی خۆی دانا. پێغەمبەری خوا فەرموی: ئەوە بۆچی وەك یەك تەماشات نەکردنو یەکسانیت لە نێوانیاندا نەنواند.

زۆربەی دایكو باوك سکاڵای ئەوە دەکەن، کە لە نێوان منداڵەکانیاندا حەسودیو غیرە پێك بردن دەبینرێ، ئەوەش دەبێتە هۆی لاسەنگیو لاوازی کەسایەتیو ڕەفتاری منداڵ.

پێغەمبەر ﷺ واجبی کردوە، کە دەبێ لە نێوان کچو کوڕ.. خوشكو

---

١) رواه البزار ورجاله ثقات.

برا یەکسانی پەیڕەو بکرێو بە عەدالەت مامەڵەو هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکرێ، تا حەسودیو ڕقو قینەیان بەرامبەر بە یەکتری نەبێ.

زۆرجار دایكو باوك هەموو ئەمانە دەکات، لە بەسەرهاتی یوسف (سەلامی خوای لێبێ) ئەوەمان بینی، کە بوە هۆی کارەسات، کە برایەکانی یوسف گومانیان وابوو، کە یەعقوبی باوکی بەسەر ئەوانی هەڵبژارد بوو لەوانی زیاتر خۆشدەویست.

## سۆزو بەزەیی پێویستە بۆ منداڵ بنوێندرێ

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((الراحمون يرحمهم الرحمن، إرحموا من في الأرض يرحمكم من في السماء))[١]، واتە: ئەو کەسانەی بە بەزەیین، خوای بەخشندە ڕەحمیان پێ دەکات، کەواتە بە بەزەیی بن لەگەڵ هەرچی‌یەك، کە لەسەر زەوی هەیە، ئەو کاتە ئەوەی کە لە ئاسمان دایە ڕەحمتان پێ دەکات.

ئەنەس گوتویەتی: ((ما رأيت أحداً كان أرحم بالعيال من رسول الله ﷺ))[٢]، واتە: کەسم وەك پێغەمبەری خوا نەبینیوە بۆ منداڵ بەرەحم تر بێ.

((وكان من وصاياه ﷺ لقواده: أغزوا باسم الله... ولا تقتلوا وليداً))[٣]، واتە: لە ڕاسپاردەکانی پێغەمبەر بۆ سەرکردەی سوپاکانی دەیفەرمو: بە ناوی خوا جیهاد بکەن‌و بجەنگن... منداڵ مەکوژن.

ئەم پەروەردە بەرزەی پێغەمبەر ﷺ کاریگەری‌یەکی گەورەو زۆری کردبوە سەر دڵ‌و دەرونی هاوەڵە بەڕێزەکانی. بە نمونە: عومەری کوڕی خەتتاب -ڕەزای خوای لێ بێ- پیاوێك لە بەنی ئەسەدی بۆ کارێك ڕاسپارد، کە بیکات، پیاوەکە هاتە لای تا پەیمانی سەر ڕاستییەتی کارەکەی وەرگرێ، لەو کاتەدا عومەر هەندێ لە منداڵەکانی ماچ کرد. پیاوەکەش گوتی: ئەی گەورەی بڕواداران ئەوە ماچیان دەکەی، بە خوا من

---

١) رواه أبوداود والترمذي (حديث صحيح) .

٢) رواه مسلم .

٣) رواه مسلم .

تا ئێستا هیچ منداڵێکم ماچ نەکردوە! عومەر گوتی: کەواتە تۆ زۆر بێ ڕەحمی، مادام وایە کارەکەمان بدەوەو، هیچ کارێکمان بۆ مەکە!.

ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حاریسە گوتویەتی: ((کان رسول الله ﷺ يأخذني فيقعدني على فخذه، ويُقْعِدُ الحسن بن عليّ على فخذه الآخر ثم يضمهما ويقول: اللّهم إرحمهما فإني أرحمهما"))[1]، واتە: پێغەمبەری خوا منی لەسەر ڕانی خۆی دادەنا، حەسەنیشی لەسەر ڕانەکەی تری دادەنا، پاشان بە سینگی خۆیەوەی دەکوشینو دەیفەرمو: خوایە ڕەحمیان پێ بکەی، لەبەر ئەوەی من بە بەزەییم لەگەڵیان.

ئیبن مەسعود گوتویەتی: ((ضربت غلاماً بالسوط، فسمعت صوتاً من خلفي. فإذا برسول الله ﷺ يقول: أعلم يا أبا مسعود إن الله أقدر عليك منك على هذا الغلام))[2]، واتە: بە قامچی یەك لە منداڵێکم دا، جا لە دواوەم گوێم لە دەنگێ بو، کە دەبینم پێغەمبەری خوایە دەفەرموێ: ئەی ئەبو مەسعود، بزانە خوای گەورە لەسەر تۆ بە تواناترە لەتوانای تۆ لەسەر ئەو منداڵە.

((وكان ﷺ يقول للخادم: ألك حاجة؟!))[3]، واتە: پێغەمبەری خوا بە خزمەتکارەکەی دەفەرمو: چیت پێویست نی‌یە؟

((وكان رسول الله ﷺ يزور الأنصار، فإذا جاء دور الأنصار، جاء صبيان الأنصار يدورون حوله. فيدعو لهم ويمسح رؤسهم ويسلّم

---

١) رواه البخاري .

٢) رواه مسلم .

٣) رواه البخاري .

عليهم: الحديث))[١]، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی ئەنصارەکانی دەکرد، کاتێك کە دەهاتە گەڕەکی ئەنصارەکان، منداڵە ئەنصاری یەکان، دەوری پێغەمبەریان دەدا، پێغەمبەریش دوعای خێری بۆ دەکردن‌و دەستی بەسەریاندا دەهێناو سلاوی لێ دەکردن.

لەم چەند فەرمودەیەدا ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ، کە پێغەمبەری خوا چەندە بەرەحم بوە لەگەڵ منداڵ دا. ئەوەش شایستەی ئەوەیەو هاندەرە بۆ باوکان، تا سودی لێوەرگرن‌و پەیڕەوی بکەن، چونکە زۆربەی باوکان -بە داخەوە- بە خراپی رەفتارو مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانیان دەکەن، لەسەر چەند شتێکی بێهودە، بە بێ بەزەییانە لە منداڵەکانیان دەدەن. تەنانەت لە گەمەو یاری کردنیشیان دەکەن‌و کەمترین سەربەستیان پێ نادەن‌و ئیهانەیان دەکەن‌و سەرکۆنەیان دەکەن.

ئەم کارەش کاردانەوەی لێ دروست دەبێ‌و دەبێتە هۆی نانەوەی ئاکام‌و سەرنجامێکی خراپ،و کاریش دەکاتە سەر کەسایەتی منداڵەکە بە رادەیەکی وا، کە لەوانەیە وەك شێت رەفتار بکات‌و لە ژیاندا سەرکەوتو نەبێت.

هەروەها ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێ، کە پێغەمبەر ﷺ سۆزو نازی داوەتە منداڵان‌و، بە باشی مامەڵەو رەفتاری لەگەڵ کردون، ئیتر بە ئومێدی ئەوەی ئەمە ببێتە پەندو وانە بۆ ئەو باوکە دڵ ڕەق‌و وشکانەی، کە بە توندوتیژی‌و دڵڕەقانەو ئاژەڵانە مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانیان دەکەن، کە ئەمەش دەبێتە هۆی لاوازکردنی کەسایەتیان‌و زەبون کردنیان، کە ڕەنگە

١) رواه أحمد في المسند وغيره وسنده صحيح .

ڕق و قینە بەرامبەر بە باوکیان دروست ببێت.

جا لەمبارەوە کارەساتێکتان بۆ باس دەکەین، کە بۆ پەند وەرگرتن و هاندانی دایکان و باوکانە تا منداڵەکانیان لە بنەمای پەروەردەیی دروست پەروەردە بکەن:

هەواڵەکان ڕایانگەیاند، پۆلیسێك پارەی پاشەکەوت کرد، هەتا توانی تاقمە قەنەفەیەك بکڕێ. جا خۆی و ژنەکەی زۆر پێی دڵخۆش بون. لە کاتێکدا ئەوان ئاگایان لێ نەبوو، منداڵەکەیان بە موس تاقمە قەنەفەکەی دڕاند، کاتێ باوکی ئەمەی بینی، شێتگیر بوو یەکسەر بە داری تیژ زۆر بە توندی لە پەنجەکانی منداڵەکەی دا، بۆ بەیانی پەنجەکانی منداڵەکە ئیلتهابی کرد، پزیشك بڕیاری بڕینەوەی دا، ئەوەبوو لە نەخۆشخانە پەنجەکانیان بڕیەوە.

جا دوای نوژداریەکە، باوکەکە سەردانی کوڕەکەی کرد، کوڕەکەی هاواری کرد:

بابە، بابە پەنجەکانم بۆ بگەڕێنەوە، ئیتر تاقمەکە نادڕێنم. کاتێ باوکەکە گوێی لەم قسەیە بوو، گوللەیەکی لە خۆیداو خۆی کوشت...

با بەردەوامی ئەوە بزانین، منداڵ پێویستی بە سۆز و خۆشەویستی هەیە، هەروەك چۆن پێویستی بە خواردن و خواردنەوە هەیە، جا لە سایەی خۆشەویستیدا دەرون و کەسایەتیی گەشە دەکات.

## دایـك و بـاوك كە منداڵیـان دەمریٚ و ئـارامی لەسـەر دەگـرن پـاداشـتیان بۆ هـەیە

ئەبو سەعیدی خودری دەگێڕێتەوە: ((إن رسول الله ﷺ قال للنساء: ((ما منكم امرأة يموت لها ثلاثةٌ من الولد إلا كانوا لها حجاباً من النار!)) فقالت امرأة: وإثنان؟ فقال: وإثنان))[١]، واتە: پێغەمبەری خوا بە ئافرەتانی فەرمو: هەر كەسێك لە ئێوە سێ منداڵی بمرێ، ئەو منداڵانە دەبن بە پەردەیەك بۆ پاراستنیان لە ئاگری دۆزەخ.

جا ژنێك گوتی: ئەدی ئەگەر دو منداڵی بمرێ؟ فەرموی: گەر دو منداڵیشی بمرێ، هەمان شتی بۆ هەیە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ما من مسلم يموت له ثلاثة من الولد لم يبلغوا الحنث، إلا تَلَقّوه من أبواب الجنة الثمانية من أيهما شاء دخل))[٢]، واتە: هەرمسوڵمانێك سێ منداڵی بمرێ كەبالغ نەبوبن، ئەوا ئەو منداڵانە لەبەردەم هەر هەشت دەرگای بەهەشتەوە پێیان دەگات، كە لە كامە دەرگاوە ئارەزوی دەكات دەچێتە ژوردوە.

((ما من مسلم يموت له ثلاثة من الولد لم يبلغوا الحِنْثَ، إلا إدخله الله الجنة بفضل رحمته إياهم))[٣]، واتە: هەر مسوڵمانێك سێ منداڵی بمرێ، كە نەگەیشتبنە حەدی باڵغ بون، ئەوا خوای بەخشندە بە فەزڵ و بەزەیی خۆیەوە، لەبەر ئەم منداڵانە ئەو مسوڵمانە دەباتە بەهەشت.

---

١) رواه البخاري والنسائي .

٢) حديث صحيح .

٣ رواه البخاري ومسلم والنسائي

## منداڵ شەفاعەت بۆ دایك و باوكی دەكات

ئەبو حەسان گوتویەتی: ((توفي إبنان لي، فقلت لأبي هريرة: سمعتَ من رسول الله ﷺ حديثاً تحدثنا، يطيب أنفسنا عن موتانا: قال نعم! صغارهن دعاميص الجنة، يلقي أحدهم أباه -أو قال أبويه- فيأخذ بناحية ثوبه أو بيده كما آخذ بِصنَفَةِ ثوبك هذا، فلا يفارقه حتى يُدخله الله وأباه الجنّة!))[١]، واتە: دو كوڕم مردون، جا بە ئەبو هورەیرەم گوت: گوێم لە فەرمودەیەكی پێغەمبەری خوا بوە دەربارەی مردوەكانمان، كە دەبێتە مایەی دڵنەوایی و ئارامی دڵ و دەرونمان. ئەویش گوتی: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: منداڵەكانیان چۆلەكەی بەهەشتن، یەكێك لەو منداڵانە بە باوكی -یان فەرموی دایك و باوكی- دەگات، لچكی كراسەكە، یان دەستی دەگرێ، وەك چۆن لچكێكی كراسەكەت ئاواهی دەگرم، جا ئەو منداڵە لێی جیانابێتەوە، تا خوای گەورە منداڵەكەو دایك و باوكی دەباتە بەهەشت.

---

١) رواه مسلم .

## ژن دەتوانێ خەمی مێردەکەی کەم بکاتەوە

ئەنەس گوتویەتی: ((إشتكى إبن لأبي طلحة، فمات، وأبو طلحة خارج، ولم يعلم بموته، فلما رأت امرأته أنه قد مات، هيأت شيئاً ونحّته في جانب البيت. فلما جاء أبو طلحة قال: كيف الغلام؟ قالت: قد هدأتْ نفُسه. وأرجو أن يكون قد إستراح! ثم قربت له العشاء، ووطّأت الفراش، فلما أصبح اغتسل، فلما أراد أن يخرج أعلمتْه بموت الغلام، فصلّى مع النبّي ﷺ ثم أخبره بما كان منها، فقال النبّي ﷺ: ((لعله يبارَك لكما في ليلتكما))! فجاءهما تسعة أولاد، كلهم قرؤوا القرآن))[1]، واتە: کوڕێکی ئەبو تەڵحە توشی نەخۆشی یەك بو، بە هۆی نەخۆشی یەکەوە مرد، لەو کاتەش ئەبو تەڵحە لە دەرەوەی ماڵ بو، نەشی زانیبو کە کوڕەکەی مردوە، خێزانەکەی، کە بینی کوڕەکەی مردوە، شتێکی ئامادە کردو لە لایەکی ماڵەکەی دانا.

کە ئەبو تەڵحە هاتەوە گوتی: کوڕەکە چۆنە؟ ژنەکە گوتی: هێدی بۆتەوە، داوام وایە کە حەسابێتەوە! پاشان ژنەکەی نانی شێوانی بۆ داناو جێگای نوستنی بۆ ئامادە کرد، کە بەیانی داهات ئەبو تەڵحە خۆی شوشتو ویستی بچێتە دەرەوە، ژنەکەی هەواڵی مردنی کوڕەکەی پێدا. ئەبو تەڵحە چو نوێژی لەگەڵ پێغەمبەر کرد، پاشان ئەم ڕوداوەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بەڵکو خوای گەورە بەرەکەت بهاوێتە ئەم شەوەتان -واتە کاتی جوتبونتان-. خوای گەورەش نۆ منداڵی پێ بەخشین، کە هەمویان قورئان خوێن بون.

---

١) رواه البخاري بنحوه .

## جێگەی نوستنی منداڵان لەیەکتری جیا بکەنەوە

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((مروا أولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع، واضربوهم عليها وهم أبناء عشر، وفَرِّقوا بينهم في المضاجع))[١]، واتە: لە تەمەنی حەوت ساڵیدا فەرمانی نوێژکردن بە منداڵەکانتان بدەن، لە تەمەنی (دە) ساڵی گەر نوێژیان نەکرد لێیان بدەنو، جێگەی نوستنیان جیا بکەنەوە[٢].

---

١) رواه أبوداود (حديث حسن)

٢) جیا کردنەوەی جێگەی نوستنی منداڵ لە تەمەنی (دە) ساڵی، ئەدەبێکی ئیسلامی گرنگە، کە بەداخەوە زۆر کەس فەرامۆشیان کردوە، کە یەکێك لەو کەسانە لەلام دانی پیادا هێنا، کە بە هۆی فەرامۆشکردنی ئەو فەرمانەی پێغەمبەر، دەست درێژی کردۆتە سەر پوریو کچی پوری!

لە کتێبی (طوق الحمامة)ی ئیمام (ئیبن حزم) هاتوە، ژنێکی عەرەب، کە لە خزمێکی سکی پڕ ببو، پرسیاری لێکرا: ئەوە چیە لە سکت؟! گوتی: نزیکیی سەرین، درێژی شەو! بە واتای ئەم کارەساتە لە ئاکامی نوستن پێکەوە، یان نزیکی لەو و، زۆر تێکەڵاو بون لەنێو خزمەکانیدا ڕویداوە!

ئەوەی دەبێتە بەڵگەی گەورەیی ئیسلام و پێشکەوتنی مەبدەئەکانی ئەوەیە، کە تیۆری جیاکردنەوەی نوستنی منداڵ، پێغەمبەر ﷺ پێش چوارده سەدە فەرمانی پێکردوین، ئەمڕۆ زانایان لە کتێبە پزیشکیو جنسییەکاندا، هانی لەسەر دەدەنو لایەنە باشەکانی ئاشکرا دەکەنو حەزەر بە فەرامۆش نەکردنی دەدەن.. لە کتێبی (صرح طفلك عن الجنس) لە دانراوی (کۆمەڵەی لێکۆڵینەوەی منداڵ لە ئەمریکا)دا هاتوە: (منداڵەکان نابێ لە یەك پێخەفدا بخەون، هەروەها باشتر وایە لەیەك ژور نەخەوێنرێن، ئەو منداڵانەی لە یەك پێخەفدا دەخەون، بەشێوەیەکی ڕێکخراو توشی لێك خشاندنو پێکەوە نوسانی جەستەیی دەبن، کە لەوانەیە بە هۆیەوە گەمە پێکردن ڕو بدات...

خەوتنی منداڵیش لەگەڵ دایك و باوکی لەیەك ژوردا، کارێکە هەرگیز پێی ناگوترێ

## مافەكانی دایكو باوك

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا، وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴾(الإسراء- ٢٣)، واتە: پەروەردگارت فەرمانی داوە لەو زیاتر كەسی تر نەپەرستن و، لەگەڵ دایكو باوك بە باشی رەفتار بكەن. گەر یەكێكیان لە لات پیر بون پێیان مەڵێ ئۆف لەبەر بێزاری، گەر داوای شتێكیان لێ كردی. گەر شتێكت بە دڵ نەبو سەركۆنەو سەرزەنشتیان مەكە. قسەی خۆش و نەرمو نیانیان لەگەڵ بكەو باڵی ملكەچی بەزەیی یان بۆ رابخە. بڵێ خوایە رەحم بە دایكو باوكم بكە، وەك ئەوان منیان بە بچوكی بەخێو كردووە پێگەیاندوە [1].

---

حیكمەتو دانایی. منداڵ كە دەخەوێ وا پێدەچێ خەوتوە، بەڵام ئاواش نی یە، تەنانەت ئەوانەی لە تەمەنی دو ساڵی یان سێ ساڵی دان، لە كاتی هەست كردن بە دیاردەی كرداری جنسی دایكو باوك لەسەرجێ دا، دەترسن.. تەنانەت تاریكیش نابێتە پەردە لەبەردەمیاندا، چونكە منداڵی بچوك لە دەنگە دەنگدا توشی دڵەراوكێ دەبێت!!

دەتوانین بڵێین زۆربەی حاڵەتەكانی كزی جنسی، كە لە منداڵان رو دەدات، هۆیەكەی فەرامۆش كردنی جیاكردنەوەی شوێنی نوستنیانەو، نوستنیانە لە ژوری دایكو باوك، هەمو ئەمانەش بە شەرعی خواو عەقڵیش قەدەغەیە، كەواتە با دایكو باوكان ئاگاداربن.

١) ئەمە هەستی سروشتی یە بەرامبەر بەو كەسەی، كە چاكەكردنیان، توشی بێزاری نەكردونو بە هەوڵ كۆشش دانیان داوای پاداشت ناكەن، بەڵكە هەمو چاودێریی بەردەوامو بەزەیی یەكیان خستۆتە گەڕ، لەبەر نزیكیو سروشتی یەتی، كە هیچی كەمتر نی یە لە سوپاسو پێزانین، ئەمەش بۆ ئەوەی وەفایی مرۆڤایەتی بپارێزێ لە دەردەكانی پێنەزانینو نكوڵی كردن.

هەروەهـا خوای بـالاّ دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ لاَ تَعْبُدُونَ إِلاَّ اللهَ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾ (البقرة- ٨٣)، واتە: کاتێك پـەیمانی متمانەییمان لە بەنی ئیسرائیل وەرگرت، کـە جگـە لـە خـوا کەسـی تـر نەپەرستن و بەندایەتی بۆ نەکەن و، لەگەڵ دایك و باوکانیش باش بن.

دەفەرمـوێ: ﴿وَوَصَّيْنَا الإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًـا عَلَـى وَهْـنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنْ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾ (لقمان- ١٤)، واتە: فەرمانمان بە ئـادەمیزاد کـردوە لەگـەڵ بـاوك و دایکـی بـاش بـێ و چاکەیان لەگەڵدا بکات، چونکە دایـك بـە هـۆی سـك پـڕی یـەوە توشـی بێهێزی و سستی لەش و (مضاعفات) دەبێ. ئەم دایکە بۆ ماوەی دو سـاڵ

---

بە ئەرکی خۆمان دەزانین، کە ئێمە دەربارەی ژن و مێردی ئیسلامی بەختەوەر دەنوسین، قسە لەسەر مافەکانی دایك و باوك بکەین، کە لە لایـەن ژنـەوە، یـان لـە لایـەن کـوڕە تاوانبارەکەیانەوە، بە ئاڕاستەی هاوسەرە بەدکارەکەی خراپەیان بەرامبەر دەکرێ، نازانن بەم کردەوەیان یەکەم بەردی بناغەی جیابونەوە و روخانی بەختەوەریان دادەنێن، چـونکە خوای گەورە لە مافەکانی باوك و دایك بێئاگا نابێ، تۆڵەش دەسـتێنێ بـۆ ئـەو دایـك و باوکەی، کە ئەوپەڕی تواناو کۆشـشیان سـەرف کـردوەو شـەونخونیان کـردوە لـە پێنـاو بەختیارکردنی کوڕەکـەیان، کـە لـە تەمـەنی گەورەیـدا خـۆ بـەزل زانینیـان بەسـەردا دەسەپێنێ.

ئێمە کە لەسەر بەختەوەری خێزانی مسوڵمان سورین، ئەم ئامۆژگاری و راسپاردانەمان پێشکەش کردن، ئاواتەخوازین ژن و مێرد لێی بێ ئاگا نەبن، ئەمـەش چـی تـێ ناچـێ، تەنها دابەزین لە هەندێ خۆپەرستیان داو، بیر لە بەساڵاچونی خۆیـان بکەنـەوە، چـونکە خوای گەورە نامرێ، چۆن بیت ئاوات لەگەڵ دەکرێت چ بچێنی ئەوە دەدوریەوە!

بەختەوەرترین کەس ئەوەیە، کە کۆشش دەکا بۆ دڵخۆش کردن و شادی خستنە نێو دڵی باوك و دایکی یەوە، ئەمەش تەنها هەندێك سۆزو کەمێك لە قوربانی و پەلـەکردنی دەوێ، بۆ ئەو پەیڕەوەی کە ئیسلام دایناوەو ئەو پلانەی دایناوە بۆ مافەکانی دایك و باوکی.

شیری دەداتێ. لەبەر ئەوە سوپاسی من بکەو سوپاسی دایكو باوکت بکە، چارەنوسیشتان گەڕانەوەیە بۆ لای من.

هەروەهـــا دەفەرمــوێ: ﴿وَوَصَّيْنَا الإنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلاثُونَ شَهْرًا﴾(الأحقاف- ١٥)، واتە: فەرمانمان بە ئادەمیزاد کردوە چاکە لەگـەڵ دایـكو باوکیـا بکـات، چونکە دایکی بە ئێشو ئازارو ناخۆشی‌یەوە نۆ مانگ لە سکیدا هەڵیگرتوە، کاتێکیش لەدایك بوە، بە هەمان شێوە ئێشو ئازارو ئەشکەنجەی بینیـوە. جا بە حەملو لەشیر بڕینەوەکە دەکاتە (٣٠) سی مـانگ، دایکەکـە لـەم ئازارە دایە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ألا أنبئكم بأكبر الكبائر؟ الـشرك بـالله، وعقوق الوالدين))[١]، واتە: ئایا هەواڵی گوناهە هەرە گـەورەکانتان پـێ ڕابگەیەنم؟ بریتین لە هاوبەش دانان بۆ خواو ئازاردانی دڵی دایك و باوك.

((جاء رجل الى النبي ﷺ يسأله: يا رسول الله من أحق الناس بحسن صحابتي؟ قال أمك! قال: ثم من؟ قال: أمك. قال: ثم من؟ قال: أمك. قال: ثم من؟ قال: أبـوك)) (رواه البخـاري ومـسلم)، واتــە: پیاوێـك هاتـە خزمەت پێغەمـبەر ﷺو لــێی پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا! کێ لە هەمو خەڵك شایـستە ترە بیکەمــە هـاودڵمو چـاکەی لەگەڵـدا بکـەم؟ فـەرموی: دایکت. گوتی: پاشان کێی تر؟ فەرموی: دایکت. گوتی: پاشان کێی تـر؟ فەرموی: دایکت. گوتی: پاشان کێی تر؟ فەرموی: باوکت .

---

١) رواه البخاري .

((رغم انف من أدرك والديه عند الكبر أو أحدهما ولم يدخل الجنّة))[١]، واته: لوتی ئەو کەسە بەقورِ داچێ، کە دەگات بە دایكو باوکی، یان یەکێکیان لەکاتی پیریو، خزمەتێکی وایان ناکات کە پێی بچێتە بەهەشت.

دەفەرموێ: ((أنت ومالك لوالدك! إن أولادكم من أطيب كسبكم، فكلوا من كسب أولادكم))[٢]، واته: تۆو ماڵو سامانت هی باوکتە! منداڵەکانتان لە باشترین دەستکەوتی ئێوەن، دەکەواتە لە دەستکەوتی منداڵەکانتان بخۆن.

دەفەرموێ: ((إن الله حرم عليكم عقوق الأمهات))[٣]، واته: خوای گەورە ئازار دانی دڵی دایکانی لەسەرتان حەرام کردوە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق))[٤]، واته: گوێڕایەڵیو فەرمانبەری کەسێك ناکرێ، کە سەرپێچی فەرمانەکانی خوا بکات.

---

١) رواه مسلم والترمذي .

٢) رواه أحمد في المسند وأبوداود (حديث صحيح) .

٣) رواه البخاري .

٤) رواه أحمد في المسند (صحيح) .

# فیتنەی ئافرەت

## لە ئافرەت بگەڕێ

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ما تركتُ بعدي فتنةً أضَرَّ على الرجال من النساء))[1]، واتە: لە دوای خۆم هیچ تاقیکردنەوەیەك، وەك تاقیکردنەوەی ئافرەتان بۆ سەر پیاوانم بەجێ نەهێشتوە، کە ئاوا کاریگەر بێ.[2]

---

١) رواه البخاري ومسلم

٢) هەندێك گوتویانە: شەیتان بە ئافرەت دەڵێ: تۆ نیوەی سەربازی منی، تۆ تیرێکی منی دەیهاوێژمو ئامانج دەپێکم، جانیوەی سەربازەکەی بریتی‌یە لە ئارەزوبازی (الشهوة)، نیوە سەربازەکەی تری بریتی یە لە توڕەیی (الغضب).

یەکێك لەژێر سەردێری (ژن لەدوای هەر هەنگاوێکە، کە لە ژیان هەنگاوی دەنێی، خۆی شاردۆتەوە) گوتویەتی: ژن لە دواوەی هەمو بەدبەختی‌یەکە، هەروەها هۆی بەختەوەریشە، ئافرەت پاڵت دەنێ بۆ ئاواتی زۆر.

ئافرەت ئەو مرۆڤە سادەو ئاڵۆزەیە، ئەو شەماڵە سیحرو چێژە جوانەیە، تاوانو شتە خراپەکانە، ئەو بایە گەرمەی ئاگری غەزەبە!

لەو جەستە لاوازو ناسکە، بەهێزترین هۆکارەکانی سیحری تێدا شاراوەتەوە، هەروەها تاوانو کاری خراپیش. هەر لەم جەستە بێ‌هێزەدا هۆکارەکانی کارە چاكو پاكو جوانەکان شاراوەتەوە!

سەری بچوکی شۆڕشو ئاگرە، هەروەها هێمنیو شێتیو ژیریو ڕۆشنی تێدایە. لەبەر هەمو ئەمانەو مەترسی ئافرەت، وەك لە پێشەوە باس کرا، پێغەمبەر ﷺ ڕای سپاردوە، کە ئافرەتی دیندار لە بێ‌دین بە باشتر دابنرێ. قبوڵ کردنی دینو سور بون لەسەری، مانای ویستی ئیسلامە لە بەرقەراری خێزانو خۆشگوزەرانی.

هەروەها دەفەرموێ: ((إن الدنيا حلوة خضرة، وإن الله مستخلفكم فيها، فينظر ماذا تفعلون، فاتقوا الدنيا واتقوا النساء، فإن أوّل فتنة بني إسرائيل كانت في النساء))[1]، واتە: دنیا سەوزو شیرینەو خوای گەوردش ئێوەی تێدا جێنشین کردوە، تەماشاش دەکات بزانێ چی دەکەی.

کەواتە: لە ڕازاوەیی‌و، لە ڕێ لادەری دنیا خۆتان بپارێزن‌و لە شتە فریودەرەکانی ئافرەت‌و فێڵ‌و تەڵەکە شەیتانیەکانیان خۆتان بپارێزن، چونکە یەکەم تاقیکردنەوەی بەنی ئیسرائیل بە هۆی ئافرەتانەوە بو.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لولا حواء لم تخن أنثى زوجها الدهر!))[2]، واتە گەر دایکە حەوا نەبوایە، بەدرێژایی ڕۆژگار، هیچ ئافرەتێك ناپاکی لە مێردەکەی نەدەکرد.[3]

---

هاوسەری بێدین بارگرانی‌یە لەسەر مێردەکەی‌و وەچەکەی، نمونەی وەك ئەوەیە، کە ناتوانێ لەبەردەم کۆسپ‌و تەگەرەو ناخۆشی‌و بەڵایەکانی دنیا خۆی ڕابگرێ، لە ژیانیشدا بەختیار نابێت. بەڕاستی مێینەی ئافرەت‌و فیتنەیی ماڵی‌و سامانی‌و ڕەچەڵەکی، بەختیاری ناکات، خێزانەکەشی بەختیار ناکات، تا بیگۆڕێ بۆ بەروبومێکی ئارەزومەندو بەزەیی یەکی فراوان‌و ڕابواردنێکی سودمەندو توێشویەکی دیاریکراو.

لەم بارەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إن الدنيا متاع، وخير متاعها المرأة الصالحة)). (رواه مسلم والنسائي) (الأسرة في الإسلام)

علامة صديق حسن خان لە کتێبەکەی (حسن الأسوة) گوتویەتی: ئافرەت فیتنەن (واتە تاقیکردنەوەی پیاوانن)، چونکە سروشتی پیاو زۆر بە لایاندا دەچێت، لە پێناو ئەوان توشی حەرام دەبێت، بە هۆی ئەوانەوە هەوڵی کوشتارو دوژمنایەتی دەدرێت، کەمترین شت لەمەدا ئەوەیە، کە لە دنیادا ئارەزوت لێی بێ‌و، گەندەڵ کردنیشی زیانی زۆرترە.

١) رواه مسلم .

٢) رواه مسلم

٣) (مناوی) لە (فیض القدیر)دا لە ڕاڤەی ئەم فەرمودەیە گوتویەتی:... بە واتای گەر خیانەتی دایکە حەواء بۆ ئادەم نەبوایە بە گومڕاکردنی‌و هاندانی لەسەر سەرپێچی

کردنی فەرمانی خوا بە خواردنی درەختەکە، ئەوا هیچ ئافرەتێك خیانەتی لە مێردەکەی نەدەکرد، چونکە دایکە حەوا دایکی ئافرەتانە، جا ئافرەتانی بەو چواندوە، گەر ئەو ئەم ڕێ یەی نەگرتبا بەر، هیچ ئافرەتێك لەگەڵ مێردەکەی ئەم ڕێ یەی نەدەگرتە بەر، جا کە ناپاکی کرد، ئەم ناپاکی یە لە نێو کچەکانی بڵاوەی کرد، کەم ئافرەت هەیە لە ناپاکی مێردەکەی دەرباز بێت، جا بە کردەوە بێت یان بە گوفتار.

مەبەست لە ناپاکی داوێن پیسی(زنا) نی یە، حاشا نەخێر! بەڵکو دایکە حەوا مەیلی دا بە ئارەزوی نەفس بە خواردنی درەختەکە، ئەمەش بۆ باوکە ئادەم رازایەوەو جوان کرا، کە فەرمانی ئیبلیس جێبەجێ بکات، کە ئەمە بە ناپاکی ئادەم دانرا، بەڵام ئەو ئافرەتانەی دوای ئەو دێن، کە ناپاکیەکیان لێ ڕودەدات بەهۆی ئەودوەیە!

ئەم فەرمودەیە ئاماژەیە بۆ دڵدانەوەی پیاو لەوەی، کە لە ژنەکانیان دەیبینن و ڕودەدات، وەك لە دایکە گەورەیان ڕوی داوە! ئەمەش لە سروشتیانەوەیەو بۆیان ماوەتەوە.

کەواتە لە کەمتەرخەمی کردنیان بەبێ مەبەست لۆمەیان ناکرێ، هەروا پێویستە ئافرەتان خۆیان بەجۆرە ئاسانیو لەسەرخۆیی یە ڕانەهێنن، بەڵکە دەبێ نەفسی خۆیان زەبت بکەنو جیهادی هەواو ئارەزویان بکەن، بۆ ئەوەی لەلای خوای گەورە پاداشت بەدەست بێننو پلەو پایەی بەرز لەلای پیاو دەستەبەر بکەن.

## مەترسی کێشەی جنسی

ئیسلام گرنگی یەکی زۆری بە کێشەی جنسی داوەو تایبەتی یەکی بۆ داناوە، ئەویش بە چاودێری کردنی یەتی، وەك لەم کتێبەدا هەندێکی لێ باسکرا، ئەوەش دیارە لەبەر گرنگی پێدانو مەترسی یەکەیەتی.

بە بۆنەی ئەم ناونیشانەوە، پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، یەکەم تاوان لەسەر زەوی ڕویدا، هۆیەکەی جنس بوە!!

لە تەفسیری (إبن کثیر) هاتوە: ئادەم هەر منداڵێکی لە دایك بوبێ کوڕو کچی پێکەوە لە دایك بون، جا کوڕی ئەم سکەیان کچی سکەکەی تری دەکردە هاوسەری خۆی، کوڕی سکەکەی تر کچی ئەم سکەی دەکردە هاوسەر، تا ئەو کاتەی دو کوڕی لە دایك بو کە ناویان هابیلو قابیل بو.

قابیل خاوەنی بێستانێك بو، هابیلیش خاوەنی مەڕ بو. قابیل گەورەترینیان بو، کە خوشکێکی هەبو لە خوشکی هابیل جوانتر بو، هابیل داوای خواستنی خوشکی قابیلی کرد، قابیل ڕازی نەبوو گوتی: ئەوە خوشکمەو لەگەڵ من لە دایك بوەو لە خوشکی تۆ باشترە، من شایستەترم بیکەمە هاوسەری خۆم!.

باوکیشی فەرمانی پێدا، کە خوشکەکەی بدات بە هابیل، بەڵام ڕازی نەبو، جا هەردوکیان قوربانییێکیان بۆ خوای گەورە سەربڕی، تاوەکو بزانرێ کامەیان شایستەترن بە کچەکە، لەو کاتەدا ئادەم ﷺ لە لایان نەبو، جا ئاگرێك هاتو قوربانی یەکەی هابیلی خواردو وازی لە قوربانی یەکەی قابیل هێنا، قابیل توڕە بو، گوتی: دەتکوژم بۆ ئەوەی خوشکەکەی من نەکەیە هاوسەری خۆت!!..أ.هـ.[١]

---

١) بە کورتی ئیبن جریر گێڕاویەتەوە.

خـوای گەورە دەفەرموێ: ﴿زُيِّـنَ لِلنَّـاسِ حُـبُّ الـشَّهَوَاتِ مِـنَ النِّـسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُـسَوَّمَةِ وَالأَنْعَـامِ وَالْحَرْثِ﴾ (آل عمران- ١٤)، واتە: خۆشەویستی ئارەزووەکانی نەفسانی بـۆ خەڵك ڕازاوەتەوە، کە بریتی‌یە لە ژنـان[١]، منـداڵ، کیـسەی زێـڕو زیـو، ئەسپی خۆشڕەنگ‌و نیشانەدارو مەڕو ماڵات‌و کشتوکاڵ.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((أكثر مـا يُـدخِلُ النـاسَ الجنّـة تقـوى الله وحُسْنُ الخُلُق، وأكثر ما يُدخِلُ النار: الفم والفرج))[٢]، واتە: ئەوەی کە بە زۆری خەڵك دەباتە نێو بەهەشتەوە، لە خوا ترسان‌و ڕەوشت باشـی‌یـە، زۆربەی ئەوەش خەڵکی دەباتە نێو ئاگری دۆزەخەوە: زمان‌و داوێنە.

هەروەها دەفەرموێ: ((من وقاه الله شَرّ ما بين لَحْيَيْـهِ و شَـرَّ مـا بـين رِجْلَيـهِ دخل الجنّة))[٣]، واتە: هەر کەسێ خوای گەورە لە خراپەی زمانی‌و داوێنی[٤] بپارێزێ ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە.

---

١) لەم ئایەتەدا خوای گەورە ئافرەتی بە سەروی ئارەزووەکـان (الـشهوات) دانـاوە، لەبـەر ئەوەی لە هەمو لایەکەوە پێشڕەوی دڵی پیاوان دەکەن.. یەکێك لە ئافرەتـە صـاڵحەکان دەیگوت: لە بەدبەختیمان ئەوەیە، کە خوای گەورە لە پێـشەوەی ئارەزووەکـانی دانـاوین، پاشان ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە.

٢) رواه الترمذي (حديث حسن) .

٣) رواه الترمذي وابن حبان (حديث صحيح).

٤) یەکەم خوێن لەسـەر زەوی ڕێژرا، خـوێنی یـەکێك لـە کوڕەکـانی ئـادەم بـو بـە هـۆی پێشـبڕکێ کردن لەسەر ئافرەت، وەك لـە پێـشەوە باسـان کـرد، نـامۆش نـی‌یـە گـەر پێغەمبەری خوا ﷺ ڕزگار بون لە ئاگر بۆ کەسێك مسۆگەر بکات، کە زمان‌و داوێـنی بپارێزێت، لەو کەسانەش دەبێت، کە لە پێشەوە دەبن لە چونە بەهەشت.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إثنان يدخلان الجنّة: من حفظ ما بين لَحيَيْهِ ورِجْلَيهِ دخل الجنَّة))[١]، واتە: دو شت هەن دەبنە مایەی چونە بەهەشت: هەرکەسێ زمانو داوێنی لە گوناهـ و تاوان بپارێزێ، دەچێتە بەهەشتەوە.

هەروەها فەرمویەتی: ((اللّهم إني أعوذ بك من شَرِّ سمعي، ومن شَرِّ بصري، ومن شَرِّ لساني، ومن شَرِّ قلبي، ومن شر منيِّي!))[٢]، واتە: خوایە من پەنا بە تۆ دەگرم، لە خراپەکاری گوێو چاوو زمانو دڵمو، لە خراپەکاری داوێنم.

---

لەبەر ئەوەیە پاکخویی کردنو بە پاك ڕاگرتنو ناراستەکردنی غەریزەی جنسی، بۆ ڕێگای ڕاستو دروستو شەرعی بە گرنگترین شوێنو پایە دادەنرێت، چونکە سەلامەتیو هەستانەوەی ئومەت لەسەر ئەمە ڕادەوەستێ!

هەر بە بۆنەی قسەکردن لەسەر مەترسی کێشەی جنسی، باش وایە باسی ئەوە بکەین، کە بزاڤی چاکسازی ئایینی (اللوثری) لە ئەوروپا لە گرنگترین هۆیەکانی چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، وەك کە (مارتن لوثر) سەرۆکی ئەم چاکسازییە ئاشکرای کرد، کە بە پێی ئەوەی لە کتێبی (حیاتنا الجنسیة)ی دکتۆر (فریدریك کهن) هاتوە، گوتویەتی: (هەر کەسێك دەیەوێ بە زۆرەملێ گەرمایی جنسی کپ بکاتەوە، بە کەسێك دەچێ، کە بێهەستەو دەیەوێ قەناعەتمان پێ بکات سروشت پێچەوانەی ئەو شتەیە، کە ئێمە دەیناسین، نە ئاگر شت دەسوتێنێو، نە ئاویش شت تەڕ دەکاتو، نە پیاویش دەخوار دەخواتەوە!!)

لۆثەر بە قسەکانی بەرپەرچی تێگەیشتنەکانی ڕەوشتی کەنیسە دەداتەوە، کە بەسەر خەڵکیدا سەپاندوە، ئەویش بریتی یە لەو ڕەبەنی یەی خۆیان دایان هێناوە، ئەو قسەیەی دەڵێ:

جنس خودی خۆی شتێکی پیسە، نافرەت دروستکراوێکی شەیتانی پیسە، پێویستە خۆی لێ دور بخرێتەوە، هاوسەرگرتن (زواج)یش پێویستی یەکی غەریزەیی-ئاژەڵی-یە بۆ گشتی، بەڵام کەسی بەختەوەری تەقوادار ئەو کەسەیە، کە ژن نەهێنێ.

١) رواه الخرائطي (حديث صحيح) .

٢) رواه أبو داود (حديث صحيح) .

# خێزان له‌به‌رده‌م گێژه‌ڵوکه‌دا

## مه‌ترسی تێکه‌ڵاوی‌و
## به ته‌نها دانیشتن له‌گه‌ڵ ئافره‌ت

پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رموێ: ((ألا لا يبيتَنَّ رَجلٌ عِنْدَ إمرأةٍ ثَـيِّبٍ، إلا أن يكون ناكحاً أو ذا مَحْرَم))[١]، واته: با هیچ پیاوێك له‌ لای ژنێك شوی کردبێ نه‌مێنێته‌وه، مه‌گه‌ر ماره‌بڕی بێ، یان مه‌حره‌مێکی بێ -وه‌ك باوك‌و براو خاڵ و مام-.

هه‌روه‌ها ده‌فه‌رموێ: ((إن المرأة تقبل في صورة شيطان، وتدبر في صورة شيطان))[٢]، واته: ئافره‌ت له‌ ڕازاوه‌یی‌و فێڵ دا، له‌ شێوه‌ی شه‌یتان دێته‌ پێش پیاوو، له‌سه‌ر شێوه‌ی شه‌یتان پشت هه‌ڵئه‌کا.

هه‌روا ده‌فه‌رموێ: ((لا يخلونَّ رجلٌ بإمرأة إلا كان ثالثهما الشيطان))[٣]، واته: هه‌ر پیاوێك له‌گه‌ڵ ئافره‌تێك به‌ ته‌نهایی دانیشێت، ئه‌وا سێیه‌میان شه‌یتانه، که‌ دێته‌ نێوانیان‌و ده‌بێته‌ هانده‌ر بۆ خراپه‌کاری.

ده‌فه‌رموێ: ((لا يخلون أحدكم بامرأة إلا مع ذي محرم))[٤]، واته: نابێ هیچ که‌سێك له‌ ئێوه‌ له‌گه‌ڵ ئافره‌تێك به‌ ته‌نهایی‌و به‌ جوته‌ دابنیشن،

---

١) رواه مسلم .
٢) رواه مسلم .
٣) رواه الترمذي حديث صحيح واسناده جيد.
٤) رواه البخاري ومسلم

مەگەر مەحرەمێکی یان لەگەڵ دابێ[1].

(محمد طلعت حرب) لە پەرتوکەکەی (المرأة والحجاب)دا دەڵێ: تێکەڵاوی ژنو پیاوو هەڵگرتنی باڵاپۆشیی دو ئاواتی دێر زەمانی ئەوروپایە، بە شێوەیەکی وا، کە گشت کەسێك هەستی پێ دەکات.

دەڵێ: هیچ لەمپەرو بەربەستێك نەماوە بۆ ئەوەی کۆمەڵگەی ئیسلامی لە ڕۆژهەڵات بەرەو ڕوخان ببات، ئەمەش نەك تەنها لە میسر، بەڵکو گۆڕانکاری بەسەر ئافرەتی مسوڵمان هێناوەو بەردو ئەو خراپەکاریو بەدڕەوشتییەی بردون، کە ئافرەتی ڕۆژئاوای گرتۆتەوە. ئەمەش دەبێتە مایەی مەترسیو خەتەرناکی ڕەوشتی کۆمەڵگە.

هەندێك گەنجو لاو بە کوڕو کچەوە سەیریان بەوە دێ، کە نابێ کوڕو کچێك بە تەنهایی لە ژورێك کۆببنەوە، بەڵکو دەبێ برایەکی، یان

---

١) ئەم نەدەبە بەرزەی ئیسلام، لە کوێ لە ئاست دابو نەریتی بێگانە فاجیرەکان، کە ئەم جۆرە کۆبونەوەی پیاوو ژنی نامەحرەم بە تەنهاییو تێکەڵاوی ژنو پیاو بە کارێکی ئاسایی دادەنێن.

با خوێنەر ئاگاداری ئەم چیرۆکە بێت، کە باسی ڕادەی هەڵوەشانەوەی ڕۆژئاوا دەکات، کە لە ڕۆژنامەی (أخبار اليوم) ژمارە (٣)ی یۆنیۆی ساڵی ١٩٥٦ لە ژمارە ٦٠٨ لاپەڕە ٢ بڵاوی کردۆتەوە:

(پیاوێك لە ماڵەکەی خۆی، هاوسەرەکەی خۆی لەگەڵ پیاوێکی بێگانە بە ڕوتی گرتوە، وەك ڕۆژی لە دایك بونیان، بۆیە لە دادگا سکاڵای بەرز کردۆتەوەو داوای جیابونەوە (طلاق)ی کردوە لە هاوسەرە داوێن پیسەکەی، کە سوکایەتی بە کەرامەتیو کەرامەتی ماڵی هاوسەرییەتی پیرۆزی کردوە، بەڵام دادگای ئینگلیزی لە یەکێ لە دادگاکانی لەندەن، ڕەفتاری ئەم پیاوە کۆنەپەرستەی بە دڵ نەبوە، کە لەگەڵ پێشکەوتنی ڕۆژئاواییو کۆمەڵایەتی ناگونجێ!! بۆیە حوکمیان دا بە ڕەتکردنەوەی داواکەی، بە پاساوی ئەوەی لەسەر پیاو (هاوسەر) پێویستە ڕەچاوی بارودۆخو دابو نەریت بکات!!!).

خوشکێکی لەگەڵ بێ. بە بیروبۆچونی ئەم گەنجانە ئەم شێوازە، ڕێگەگرتنە لە سەربەستیو ئازادی یان، دیارە ئەوەش بە مەبەستی ئارەزوو هەواو هەوەسیانو ئارەزووبازیان، ئەمە دەڵێن.

ڕۆژنامەی (الجمهورية)ی میسری لە ڕۆژی ٩ی یۆنیۆی ١٩٦٢ سەروتارێکی بڵاوکردەوە لەژێر سەردێری: (ئافرەتێکی نوسەری ئەمریکی دەڵێ: مەهێڵن کورو کچ تێکەڵاو بن، ئافرەتان ببەستنەوە).-سەروتارەکە بە کورتی باس دەکەین-:

ناوی ئافرەتە نوسەرەکە (هیلسیان ستانسبری)یە، کە ڕۆژنامەنوسێکی ناودارە. ئەم ئافرەتە نوسەرە سەردانی زانکۆکانو سەربازگەکانی لاوانو دامەزراوە کۆمەڵایەتی یەکانی کۆماری میسری کرد، جا دەڵێ: کۆمەڵگەی عەرەبی (مەبەستی پێ ئیسلامی) کۆمەڵگایەکی ڕێكو پێكو ساغەو، لە سروشت (طبيعة) باشی ئەو کۆمەڵگایە ئەوەیە، کە پابەندی خوو نەریتیانن، کە کورو کچ لە سنورێکی مەعقولو دیاریکراودا ڕەفتار دەکەنو، نەریتێکتان هەیە، کە بەرەڵڵایی سێکسی بە حەرام دادەنرێت، کە ئەمە لە ڕۆژئاوا بە ئاسایی دادەنرێو هەرەشەش لە کۆمەڵگاو خێزانی ئەوروپاو ئەمریکا دەکات...

لەبەر ئەوە ئامۆژگاریم ئەوەیە، پابەندی ڕەوشتو خوو نەریتتانو، تێکەڵاو نەبونی کچو کوڕ بن. سەربەستی ئافرەتان سنوردار بکەنو بگەڕێنەوە چەرخی باڵاپۆشیو سەرپۆشین. کۆمەڵگەی ئەمریکی بوەتە کۆمەڵگەیەکی وشكو بێ سۆزو عاتیفە، پڕە لە بەرەڵڵایی کاری جنسیو ئافرەتی ڕوت، بونەتە قوربانی تێکەڵاوی سەربەستی بێسنور، کە لاوەکانیان تەمەنیان پێش ئەوەی بگاتە بیستساڵی لە گرتوخانەکانو

شۆسته‌کان‌و خانوه نهێنی‌یه‌کان ده‌بینرێنه‌وه! ئه‌و سه‌ربه‌ستی یه بێ سنوره‌ی به‌خشیمان به کچ‌و منداڵه‌کانمان، وای لێ‌کردن بین به چه‌ته‌کانی (جیمس دین)و چه‌ته‌ی مادده بێهۆشکه‌ره‌کان‌و کۆیله سپی یه‌کان.

تێکه‌ڵاوی کورو کچ‌و به‌ره‌ڵلایی‌و سه‌ربه‌ستی، له کۆمه‌ڵگای ئه‌وروپی‌و ئه‌مریکی، خێزانی خسته مه‌ترسی‌یه‌وه‌و قییه‌م‌و ئه‌خلاقی خسته له‌رزه، له گرنگترین ئه‌و قسه‌یه‌ی له ڕێگه‌ی گومڕایی زانستی هاته ناو ئوممه‌ته‌که‌مان ئه‌وه بو، تێکه‌ڵاوی نێوان کورو کچ سروشته‌کان پاك ده‌کاته‌وه‌و ده‌بێته شتێکی ئاسایی‌و، بیرکردنه‌وه له مه‌سه‌له‌کانی جینس که‌م ده‌کاته‌وه.. ئه‌مه‌ش درۆیه به ده‌می زانسته‌وه ده‌کرێ، که واقعی ژیان ئه‌مه به درۆ ده‌خاته‌وه. په‌یوه‌ندیم به یه‌کێك له زانا ده‌رونناسه میسرییه‌کانه‌وه کرد، که باوه‌ڕیان به‌م تیۆره گه‌نده‌ڵه هه‌بو، پێم گوت: گه‌ر ئه‌مه ڕاست با، ده‌بوایه ئه‌و تێکه‌ڵاویه ته‌واوه‌ی ژن‌و مێرد ببێته هۆی دورکه‌وتنه‌وه‌یان له مه‌سه‌له‌کانی جنسی! ئه‌مه‌ش ڕاست نی‌یه.

## ئـەی ژنـی میـرددار وریـابـە!

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **((لا تباشر المرأة فتنعتها لزوجها كأنه ينظر إليها))**[١] ، واتـە: بـا ئـافرەت وەسـفی جـوانیو شـۆخو شـەنگی ئافرەتێکی تر بۆ مێردەکەی نەکات بەو شـێوەیەی، کـە وا لـە مێردەکـەی بکات تەماشای بکات، ئاوا وەسفی دەکات، کـە دەیهێنێتـە پـێش چـاوی وەك بڵێی تەماشای دەکات.

ئەم تەوجیهەی پێغەمبەر ﷺ، دەرونی ئـادەمیزاد بـە دیـار دەخـاتو دەیناسێنێو مەترسی یەکەشی دەخاتە ڕو، کە زۆرجار بە هۆی وەسف کردنی ئافرەتێك بۆ پیاو، دەبێتە هۆی ئەوەی دڵی پیاوەکە بۆ لای ئافرەتە وەسـف کراوەکە بچێ، نیازی خراپی هەبێو ئافرەتەکە ببێتە نێچیری خۆشەویستی.

هیچ گومانیش لەوەدا نیە ﴿**وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى ۞ إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى**.... بـە ئـارەزوی خـۆی قـسە ناکـات، هـەرچ دەیڵـێ لـە خـواوە تێگەیەنراوە﴾**(النجم : ٢-٣)**.

ئیبن القیم دەڵێ: ئەو شتانەی دەبنە هۆی خۆشەویستی بۆ خۆشەویستراو چوارن:

یەکێکیان: تەماشاکردن بە چاو، یان بە دڵ، کـە بـۆی وەسـف دەکـرێ، چونکە زۆربەی خەڵك خۆشەویستی یان بەبێ بینیـن بۆ دروست دەبێ.

جـا لەبـەر ئەمـە پێغەمبـەر ﷺ حـەرامی کـردوە ئـافرەت وەسـفی ئافرەتێکی تر بۆ مێردەکەی بکات[٢]..

---

١) رواه أحمد في المسند والبخاري وأبوداود والترمذي (حديث صحيح) .

٢) روضة المحبين، لاپەڕە ٨٨ .

## پاراستنی ئافرەتو پارێزگاری کردنی

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((لا يَحِلُّ لإمرأة تؤمن بالله واليوم الآخر أن تسافر سفراً يكون ثلاثة أيام فصاعداً إلا ومعها أبوها أو أخوها أو زوجُها أو إبنُها أو ذو مَحْرَمٍ))[1]، واتە: ئافرەتێك كە بڕوای بە خوای گەورەو ڕۆژی دوایی هەیە، بۆی حەڵاڵ نیە سەفەر بۆ شوێنێك بكات، كە ماوەكەی لە سێ ڕۆژ بەرەو سەرەوە زیاتر بێت. مەگەر باوكی، یان براكەی، یان مێردەكەی، یان كوڕەكەی، یان مەحرەمێكی لەگەڵ دابێ.

پیاوێك دانی بەم ڕاستی‌یە هێناو دەڵێ: لە شارێك بوم، بە دوای ژنەكەم نارد، كە بێتە لام، ئەویش لە شارێكی تر بو. جا لە كاتی دیاریكراودا چاوەڕوانیم كرد، بەڵام فڕۆكەكە هەر نەگەیشت. لە فڕۆكەخانەكە بە تەلەفۆن پرسیارم كرد، ئەوانیش گوتیان: فڕۆكەكە شتێكی خراپ بودو ئیش ناكاتو ناچار بوە بە مەبەستی چاك كردنەوەی لە شوێنێك بنیشێ، پاش سەعاتێكی تر فڕۆكەكە دەگاتە شوێنی خۆی، پاشان فڕۆكەكە گەیشت.. ژنی پیاوەكە لەسەر فڕۆكەكە دابەزی، مێردەكەشی چو لە تەنیشت ژنەكەی ڕاوەستا. ئەو ئافرەتەی خزمەتی ناو فڕۆكەكە دەكات (مضيفة) بە ژنەكەی گوت: خواحافیزیت لە فڕۆكەوانەكە كرد؟ كاتێ ئەو قسەیەی گوت نەیزانی ئەو پیاوەی لە تەنیشت ژنەكەیە مێردیەتی.

مێردی ژنەكە زانی چی ڕویداوەو چی بوە، چونكە فڕۆكەوانەكە فێڵی لە سەرنشینەكان كردبو بە بیانوی بونی خەلەلێك لە فڕۆكەكە، كە ماوەی

---

١) رواه البخاري ومسلم وغيرهما .

کاتژمێرێك پێویستی بە چاککردنەوە هەیە، جا فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەیەك نیشتوەو سەرنشینەکانیش دابەزیون، پاش تێپەڕبونی کاتژمێرێك سەرنشینەکان گەڕابونەوە ناو فڕۆکەکە، لە ماوەی ئەم کاتژمێرەدا فڕۆکەوانو یاریدەدەرەکەی ئیشی خۆیان لەگەڵ بەجێ هێنابو، واتە: زینایان لەگەڵ کردبو! ئەم ڕوداوە مایەی پەندو ئامۆژگاری یە بۆ ئەو کەسەی پەندو وانە وەردەگرێت.

ئافرەت لە کاتی سەفەرکردندا، کە یەکێکی مەحرەمی لەگەڵدا دەبێ، ئەم مەحرەمە دەبێتە سودمەند بۆی، بەوەی یارمەتی دەداتو لە دەستدرێژی دەیپارێزێت.

یەکێك لە ئافرەتە بەرەڵلاو گاڵتەجارەکان، کە گوێبیستی ئەم فەرمودەیەی پێشەوە بو، بەلایەوە سەرنج ڕاکێشەرو گرنگ نەبو. ئەوەبو خوای گەورە وای ڕێك خست لەگەڵ خێزانەکەم سەفەر بکەم، کاتێك ئافرەتەکە هات خوا حافیزیان لێ بکات، بینی من چۆن بومەتە یارمەتیدەری ژنەکەم لە هەڵگرتنی کەلو پەلی سەفەر. ئەو کاتە دانی بە حیکمەتی فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ دانا.

## ڕوانینی حەرام تیرێکە لە تیرەکانی شەیتان[1]

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذٰلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللّٰهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ، وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ﴾ (النور: ٣٠-٣١)، واتە: بە پیاوە بڕوادارەکان بڵێ: با چاویانو نەوی کەن لە ئاست ئافرەتی بێگانە (نامەحرەم)، با داوێنیان بپارێزن لە خراپەکاریو زیناو گوناهـ و تاوان. ئەم چاو دانەواندنە بۆ دڵی ئەوان پاکترو باشترە، خوای گەورەش ئاگادارە بەوەی ئەنجامی دەدەن. هەروەها بە ئافرەتە بڕوادارەکانیش بڵێ با چاویان نەوی کەن لە ئاست پیاوی بێگانە، با داوێنیان بپارێزن لە زیناو خراپەکاری، با جوانیو ڕازاوەیی خۆیان بە دیار نەخەن، تەنها ئەوە نەبێ کە بەدیار دەکەوێ -ئەویش دەمو چاوو دو دەستەکان دەگرێتەوە-، با سەرپۆشەکانیان بەسەر سنگو بەرۆکیاندا بێننە خوارەوە.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((إن الله كتب على ابن آدم حظّه من

---

١) بێداریو هۆشیاری ئیسلام چەندە گەورەیە، کە لێ نەگەڕاوە مسوڵمان بە پێی هەواو ئارەزوو ڕەفتاری جنسی خۆی، پلان بۆ خۆی دابنێ، هەتا گەر تاوانی زینای لێ ڕودا، خۆیو کەسانی تر بە هیلاك بداتو شایستەی سزای دنیاو ئاخیرەت بێت، بەڵکو ئیسلام هەموو ئەو دەروازە خراپانەی دەبنە هۆی تێوەگلان بەم تاوانە ناشیرینە، لەبەردەمی دادەخات: وەك ڕوانینی حەرامو سفورییو خۆپۆشتە نەکردنو تێکەڵاوی کچو کوڕو خۆ چواندن بە ئافرەتە بێبڕواکانو، نیشتەجێ بوون لە نزیکیانەوەو، فەرامۆش کردنی باڵاپۆشیو شتی تر، کە هەموو ئەم پیشەکیانە بەرەو خراپترین سەرەنجام کێش دەکات.

الزنى، أدرك ذلك لا محالة، فزنى العين النظرُ، وزنى اللسان النطق، والنفس تتمنى وتشتهي، والفرج يصدّقُ ذلك أو يكذّبه)) (رواه البخاري ومسلم وأبو داود والنسائي)، واتە: خوای گەورە بەشی زینای لەسەر ئادەمیزاد نوسیوە، مەحاڵیشە کە ئەم بەشە دەبینێ، ئەم زینایەش لەمانە پێك دێت: زینای چاو تەماشاکردنە بە حەرامی، زینای زمان بەکارهێنانێتی بە خراپەکاری، نەفسی مرۆڤیش هەردەم داوای ئەم کارە دەکات و ئارەزویەتی، ئەو کاتەش (داوێن- فرج) ڕۆڵی خۆی دەبینێ، کە یان زیناکە دەکات، یان نایکات.

جەریری کوڕی عبداللە گوتویەتی: ((سألت رسول الله ﷺ عن نظرة الفجأة فأمرني أن أصرف بصري))[1]، واتە: دەربارەی تەماشاکردنی لەناکاو ئافرەت، پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد، فەرمانی پێ‌کردم کە چاوم لێی لادەم.

ئیمام إبن القیم دەڵێ: (نظر) نەکردن چەند سودێکی هەیە:

یەکەم: ڕزگارکردنی دڵ لە ئازاری حەسرەت هێنان.

دودم: ڕۆشنایی و ڕەنگدانەوە لە دڵ بەجێ دەهێڵێ، کە لە ڕوخسارو ئەندامەکانی لەش بە دەردەکەوێ.

سێیەم: دڵ بەهێز دەکات و ئازایەتی پێ دەبەخشێ.

چوارەم: خۆشی و شادی و دڵ فراوانی دەدات بە دڵ، کە خۆشی‌یەکەی لە خۆشی تەماشاکردنەکە خۆشترە.

پێنجەم: دڵ ڕزگار دەکات لە دیلی و بەندایەتی شەهوەت و ئارەزوبازی.

شەشەم: دەرگایەك لە دەرگاکانی دۆزەخی لەسەر دادەخات.

---

[1]) رواه مسلم.

حەوتەم: عەقڵ بەهێزو زیـــاد دەکـات، چـونکە بـەرەڵڵاکردنی چـاو بـۆ تەماشاکردنی حەرام، لە کەمی عەقڵەوەیە...أ.هـ. [١].

## ڕاشکاوییەکی ئاشکرا (صـراحة مكشوفـة)

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إذا رأى أحدُكم إمرأةً، فوقعت في قلبه، فليعْمَدْ إلى امرأته، فليواقعها، فإن ذلكَ يُردُّ ما في قلبه))[٢]، واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە ئـافرەتێکی بـینیو کەوتـە دڵـی یـەوە، بـا بـچێتەوە لای ژنەکەیو لەگەڵیدا جوت ببێ، چـونکە ئـەم جوتبونـە دەبێتـە هـۆی ڕەت کردنەوەی ئەوەی کە چۆتە دڵیو دڵی پێی دادەمرکێ[٣].

---

١) بەکورتکراوەیی لە (روضة المحبيـن)، لاپەڕە، ٩٥-١٠٢ وەرگیراوە.

٢) رواه مسلم.

٣) بەڕاستی تەوجیهێکی پڕ لە حیکمەتو بەرزە، بە تایبەتی لە ڕۆژگارێکی گەندەڵی وەك ئەمڕۆ، ئافرەتان زیاد لە سنور لادان خۆیان لە پۆشاك داماڵیوەو، خۆیان کردۆتـە مزراحـی دەستی گاڵتەجاڕی ئافرەتان، بونەتە پەیڕەوکارو جێبەجێکەری زنجیرە تەمسیلی یـەکانی بێگانە لە دوای دۆبلاج کردنیان بۆ زمانی عەرەبی. ئافرەتان بە شێوەیەك خۆیان دەخەنە ڕو و پۆشاکێك لەبەر دەکەن، کە هەر بەناو پۆشاکە،جا کە بەمجۆرە خۆیان نمایش دەکـەن، سەرنجی گەنجو پیاوی پێ ڕادەکێشن، ڕەنگە سەربکێشێ بۆ خراپەکاریو داوێـن پیـسی. هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ لەم فەرمودەیەدا ڕێنمایی پیـاوان دەکـات، هـەرکاتێ شـتێکی ناوایان کەوتە بەرچاو و سـەرنجی ڕاکێـشانو ئـارەزوی بزوانـدن، ڕاسـتەوخۆ بـچنەوە لای خێزانیان، ئەو گەنجانەش کە ژنیان نەهێناوە، دەبێ ئارام بگرنو زۆر بـەڕۆژو بـن، هـەروا دوعا بکەن هەتا خـوای بەخـشندەکاری ژن هێنانیـان بـۆ ئاسـان دەکـات.. ئـەو جـۆرە ئافرەتانەش گەر تۆزێك ئابڕویان هەبێ، ڕێگە بەخۆیان نادەن ئەم جلە سەرشۆڕکەرە لەبەر بکەن. (وەرگێڕ)

## دەبێ ژن لە داوای مێردەکەی بۆ جوتبون پەلە بکات

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێ: ((ثلاثة لا تقبل منهم صلاة، ولا تصعد إلى السماء، ولا تجاوز رؤوسهم: إمرأة دعاها زوجها من الليل فأبت عليه ... الحديث))[1]، واتە: سێ کەس نوێژیان قبوڵ نابێ، بەرەو ئاسمانیش بەرز نابێتەوەو لەسەر سەریشیان زیاتر تێپەڕ ناکات: یەك لەو کەسانە ئەو ئافرەتەیە، کە مێردەکەی بەشەو داوای جوتبونی لێ دەکات، بەڵام ژنەکەی ڕازی نابێ وداواکەی جێبەجێ ناکات.

دەفەرموێ: ((إذا دعا الرجل إمرأته إلى فراشه، فلم تأته، فبات غضبان عليها، لعنتها الملائكة حتى تصبح))[2]، واتە: پیاو گەر داوای سەرجێیی لە ژنەکەی کرد، ژنەکەشی بە دەم داواکەی نەچو، مێردەکەشی لێی توڕە بێ و بەو حاڵەتەش بمێنێتەوە، ئەوا فریشتەکان نەفرین (لەعنەت) لەو ژنە دەکەن تا بەیانی دەکاتەوە.

هەروەها دەفەرموێ: ((إذا دعا الرجل إمرأته الى فراشه، فلتجب وإن كانت على ظهر قتب))[3]، واتە: پیاو گەر داوای سەرجێیی لە ژنەکەی کرد بۆ جوتبون، با ژنەکەی بەدەم داواکەی بچێ، ئەگەریش ئافرەتەکە لەسەر پشتی حوشتر بێ.

---

١) رواه أبن خزيمة (حديث صحيح) .
٢) رواه البخاري ومسلم وأبوداود والنسائي .
٣) رواه البزار (حديث صحيح) .

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إذا دعا الرجل زوجته لحاجته فلتأته، وإن كانت على التنور))[1]، واتە: گەر پیاو داوای جوتبونی لە ژنەکەی کرد، با ژنەکەی بەدەنگی یەوە بچێ، با ژنەکەی لەسەر تەندوری نان کردنیش بێ.

هەروا دەفەرموێ: ((والذي نفسي بيده ما من رجل يدعو إمرأته إلى فراشه فتأبى عليه إلا كان الذي في السماء ساخطاً عليها حتى يرضى عنها))[2]، واتە: سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، هەر پیاوێك داوای سەرجێیی لە ژنەکەی بکات و ژنەکەشی بە دەنگی یەوە نەچێ، ئەوا ئەوەی لە ئاسماندایە تورە دەبێ، تا ئەوکاتەی مێردەکەی لێی رازی دەبێ[3].

---

١) رواه النسائي والترمذي (حديث صحيح).

٢) رواه البخاري ومسلم.

٣) زۆرجار لەبەر چەند ئیش و کارێك، ژن لە مێردەکەی دور دەکەوێ و داواکەی جێبەجێ ناکات، جا بەجۆرە ژنە دەڵێم: پێویستە لەکاتی داواکردنی سەرجێیی هەمو ئیش و کار و خەم و خەفەتێك بخرێتە لایەك و، هەمو ئیعتبارێك بخرێتە لایەکی تر! بەراستی ئەوکاتە چەند کاتێکی بەتام و خۆش و بەلەزەتە، کە ژن و مێرد بۆ لای یەکتری رادەکێشێ و لەناو سۆز و خۆشەویستیان بۆ یەکتری بتوێنەوەو ببنە یەك جەستەو، تیشکی خۆشەویستی و ئەوین لەم کەشە جوان و خۆشە بەسەریاندا بلاوببێتەوە.

بەبۆنەی قسەکردن دەربارەی راسپاردەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ ژنان، کە پەلە بکەن بۆ بەجێهێنانی داوای مێردەکەی بۆ جوتبون، ئەم سەربردەیە باس دەکەین:

لە کتێبی (الاغاني) کەمێك بەکورتی و دەسکاریەوە هاتوە کە ئافرەتێك گوتویەتی:

((لەلای عائیشەی کچی تەڵحە بوم، گوتیان: ئەوە (عەمری کوری عبید)ە گەرایەوە - واتە مێردی عائیشە-. منیش لاکەوتم و مێردەکەی چوە ژورەوە، جا بۆ ماوەیەك گوێم لە دەنگی دەستبازی ژنەکە بو، گوێم لە قسەی سەیرو سەمەرە بو.. هەر کە مێردەکەی چوە دەرەوە، بە عائیشەم گوت: تۆ ئەو پلەو پایەت هەیەو شتی وا دەکەیت؟! ئەویش گوتی: ئێمە ئەوەندەی لەتوانامان‌دا هەیە، بەدەم ئەو کەڵەپیاوانەوە دەچین و بەدەم ئەو شتانەوە دەچین، کە دەمانبزوێنێ.. کەواتە من چ شتێکی خراپم کردوە! گوتم: حەزم دەکرد بەشەو

ئەوەتان بکردبایە. ئەویش گوتی: گەر بەشەو بایە ئەوە بۆ وی زۆر گەورە بـو، خـۆی پـێ نەدەگیرا، چونکە ئەو هەرکە من دەبینێ ئارەزوی دەجولێو دەستی بۆم دێنێو منیش بە ئارەزوی ئەو دەکەم، بۆیە ئەوە ڕودەدات، کە دەیبینی!))

لەم فەرمودانە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە پێغەمبەر ﷺ داوا لە ئـافرەت دەکـات بـە زوییو بە پەلە ئارەزوی جنسی مێردەکەی تێر بکات، ئەمەش لەبەر چەند شتێك، لەوانە: لەو کاتەی ئافرەت بە دەنگی مێردەکەیەوە ناچێت، مێردەکەی وا دەزانێ ژنەکەی خۆشی ناوێ، دیارە ئەوەش سەرەنجامەکەی باش نابێت، جێبەجێکردنی داواکـاری پیـاو ئـەوە ناگەیەنێ، کە ژن ملکەچی مێردەکەی بێو بۆی بچێتە ژورەوە، بـەڵکو دەبـێ ژنەکـەش وەك پیاوەکە ئامادەیی هەبێتو، ئـارەزوی جوتبـونی هـەبێو ئـارەزو لەگـەڵ یەکتریـدا بگۆڕنەوە. هەروەها ژنەکە نابێ ساردی خۆی پیشان بـدات، چـونکە گـەر ژن ئامـادەیی خۆی دەرنەبڕیو سارد بو، ئەوا بیرۆکەیەکی خراپ لەلای مێردەکەی دروست دەبێ.

لەسەر ژن پێویستە لەگەڵ مێردەکەی تەفاهومی هەبێتو بە ڕاشکاوی لە بارەی هەمو شتێکی جنسی قسەی لەگەڵدا بکات. گەر ئارەزوی جنسی مێردەکـە لـە سـنوری خـۆی زیاتر بو، ئەوا لەسەر ژن پێویـستە بـە لێزانـیو دانـایی ئـەو چـالاکییـە جنسـییـەی مێردەکەی بە چالاکی تر پڕ بکاتەوەو، فکرەی جنسـی لـەلای کـەم بکاتـەوەو لـە بـیری بباتەوە، ئەوەش لە کاتێکدا گەر مێردەکەی ڕێژەی جوتبونەکەی لە سنوری مام ناوەنـدی زیاتر بو، کە لە هەفتەیەکدا دو جارە. گەر جوتبون لەم سنورە زیاتر کـرا، بـە تایبـەتی پاش تێپەڕبونی ماوەیەکی درێژ بەسەر ژن هێناندا، ئەوا دەبێتە هـۆی لاوازیو بـێهێزی جەستەو لاشەو عەقڵو جینس.

بەم بۆنەوە گرنگترین شت، کە پێویستە ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە، کـە زۆر ئـافرەتی مێرددار، بە هۆی نەشارەزاییان لە مانای رابواردنی جنسی، لە پیـاوان دور دەکەونـەوەو بەردەوام دەبن لەسەر ساردی نواندن، جا گەر پیاو (مێرد) شارەزا نەبێت بـە وروژانـدنی، بە گەمەو یاری درێژخایەن، بە تایبەتی شوێنە هەستیارەکانی ژن، گەر ئەو هاوسەرییەتی یە ئاوا بەردەوام بێت، ئەوا ژن بەدەم داوای مێردەکەی نایەت، ئینجا گێروگرفتو کێـشە دروست دەبێت.

لە هۆیەکانی دورکەوتنەوەی ژن لە مێردەکەی، زۆر جار بە هۆی خواپەرستی یەکی لارو خوارەوەیە، تەنانەت هەندێ ژن خۆیان لە مێردەکانیان دور دەگرن، ئەمەش لـە ناکـامی

ئاراستەکردنی قوتابخانە خراپەکەیانە، کە ئیسلام لێی بەرییە، ئیسلام هاوسەریەتی بە عیبادەت داناوە.

ئامۆژگاریم بۆ پیاو (مێرد) ئەوەیە، هەر تەنها پشت بەو فەرمودانە نەبەستێ، کە هانی ژن دەدات لەسەر بەدەمەوە هاتنی داوای مێردەکەی، بەڵکو لەسەریەتی کە سەلیقەدار بێتو تەنازول بکات لە خۆویست (أناني)و پەلەکردن بۆ جوتبون، پێویستە تواناادار بێت لەسەر سەرنج راکێشانی هاوسەرەکەی. گوتراوە ئافرەت وەك ئامێری مۆسیقا وایە، بە دەستی مۆسیقاژەنێکی کارامە نەبێت ناژەنرێ.

# چەند مەترسیەك هەڕەشە لە خێزان دەكەن

## مەترسی خزمی مێردو هاوڕێیانی خێزان

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إياكم والدخول على النساء، فقال رجل: يا رسول الله! أرأيت الحمو؟ قال: الحمو الموت))[١]، واتە: نەكەن ئێوە بچنە شوێنێك... ژورێك كە ئافرەت بە تەنها لەو ژورە بێت. پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا: ئەی گەر برای مێردەكەی بێت؟ پێغەمبەر فەرموی: ئەمەیان هەر مردنە، بە واتای جێگەی فیتنەو نزیكی سەركێشی خراپەكارییە، چونكە خراپەكاریو مەیل بە لایاندا كارەكەی ئاسانتر دەبێ..

بە هۆی فەرامۆشكردنی ئەم فەرمودە پیرۆزە، چەندەها كێشەو گیروگرفت هاتۆتە كایەوەو بۆتە هۆی روخاندنی بنەماكانی خێزان. نمونەی (الحمو): بریتی یە لە هاوڕێیانی مێردو ناسیاوانی ژن، كە زۆرجار مەترسی خراپەكاری لەوانەوە دروست دەبێ. زۆر كەسیش بێئاگا لە فەرمانەكانی خواو پێغەمبەر، دیدو بۆچونیان وایە، كە هاوڕێیانی مێردو ناسیاوانی ژن جێگەی مەترسی نین. جا شەوانە لەگەڵیان دەمێننەوەو سەهرەیان لەگەڵ دەكەن.

ئەوەی بە ڕاستی و واقیعی ڕویداوە ئەوەیە، كە یەكێك لەو جۆرە كەسانە لەماڵی خۆیدا هاوڕێكەیو ژنەكەشی دەعوەت كردبو، كاتێك میوانەكان هاتن، ئەو پیاوە دەستی كرد بە تێكردنی مەی بۆیان، پیاوەكە ڕێژەی مەیەكەی بۆ هاوڕێكەی زیاتر تێ دەكرد، بەڵام بۆ ژنەكەی كەمتری

---

١) رواه البخاري ومسلم.

تێ دەکرد، بۆ خۆیشی کەمێکی دەخواردەوە، تا زۆر سەرخۆش نەبێ‌و بە ئاگا بێ‌و نیازە گڵاوەکەی بێنێتە دی. پاش تێپەڕبونی سەعاتێك، یان زیاتر هاوڕێکەی سەرخۆش بو ئاگای لە خۆی نەما، چاوچاوێن‌و گەمەو یاری لە نێوان پیاوەکەو ژنی هاوڕێکەی دەستی پێ‌کرد، چونکە ئەویش سەرخۆش بو. جا هەر لە نزیك مێردەکەیەوە پیاوەکە زینای لەگەڵدا کرد.

هەروەها ئافرەتیش، کە هاوڕێی خێزان بێ، مەترسیەکی لە پیاوی هاوڕێی خێزان کەمتر نیە، کەواتە دەبێ زۆر ئاگادار بین.

لە ویلایەتی فلۆریدا لە نێو چینی دەوڵەمەندان تاوانکاریەکی قێزەون ڕویدا!! کە کورتەکەی بەم شێوەیەیە:

ژنێك حەزی لە پزیشکێکی لاو کرد، کە لە ڕێی مێردەکەیەوە لە یەکێ لە ئاهەنگەکان لە یانەیەکدا یەکتریان ناسی، کە مێردەکەی زۆر هاتوچۆی ئەم یانەیەی دەکردو ژنە گەنجەکەی لەگەڵ خۆی دەبرد... جا ژنەکەی بە پێی باوو نەریتی چینی دەوڵەمەندانەوە داوای لەم گەنجە کردو سەمای لەگەڵ دەکرد!! جا پەیوەندی لە نێوان ژنەکەو پزیشکە گەنجەکە پتەو بوو کە ناوی (أنطون) بوو، لەسەر زەواج پێکهاتن..

بەڵام گرفت ئەوەیە چۆن لەم مێردەی دەرباز بێت، کە زۆر خۆشی دەوێت، هەروەها چۆن لە دوو مناڵە بچوکەکەی دەربازی بێت... بەڵام پزیشکەکە هانی ژنەکەیدا، کە ژەهر بخاتە نێو خواردنی مێردەکەی‌و منداڵەکانی ئەوەبوو ژنەکە تاوانەکەی ئەنجام داو... لەگەڵ عاشقەکەی بە ئۆتۆمبێل ڕای کرد...

لەو کاتەی پۆلیس بە دوای ژنە تاوانبارەکەو دۆستەیەکدا دەگەڕان، بینیان لە دۆڵێکدا، کە زۆر قوڵ نەبوو لە نزیك ڕێگای گشتی تەرمی

هەردوکیان بە شێواوی کەوتووە. ئۆتۆمبیلەکە دوای وەرگەڕانی، تانکی بەنزینەکەی تەقیبۆوە:

ئەمەش تۆڵەی خوا بوو، کە بە زویی هاتەدی! (حضارة الإسلام) (٧٤ س ٤، ص ٩٩).

ئەمە نمونەیەکە کە لە هەزاران نمونەی زیانی تێکەڵاوی ژن و پیاوی نامەحرەم، جا ئایا پەندی لێوەردەگیرێ؟!

# ئـاگـادارکـردنەوە لە دەرخسـتنی جوانـی و ڕازاوەیـی ئـافـرەت

خوای گەورە دەفەرمویێ: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ﴾ (الأحزاب- ٥٩)، واتە: ئەی پێغەمبەر بە خێزانەکانتو کچەکانتو بە ئافرەتە باوەڕدارەکان بڵێ، با عەباکانیان بەسەر خۆیاندا بێننە خوارەوە[1]، ئەمە بۆ ئەوان چاکترە بۆ ئەوەی بناسرێنو ئازار

---

١) لە کتێبی (الأسلام والحياة الجنسية) هاتوە: ئەم چارەسەرە قورئانی یە، کە داوای خۆداپۆشین دەکات، سودەکەی تەنها لەسەر ئەو بارە دەرونی یەی لە پێشەوە باسکرا کورت هەڵ نەهاتوە، بەڵکو سودێکی کۆمەڵایەتی تێدایە، کە چارەسەرکردنی قەیرانە!!! قەیرانی هاوسەرگرتن (الزواج)ـە.

لە بنەماکانی ئەم قەیرانە ئەو ڕوتی یەیە، کە لە کەنار دەریاو ناهەنگەکانو، لە کۆبونەوەکانو کۆڕو شەقامەکانو هاوینەهەوارەکان، سەرنجی چاوی پیاوان ڕادەکێشێ... کە ئافرەتان جلیان لەبەرەو ڕوتیشن.

خواردنێکی موباح.. زەمینەیەکی کراوە.. جەستەکە لە هەمو شوێنێك لەبەر دەمیەتی، بە وتەیەکی شیرین یان بەڵێنێکی درۆ، ئەو جەستەیە لەوانەیە ببێتە مولکی ئەو پیاوە. ئافرەتەکەش فریوو چەواشە دەکرێ، نەفسەکەی دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی پیاوەکە، پاشان ژیانەکەی، وەك کچێکی شەریف کۆتایی دێتو، سەرەتای ژیانی وەکو کچی شەوانی دەست پێدەکات!! جا قەیرانی هاوسەرگرتن لە کۆمەڵگەدا بەو شێوەیە دەمێنێتەوە. جا مادام ڕوتی شتێکی باوە! هەمو قەدەغەکراوێکیش خوازراوە خەڵکی دوای دەکەوێ.

هەمو شتێکی کەم نرخ لە کاتی دەست بەسەراگرتنیدا، بایەخەکەی کەم دەبێتەوە! گەر کچ خۆی پۆشتە کات -یان بە عیبارەتێکی وردتر- گەر بە باڵاپۆشی خۆی پارێزگار

نـەردرێن[١].

---

بکات، ئەوا کوڕ ئاواتەخوازی دەبێ و پەلەی هێنانی دەکات..

(ماری ودالن)، کە بە پەروەردەیەکی ڕۆژئاوایی گۆش کراوە، وتەکەی چەند جوانە، کـە لە کتێبەکەی (فن العلاقات الجنسية)دا گوتویەتی:

((کچان شوێنەوارێکی مەعنەوی گەورە هەڵدەگرن، کە پەیوەندی بە سـیرەی گەنجانـەوە هەیە، ئەوەندە بەسە، کە پۆشاکەکەی فەرامۆش بکاو گرنگی پێ نەدات، یان لە پەخشان کردنی قژی زیادەڕۆیی بکات، ئەو شوێنە بەدەربخات، کە پێویستە بشارڕێتەوەو چاوەکان نەیبینن، وا دەکات گەنجان بە چاوێکی دیاریکراوەوە بڕواننە ئەو.

ئافرەت بە جوڵەو ڕوانینەکانی و هەڵس و کەوتی، دەتوانێ سەرنجی تەماشاکەر بۆ خـۆی ڕابکێشێ و چەند بیرۆکەیەکی لەلا دروست بکات، کە بەرەو کرداری ناشیرینی ببات.

لەوانەیە بگوترێ: پێویستە پیاوان ئارەزوەکانیان کپ بکەن، بێگومان ئـەوە لەسـەریان پێویستە، ئێمە گازاندە لـێکردنیان کەم ناکەینەوە، بەڵکو ئـەوان شایـستەی گازانـدەی زۆرن، بەڵام ئەو کچەی تەڵە بۆ ڕێگای گەنجان دادەنێتەوە، کـچێکی تاوانبـارە!! لەسـەر ئافرەتە ببێتە مسۆگەری پاراستنی داوێنی پیـاوان، نـەك هۆیـەك بێـت بـۆ ڕوخانـدنی! هەروەها لە باری دایە بیپارێزێ وەك ئەوەی کە دەیپارێزێ.

گەر کچ هێزی خۆی ناسی، گەر پەرێزێکی عاقڵانەو خۆ بەکەم نواندنی ئەنجامدا، ئـەوە دەتوانێ پیاو لە هەمو بیرۆکەیەکی پیس و خراپ دور بخاتەوە!!)).

لە کاریگەریە ترسناکەکانی (تبـرج) لە ڕوی تەندروستی یـەوە ئەوەیـە، دەبێتـە هـۆی نەزۆکی ئافرەتان. لەم دواییەدا لە (صوفيا) پایتەختی بولغاریـا، لەگـەڵ قوتـابی یـەك دانیشتم، کە لەوێ دەیخوێند، ئـافرەتێکی بولغـاری کردۆتـە هاوسـەر، کـە دکتۆرەیـە، دەربـارەی منداڵـەکانی پرسـیارم لێکـرد، قوتـابی یەکـە گـوتی: خێزانەکـەم بـە هـۆی لەبەرکردنی تەنورەی کورت، دوچاری نەزۆکی بوە، لە ئاکامی سەرما بون بۆتە هۆی زیان گەیاندن بە منداڵدانی. جا ئەویش دەربارەی قەدەغـەکردنی پۆشـینی تـەنورەی کـورتی نوسی، کە کچانی هاوڕەگەزی لەم جلە ئاگادار دەکاتەوە.

١) لە خراپترین زیانەکانی (تبرج)، وروژاندنی گەنج و لاوەو هاندانیانە بۆ دەستدرێژی کردنە سەر ئافرەتی دەرخەری جوانی و ڕازاوە، بۆ بەڵگەی ئەمەش نمونەیەك دێنینەوە:

هەروا دەفەرموێ: ﴿ يَابَنِـي آدَمَ لاَ يَفْتِنَـنَّكُمُ الـشَّيْطَانُ كَمَـا أَخْـرَجَ أَبَوَيْكُمْ مِنَ الْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْآتِهِمَا﴾(الأعراف- ٢٧)، واتە: ئەی نەودكانی ئادەم، با شەیتان نەتانخاتە ناو بـەڵاو نارِەحـەتی، وەك باوكو دایكتانی لە بەهەشت دەرهێنا، لە بەهەشت دەری كردن بـەجۆرێ، كە پۆشاكەكەیانی لـێ داكەندنو بو بە هۆی ئەوەی، عەیبو عەوردتەكەیان دەرخاتو نیشانیان بدات.

دەفەرموێ: ﴿وَقُـلْ لِلْمُؤْمِنَـاتِ يَغْضُـضْنَ مِـنْ أَبْـصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْـنَ فُرُوجَهُنَّ وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَـضْرِبْنَ بِخُمُـرِهِنَّ عَلَـى

---

گەنجێكی خەڵكی لادێ شەوێك لە سینەما لەگەڵ هاوسەرە سفورەكەی دێتە دەرەوە، كـە لەبەردەم خەڵكیدا شـانازی پێـوە دەكـرد! جـا تەكـسیەك بـەكرێ دەگرێـت بـۆ ئـەوەی بیانگەیەنێتەوە گوندەكەی، لـە رێگـا شـەیتان چـوە نـاو عـەقڵی شـۆفێرەكەو، بـەهۆی دەرخستنی دیمەنی جوانیو رِازاوەیی ژنەكە، یاری بە عەقڵیەوە كرد، جـا وای پێـشاندا كـە ئۆتۆمبیلەكـە شـتێكی خـراپ بـوە، ئۆتۆمبیلەكـەی وەسـتاندو هاتـەخوار بـۆ چاككردنەوەی، لە كۆتایی داوای لە پیاوەكە كرد لە ئۆتۆمبیلەكە بێتەخوار بۆ ئەوەی لە دواوە كەمێك پاڵ بە ئۆتۆمبیلەكەوە بنێت، جا شۆفێرەكە یەكـەر ئۆتۆمبیلەكـەی لـێ خوریو ئافرەتەكەی فرِاند، مێردی ژنەكەش هەرچەندە داوای فریاكەوتنی كرد، بەڵام هیچ كەسێك بە هاواریەوە نەهات.. جا گومانی خراپی لـێبكەو لە هەواڵەكـەش مەپرسـە كە چی رِویدا! ﴿وَمَا ظَلَمَهُمُ اللهُ وَلَكِنْ أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ... خودا ستەمی لـێ نەكردن، بەڵام خۆیان ستەم دەكەن.﴾.

جارێك بە یەكێك لە ئافرەتە ناسیاوەكانم گوت، خۆی پۆشتە بكاتو جوانیو رِازاوەیی خۆی دەرنەخات، ئەویش وەڵامی دامەوە، كە من كۆنەپەرستم! منیش پێم گوت: بـەڵكو تۆ كۆنەپەرستی، كە لاسایی ئافرەتە هەمەجی یەكان دەكەیتەوە كە خۆت رِوت كردۆتەوە، هێشتاكەش هەندێكیان لە هەندێ وڵاتـی ئـەفریقی مـاون، كـە تـەنها پـاشو پێـشیان دادەپۆشن!

گەر پێشكەوتن بە رِوتی بێت، دەبوایە بزنو مەیمون لە پێشەوەی پێشكەوتن بان.

جُيُوبِهِنَّ وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي الإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاءِ وَلاَ يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾(النور- ٣١)، واتە: ئەی پێغەمبەر، بە ئافرەتە بڕوادارەکان بڵێ با لە ئاست پیاوی بێگانە چاویان نزم کەن‌و، داوێنی خۆیان لە خراپەکاری بپارێزن‌و، جوانی‌و ڕازاوەیی خۆیان بۆ پیاوی بێگانە بەدەر نەخەن، تەنها ئەوە نەبێ کە بەدەردەکەوێ، کە ڕوخسارو هەردو دەست دەگرێتەوە. با سەرپۆشەکانیان بەسەر سەرو سینگیان بێننە خوارو داپۆشێ، با جوانی خۆیان بەدیار نەخەن، جگە لە مێردەکانیان‌و مندالّی مێردەکانیان، یان برایەکانیان، یان مندالّی برایەکانیان، یان مندالّی خوشکەکانیان، یان ئەو ئافرەتانەی خزمەتکاریانن‌و ئەو ئافرەتانەی کە هاوڕێیەتیان دەکەن، یان ئەو پیاوە خزمەتچی یانەی، کە لە پیاوەتی کەوتون‌و توانای جیماعیان نیە، یان بۆ ئەو مندالآنەی ئیحتلامیان نەبوەو نەگەیشتونەتە ڕادەی ئارەزوکردنی ئافرەتان.. با بە پێیەکانیان لە زەوی نەدەن، کە لەم قاچ لە زەوی دانە دەنگی لێ دەردەچێ‌و، بەو دەنگە ئەو جوانی یەی شاردویەتیانەوە بزانرێ‌و سەرنجی پێ ڕابکێشرێ[1].

١) مامۆستامەودودی لە کتێبەکەی (الحجاب)دا گوتویەتی: لەوانەیە ئافرەت زمانی بێدەنگ بێ، بەلاّم جولاّنەوەی تری شوێنی ئەو دەگرێتەوە، کە دەنگەکەی کار لە گوێی بیسەر

هەروا دەفەرموێ: ﴿يَانِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِنَ النِّسَاءِ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلاَ تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلاً مَعْرُوفاً، وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلاَ تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الأُولَى وَأَقِمْنَ الصَّلاَةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللهَ وَرَسُولَهُ﴾ (الأحزاب: ٣٢-٣٣) ، واتە: ئەی ئافرەتانی پێغەمبەر، یەکێك لە ئێوە وەکو یەکێك لە ئافرەتەکانی تر نیە، لەبەر نزیکی ئێوە لە پێغەمبەر، ئەگەر ئێوە لە خوا بترسن، ئێوە قیاس ناکرێن بە ئافرەتەکانی تر لەبارەی گەورەییتان، بە نەرمی‌و ناسکی قسە لەگەڵ پیاوان مەکەن، نەبادا ئەو کەسە نیفاقی لە دڵی هەبێت، قسە بە گوێرەی شەرعی خوا بکەن‌و ملکەچ بن، ئارام بگرن لە خانوەکانتان‌و ئۆقرە بگرن‌و جوانی‌و ڕازاوەیی خۆتان بەدەر مەخەن،[1] وەك ئەو جوانی‌و ڕازاوەیی‌یەی لەسەردەمی نەفامی یەکەم بەدەریان دەخست، نوێژەکان

---

دەکات، ئەمەش لە بابی نیەتی پیسەوەیە، کە ئیسلام قەدەغەی دەکات بە فەرمودەی خوای گەورە: ﴿وَلاَ يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ﴾(النور-٣١).

١) (تبرج) ئەوەیە ئافرەت ئەو ڕازاوەیی‌و جوانیەی خۆی بەدەربخات، کە پێویستە لەسەری دایپۆشێ، چونکە ئەو جوانی‌و ڕازاوەیی یە ئارەزوی پیاو دەبزوێنێ.. (فتح البيان)

لەو کاتەی (غليوم) ئیمپراتۆری ئەڵمانیا سەردانی تورکیای کرد، ئەندامانی کۆمەڵەی (الاتحاد والترقي) حەزیان کرد شارستانیەتی خۆیان پیشان بدەن، بۆیە دەستیان کرد بە هێنانەدەری هەندێك لە قوتابی کچ، کە سفور بون، چەپکە گوڵیان پێشکەش کرد، ئەویش سەری سوڕما لەوەی بینی، بە بەرپرسیارانی گوت: (ئاواتەخواز بوم لە تورکیا بەرگی حیشمەت‌و حیجاب ببینم بە حوکمی ئاینی ئیسلامیتان، کەچی ئەو سفورە دەبینم، کە ئێمە لە ئەوروپا پێوەی گرفتارین، کە بەرەو لەنێوبردنی خێزان‌و تێکدانی نیشتمان‌و منداڵ پەرتەوازەکردن دەبات!!).

ئەنجام بدەن و زەکات بدەن و گوێڕایەڵی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی بن.

خاتو عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ گوتویەتی: ((إن أسماء بنت أبي بكر رضي الله عنهما، دخلت على رسول الله ﷺ وعليها ثياب رقاق، فأعرض عنها رسول الله ﷺ وقال لها: يا أسماء! إن المرأة إذا بلغت المحيض، لم يصلح أن يُرى منها إلا هذا وهذا (وأشار الى وجهه وكفيَّه).))[1]، واتە: ئەسمای کچی ئەبو بەکر هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پۆشاکێکی تەنکی لەبەر بو[2]، پێغەمبەریش ڕوی لێوەرگێڕاو پێی فەرمو: ئەسماء! ئافرەت کە توشی خوێنی بێنوێژی بو، بۆی نی یەو دروست نی یە، هیچ شوێنێکی ببینرێ جگە لە ڕوخساری و دەستەکانی.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((من جرَّ ثوبه خيلاء لم ينظُرِ الله إليه يوم القيامة، فقالت أم سلمة: كيف تصنع النساء بذيولهن؟! قال: يرخين شبراً، قالت: إذاً تنكَشف أقدامُهن! قال: فيرخين ذراعاً، ولا يزدن عليه))[3]، واتە: هەر کەسێك پۆشاکەکەی لەبەر لوت بەرزی لە دوای خۆی بخشێنێ، واتە درێژ بێت، خوای گەورە تەماشای ناکات، ئوم سەلەمە گوتی: ئەدی ئافرەتان چی لە دامەنیان بکەن؟!

فەرموی: با بستێکی بهێڵنەوە.

گوتی: کەواتە قاچیان بە دیار دەکەوێت.

---

١) لهذا الحديث طرق يقوي بها الى درجة الحسن.

٢) أبن عبدالبر گوتویەتی: (مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە ئەو ئافرەتانەی پۆشاکی تەنك لەبەر دەکەن لەشیان تێدا دیارە، ئەوانە بەناو پۆشتەن، لە ڕاستیش دا ڕوتن).

٣) (أخرجه أصحاب السنن وهذا لفظ الترمذي).

فەرموی: با یەك گەز بهێڵنەوەو لە سەری زیاد نەکەن.

دەفەرموێ: ((ثلاثة لا تَسأل عنهم، رجلٌ فارق الجماعة، وعصى إمامه، ومات عاصياً. وأَمَةٌ أو عبد أبق فمات. وامرأة غاب عنها زوجُها- قد كفاها مؤنة الدنيا- فتبرجت بعده، فلا تسأل عنهم))[1]، واتە: سێ چین پرسیار دەربارەیان مەکەن، پیاوێك کە لە جەماعەت جیابوبێتەوەو لە پێشەواکەی یاخی بوبێتو بە یاخی بویی بمرێ، ئافرەتێکی کۆیلە یان پیاوێکی کۆیلە لە گەورەکەی هەڵاتبێ، ئافرەتێك مێردەکەی لە لای نەبێتو مێردەکەی پێداویستی دنیای بۆ دابین کردبێ، بەڵام دوای ئەو جوانیو ڕازاوەیی خۆی پیشانی پیاوی بێگانە دابێ، ئەوا لێیان مەپرسن.

هەروا دەفەرموێ: ((صنفان من أهل النار لم أرهما: قوم معهم سياطٌ كأذناب البقر، يضربون بها الناس! ونساءٌ كاسياتٌ[2] عارياتٌ، مائلاتٌ مميلاتٌ، رؤوسهن كأسنمة البخت، لا يدخلن الجنّة ولا يَرحْنَ ريحَها،

---

١) رواه أحمد في المسند والبخاري في الأدب المفرد والحاكم وصححه وأقره الذهبي وهو كما قالا.

٢) لە ڕسالەی (التبرج)ی ژنی دکتۆر محمد رضا هاتووە: هەر ژنێك لەماڵ دەردەچێتو، خۆی جوان کردبێتو ڕازاندبێتەوە، ئەوا بە زمانی خۆی دەڵێ: ئەرێ تەماشای ئەم جوانیە ناکەن؟

ئایا کەس هەیە لێم نزیك بێتەوەو کاری خۆی بکات؟

ئەو جۆرە ژنە لە بازاڕو شەقامەکان جوانی خۆی نمایش دەکات، وەك چۆن بازرگانی گەڕۆك کەلوپەلی خۆی نمایش دەکات، وەك چۆن پاقلاوە فرۆش، پاقلاوەکەی بە ڕەنگی جوانو کاغەزی درەوشاوە نمایش دەکات، بۆ ئەوەی سەرنجی کڕیار ڕابکێشێو بفرۆشرێو کڕیاری زۆر بێت، برسیەکان هەڵپەی بۆ بکەن)). لاپەڕە ٢٦، چاپی گۆڤاری (التمدن الإسلامي) لە دیمەشق.

وإن ريحَها لَتوجَدُ مِن مسيرة كذا و كذا))[1]، واتە: دو پۆل هەن ئەهلی ئاگرن، نەمدیون: کۆمەڵێك قامچی‌یان بەدەستە پێی لە خەڵکی دەدەن! ئافرەتانێك پۆشتەن‌و ڕوتیشن، بە لارو لەنجە دەڕۆن‌و سەرنجی پیاو بۆ خۆیان ڕادەکێشن، قژیان لەسەر سەریان کۆدەکەنەوە وەك کۆپانەی حوشتر، ئەوانە نە دەچنە بەهەشت‌و نە بۆنی بەهەشت دەکەن، کە بۆنەکەی لە ماوەی ئەوەندەو ئەوەندە بۆنی دەکرێ.

هەروەها دەفەرموێ: ((إن المختلعات و المنتزعات هُنَّ المنافقات)) (رواه الطبراني (صحيح)، واتە: ئەو ئافرەتانەی خۆیان ڕوت‌و قوت دەکەن‌و جل لە خۆیان دادەماڵن، ئەو ئافرەتانە دەغەڵن.

---

١) رواه مسلم

# نابێ ئافرەت خۆی بەپیاو بچوێنێ و بە پێچەوانەوە

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَتَمَنَّوْا مَا فَضَّلَ اللهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِمَّا اكْتَسَبُوا وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِمَّا اكْتَسَبْنَ وَاسْأَلُوا اللهَ مِنْ فَضْلِهِ إِنَّ اللهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾(النساء- ٣٢)[1]، واتە: ئاواتەخوازی شتێك مەبن، کە خوای گەورە فەزڵی کردوە بەسەر هەندێکیان دا، پیاوان لەوەی بە دەستی دێنن بەشێکیان بۆ هەیە، ئافرەتانیش

١) هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوەبو، کە ئوم سەلەمە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، پیاوان غەزا دەکەن و ئێمە غەزا ناکەین، ئێمە تەنها نیوەی میراتمان بۆ هەیە. جا ئەم ئایەتە هاتەخوار.. موجاهید ئەمەی گوتوەو (حاکم) بە صحیحی داناوەو (ذهبي) رازی بوە بەوە.
سەبارەت بە دابەزینی ئەم ئایەتە گوتراوە، کە ئافرەتان گوتویانە: ویستومانە خوای گەورە غەزامان لەسەر دابنێ، بۆ ئەوەی وەك پیاوان پاداشتمان بۆ بنوسرێ، ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی.. ئەمە (عەکرەمە) گوتویەتی.
مانای ﴿لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِمَّا اكْتَسَبُوا وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِمَّا اكْتَسَبْنَ﴾ ئەوەیە کە ئافرەت وەك پیاو پاداشت وەردەگرێ و گوناهی بۆ دەنوسرێ، هیچ جیاوازی نییە لە هەر یەکێکیان دا، مەگەر بە گوێرەی تایبەتمەندی نەبێت، جا با ئافرەتان ئاواتەخوازی ئەوە نەبن وەکو پیاوان بن، چونکە پاداشت بۆ هەموان بە پێی سنوری کارەکەی دانراوە، پێویست بە هەڵ گەڕانەوەی ئافرەتان ناکات لەسەر ئەرکەکانی ماڵەوەیان.
خوای گەورەش فەرمویەتی: ﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ﴾ (آل عمران- ١٩٥)، واتە: پەروەردگاریان بەدەنگیانەوە هات، کە من کردەی هیچ مرۆیەك -لە نێرو مێ- بەبێ پاداشت ناهێڵمەوە، گشتتان لەلای من چون یەکن.

بەشێکیان هەیە لەوەی بەدەستی دێنن، داوا لە خوای گەورە بکەن لە فەزڵی خۆی، خوای گەورە بە هەمو شتێك زانایە.

((لعن رسولُ الله ﷺ المتشبِّهين من الرجال بالنساء والمتشبِّهات من النساء بالرجال))[1]، واتە: پێغەمبەری خوا نەفرەتی لەو پیاوانە کردوە، کە خۆیان بە ئافرەتان دەچوێنن‌و، نەفرەتی لەو ئافرەتانە کردوە، کە خۆیان بە پیاوان دەچوێنن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((ليس منَّا مَن تَشَبَّه بالرجال من النساء، ولا من تشبَّه بالنساء من الرجال))[2]، واتە: ئەو ئافرەتانەی خۆیان بە پیاوان دەچوێنن لە ئێمە نین‌و، هەروا ئەو پیاوانەی خۆیان بە ئافرەتان دەچوێنن.

ئەبو هورەیرە گوتویەتی: ((لَعَنَ رسول الله ﷺ الرجل يلبس لبسة المرأة، والمرأةَ تلبس لبسةَ الرجل))[3]، واتە: پێغەمبەری خوا نەفرینی لەو پیاوە کردوە، کە جلی ئافرەت لەبەر بکات، نەفرینی لەو ئافرەتەش کردوە، کە جلی پیاو لەبەر بکات.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((ثلاثةٌ لا يدخلون الجنّةَ ولا ينظرُ اللهُ اليهم يوم القيامة: العاقُّ لوالدَيْه، والمرأةُ المتشبهة بالرجال، والديُّوث))[4]، واتە: سێ کەس ناچنە بەهەشت، ڕۆژی قیامەت خوای گەورە تەماشایان ناکات: ئەو کەسەی ئازاری دڵی دایك‌و باوکی دەدات، ئەو ئافرەتەی خۆی

---

١) رواه البخاري وغيره.

٢) رواه أبو داود وسنده صحيح.

٣) رواه أبو داود والنسائي وابن ماجة والحاكم وقال صحيح على شرط مسلم.

٤) رواه أحمد في المسند بسند صحيح

بە پیاوان دەچوێنێ،و،[1] گەواد.

دەفەرموێ: ((أخرجوا المخنثين من بيوتكم))[2]، واتە: ژنانیەکانو نێرە موکان لە ماڵەکانتان دەرکەن.

---

١) لە گرنگترین هۆیەکانی قەدەغەکردنی خۆچواندن ئەوەیە، شوێنەوارێکی مەترسیدار لە دڵودەرون بەجێ دێڵێ، کە بۆ ڕفتار دەگوازرێتەوە، جا گەر ئافرەت خۆی بە پیاو بچوێنێ، ئەوا مەیلی بەلای کردەوەکانی پیاودا دەدات‌و سروشتەکەی دەگۆڕێت‌و مێینەییەکەی لە دەست دەدات. هەمان حاڵەتیش بۆ پیاو پیادە دەبێت.. شاراوەش نیە کە ئەم کارە گۆڕینی فیترەتەو، مەرگەساتە بەڵام چ مەرگەساتێك.

لە گرنگترین ئەو شتانەی پێویستە ئاماژەی پێ بکرێ، لە مەترسی خۆچواندن (تشبە) ئەوەیە" لە لەشی مرۆڤ چەند گلاند (غدة)ێك هەیە، کە هۆرمۆنی مێینەو هۆرمۆنی نێرینە دەردەدات‌و، هۆرمۆنەکانی مێینە زیاتر دەبێت بەسەر هۆرمۆنەکانی نێرینەو بە پێچەوانەوە، دیارە ئەمەش بەهۆی خۆچواندن‌و ڕەفتارکردنەوە دروست دەبێ. گەر ئافرەت خۆی چواند بە پیاو، جا چ لە جل‌و بەرگدا، یان لە جوڵەو نەریت‌و ئارەزووەکاندا، ئەوا ئەو گلاندە هۆرمۆنەکانی نێرینە زیاتر دەردەدات، ئەو کاتە سروشتی ئافرەتەکە بە سروشتی پیاو دەچێت، بە هەمان شێوەش لەلای پیاو.

مانای ئەمەش ئەوەیە، گۆڕینی ڕەفتاری ئافرەت، کار لە دەردانی ئەو هۆرمۆنانە دەکات، جا ئەگەر ئافرەت ڕێڕەوی پیاوی گرتەبەرو، لە جل‌و بەرگ‌و جوڵانەوەو کردەوەکانی خۆی بە پیاو چواند، ئەوا هۆرمۆنەکانی نێرینەیی زاڵ دەبێت بەسەر هۆرمۆنەکانی مێینەدا، ئەوکاتەش ئافرەتەکە بە پیاو دەچێت، لەمەشدا وەرگێڕانی تێکەیشتنەکان‌و گۆڕینی فیترەتەو، بە فیڕۆدانی بەرزترین سروشتەکانیەتی، ئەو کاتەش وەك پیاوی لێ دێ، کە نە خۆی ڕازی دەکات‌و نە پیاوەکەشی.

هەروەها بە پێچەوانەوەش ڕاستە، ئەگەر پیاو ڕێڕەوی مێینەی گرتەبەرو خۆی بەوان چواند لە هەڵس‌وکەوت‌و جل‌و بەرگیدا، تەنانەت لە ڕیش تاشینیشدا، ئەوا تایبەتمەندی یەکانی پیاوەتی‌و هێز لە دەست دەدات.

ئەم کارەش لە ڕۆژئاوا بە ئاشکرا بەرچاو دەکەوێ، کە خۆچواندنی ئافرەت بە پیاوان زۆرترە، پیاو وازی لە ئافرەت هێناوەو ئافرەتیش لە پیاو، هەردوکیان بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین مەیلیان داوە بە لای (شذوذ الجنسي)دا.

٢) رواه البخاري

# لاڕێیی غەریزەی خۆ دەرخستن(١)

١) ئەم غەریزەیە پاڵ بە خاوەنەکەیەوە دەنێت خۆی دەربخات، گەر ئەمە بۆ بڵاوکردنەوەی کارە چاکەکانو ناکارە باشەکان بێت، ئەوە کارێکی دروستو شەرعی یە. لە قورئانی پیرۆزدا لەسەر زمانی ئیبراهیم پێغەمبەر هاتوە، کە دوعای کردوە: ﴿رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا!﴾، واتە: ئەی پەروەردگارمان، ژنو منداڵانی وامان پێ ببەخشە، ببنە مایەی چاو ڕونیمان، بشمانکە پێشەوا بۆ خۆپارێزەکان.
کۆمەڵێك لە صۆفی یەکان هەوڵی دژایەتی کردنو خەفەکردنی ئەم غەریزەیان داوە، تەنانەت ابن عطاء الله السكندري گوتویەتی: (أدفن وجودك في أرض الخمول! فما ينبت مما يدفن، لا يتم نتاجه) واتە: وجودی خۆت لە زەوی بێ هێزی بنێژە، هەر شتێك نەنێژرێ سەوز نابێ و، بەرهەمەکەشی بەتەواوی نایەتە بەرهەم.. کە ئەمەی ناوە (الحكم العطائية).
ئەم جۆرە گومڕا کردنەمان بینیوە؟! کە بەجۆرە درۆو لاڕێبونە، دینی یان لەسەر مسوڵمانان مراندو بونە هۆی کزیو بێ هێزیو داڕوخان، جا هەمو ئەوانە لە کوێو، وەسفی خوای گەورە بۆ بڕواداران لە کوێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾، ﴿وَأَنْتُمُ الأَعْلَوْنَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ و، فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ ((أنا سيد ولد آدم ولا فخراً!)) ؟!
ئەوەی جێی داخو دڵ گرانی یە ئەوەیە، ئەم غەریزەیە لەلای زۆر لە ئافرەتان بە چەوتی پیادە دەکرێ، بە شێوازی ناشیرین هەوڵی خۆ بەدەرخستنیان دەدەن، کە ڕازاوەیی خۆیان دەردەخەنو بۆن لە خۆیان دەدەنو عەوراتیان بەدەر دەخەن، کە وروژاندنی پیاوانی تێدایە.
ئافرەتێك لە یەکێك لە سەیرانگاکاندا، کە پیاوێك لە نزیکی یەوە بوە، لە لای پۆلیس سکاڵای کردو گوتی: ئەوپیاوە ئازارم دەدات، کاتێك پرسیاری لە پیاوەکە کرد سەبارەت بەمە، ئەویش گوتی پشتم تێکردوە بۆ ئەوەی تەماشای نەکەم، ئافرەتەکە گوتی: ئا ئەمەیە ئازارم دەدات، چونکە گرنگیم پێ نادات!
با ئەم جۆرە ئافرەتانە لە خوا بترسنو پۆشاکی حیشمەت بپۆشن، با دور بکەونەوە لە هەڵسو کەوتو کرداری وروژێنەر، بۆ ئەوەی شەرەفی ئەوانو شەرەفی پیاوان پارێزراو بێت،

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿...وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾(النور-٣١)، واتە نابێ ئافرەتانی ئیماندار قاچیان بدەن بە زەویدا( تا دەنگی خشڵو پاوانەکانیان بێت) و بزانرێت، کە زینەتدارو خشڵدارن، کەواتە، ئەی ئیمانداران! هەموتان بەرەو لای خوا بگەڕێنەوە، بەڵکو سەرافراز بن.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: ((أيما أمرأةٍ إستعطرت ثم خرجت، فمرت على قومٍ ليجدوا ريحها فهي زانية، وكل عينٍ زانية))[1]، واتە: هەر ئافرەتێك خۆی بۆن خۆش بکات[2] و پاشان بچێتە دەرەوەو بە لای

---

ئەم هەڵس‌وکەوتو کردەوە وروژێنەرانە تەنها با بۆ مێردەکەی بێت.. با ئافرەت حەزی خۆ بەدەرخستن لە مەیدانەکانی پەروەردەی وەچەی چاكو ئامادەکردنی بەرزە پیاوانو بەرزە دایکان بەدەر بخات، وەك کە لە دوعای ئیبراهیم‌عليه السلام هاتوە.

١) رواه أحمد في المسند والنسائي حديث حسن .

٢) مامۆستا مەودودی لە کتێبەکەی (الحجاب)دا لە ژێر سەردێری (فتنة الطيب) گوتویەتی:

بۆن خۆشی نێرەرێکە لە دەرونی خراپەوە دەچێتە ناو نەفسێکی خراپتر -مەبەستی گەر ئافرەتێك خۆی بۆن خۆش کردبێتو لە ڕێگا بێت- ئەوە ناسکترین هۆیەکانی هەواڵ دانو پەیامنێرایەتی‌یە، کە سیستمی ڕەوشتی گشتی (مەبەستی نائیسلامییە) بەسوکی دادەنێ، بەڵام شەرمو شکۆی ئیسلامیو هەست ناسکی یەکەی، گەیشتۆتە ڕادەی ئەوەی تەنانەت ئەم هۆکارە ناسکە، لە هۆکارەکانی فریودان فەرامۆش ناکات، ڕێگە بە ئافرەت نادات بە بۆن خۆشی بە ڕێگادا بڕوات، یان لە کۆڕو مەجلیس دابنیشێ، با خۆیشی دابپۆشێو جوانیو ڕازاوەیی بەدەر نەخات، چونکە بۆنەکەی لەو شوێنەدا بڵاو دەبێتەوەو سۆزو عاتیفە دەجولێنێ.. (ص٣١٩)

بەبۆنەی قسە کردن لەسەر مەترسی چونە دەرەوەی ئافرەت بە بۆن خۆشی، ئەم توێژینەوە بۆ دڵدانەوەو پەند وەرگرتن باس دەکەین، کە لە کتێبی (الهلال) نساءٌ مفترسات، لاپەرە ٩٦-٩٧ بە کورتی وەرگیراوە.

کۆمەڵێك پیاودا بڕوات بۆ ئەوەی بۆنەکەی سەرنجیان ڕابکێشێ، ئەوا وەك زیناکەر وایە،[1] هەمو چاوێك زینا دەکات .

---

ئایا دەزانن نهێنی شاراوە لە دوای کۆبونەوەی چەند سەگێك لە دەوری دێڵە سەگێك، کە دەیەوێ جوت ببێ چی یە؟ ئەم پرسیارکردنە کە ماوەی چەند ساڵێکە لە ئارادایە، سەرنجی یەکێ لە زانایانی ڕاکێشا.. ئەویش ئەو گومانە باوەی هەبو، کە دێڵە سەگ -لە وەرزی زاوزێدا- بۆنێکی مێیینە دەردەدات، کە لە شوێنێکی دورەوە نێرینەکان بۆ خۆی ڕادەکێشێ، هیچ سەگێك ناتوانێت بیر لە جینس بکاتەوە، گەر ئەم بۆنە سحری یە نەیەت، جا ئەوکاتە غەریزەکەی دەبزوێ و، بە دوای ئەو دێڵە سەگە دەگەڕێ، کە بۆنەکەی دەرکردوە.

یەکێ لە زانایان ئەم ڕاستی یە دەگێڕێتەوە، کە سەرقاڵی تاقیکردنەوەی ئەو ماددەیە بوە، کە نێرینەی سەگ هەڵدەنێ و جنسی دەبزوێنێ، ڕۆژێك کارخانەکەی بەجێ دێڵێ و بە پێ دەچێتەوە بۆ ماڵ، کەمێك لەو ماددەیە بە جلەکانیەوە نوسابو، جا کۆمەڵە سەگێك بە بێدەنگی و هاربو (هەڵچو) بەدوای کەوتن، خەڵکیش بەمە سەریان سوڕماو نەیانزانی هۆکەی چی یە.

ئەو بۆنە کاتێك لە دێڵە سەگ دەردەچێت، کە ئارەزوی جنسی هەبێت. جا ئەم بۆنە وەك پلیتی لێ گێڕانەوەی نهێنی وایە، کە هەوا هەڵی دەگرێ و دەیگوازێتەوە بۆ هەمو سەگەکانی ناوچەکە.. هیچ سەگێك ناتوانێت بیر لە جنس بکاتەوە، گەر ئەو نامە کیمیایی یە، یان سروشتی یەی پێ نەگات!! کە لوت دەیگوازێتەوە بۆ دەماری بۆن کردن و، لە کۆدەمارەکانەوە بۆ مێشك و، لە مێشکەوە بۆ لیکە ڕژێنەکانی جنسی، جا گڕ دەگرێ و خاوەنەکەی، جنسی گڕ دەگرێ و، سەگەکان کۆدەبنەوەو جەنگێکی وردو خاشکەر لەسەر دێڵە سەگەکە ڕو دەدات!! تا بەو شێوەیە لە دواوەی ئەم بیرۆکەیە، دێڵە سەگەکە یاری خۆی ئەنجام دەدا.

١) مەناوی لە (فیض القدیر)دا گوتویەتی: بە واتای وەك زیناکەر وایە لە گوناهدا، با جیاوازیشی هەبێ، چونکە بکەری هۆیەکە، وەك بکەری هۆکارەکەیە، (الطیبي) گوتویەتی: ئافرەت کە بە بۆنخۆشی لە ماڵەکەی دەردەچێت، ئارەزوی پیاو دەوروژێنێت، وەك مەیل دانی زیناکردن وایە.

(کل عین زانیة) بە واتای هەر چاوێك تەماشای ئافرەتێکی بێگانە یان پیاوێکی

بێگانەی کرد، بەشێکی زینای بەرکەوتوە، چونکــە چاو ئەمە بەشی‌یەتی لـەو زینایـە. هەندێ لە مالیکی‌یـەکان لـەم فـەرمودەدا ئـەوەیان وەرگرتـوە، کـە چـێژ وەرگـرتن بـە بۆنکردنی بۆن خۆشی ئافرەتی بێگانە حەرامە، چونکە خوای گەورە ئەگەر شتێك حـەرام بکات، ئەوا شەریعەت ئەو شتەش قەدەغە دەکات، کە نزیکـە لـەو بـچێ، هەنـدێ لـە سەلەف لەمەدا زیادەڕۆیی‌یـان کـردوە، تەنانـەت ئـیبن عومـەر ڕەزای خـوای لــێ بـێ قەدەغەی کردوە، گەر ئافرەتێك لە شوێنێك دانیشت و دوایی هەستا، یەکـسەر پیـاو لـە شوێنەکەی دابنیشێ، مەگەر کاتێ گەرمایی شوێنی دانیشتنەکەی نامێنێ!

## نابێ خۆ بە بێبڕوایان بچوێندرێ

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَاسْتَقِيمَا وَلاَ تَتَّبِعَانِ سَبِيلَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ (يونس- ٨٩)، ئەم ئایەتە ئاراستەی موساو هارون عليه السلام کراوە، واتە: بەردەوام بن لەسەر خواناسیو چاکەکاریو شوێن ڕێچکەی نەزانان مەکەون.

دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ﴾ (النساء- ١١٥)، واتە: هەرکەسێك سەرپێچی لە فەرمانەکانی پێغەمبەر بکات، دوای بەدیارکەوتنی ڕێگای ڕاست، غەیری ڕێگای بڕواداران بگرێتە بەر، ئەوا وازی لێ دێنینو ئاگری دۆزەخی توش دەکەینو، توشی خراپترین چارەنوسی دەکەین.

هەروا دەفەرموێ: ﴿وَلَنْ تَرْضَى عَنْكَ الْيَهُودُ وَلاَ النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ قُلْ إِنَّ هُدَى اللهِ هُوَ الْهُدَى وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ اللهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلاَ نَصِيرٍ﴾(البقرة- ١٢٠)، واتە: جولەکەو گاورەکان لێت ڕازی نابن تاکو شوێن ئایینی ئەوان نەکەوی! بلێ بە ڕاستی ڕێگای ڕاستی خوا هەر ئەمە ڕێگای ڕاستە کە ئیسلامە، گەر شوێن ئارەزووەکانیان بکەوێ پاش ئەوەی کە (سروش)ت بۆ هات ئەوا خوای گەورە دۆستو یاریدە دەرت نی یە.

هەروا دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقُولُوا رَاعِنَا وَقُولُوا انظُرْنَا وَاسْمَعُوا وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾(البقرة- ١٠٤)، واتە: ئەی ئەوانەی

باوەڕتان هێناوە مەڵێن (راعنا)[1]، چونکە بە عەرەبی ئەگەر چی مانای ڕەچاوکردنو موراعاتە، بەڵام بە زمانی جولەکە (جنێوە). لە جیاتی ئەم وشەیە بڵێن (انظرنا) بە مانای چاوت لە ئێمە بێ، بۆ کافرانیش ئازارو عەزابی بە ئێش هەیە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((من تشبه بقومٍ فهو منهم))[2]، واتە: هەر کەسێك خۆی بە قەومێك بچوێنێ، ئەوا ئەو کەسە لەوانە.

ئەبو واقیدی لەیثی ﷺ گوتی: (لەگەڵ پێغەمبەری خوا پێش خەیبەر دەرچوین، ئێمە نەو مسوڵمان بوین، موشریکەکان درەختێکیان هەبو لە دەوردی دەمانەوەو چەکەکانیان پێوە هەڵدواسی، کە پێیان دەگوت: (ذات أنواط).. گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، (ذات أنواط)ێکمان بۆ دابنێ، وەك کە ئەوان (ذات أنواط)یان هەیە، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموین: ((الله أكبر! وەك کە بەنی ئیسرائیلی یەکان گوتیان پەرستراوێکمان بۆ دابنێ وەك کە ئەوان پەرستراوێکیان هەیە، ئەوە ئێوە ڕێبازی پێش خۆتان

---

١) قەتادەو غەیری ئەو گوتویەتی: جولەکەکان بە گاڵتە جاری یەوە دەیانگوت (راعنا)، جا خوای گەورە رازی نەبو بڕواداران وەك ئەوان ئەو قسەیە بکەن.

ئیمام ئیبن تەیمیە قسەیەکی لەسەر ئەم ئایەتە هەیە، گوتویەتی: هەمو ئەمانە ئەوە دەردەخەن، ئەم وشەیە لە مسوڵمانان قەدەغە کراوە، چونکە جولەکە ئەو کاتە ئەو قسەیان دەکرد، هەرچەندە لای جولەکە ئەم قسەیە شتێکی ناشیرینەو، لای مسوڵمانان ناشیرین نی یە، بەڵام خۆ چواندنیان لەمەدا خۆ چواندنە بە بێبڕوایان، خۆ چواندنە بە ڕێگایان بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانیان.. (اقتضاء الصراط المستقیم)

٢) حدیث صحیح رواه أبو داود .

ده‌گرنه‌به‌ر!))[١].

پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمویه‌تی: ((لَتَتَّبِعُنَّ سُنَنَ مَن قبلكم شبراً بشبرٍ وذراعاً بذراعٍ: حتى لو أنَّ أحدهم دَخَل جُحْر ضَبّ لدخلتموه؟، وحتى لو أن أحدهم جامع أمرأته بالطريق لفعلتموه))[٢]، واته: لێره‌و به‌دوا شوێن رێبازی قه‌ومی پێش خۆتان ده‌که‌ون، بست به‌ بست‌و گه‌ز به‌ گه‌ز، ته‌نانه‌ت گه‌ر یه‌کێکیان بچێته‌ ناو کونی سه‌رمازه‌ڵه‌وه‌، ئێوه‌ش ده‌چنه‌ ناوی[٣]. ته‌نانه‌ت گه‌ر یه‌کێکیان له‌ رێگادا له‌گه‌ڵ خێزانه‌که‌ی جوت ببێ،

---

١) فه‌رمووده‌یه‌کی (صحیح)ه‌ .

٢) رواه الحافظ العراقي .

٣) خۆ چواندن به‌ بێگانه‌ که‌سایه‌تی له‌ده‌ست ده‌دات، کیانی نومه‌ت ناهێڵێ، که‌ ئه‌ویش به‌ڵگه‌ی لاوازی‌یه‌تی‌یه‌، چونکه‌ لاواز لاسای به‌هێز ده‌کاته‌وه‌، لاساکردنه‌وه‌ی بێبڕوایان له‌ جل‌وبه‌رگ‌و داب‌و نه‌ریتیان، سه‌ر ده‌کێشێ بۆ لاساکردنه‌وه‌یان له‌ بیروباوه‌ڕو بیرۆچکه‌کانیاندا.

بۆیه‌ ئیمام ئیبن ته‌یمیه‌ گوتویه‌تی: ((ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ له‌ که‌مترین حاڵه‌ته‌کانی حه‌رامکردنی خۆ چواندن به‌ بێبڕوایان ده‌خوازێ، ئه‌گه‌ر چی (ظاهر)ه‌که‌ی به‌ بێبڕوا دانانی خۆ چوێنه‌ره‌ به‌وان، وه‌ك خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێ: ﴿وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾، واته‌: هه‌ر که‌سێك له‌ ئێوه‌ دۆستایه‌تیان بکات ئه‌وه‌ له‌وانه‌. ئه‌مه‌ش به‌رامبه‌ری وته‌ی ئیبن عومه‌ره‌ که‌ ده‌ڵێ: (هه‌ر که‌سێك له‌ خاکی موشریکان بنیات بنێ‌و نه‌ورۆزو میهره‌جانیان بکات‌و خۆی پێیان بچوێنێ هه‌تا ده‌مرێ، رۆژی قیامه‌ت له‌گه‌ڵ ئه‌وان حه‌شر ده‌کرێ، ئه‌مه‌ش خۆ چواندنی ره‌ها هه‌ڵ ده‌گرێ!)).

ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ لاسایی کردنه‌وه‌ی بێگانه‌ له‌ پیشه‌سازی‌یان‌و زانسته‌ به‌ سووده‌کانیان ناگرێته‌وه‌، چونکه‌ حیکمه‌ت شتێکی بزر بوی بڕواداره‌.

ئه‌رێ ئافره‌ته‌ مسوڵمانه‌کان! ئه‌مڕۆکه‌ له‌و فه‌رمووده‌یه‌ له‌ کوێن؟!

بە داخەوە ئەو ئافرەتانە لە زۆر نەریت و جل و بەرگ و خۆ جوان کردن و نینۆك درێژکردن خۆ بە ئافرەتە بێگانەکان دەچوێنن، کە ئەو نینۆك درێژکردنە وەك نینۆکی ئاژەڵە دڕندەکانە، کە زۆربەی نەخشەسازی جولەکەی جیهانی یە بۆ ماڵ بەفیڕۆدان و دابەزینی نرخی مرۆڤ و گاڵتە پێکردنی.

وێڕای ئەوەی باسکرا لەم لاسایی کردنە کوێرانەیە، هۆیەکیشە بۆ بەفیڕۆدانی سامانی گشتی و پاڵی ناوە بە زۆر لە ئافرەتان، کە لە ڕێی کاری خراپەوە ئەو مۆدێلە پیس و خراپەیە دەستەبەرکردن.

جا وریا بن ئەی پیاوان و ژنانی خاوەن عەقڵ!

بە شێوەیەکی تایبەتی ڕاسپاردەم بۆ ژن (هاوسەر) ئەوەیە، کەسایەتی خۆی بەهێز بکات و وەك مەیمون لاسایی نەکاتەوە، لەسەری یەتی خاوەن ویستێکی بەهێز بێت و تەوژمەکانی سەردەم و جل و بەرگی ڕۆژئاوایی کاری تێ نەکات، جا چ لە پۆشاکیدا، یان لە کەل و پەلی ماڵەوەیدا، یان لە نەریتی دا، چونکە بەختیاری ژن و مێرد، بە خۆشەویستی نێوانیان و سۆز نواندنیان و لێك گەیشتنیانە، نەك بە پۆشاکی زۆرو کەل و پەل و شانازی کردن لەبەردەم میوان و دراوسێکان.

بێ ئاگایی لەم ئامۆژگاریانە چەندە بۆتە هۆی سەرکێشی ناکۆکی و دژایەتی و جیابونەوە لە نێوان ژن و مێرددا، کەواتە ئاگادار بن ئاگادار!

بە بۆنەی قسەکردن لەسەر ئاگاداری دانی خوای گەورە بە خۆ نەچواندن بە بێ بڕوایان، سەرنجی خوشکی بڕوادار ڕادەکێشم، کە قژ لە ئوتودان (كي الشعر) و ڕەنگ کردنی بە ڕەنگی جیاجیا لەسەر شێوەی بێگانە، سەرەڕای حەرامی یەکەی، دەبێتە هۆی قژ هەڵوەرین بە خێرایی.

دکتۆر عبدالمنعم المفتی مامۆستاو سەرۆکی بەشی نەخۆشی یە پێستی یەکان لە کۆلیجی پزیشکی لە زانکۆی قاهیرە، لە گۆڤاری (طبيبك الخاص)، ساڵی دوەم، ژمارە (٤)ی نیسانی ١٩٧٠، ل٩٤، نەقلی کردوەو گوتویەتی:

((چەند شێوازێکی چاککردنی قژ هەیە کە دەبێتە هۆی هەڵوەرینی" بەکارهێنانی ئوتو.. یان بەکارهێنانی یەك تاکە دەرمانی کیمیائی، کە چەند ماددەیەکی گەرمی تێدایە دەبێتە هۆی هەڵوەرینی قژ.. ئەم دەرمانانە، سروشتی مو لاواز دەکات، هەتا

ئێوەش وەك ئەوان دەیکەن.[1]

شێوەی داواکراو وەردەگرێ...)).

هەندێکیش زیانی بەستنی قژ نازانن، جا چ بە بەکارهێنانی (رولو) بێت، یان بە هەر ڕێگایەکی تر، هەروا ڕاکێشان بۆ چەند کاتژمێرێکی درێژ، ماناکەی ڕاکێشانی ڕەگی قژە بەستراوەکەو سنور دانانە بۆ چونی ئەو چەندی‌یە خوێنەی دەگاتە قژ...

مانای ئەمەش رودانی بێ‌هێزی‌یە لە خانەکانی رەگی قژە بەستراوەکەداو، وەستانی گەشەکردنیەتی.. پاشان پاڵنانی بۆ قۆناغی ڕاوەستان.. پاشان سیس بون.

بە بۆنەی قسەکردن لەسەر مەرجەکانی باڵاپۆشی ئیسلامی، جێی داخمە، کە بڵێم زۆر لە ئافرەتە مسوڵمانە پارێزکارەکان (التقيات) نەزانن بەرامبەر بەم مەرجانە، دەبینین هەندێکیان چاك سەری داپۆشیوە، هیچ مویەکی بەدیارەوە نی‌یە، کەچی قاچەکانی بە دیارەوەن، گومان وا دەبەن، کە تەنها گۆرەوی بەسە بۆ داپۆشینی قاچ!! ئەمە هەڵەیە، چونکە گۆرەوی قەبارەی قاچ دەردەخات.

لەو ئافرەتانە هەن جلو بەرگێکی پۆشتە لەبەر دەکەن، بەڵام تەسکەو زۆر لە بەشەکانی جەستەی بەدیار دەخات. هەیانە جلو بەرگی پانو فراوان لەبەر دەکات، بەڵام ڕەنگاو ڕەنگە، ئەم جۆرە حیجابانە جائیز نی‌یە.

١) ئەم ریوایەتە جگە لە ((لو أن أحدهم جامع أمرأته))، فەرمودەکە هەموی حاکم گێڕاویەتەوەو بە (صحيح)ی داناوەو ذهبي هاودەنگی (صحيح)ەکەیە.

## مەرجەکانی بالاپۆشی ئافرەتی مسوڵمان

### مەرجەکانی بالاپۆشی ئافرەتی مسوڵمان هەشتن:

١- جلەکە هەمو لەش دابگرێت، لە حەدیسی أسماء دیاری کراوە: ((یا أسماء! إن المرأة إذا بلغت المحيض، لم يصلح أن يُرى فيها إلا هذا وهذا، وأشار الى وجهه وكفيه)) [١]، واتە: ئەسماء، ئافرەت کە توشی خوێنی بێنوێژی بو، بۆی نی‌یەو دروست نی‌یە هیچ شوێنێکی ببینرێ، جگە لە دەمو چاوو هەردو دەستی.

٢- نابێ جلەکە لە خودی خۆیدا ڕازاوە بێت، ﴿وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ...﴾، ئەم ئایەتە بە گشتی هەمو پۆشاکێکی دەرەوە دەگرێتەوە، گەر سەرنج ڕاکێشەری پیاوان بێت. گەواهی ئەمەش فەرمایشتی خوای گەورەیە: ﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلاَ تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الأُولَى﴾.

لە فەرمودەشدا هاتوە: ((ثلاثة لا تسأل عنهم: رجل فارق الجماعة وعصى إمامه ومات عاصياً، وأمة أو عبد أبق فمات وإمرأة غاب عنها زوجها قد كفاها مؤنة الدنيا فتبرجت بعده، فلا تسأل عنهم)).

٣- پێویستە جلەکە ئەستور بێت و تەنك نەبێت، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((سيكون في آخر أمتي نساءٌ كاسياتٌ عارياتٌ، على رؤسهن كأسنمة البخت..)).

٤- پێویستە پان و بەرین و فراوان بێ و تەسك نەبێت، کە ئەندامێکی لەشی

---

١) حديث حسن بمجموع طرقه.

ئافرەتەکە بەدیار بخات.

ئوسامەی کوڕی زەید گوتی: ((**كساني رسول الله ﷺ قبطية كثيفة مما أهداها له دحية الكلبي، فكسوتها أمرأتي، فقال: ما لك لم تلبس القبطية؟ قلت: كسوتها أمرأتي، فقال مُرْها فلتجعل تحتها غلالة، فإني أخاف أن تصف حجم عظامها**))[1]، واتە: پێغەمبەری خوا بەرگێکی وەك جبەی پێ بەخشیم، کە تەسك بو، دوحیەی کەلبی بە دیاری پێشکەشی پێغەمبەری کردبو، منیش بەخشیمە خێزانەکەم، جا پێغەمبەر پێی گوتم: بۆچی ئەو جلەت لەبەر نەکردوە، منیش گوتم: بەخشیمە خێزانەکەم لەبەری بکات. فەرموی: بە خێزانەکەت بڵێ با ژێرکراسی لەگەڵ لەبەر بکات، چونکە دەترسم قەبارەی ئێسکەکانی بەدەر بخات.

٥- نابێ بۆن خۆش کرابێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**أيما أمرأة استعطرت، فمرت على قوم ليجدوا ريحها، فهي زانية**)).

٦- نابێ بە جلو بەرگی پیاوان بچێ، ((**لعن رسول الله ﷺ الرجل يلبس لبسة المرأة، والمرأة تلبس لبسة الرجل**)).

٧- نابێ بە جلو بەرگی کافران بچێ ((... **ومن تشبه بقومٍ فهو منهم**)).

سەرۆکی گەورەی میسری مصطفى كامل، سەرۆکی پارتی نیشتمانی لە میسر، لە ڕۆژنامەی (اللواء)دا لە وەلامی قاسم أمين، لە کتێبەکەی (تحرير المرأة)دا گوتویەتی: ((من لەو کەسانە نیم دیدگایان وابێ، کە

---

١) رواه أحمد في المسند (٢/٢٠٥) .

پێویسته پەروەردەی کچان لەسەر مەبدەئەکانی ئەورووپی بێت، چونکه لەمەدا مەترسی هەیه بۆ سەر ئایینەدی ئوممەت، چونکه ئێمه مسوڵمانین، هەر ئوممەتێکیش شارستانی یەتیەکی تایبەت بە خۆی هەیە، لایەق بە ئێمه نی یه وەك مەیمون لاسایی کوێرانەی بێگانه بکەینەوە، چونکه بالاپۆشی له ڕۆژهەڵاتدا پارێزەره، بەڵام چ پارێزەرێك!))

٨- نابێ جل و بەرگەکه بۆ ناوبانگی و شۆرەت بێت، وەك که پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((من لبس ثوب شهرة في الدنيا ألبسه الله ثوب مذلة يوم القيامة ثم ألهب فيه ناراً))[1]، واته: هەرکەسێك جل و بەرگ بۆ ناوبانگی لەبەر بکات، خوا له ڕۆژی قیامەتدا جل و بەرگی زەبونی لەبەر دەکات و ئاگری دەدات.

١) (حجاب المرأة المسلمة) به کورتکراوەیی.

## داوێن پاك لە ژێر سێبەری خوایە
## -پاداشتی داوێن پاکی-

خوای گەورە لە باسی چیرۆکی یوسف دا دەفەرموێت:
﴿وَرَاوَدَتْهُ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَنْ نَفْسِهِ وَغَلَّقَت الأَبْوَابَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ قَالَ مَعَاذَ اللهِ إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾ (يوسف-٢٣)، واتە: یوسف کە لە ماڵی زولەیخا بو، زولەیخا داوای لە یوسف کرد، کە لەگەڵی جوت ببێ، جا حەوت دەرگاکانی خانوەکەی کلیل داو بە یوسفی گوت وەرە رویی خۆت لە من بکە، یوسف گوتی: خۆم دەپارێزم بە خودا لەم کارە، چونکە (قطفیر)ی مێردی تۆ گەورەی منە، رێزگرتنی جێگای منی بە تۆ سپارد، -من خیانەت لەو ناکەم-، بەڕاستی ستەمکاران قەت رزگار نابن[1].

---

١) هەواڵی ئەوانە زۆرە، کە لە ترسی خوای گەورە بەسەر هەواو ئارەزوەکانیان زاڵ بون، لەوانە: شەوێك خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب -رەزای خوای لێبێ- لە کاتی گەڕانیدا گوێی لە ئافرەتێك بو شیعری بەسەر گەنجێکی جواندا هەڵدەگوت، ئاواتەخوازبو هاوسەری ئەوبا، کە ناوی نصر بن حجاج بو:

| | |
|---|---|
| هل من سـبيل الى خمرٍ فأشربها | أو من سبيلٍ إلى نصر بن حجاجِ |
| إلى فتىً ماجد الأعـراقِ مقتبلٍ | سـهل المحيا كريم غير ملجاجِ |
| نمته أعـراق صـدقٍ حين تنسبهُ | أخي حفاظ عن المكروب فـراجٌ |

خەلیفە کە گوێبیستی بو تورە بو، گوتی: بە خوا نابێ پیاوێك لەگەڵم دابێ ئافرەتان لە ماڵەوە بەسەریدا هەڵبڵێن.

بۆ بەیانی هێنایە لای خۆی، جا کە جوانیەکەی بینی گوتی: بە خوا نابێ لە شارێك دابنیشی، کە ئافرەتان ئاواتەخوازت بن، بڕۆ بۆ (بەسرە)و چەندت پێویستە لە پارەی

هەروا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَاوَدتُّهُ عَنْ نَّفْسِهِ فَاسْتَعْصَمَ﴾(یوسف- ٣٢)، واتە: زولەیخا گوتی: بەڕاستی داواکاری بەدکاریم لە ئەو کرد، ئەمیش نەیویست داواکاریەکەم جێبەجێ بکات.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((حەوت کەس لەژێر سێبەری خوای گەورەدن، لە ڕۆژێکدا هیچ سێبەرێك نی یە، جگە لە سێبەرەکەی ئەو نەبێت: پێشەوایەکی دادگەر (عادل)، گەنجێك لە گوێڕایەڵی خوادا پەروەردە بوبێت، پیاوێك دڵی بە مزگەوتەوە بەستراو بێت، دو کەس لەبەر خوا یەکتریان خۆش بوێت‌و لەسەر ئەمە کۆببنەوەو لە یەکتری جیا ببنەوە، پیاوێك ئافرەتێکی جوان‌و خاوەن پلەو پایە بانگی بکات بۆ داوێن پیسی‌و بڵێ: من لە خوا دەترسم!! پیاوێك بە شاراوەیی خێرێك بکات نەهێڵێ

---

(بیت المال) هەڵگرە.

نەصر پێی گوت: بەڕاستی منت کوشت، چونکە جیابونەوە لە نیشتمان وەك کوشتنی نەفسە.

عومەر پێی گوت: چۆن وایە؟

نەصر وەڵامی دایەوە: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِنْ دِيَارِكُمْ﴾.

خەلیفە گوتی: بەڵام منیش ئەوە دەڵێم، کە شوعەیب گوتی: ﴿إِنْ أُرِيدُ إِلاَّ الإِصْلاَحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلاَّ بِاللهِ﴾.

جا خەلیفە بەم چارەسەرە جوانە هەوڵیدا (نەصر) بە غەریزە جنسی‌یەکەی بەرزبکاتەوە بۆ سۆز نواندنی نیشتمانەکەی‌و خۆزگە خواستن بۆ کەس‌وکاری.

کاتێ کچەکە زانی (نەصر) بەهۆی ئەوەوە دورخراوەتەوە بۆ (بەصرا)، شەوێك هۆنراوەیەکی گوت، تیایدا بەرائەتی خۆی ئاشکرا کرد، کە ئەو قسانەی کردویەتی سەرزارەکی بوەو وەسوەسەی شەیتان بوە، خۆی ئافرەتێکی لە خوا ترس‌و داوێن پاکە.

عومەریش کە گوێی لە هۆنراوەکەی کچەکە بو دەستی کرد بە گریان، لەبەر گومان بردنی بەو ئافرەتەو، لە دڵی خۆیدا گوتی: سوپاس بۆ خوا، کە هەواو ئارەزوی بە لغاوی داوێن پاکی‌و تەقواوە بەستوە.

دەستی چەپی بەوە بزانێ، کە دەستی ڕاستی بەخشیوەتی، پیاوێك یادی خوا بکاتو لە ترسی خوا چاوی پڕ بێ لە فرمێسك))..[1]

هەروەها فەرمویەتی: ((سێ کەس لەپێش ئێوە لە شار دەرچون تا چونە ناو ئەشکەوتێك، جا بەردێکی گەورە لەسەر شاخەکەوە کەوتە بەردەمی ئەشکەوتەکەو کونەکەی گرت، ئەو سێ کەسە گوتیان: هیچ شتێك لەم بەردە رزگارتان ناکات، مەگەر داوا لە خوای گەورە بکەن بە هۆی کردەوەی باشتان فریاتان بکەوێ..

یەکێکیان گوتی: خوایە من کچێکی مامم هەبو، کە لە هەمو خەڵك زیاترم خۆش دەویست، داوای زینام لێکرد ئەویش ملکەچ نەبو. ساڵێك لە ساڵەکان هاتە لامو داوای پارەی لێکردم، منیش سەدو بیست دینارم پێ بەخشی بەمەرجێ، کە ملکەچی داواکەم بێت، ئەویش داواکەی جێبەجێ کردم، ویستم کارەکە بکەم گوتی: ئەی بەندەی خوا، لە خوا بترسە! ئەو مۆرە بە حەقی خۆی نەبێ مەیشکێنەو مەیکەوە، منیش کارەکەم نەکردو وازم لێ هێنا، کە خۆشەویستترین کەس بو لەلام، ئەو پارەیەش، کە پێم بەخشی بو لێم نەسەندەوە، خوایە ئەگەر ئەو کارەم لەبەر خاتری تۆ کردوە، دەرگامان لێ بکەوەو لەوەمان رزگار بکە،[2] جا

---

١) بوخاریو موسلیمو غەیری ئەوان گێڕاویەتیانەوە.

٢) تەوەسول کردن بەو شێوەیە دروستەو خوای گەورە پێی رازی‌یە، دەبێ بە هۆی کردەوەی چاك بێت، تەوەسول کردن بە پێغەمبەرانو غەیری ئەوان جائیز نی‌یە. لە فەرمودەی صحیحدا هاتوە: ((یا فاطمة! لا أغني عنك من الله شیئاً!)) فاطیمە! من لە لای خوا هیچم بۆ تۆ پێ ناکرێ.. پێویستە لەسەر بڕوادار، متمانە لەسەر کردەوەی خۆی بکات! وێنەی ئەم ناڕاستەیە نی‌یە، کە پاڵنەرە بۆ جیدیەتو پێشکەوتن، ئەو ئومەتەی، کە واسیطەکاری تێدا بڵاوە، سەرفراز نابێو بەرەو پێش ناڕوات!

بەردەکە لا کەوت))..[١]

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((ثلاثة لا ترى أعينهم النّار: عينٌ حرست في سبيل الله، وعينٌ بَكَتْ من خشية الله، وعينٌ كفّت عن محارم الله))[٢]، واتە: سێ چاو ئاگر نابینێ: چاوێك لە پێناوی خوای گەورە پاسەوانی بکات، چاوێك لە ترسی خوا بگری، چاوێك خۆی لە حەرامکراوەکانی خوا لابدات.

لە ئیبن عامرەوە گوتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بو دەیفەرمو: ((پیاوێك هەبو لە بەنی ئیسرائیلی یەکان ناوی (کفل) بو، لە هیچ گوناهێك سلّی نەدەکردەوە. ئافرەتێك هاتە لای، شەست دیناری پێدا بەرامبەر بە دەست تێکەڵکردن و داوێن پیسی، جا کاتێك ویستی کارەکە بکات، ئافرەتەکە لە ترسا گریا.

(کفل) گوتی: بۆ دەگری؟!

ئافرەتەکە گوتی: قەت ئەم کارەم نەکردوە، بەڵام هەژاری و نەداری پاڵی پێوەناوم بۆ ئەم کارە.

(کفل) گوتی: تۆ لە ترسی خوا دەگری، ئەوا من شایستەترم بەوە، بڕۆ ئەوەی پێم بەخشیت بۆ خۆت بێ، بە خوا لەدوای ئەوە هەرگیز سەرپێچی خوا ناکەم، ئەو شەوە گیانی سپارد، بۆ بەیانی لەسەر دەرگای ماڵەکەی نوسرابو: خوای گەورە لە گوناهی (کفل) خۆش بو، خەڵکەکە بەم کارە سەرسام بون))[٣].

---

١) بوخاری و موسلیم گێڕاویەتیانەوە.

٢) رواه الطبراني حديث صحيح.

٣) حاکم و ترمذي گێڕاویانەتەوەو بە (حسن)یان داناوەو (صحیح)ە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((لَو عَلِمتُم ما أعْلَمُ لَضَحكتُمْ قَليلاً و لَبَكَيتُمْ كثيراً، وما تَلَذَّذتُمْ النِساءَ على الفُرُش، ولَخَرجتُم الى الصَّعُدات تَجأرون الى الله...))(رواه الترمذي و غيره)، واته: ئەوەی من دەیزانم، گەر ئێوە بتانزانیبایە، کەم پێدەکەنن و زۆر دەگرین و، سەرجێی لەگەڵ خێزانتان نەدەکردو، دەچونە سەر بەرزاییەکان لە خوا دەپاڕانەوە.

## نزیکی زینا مەکەون

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً﴾[1] (الإسراء- ٣٢)، واتە: نزیك زینا مەکەون، چونکە زینا کارێکی زۆر ناشیرینو خراپترین ڕێگایە.

هەروا دەفەرموێ: ﴿وَعِبَادُ الرَّحْمنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الأَرْضِ هَوْنًا... تا دەگاتە: وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلاَ يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذلِكَ يَلْقَ أَثَامًا، يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا...﴾ (الفرقان: ٦٣،٦٨-٦٩)، واتە: بەندەکانی خوا ئەوانەن کە بەسەر زەویدا بە نەرمیو لەسەر خۆ دەڕۆن... سیفەتیان وایە کە لە غەیری خوا خودایەکی تر ناپەرستنو، کەس بە ناحەق ناکوژنو، زینا ناکەن. هەر کەسێك یەکێ لەمانە بکات، دەگات بە سزاو عەزاب، لە ڕۆژی قیامەتدا دو چەندانە عەزابەکەی بۆ زیاد دەکرێو بە هەمیشەییو بە ریسوایی تێیدا دەمێنێتەوە.

ئیبن مسعود گوتویەتی: ((قلت: يا رسول الله أي الذنب أعظم عند الله؟

---

١) لەسەر ئەم ئایەتە ئیمام ئیبن القیم قسەیەکی هەیەو گوتویەتی:
خوای گەورە ڕێگای زینای بە خراپترین ڕێگا داناوەو فەرمویەتی، کردەی زینا خراپترین شوێنی لە دۆزەخدا هەیە، ڕۆحەکانیشیان لە بەرزەخ جێگیرەو لە تەندورێکی ئاگرین دایە، کە گڕەکەی لە ژێریانەوە بۆیان دێت، جا کە گڕەکەیان بۆ دێت هەرا هەرایان لێ پەیدا دەبێتو بەرز دەبنەوە، پاشان دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان، ئا بەو شێوەیە تا ڕۆژی قیامەت دەمێننەوە. وەك پێغەمبەر ﷺ لە خەویدا بینیویەتی، خەونی پێغەمبەرانیش بێگومان ڕاستە. (روضة المحبين، بە کورتکراوەیی)

قال: أن تجعل لله نداً وهو خلقك.. قال: قلت: ثم أي؟ قال: أن تقتــل ولدك مخافــة أن يطعم معك.. قال: قلت: ثم أي؟ قــال: أن تزنـــي بحليلة جارك... الحــديث))[1]، واتــه: گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا چ گوناهێك لای خوا لە هەمو گوناهەکان گەورەترە؟ فەرموی: هاوبەشی بـۆ پەیدا بکەی، کە ئەو تۆی دروست کردوە.

دەڵێ: گوتم: پاشان چی تر؟ فـەرموی: منداڵەکـەت بکـوژی لـە ترسـی ئەوەی خواردنت لەگەڵ بخوات.

دەڵێ: گوتم: پاشان چی تر؟ فەرموی: زینا لەگەڵ خێزانـی دراوسـێکەت بکەی.

سمرەی کوڕی جندب گوتی: قال لنا رسول الله ﷺ ذات غـداة: ((إنـه أتاني الليلة آتيان وإنهما ابتعثاني وإنهما قالا لي: انطلق، واني انطلقـت معهما... فأتينا على مثل التنور، فاذا فيه الغط وأصوات، قال: فانطلقنا، فإذا فيه رجالٌ ونساءٌ عراة وإذا هم يأتيهم لهب من أسـفل مـنهم، فـإذا أتاهم ذلك اللهب ضَوْضَوْا)) الحـديث.... وفي آخـره ((وأمـا الرجـال والنساء العراة الذين في مثل التنور، فإنهم الزنـاة والزوانـي))[2]، واتـە: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا پێی فەرموین: ئەمشەو دو فریشتە هـاتن منیـان لەگەڵ خۆیان برد و پێیان گوتم: بڕۆ، منیش لەگـەڵیان ڕۆیـشتم... چـوینە شوێنێك کە وەك تەندور وابو، دەنگە دەنگی لێوە دەهـات، فـەرموی: جـا تەماشامان کـرد، دیتمـان چـەند پیـاو و ئـافرەتێکی ڕوتـی تێدایـە، لـە ژێرەوەیان گڕی ئاگریان بۆ دێت، کە ئەو گڕە ئاگرەیـان بـۆ دەهـات هـاوار

---

١ رواه البخاري ومسلم.

٢) رواه البخاري بأختصار.

هاوارو قیژەیان لـی هەڵدەستا... ئەو پیاو و ئافرەتـە ڕوتانـەی کـە لـەناو شوێنێکی وەك تەندور دابون، ئەوانە ئافرەتی زیناکەرو پیاوی زیناکەر بون.

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((**لا يحل دم أمريء مسلم يشهد أن لا الـه إلا الله وإني رسول الله إلا بإحدى الثلاث: الثيـب الـزاني، والـنفس بالنفس، والتارك لدينه المفـارق للجماعـة**))[1]، واتـە: خـوێنی هـیچ مسوڵمانێك حەڵاڵ نی یە، کە شایەتمان بێنێ، مەگەر بـە یـەکێك لـە سـێ شت نەبێت: پیاوی ژن دارو ژنی مێـرد داری زیناکـەر[2]، یـەکێك حـەقی

١) رواه البخاري ومسلم.

٢) بـۆ پاراسـتنی قـەوارەی خێـزان، ئیـسلام سـزای تونـدی بـۆ پیـاوی ژنـدارو ژنـی مێرددار(محصن)ی زیناکەر داناوە، کە شەریعەتی تەوراتیش هەر هەمان سزای بۆ داناون، کەواتە دوژمنانی ئیسلام چی یانە سەبارەت بەم سزایە، ئیسلام بە توندوتیژیو دڵڕەقـی تاوانبار دەکەنو غەیری ئیسلام تاوانبار ناکەن؟! لەگەڵ ئەوەی کە چەند مەرجێکی وردی بۆ داناوە، کە شوێنەکە جێی باسکردنی نی یە، بۆ ئەوەی وەڵامی بدرێتەوە!

پرسیار لە ئەدیبی گەورە (مصطفى صادق الرافعي) کرا دەربارەی حیکمـەتی بـەردباران کردنی زیناکەری (محصن)، جا لە کتێبەکەی (وحي القلم)دا وەڵام دەداتەوەو دەڵێ: چـونکە ماڵێکی وێران کردوەو روخانـدوە، پێویـستە بـە بەردەکـەی بکوژرێتـەوە؟! چـونکە هـیچ پێویست بە زینا ناکاتو پاساویشی بۆ نی‌یە، پیاو و ژن هەر یەکەیان بە هەمو سەربەستی خۆیان یەکتریان هەڵبژاردوە، تەنانەت ئەم حەقە بۆ خودی مەلیکی ئینگلتـەرا نـەبوە، کـە لەم هەڵبژاردنەدا لە مافەکەی بێ بەش کـراوە، تـاوەکو گەیـشتۆتە رادەی ناچـار بـون بـە تەنازول کردن لە مولکەکەی!

هەروەها هەر یەکێکیان مافی هەڵوەشاندنەوەی عەقدی زەواجەکەی هەیە، گەر هەستی بە حەزنەکردنی کەسی بەرامبەر کرد، گەر هەستی کرد ژیان بردنە سـەر لەگەڵی مەحاڵە، واتە مێرد بە شێوازێکی ڕاستەوخۆو، ژنیش بە شێوازێکی ناڕاستەوخۆ لە ڕێگـای قـازی یـەوە دەتوانن لێك جیاببنەوە.

هەمو ئەوەش بە پێچەوانەی حاڵی زۆر لە دینەکانی ترە، کە تەڵاق دان حـەرام دەکـات، وەك مارەبڕینی ئافرەتێکی تەڵاق دراو بۆ پیاوێکی تر حەرام دەکات، یان حەرامی دەکـات

کوشتنی یەکێکی لەسەر بێت، ئەو کەسەی واز لـە ئایینەکـەی دێنــێو لــە کۆمەڵی مسوڵمانان جیاببێتەوە.

دەفەرموێ: ((**ثلاثة لا يكلمهم الله يوم القيامة، ولا يزكيهم، ولا ينظر اليهم، ولهم عذابٌ أليم: شيخ زان، وملك كذّاب، وعائلٌ مستكبر**))[1]، واتە: سێ کەس لە رۆژی قیامەت خوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکـاتو بــە پاکیان دانانێو تەماشایان ناکاتو عەزابی بە ئازاریان بۆ هەیــە: پیرێکــی زیناکەر، سەرۆکێکی درۆزن، فەقیرێکی بە فیزو خۆ بە گەورە زان.

((**أتى فتى شاب الى النّبــيّ ﷺ فقال: يا رسول الله إئذن لي بــالزنى! فأقبل القوم فزجروه وقالوا: مه مه! فقال: أدنُ. فـدنا منـه قريبــاً، قــال: فجلس. قال أتحبه لأُمك؟! قال: لا والله! جعلـني الله فـداءك. قــال: ولا الناس يحبونه لأُمهاتهم. قال: أتحبه لإبنتك؟ قــال: لا والله يــا رســول الله**

---

پیاوەکە دوای تەڵاق دانی ژنەکەی ژن بهێنێتەوە، لە ئینجیلی مــەتی ٣٢/٥ هــاتوە: هــەر کەسێك ئافرەتێکی تەڵاق دراو مارە بکاتەوە، ئەوە زینای کردوە!! لە ئینجیلی مەرقــەص ١٠/ ١١-١٢ هاتوە: هەر کەسێك ژنەکەی تەڵاق بدات و ئافرەتێکی تر مارە بکات، ئــەوا زینای لەگەڵدا دەکات، هەروەها گەر ژن لە پیاوەکەی تەڵاق دراو، پاشان شوی کــردەوە بــە یەکێکی تر، ئەوا ئەو ئافرەتە تاوانی زینای کردوە!!

کەواتە!... چ پاساوێك بۆ هەر یەکێك لە ژن و مێرد هەیە، کــە تــاوانی زینــا بکــات و ناپاکی لەگەڵ مێردەکەی یان ژنەکەی بکات؟! مەگەر بڵاوبونەوەی فەســادی و خراپــەکاری لەسەر زەوی بێت.

لەبەر هەمو ئەمانە، ئیسلام سزای بەردباران کردنــی پێویــست کــردوە، ئــەم بــەردباران کردنەش ئەو کاتە جێبەجێ دەکرێ، کە زیناکەر دان بــە تاوانەکــەی دادەنــێ.. جــا لەبــەر زۆریی‌و زەحمەتیی مەرجەکانی دان نان بە زیناکردنی یەکێك، زۆرجار ئەو بەردباران کردنــە جێبەجێ ناکرێ.

١) رواه مسلم والنسائي.

جعلني الله فداءك. قال: ولا الناس يحبونه لبناتهم. قال: أفتحبه لأُختك؟ قال: لا والله جعلني الله فداءك. قال: ولا الناس يحبونه لأخواتهم. قال: أفتحبه لعمتك؟ قال لا والله، جعلني الله فداءك. قال: ولا الناس يحبون لعماتهم. قال أفتحبه لخالتك؟ قال: لا والله جعلني الله فداءك. قال: ولا الناس يحبونه لخالاتهم. قال: فوضع يده عليه وقال: اللهم أغفر ذنبه، وَطَهِّرْ قَلْبَهُ، وَحصِّنْ فرجه، فلم يكن بعد ذلك الفتى يلتفت الى شيء))[1]، واته: گەنجێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا رێگام پێ بدە زینا بکەم! جا ئەو خەڵکەی لەوێ ئامادە بون نارەزایی یان دەربڕی‌و سەرکۆنەیان کرد.

پێغەمبەر فەرموی: نزیك بەوە. گەنجەکە لێی نزیك بۆوە، گوتی: دانیشت.

پێغەمبەر فەرموی: حەز دەکەی دایکت زینای لەگەڵ بکرێ؟! گوتی: نا بە خوا، خوا بم کاتە فیدات. پێغەمبەر فەرموی: خەڵکیش بۆ دایکیان حەز ناکەن.

فەرموی: حەز دەکەی کچەکەت زینای لەگەڵ بکرێ؟! گوتی: نا بە خوا، خوا بم کاتە فیدات. فەرموی: خەڵکیش بۆ کچیان حەز ناکەن.

فەرموی: حەز دەکەی خوشکەکەت زینای لەگەڵ بکرێ؟! گوتی: نا بە خوا، خوا بم کاتە فیدات. فەرموی: خەڵکیش بۆ خوشکیان حەز ناکەن.

فەرموی: حەز دەکەی پورت زینای لەگەڵ بکرێ؟ گوتی: نا بە خوا، خوا بم کاتە فیدات. فەرموی: خەڵکیش بۆ پوریان حەز ناکەن.

گوتی: پێغەمبەر ﷺ دەستی خستە سەر سینگی‌و فەرموی: خوایە لە

---

١) رواه أحمد في المسند (حديث صحيح).

گوناهی خۆش بەو، دڵـی پـاك كـەردووە، داوێـنی بپـارێزە.. پـاش ئەمـە گەنجەکە ئاوڕی بۆ هیچ شتێك نەدایەوە.

هەروا دەفەرموێ: ((لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن،[1] ولا

---

١) سەبارەت بەم فەرمودەیە پرسیار لە جەعفەری کوڕی محمد کرا، ئەویش لە زەوی یەکەدا بازنەیەکی کێشاو گوتی: ئەمە بازنەی بڕوایە، پاشان بازنەیەکی تـری لـەدەورەی کێـشاو گوتی: ئەمە بازنەی ئیسلامە، گەر عەبد زینای کرد لەمە دەردەچێو لەمە دەرناچێ.

ئیبن القیم گوتویەتی: لە زینادا هەمو خراپەیەك کۆدەبێتەوە، کـە لـە کـەم ئـایینیو نەمانی تەقواو خراپی پیاوەتیو کەم غیرەتی یـەوە دروسـت دەبـێ... جـا غـەدرو درۆو ناپاکیو کەم شەرمیو نەبونی چاودێریو وازنەهێنان لە تاوانو نەمانی غیرە لـە دڵ دا، لە لۆو پێویستی یەکانی زیناکردنە...

خوای گەورە دڵ توندی دەخاتە دڵی زیناکەرەوە، هەروەها بە ئەنجام دانی زینا سـینگ تەنگ دەبێ. گەر بابای خراپەکارو فاجر دەزانێ چ خۆشیو چێژو سینگ کرانەوەو خـۆش گوزەرانیەك لە داوێن پاکیدایە، رای وا دەبو، کە ئەو چێژەی لـە دەسـتی چـوە زۆرتـرە، لەوەی بە دەستی هێناوە. لە قازانجی لەش سـاغیو سـەرفرازی بـە پاداشـتو کـەرەمی خواش هەر مەپرسە، لەو شتە خراپانای لە زینا دێتە کایەوە ئەوەیە، کە بابـای زیناکـەر خۆی لە ڕابواردن لەگەڵ حۆری یـەکان لـە خـانوی خـۆش لـە باخـچەکانی (عـەدن) لـە بەهەشتدا بێبەش دەکات.. (بە کورتی لە کتێبی روضة المحبین ٣٥٨-٣٦١)

ئەمەو سەرەڕای سزای ئەم کارە فاحیشەیە لە ئاخیرەتدا، سزاکەشی لە دنیادا بریتییـە لە کەوتنە ناو فیتنەو ئاشوبو دوچار بون بە نەخۆشی یە پیسەکانی ئەندامەکانی زاوزێ، کە دەبێتە هۆی منداڵ نەبونو شێت بونو، دەبێتە هۆی بە خێرایی کپ بونـەوەی چـێژی جینسی.

دکتۆر (ادمس) لە کتێبەکەی (المعرفة الجنسیة)دا گوتویەتی: (بە گـوێرەی پیـشەکەی خۆم چەند پیرێك دەناسم، کە لە تەمەن حەفتاو پێنج ساڵی دانو قابیلی یـەتی جنـسیان بەهێزەو نەشڵەژاوە. کاتێك سەبارەت بە نهێنی ئـەم زیندویەتیـە عەجیبـە لـێم پرسـین، ئەوانیش پاراستنی چالاکی یەکانیان بۆ ئەم هۆکارانەی خوارەوە گەڕاندەوە:

١- لە کاتی گەنجیدا دەستپەڕ (العادة السریة)یان نەکردوە.

٢- کاتێك گەیشتنە پلەی پیاوەتی، خۆیان پاراستوەو نقومی کارە ناشیرینەکان نەبون.

يسرق السارق حين يسرق وهو مؤمن، ولا يشرب الخمر حين يشربها وهو مؤمن))[1]، واتە: ئەو کەسەی زینا دەکات لە کاتی زیناکەیدا بڕوادار نی‌یە، ئەو کەسەی دزی دەکات لەو کاتەی دزی‌یەکە دەکات بڕوادار نی‌یە، ئەو کەسەی مەی دەخواتەوە لە کاتی مەی خواردنەوەکەیدا بڕوادار نی‌یە.

هەروا دەفەرموێ: ((لا يحل دم امرئٍ مسلمٍ يشهد أن لا إله إلاّ الله وأنّ محمد رسول الله، إلاّ في إحدى ثلاث: زنا بعد إحصان، فإنه يرجم، ورجل خرج محارباً لله ورسوله، فإنه يقتل أو يصلب، أو ينفى من الأرض، أو يقتل نفساً، فيقتل بها))[2]، واتە: خوێنی مسوڵمان، کە شایەتمان دێنێ خوێنی حەڵاڵ نی‌یە، مەگەر لە یەکێ لەم سێ شتەدا نەبێت: یەکێك کە ژنی هەبێ یان شوی کردبێت و زینا بکات، ئەوە بەوە بەردباران دەکرێت، پیاوێك دژی خواو پێغەمبەرەکەی جەنگ بکات، ئەوە دەکوژرێ، یان هەڵ دەواسرێ، یان لە وڵات دور دەخرێتەوە، یان بە ناحەق کەسێك بکوژێ، ئەوا دەکوژرێتەوە.

---

٣- دوای هاوسەرگرتن (الزواج) لە جوتبونیاندا، ڕادەی مام ناوەندی‌یان گرتوەو زیادەڕەوی‌یان تێدا نەکردوە، بۆ ماوەیەکی درێژیش هێزە جنسیەکەیان کۆنەکردۆتەوە.

٤- مادده بێ هۆشکەرەکانو مەیو جگەرەیان بەکار نەهێناوە.

٥- لە حاڵەتی نەفسی‌یەتێکی باش نەبوایە، لەگەڵ خێزانیان جوت نەدەبون.

١) رواه البخاري.

٢) رواه أبو داود والنسائي (حديث صحيح).

## باسی ژیانی جنسی لە بەهەشت

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إن للمؤمن في الجنّة لَخَيمةً من لؤلؤة واحدة مجوَّفة طولُها ثلاثون ميلاً، وللمؤمن فيها أهلون يطوف عليهم المؤمن، فلا يرى بعضهم بعضاً))[1]، واتە: لە بەهەشتدا بڕوادار خیوەتێکی مرواری کلۆری بۆ هەیە، کە درێژی یەکەی سی میلە، چەند حۆرییەکی تێدایە، بڕوادار بە سەریاندا دەسوڕێنەوە، هیچ کامێکیان ئەوی تریان نابینێ.

هەروا دەفەرموێ: ((يُعطَى المؤمن في الجنة قوة كذا وكذا من الجماع. قال أنس: يا رسول الله ويطيق ذلك؟! قال: يعطى قوة مئة))[2]، واتە: لە بەهەشتدا مرۆڤی بڕوادار ئەوەندەو ئەوەندەی هێزو توانای جوتبونی پێ دەبەخشرێ.

ئەنەس گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، چۆن ئەو کەسە دەتوانێ بەرگە بگرێو، ئەوەندە جوتبونە بکات؟

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بڕوادار هێزو توانای (سەد) پیاوی پێ دەدرێ.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، (هل نَصِلُ إلى نسائنا في الجنّة؟!).

قال: ((إن الرَجلَ لَيَصِلُ في اليوم إلى مئة عذراء)) (رواه الطبراني، قال الحافظ أبو عبدالله المقدسي: و رجال هذا الحديث عندي على شرط مسلم)، واتە:

---

١) رواه البخاري.

٢) رواه الترمذي وصححه، وهو كمال قال.

ئایە لە بەهەشت لەگەڵ ژنەکانمان جوت دەبین؟!

فەرمووی: پیاو لە رۆژێکدا لەگەل سەد ژن جوت دەبێ، کە کچێنی یان ماوە.

لەقیتی عوقەیلی گوتویەتی: ((قلت: يا رسول الله، أو لنا فيها أزواج مصلحات؟ قال: ((الصالحون للصالحات، تَلَذُّونهن مثل لذّاتكم في الدنيا، ويلذّونكم، غير أن لا توالُدَ))[1]، واتە: بە پێغەمبەری فەرمو: لە بەهەشتدا ئافرەتی صالحەمان بۆ هەیە؟ پێغەمبەر فەرموی: پیاوی باش بۆ ئافرەتی باشە، جا لەو ئافرەتانە چێژ و خۆشی وەردەگرن، وەك چۆن لە دنیا خۆشیتان لێ وەردەگرتن، ئەوانیش بە هەمان شێوە چێژو خۆشی لە ئێوە وەردەگرن، بەڵام جوتبونەکە منداڵی لێ ناکەوێتەوە.

ئەبو هورەیرە گوتویەتی: ((قلت يا رسول الله: أَنَطأُ في الجنّة؟ قال رسول الله ﷺ: والذي نفسي بيده دحماً دحماً! فإذا قام عنها رَجَعتْ مُطَهَّرةً بكراً))[2]، واتە: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا: ئایا لە بەهەشتدا جوت دەبین؟ پێغەمبەری خوا فەرموی: سوێند بەو کەسەی گیانی بە دەستە، ئێوە جوت دەبن بە تەکانێکی توندو جوتبون لە دوای جوتبوبن. جا هەرجارەی، کە پیاوەکە لە سەری هەڵدەستێ، ئافرەتەکە وەکو کچێنی لێ دێتەوە.

لە (معجم)ی طەبەرانی لە فەرمودەی (ابو متوکل) هاتوە، کە ئەبو سەعیدی خودری گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((إن أهل الجنّة إذا جامعوا نساءهم عُدْنَ أبكاراً))، واتە: خەڵکی بەهەشت گەر

---

١) رواه الطبراني والحاكم وغيرها وسنده جيد.

٢) صححه أبن حبان.

لەگەڵ ئافرەتەکانیان جوتبون، ئەوا ئافرەتەکان دەگەڕێنەوە سەر حاڵەتی کچێنی.

لە هەمان کتێبی طبەرانیدا لە حەدیسی (ئەبو ئومامە) -ڕەزای خوای لێ بێ- کە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا: ئایا خەڵکی بەهەشت جوت دەبن؟ فەرموی: ((**بذَكَرٍ لا يَمَلُّ، وشهوةٍ لا تنقطع! دحماً دحماً**))، واتە: جیماع دەکەن بە چوکێك کە بێتاقەتو وەڕز نابێ‌و، بە ئارەزویەك نابڕێ‌و کۆتایی نایەت، جیماعەکەش یەك لە دوای یەکە.

هەر لە هەمان کتێبدا هاتوە: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا: ئایا خەڵکی بەهەشت جوت دەبن؟ فەرموی: ((**دحماً، لا مَنّي ولا حَيْضَة**))، واتە: جوت دەبن بە تەکانێکی توند، بەبێ مەنی‌و، ئافرەتیش توشی خوێنی حەیز نابێ.

## گەنج و لاوان! بۆ لای خوا بگەڕێنەوە

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلاَ يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا، يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا، إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحًا فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللهُ غَفُورًا رَحِيمًا﴾ (الفرقان: ٦٨-٧٠)، واتە: ئەو کەسانەی لەگەڵ خوا، پەرستراوێکی تر ناپەرستن و هانای وەبەر نابەن، کەسیش ناکوژن مەگەر بە حەقی خۆی نەبێ، چونکە کوشتنی کەسێك بە ناحەق خوای گەورە حەرامی کردوە، هەروا زینا ناکەن.. هەر کەسێك ئەم کارە حەرامانە بکات، لە ڕۆژی قیامەت سزای گوناهەکەی وەردەگرێ و بە زەبونو ریسوایی تێیدا دەمێنێتەوە.. تەنها ئەو کەسانە نەبێ، کە بۆ لای خوا دەگەڕێنەوەو باوەڕ دێنن و کردەوەی باش ئەنجام دەدەن. جا خوای گەورە بە لوتفی خۆی خراپەکانیان دەگۆڕێ بە کردەوەی باش، خوای باڵا بەخشندەو میهرەبانە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لَلّهُ أشدُّ فرحاً بتوبة عبده حين يتوب اليه من فرح أحدكم كان على راحلته بأرض فلاة، فانفلتَتْ منه، وعليها طعامه وشرابه، فآيسَ منها، فأتى شجرة فاضطجع في ظلها، وقد آيس من راحلته، فبينما هو كذلك إذا بها قائمة عنده، فأخذ بخطامها ثم قال من شدّة الفرح: اللّهمَّ أنت عبدي وأنا ربك، أخطأ من شدّة الفرح))[1]، واتە: خوای بەخشندە بە تەوبە کردن و گەڕانەوەی عەبدی

---

١) رواه مسلم .

خۆی، لەو کەسە زۆر دڵ خۆش و شادتر دەبێ، کە لە بیابانێك بێ و حوشترەکەشی خواردن و خواردنەوەی لێ بارکرابێ، جا حوشترەکەی بە بارەوە لێی ون بێ و نائومێد بێ لە دۆزینەوەی و بچێتە ژێر سێبەری دارێك پاڵ کەوێ. لەو کاتەدا دەبینێ حوشترەکەی بەبارەوە لەبەردەمی ئامادە بوە، ئەویش یەکسەر رێشمەکەی رادەکێشێ و لەبەر زۆر دڵخۆشی دەڵێ: خوایە تۆ عەبدی منی و منیش خوای تۆم. ئەم هەڵەیەش، کە دەیکات لەبەر زۆر دڵخۆشی یەکەیەتی.

## بکوژێك هەیە ناوی چێژو لەزەتە

لەسەرەتای ئەم کتێبەدا چەند گوڵ بژێرێکی جوانو سەرنج راکێشەرم دەربارەی چێژ باسکرد، دەترسم هەندێك کەس هەردەم چێژ بە شتێکی باش لەقەڵەم بدەن، لەگەڵ ئەوەی زۆرجار خراپەی زۆری لەگەڵ دایە، کە شایستەی ئەم ناوەی هەیە (بکوژێك هەیە ناوی چێژە)، کە چەندە بۆتە هۆی ئازارو کارەساتی وێرانکەر بۆ مرۆڤ .

من لە کتێبەکەم (أسرار العشاق) باسی زۆر لەو هەواڵانەم کردوە، کە چێژ و لەزەت بەرەو لادانی بردون و، گەیشتۆتە ڕادەی کوشتنی خەڵکی تر، یان خۆکوشتن، یان کوژرانی لە لایەن خەڵکەوە!

ئا بەم شێوەیە چێژو لەزەت دەبێتە هۆی خوێن ڕشتن و خۆ خستنە بەر ئازارو بەدبەختی، وەك بە درێژی ئەم باسەمان سەبارەت بە زینا باسکرد.

هەر لەزەتیشە دەبێتە مایەی پاراستنی خوێنو تەندروستیو بەختیاریی... هەمو ئەمەش لە دنیاو ئاخیرەتیشدا دەستەبەر دەکرێ، لە یەکەم باسیشماندا ئەم جۆرە لەزەتەمان مەبەست بوە.

کەواتە چ جیاوازی‌یەکی گەورە هەیە لە نێوان ژیانی زیناکەرو ژیانی هاوسەریەتی، ژیانی یەکەم وەك ژیانی دز وایە لە بەدەست هێنانی شتدا، کە هەموی ترسو شلەژانو عەزابە.. دوەمیش وەك ژیانی بازرگانە بە ئابڕوەکانە، کە باڵی دڵنیاییو خۆشی بە بەردەوامی بەسەردا کێشراوە.

ئەی گەنجو لاو بە کچو کوڕەوە! هەردەم ئەوەتان لە یاد بێت، خوای گەورە هیچ شتێك حەرام ناکات، گەر شتێکی باشتر لەوی حەڵاڵ نەکردبێ،

عیـشقێکی سـەر شـێتانەی حـەرام کـردوە، کـە خاوەنەکـەی دەڕوخێنـێ، خۆشەویستی یەکی حەڵاڵ کردوە، کە داوا لە خاوەنەکەی دەکات ژن بهێنێ، یان شو بکات، داوای ژیانێکی جێگیرو بەختیار دەکات، داوای پێکهێنانی خێزانو پەروەردەکردنی کوڕو کچ دەکات، بۆ ئەوەی ببنە ڕۆشنایی چـاو بـۆ خۆیو بۆ دایکی...

## گڕی غیرە بەختیاری ژن و مێرد دەسوتێنێ

### - غیرەی باش و غیرەی خراپ -[١]

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ﴾ (البقرة- ٢٥)، واتە: لە بەهەشت ئافرەتی پاك كراوەی تێدایە[٢].

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((إن الله يغار، والمؤمن يغار، وغيرة الله ان يأتي المؤمن ما حرّم الله))[٣]، واتە: خوای گەورە غیرەی هەیە،[٤]

---

١) ئافرەتی غیرەدار چەند نەگبەتە، چ ژیانێكی بەدبەختی هەیە، یەكێك لە ئافرەتە شارەزایەكان گوتویەتی: ((ئافرەتێكی هاوڕێم هەبو زۆر گوماندار بو، زۆر غیرەی دەرحەق بە مێردەكەی هەبو، گەر مێردەكەی بۆ دەرەوە بڕۆیشتایە، یان ژوان (موعد)ێكی لەگەڵ یەكێك هەبایە، یان لە تەلەفۆن قسەی بكردایە، یان دڵ خۆش بوایە، یان زەردەخەنەی لەسەر لێو بایە، وایدەزانی ئافرەتێك لە ژیانی ئەو پیاوەدا هەیە!!))

ئەم ئافرەتە گەمژەیە حیكمەتو دانایی بەكار نەدەهێنا، بە ڕیشەداكوتانی ئەم نەخۆشی یە خراپە، خۆی لە مێردێك بێبەش كرد كە هیچ خەوش و نەنگی یەكی نەبو.

لە ڕاستیدا غیرە دێتە ناو مێشكی ژن یان پیاو، بەڵام پێویستە فرێ بدرێ، ئەمەش لە توانای هەمو مرۆڤێكی ژیردا هەیە. با چارەسەر پێش سەر هەڵدانی شت بێت، ئەگینا گەورە دەبێ و پەرەدەسێنێ و شیفاكەی زەحمەت دەبێ.

٢) ئیمام ئیبن القیم گوتویەتی: بە واتای پاكن لە خوێنی حەیزو میزو پیسایی و، هەمو ئەو شتانەی، كە لە ئافرەتی دنیادا هەن، ناوەوەشیان لە غیرەو ئازاردانی هاوسەر پاك كراوەتەوە. (روضة المحبين)، ص(٢٤١-٢٤٢).

٣) رواه البخاري والنسائي .

٤) مناوی لە كتێبی (الفیض)دا گوتویەتی: ((بە ئابروترین خەڵك و عەزم بەهێزیان ئەو كەسەیە، كە غیرەی لە هەموان زیاترە، چونكە ئەو بڕوادارەی لە شوێنی خۆی غیرەی دەجولێ، لەگەڵ سیفەتێك لە سیفەتەكانی خوای گەورە یەك دەگرێتەوە، هەر كەسێكیش

برواداریش غیره دەیگرێ، غیرەی خوای گەورە ئەوەیە، کە بڕوادار کارێك بکات خوای گەورە حەرامی کردبێ.

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((لا أحد أغير من الله ﷻ، فلـذلك حـرّم الفواحش ما ظهر منها ومـا بطن، ولا أحد أحـب اليه المدح مـن الله ﷻ)) [١]، واتە: هیچ کەسێك لە خوای گەورە بە غیرەت تر نییە، لەبەر ئەوەیە کارە فاحیشەکانی بە حەرام داناوە، چ ئەوەی دیارە، چ ئەوەی نادیارە، هیچ کەسێکیش وەك خوای گەورە حەزی لە مەدح نی یە.

هەروا دەفەرموێ: ((المؤمن يغار، والله أشدّ غـيرة)) [٢] ، واتـە: بـڕوادار غیرە دەیگرێ، خوای گەورەش غیرەی زۆرترە.

سەعدی کوڕی عوبادە ڕەزای خوای لـێبێ گوتی: (لو رأيت رجلاً مـع أمرأتي لـضربته بالـسيف غـير مُـصْفِح) [٣]، واتـە: گـەر پیاوێـك لەگـەڵ

---

لە یەکێ لە سیفەتەکانی یەك بگرێتەوە، ئەوا ئەو سیفەتە لە جلەوی ئەو دادەبێ و لە ڕەحمەتی خۆی نزیکی دەکاتەوە)).

جا ئەم ئاراستەیە لە کوێ، کە زۆر لە پیاوانی ئەمڕۆ لە غیرە بێبەش بون، دەیانبینین خێزانو کچو خوشکەکانیان لە ڕێگاکان بە ڕازاوەیی و جوانی (متبرج) دەخەنە ڕو، بۆ ئەو کەسانەی شەرەفو ناموس هەتك دەکەن، تاکو دەستدرێژیان بکەنە سەرو وەك مار پێوەیان بدەن!

١) رواه البخاري ومسلم.

٢) رواه البخاري ومسلم.

٣) (غير مصفح) بە واتای بە پانایی شمشێرەکە لێی نادەم بەڵکو بە تیژیەکەی لێی دەدەم بۆ ئەوی بیکوژم، أبو الفرج لە کتێبی (النساء)دا گوتویەتی: معاویە گوتویەتی: ((سێ شت هەن لە خەسڵەتی گەورەیی و پلەبەرزی یە: لێبوردن (الصفح)، ئەو کەسەی ورگن نەبێ، زیادە ڕۆیی نەکردن لە غیرە)).. قەیسی کوڕی زوهێر چوە لای هەندێ لە عەرەبو پێی گوتن: من غیرە دارمو شانازی پێوە دەکەم، من نەفس بەرزم، بەڵام غیرە نامگرێ

خێزانەکەم ببینم، بە تیژایی شمشێرەکە لـێی دەدەم.

جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((**أتعجبون من غيرة سعد لأنا أغْيَرُ منه، والله أغْيَرُ مِنِّي**))[١]، واتە: لە غیرەی سەعد سەرتان سـورِ دەمێنــێ؟! من لە سەعد زیاتر غیرەم هەیە، خوای گەورەش لە من بە غیـرەترە[٢].

هەروا دەفەرموێ: ((**إن من الغيرة ما يحب الله، ومنهـا مـا يـبغض الله، فأما الغيرة التي يحبها الله فالغيرة في الريبة، وأما الغـيرة الـتي يبغـضها الله فالغيرة في غير الريبة**))[٣]، واتە: غیرەی وا هەیە خوای گـەورە حـەزی پـێ دەکات، غیرەی واش هەیە خوای گەورە ڕقی لـێیەتیو پێی ناخۆشە. ئـەو

---

هەتا نەبینم، شانازی ناکەم تاوەکو بە کردەوە نەیکەم.

ئەبو فەرەج گوتی: لە دوای وازهێنانی زیادەڕۆیی کردن لە غیرەدا، عەیبیان لە معاويه گرت، کە لە خەسڵەتەکانی گەورەیی یەو هیچ عەیبی لـێ نـابینم، چـونکە زیـادەڕۆیی بریتی یە لە سنور تێپەڕاندن، کە سەرکێشە بۆ سـتەم کـردن لـە ئافرەتەکـە.. هـەروەها عەیبیان لە قەیسی کوڕی زوهێر گرت بە گوتەکەی: غیرە نامگرێ تـا وەکـو نـەبینم، وا گومان دەبەم کە مەبەستی بینینی هۆ بێت، نەك نەبینیبی جوتبونەکە.

١) رواه البخاري ومسلم .

٢) ئیمام ئیبن القیم گوتویەتی: ئەو کەسەی خواو پێغەمبەرەکەی خۆشدەوێ، بە ئەنـدازەی خۆشویستنو بەگەورەگرتنەکەی غیرەی بۆ خواو پێغەمبەرەکەی دەجولـێ، گـەر دڵـی لـە غیرە بۆ خواو پێغەمبەرەکەی خاڵی بو، ئەوا ئەو کەسە خۆشەویستی یەکەی خاڵی یە، بـا واش دابنێ کە لەو کەسانەیە خواو پێغەمبەری خۆش ئەوێ، ئەو کەسـە درۆی کردوە، کە جاڕی خۆشەویستی خۆشویستراوێك بـۆ خـەڵکی لێـدەدات، کـە دەبینـێ خـەڵکانی تـر حورمەتی خۆشەویستەکەی دەشکێننو پێ شـێلی دەکـەنو، سـوکایەتی بـە مافـەکانی دەکەن، تا لەم حاڵەتەدا غیرەی ناجولێو دڵەکەشی ساردەو گەرمایی تێدا نیە، چۆن ئەمە ڕاستە عەبدێك جاڕی خۆشەویستی خـوا لێبـداتو بەرامبـەر بـە سـوکایەتی پێکردنـی مەحارمەکانی خوا غیرەی نەجولێو، بۆ مافە ون کراوەکانی غیرەی نەجولێ.

٣) رواه أحمد في المسند والنسائي وأبن حبان (حديث حسن).

غیرەیەی خوای گەورە پێی خۆشە، غیرەیەکە لە گومان دابێت، بەڵام ئەو غیرەیەی خوای گەورە پێی ناخۆشە ئەو غیرەیە کە لە گومانەوە پەیدا نابێ[1].

---

١) ئاراستەکردنی ئەم فەرمودەیە چەند گەورەیە، چەندەها غیرەی جاهیلی هەبوە بۆتە هۆی تەگبەتی خێزان.. من (دانەری کتێب) دان دەنێم کە ئەم قۆناغەم بەسەردا تێپەڕیوە، کە گەنج بوم، ماڵەکەم لە گوند بو، لەسەر شاخێکی دور بوم، داوام لە خێزانەکەم دەکرد خۆی داپۆشێ نەبادا شوانێك، یان کەسێکی تر تێپەڕێو ببینێ، کە ناتوانرێ ئەمە (تصور) بکرێو، ناتوانرێ دەستەبەر بکرێو جێبەجێ بکرێ، لە ناو ماڵ، یان لەناو ژوردا، جا دەم برد بۆ پیاسە، ئەویش دەم چاوی دانەدەپۆشت، گەر لەناکاو یەکێك ببینیایە، ئەوا دنیام هەڵدەساندو دام دەنیشاندو پیاسەکەم لە ئەو و خۆیشم تێك دەدا، کەچی لە ڕاستیدا دەمو چاو بەبێ دەرخستنی جوانیو ڕازاوەیی عەورەت نی یە، هەمو ئەمەش هۆکەی شارەزا نەبون بو بە ئیسلام.

ئەرکی ژنومێردە، ژیرو لەسەرخۆ بن، گومان، چاوو دڵیان دانەگرێ، کە بە هۆیەوە ژیانیان تاڵ دەبێتو هەڕەشەی تێکدانی کیانی خێزان دەکات، ئەمەش لە ناکامی ئەو گومانو وەسوەسە شەیتانیانەو خەلەلی غەریزەی مولکداری یە.

لە شتە غەریبەکانی غیرە ئەوە بو، سوارچاکەکانی فەرەنسا لە سەدەی ناوەڕاست پشتێنی ئاسنینی قفڵ داریان بەکار دەهێنا، لەو کاتەی دەچون بۆ جەنگ ژنەکانیان بەم قفڵانە دەبەستەوە، نەبادا زینا بکەن.

من ئامۆژگاری ژنو مێرد دەکەم -بە تایبەتی گەر بە ڕاستی دین دارن-، هەریەکە بوار بۆ چاودێری خوای گەورەو لێپرسینەوەی ویژدانی خۆی بکات، با بەهۆی غیرەوە بەختەوەری خێزان تێك نەدەن، بەتایبەتی گەر هەردوکیان دەستیان بە سنوری شەرعەوە گرتبو، خۆیان لە بینینی دیمەنی غەرامی جنسی وروژێنەر دور گرتبوو، لە تێکەڵ بون لەگەڵ پیاوو ژنی بێگانە دورکەوتنەوە، هەروەها ژنەکە خۆی لە خۆڕازاندنەوە بۆ خەڵك بەدور گرتبێ، کە گومان دەخاتە دڵی مێردی هۆشیارەوە.

یەکێك نوسیویەتیو دەڵێ: پێویستە ژن پارێزەر(حامیة)ی مێردەکەی بێتو بەرگری لێ بکات، نەك هەردەم ئەرکی بریتی بێت لە کاری موخابەرات، هەر لە کاتی هاتنەوەی بۆ ماڵ لێی بپرسێ: لە کوێ بوی، چیت کرد، بۆ چی دواکەوتی، لەگەڵ کێ قسەو گفتوگۆت کرد، چیت دەگوت... بەڕاشکاوی قسە بکە. ئەمەو چەندەها پرسیاری

کاتێ تاوانباران هاتنە سەر عوسمانی کوڕی عەفانﷺ، نائیلەی خێزانی قژی کردەوە، تا بەڵکو جوامێرێکیان تیابێ‌و بگەڕێنەوە، ئیمامی عوسمانیش، کە ئاوڕی لێدایەوە هاواری ئیمانی لێ هەستاو سەرزەنشتی کرد، گوتی: سەرپۆشەکەت هەڵگرەوەو سەرت داپۆشە! بێن بمکوژن باشترە لەوەی قژت ببینن!!

---

تر کە ژیانی هاوسەریەتی دەکاتە دۆزەخ و لە وزەدا نامێنێ.

((پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە، کە پیاو بەشەو لە سەفەر گەڕایەوە، لەناکاو خۆی بکات بە ماڵەوەدا، بۆ ئەوەی ژنەکەی تاقی بکاتەوە، کە ئایا خیانەتی لێدەکات یان نا؟ یان لە هەڵەو سەرسمی بگەڕێ). موسلیم گێڕاویەتیەوە.

ئەم باسە بە گوتەیەك کۆتایی دێنین کە (غیرة)ی تێدا شی کراوەتەوەو جیاوازی نێوان باش‌و خراپ دەردەخات:

دکتۆر أمیر لە قەتەر لە گۆڤاری (التربیة الحدیثة) (٣٤ ساڵی ١٢)ەم گوتویەتی، کە ئەمە کورتەکەیەتی:غیرە وەك هەمو نەخۆشی یە دەرونی یەکان، خاوەنەکەی دەفەوتێنێ، جا هاوسەنگی یەکەی تێکدەچێ، کەسایەتی یەکەی سوك دەبێ، ویـژدانی دەشـڵەژێنێ، جەستەی بێهێز دەکات، هێزی عەقڵی کەم کاردەکات، بەرهەمی کەم دەبێ.. غیرە وەك هەستکردن بە کەم‌و کورتی لە حاڵەتە سادەکاندا، هیچی تیا نی‌یە، چونکە نمونەیەکی بەرگریکردنە لە نەفس‌و، یاریدەدەرێکی ڕێکخەری سروشتی یە بۆ پێشبڕکێی پیرۆزانە.

دیارە دەروونناسی لەگەڵ فەرهەنگی ئینگلیزی هاودەنگە لە پێناسەی غیرە، کە دەڵێ: (( غیرە بریتیە لە ترسانی خاوەنەکەی، کە یەکێکی تر شوێنی ئەو بگرێت)).

ئەوەی جێی داخە زۆربەی ئەوەی پێی دەڵێن غیرەی ژن‌و مێردایەت، کە زۆرینەی خاوەنەکەی بەرەو بەدبەختی‌و تیاچون، بەڵکو بەرەو خۆکوژی‌و، ئەنجامدانی تاوانی کوشتن‌و، سێدارە دەبات، بە زۆریی ئەم غیرەیە هیچ بنەمایەکی ڕاستی نیە.

زۆر زەحمەتیشە کەسێك هەبێ چارەسەری پیاوی غیرەتدار بکات، جگە لە ژنەکەی.

## ئافرەتــان غیــرەیان چەنــد زۆرە!
## - نمـونەیـەك لە غــیـرەی عائیشــەو ئــارام گــرتنی پێغەمبــەر ﷺ -

((شەوێك پێغەمبەری خوا ﷺ خەو لەچاوانی زڕابو، چـوە قەبرسـتانی (بەقیع) تا سڵاوو دوعا بکات، بۆ ئەوانەی لەوێ بەخاك سپاردراون.. کاتی بـەیانی لـە چێـشتەنگاودا بـەلای عائیـشە تێپـەڕی و چـوە لای، بینـی وا ژانەسەری گرتوەو ناڵەناڵیەتی و دەڵێ: ئای سەرم! جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی بە ئازاری نەخۆشیەکەی کردو فەرمووی: بەخوا عـائیشە مـن سـەرم دێشێ!

کە خاتو عائیشە چەندجار دەیگوت: ئـای سـەرم! پێغەمبـەر ﷺ بـۆ گاڵتە پێی فەرمو: خۆ چ زیانت پێناگات، گەر لەپێش من بمری و منـیش هەستم کفنت بکەمو نوێژت لەسەر بکەمو بتنێژم؟!!

خاتو عـائیشەش غیرەی بزواو هاواری کرد: با ئەوە بەشی کەسی تر بێ!! بەخوا ئەگەر لەجیاتی تـۆ وام بکردبایـە، دەگەڕامـەوە ماڵەکـەم، لـەڕقی ژنەکانت خۆم دەکردە بوك!

جا روخـساری پێغەمبـەر ﷺ گەشـایەوەو خەندەیـەکی جـوانی کـردو ئازارەکەی نەما))[1].

((رۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لە خاتو عائیشە کردو فەرمووی: ئەوە غیرەت هەیە؟! ئەویش وەڵامی دایەوە: بۆچی نـا، یـەکێکی وەك مــن

---

١) حاکم گێڕاویەتیەوەو بە (صحیح)ی داناوە.

غيرەی بەرامبەر يەكێكی وەك تۆ نەبێ!))[١].

ئەنەس ﷺ گوتويەتی: ((پێغەمبەر لەماڵی هەندێ لە خێزانەكانی بـو، هەندێ لە خێزانەكانی قاپێك تێكوشەيان بۆ نارد، عائيشە خۆی لەدەستی خزمەتكارەكەداو قاپەكە كـەوتو شـكا، پێغەمبـەريش ﷺ تێكوشـەكەی هەڵدەگرتەوەو دەيخستە ناو پارچە قاپەكەو دەيفەرمو: بخۆن، ئەوە دايكتـان غيرەی گرتوە!! پاشان نەيهێشت خزمەتكارەكە بڕوات هـەتا قـاپێكی ئـەو ماڵەی، كە لێی بو دای بە خزمەتكارەكـە، تـا بيداتـەوە بـە ماڵـە قـاپ شكاوەكە))[٢].

((كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بە صەفيەوە گەڕايـەوە مەدينـە، كـە لـە ڕێگا بو بە خێزانی، خاتو عـائيشە ڕەزای خوای لـێبێ گوتی: خۆم نەناسراو كردو خۆم گۆڕی، تا بچمە دەرەوە بزانم چيە، جا پێغەمبەر منی ناسـيەوەو بەرەو ڕوم هاتو منيش گەڕامەوە، بە خێرايی ڕۆيیو گەيشتەوە منو، لـە ئامێزی گرتمو فەرموی: چۆنت ديت؟! گوتم: جولەكەی كچـی جولەكـەيە!! -مەبەستی بەندەيەو لە شەڕ گيـراوە-))[٣].

خاتو عائيشە گوتی: ((ئەو شـەوەی نـۆرەی مـن بـو پێغەمبـەر لـەلام بمێنێتەوە، پێغەمبەر گومانی وابرد خەوم لـێكەوتوە، جـا چـوە دەردوە.. منيش بەدوايدا ڕۆيشتم (وام زانی دەچێتە لای يەكێ لە هەوێيەكانمو دوای كـەوتم)، هـەتا هاتـە قەبرسـتانی (بـەقيع).. پاشـان گەڕايـەوەو منـيش

١) ئيمام ئەحمەد لە مسنەد و موسليم گێڕاويانەتەوە.
٢) بوخاری گێڕاويەتيەوە.
٣) ئيبن ماجەو حافظ الدمشقي لە (المرافعات) گێڕاويەتيانـەوە، هـەروەك طـەبـەريش لـە (مناقب أمهات المؤمنين) هێناويەتی.

گەڕامەوە، خێرا ڕۆیشت، منیش خێرام کرد، ڕۆیشتنەکەی خێراتر کرد، منیش هەروەهاو پێشی کەوتمەوە.. جا هاتە ژورەوەو فەرموی: عائیشە ئەوە چیتە دڵت زۆر لێ دەدا.. منیش پێم ڕاگەیاند.. فەرموی: گومانت وایە خواو پێغەمبەرەکەی ستەمت لێدەکەن))[1].

خاتو عائیشە گوتی: ((غیرەم دەجولا لەو ئافرەتانەی خۆیان پێشکەشی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکردو دەمگوت: چۆن دەبێ ژن خۆی پێشکەش بکات؟! جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿تُرْجِي مَنْ تَشَاءُ مِنْهُنَّ وَتُؤْوِي إِلَيْكَ مَنْ تَشَاءُ وَمَنِ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾(الأحزاب-٥١)، واتە: تۆ سەرجێیی هەرکامیان وەدوابخەی‌و کامیان بانگ بکەیە لای خۆت، کەیفی خۆتە، ژنی تەخسیرکراویش ئاشی کەیەوە، گوناهێکت نایەتە سەر.

بە پێغەمبەرم گوت: وا دەبینم پەروەردگارت ئارەزوت زو جێبەجێ دەکات!))[2].

خاتو عائیشە ڕەزای خوای لێبێ گوتویەتی: ((گەر پێغەمبەری خوا بۆ شوێنێ دەربچوایە، تیروپشکی لەنێو خێزانەکانی دەکرد، جا تیروپشکەکە بۆ عائیشەو حەفصە دەرچو، هەردوکیان بەیەکەوە دەرچون، پێغەمبەر بە شەو قسەی لەگەڵ عائیشە دەکردو لەگەڵی دەڕۆیی.

حەفصە بە عائیشەی گوت: بۆ ئەمشەو سواری حوشترەکەم نابی‌و منیش سواری حوشترەکەی تۆ دەبم، تا تەماشام بکەی‌و منیش تەماشات بکەم!! گوتی باشە! عائیشە سواری حوشتری حەفصە بو، حەفصەش سواری

---

١) (فەرمودەکە بە کورتیە) موسلیم گێڕاویەتیەوە.

٢) بوخاری ومسلیم گێڕاویەتیانەوە.

حوشتری عائیشە بو. پێغەمبەری خواش ﷺ هاتە لای حوشترەکەی عائیشە، کە حەفصەی لەسەر بو، سڵاوی لێکردو پاشان لەگەڵی رۆیی، هەتا دابەزین‌و لەبەرچاوی عائیشە ون بون. ئەویش غیرەی بزوا! جا کە دابەزین قاچی خستە کونێك‌و دەیگوت: ئەی پەروەردگارم، دوپشکێك، یان مارێکم بەسەردا زاڵ بکە، تا پێوەم بدات، ئەوە پێغەمبەرەکەتە، ناتوانم هیچ شتێکی پێ بڵێم!!))[1].

١) موسلیم گێڕاویەتیەوە.

## بـەر لـە ڕوودانـــی كـارەسـات

### لەســەرخۆیی و پەلـە نەكــردن

خوای گەورە دەفەرمویّ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنكُمْ لاَ تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَكُمْ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ مَا اكْتَسَبَ مِنَ الإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ، لَوْلاَ إِذ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا هَذَا إِفْكٌ مُبِينٌ، لَوْلاَ جَاءُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَإِذ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاءِ فَأُوْلَئِكَ عِندَ اللهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ.. الى قوله تعالى وَاللهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ (النور: ١١-٢١،١٣).

هــەروەها دەفــەرمویّ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاَتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ، يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ، يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ اللهُ دِينَهُمُ الْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ اللهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ﴾ (النور: ٢٣-٢٥).

ئەم دە ئایەتە گشتیان دەربارەی خاتو عائیشە دایكی بڕواداران دابــەزی (ڕەزای خوای لــێبێ)، لەوكاتەی چەند كەسـێك لــە مەدینــە قــسەیان بــۆ هەڵبەست بە تۆمەتی ئەوەی لەگەڵ یەكێ لە هاوەڵە بەڕێزەكانی پێغەمبەر ﷺ، كە ناوی (صەفوان بن المعطل) بو، زینای كردوە. چیرۆكی ئەم ڕوداوە بە درێژی لە كتێبەكانی تەفسیرو ژیاننامــەی پێغەمبــەر ﷺ باســكراوە، ئەوەی دەیەوێ شارەزایی لەم ڕوداوە پەیدا بكات، با سورەتی (نور) دیراسە بكات، كە پەندو ئامۆژگاری زۆری تیایەو ڕێنمایی زۆری لــێ وەردەگــیرێ

بۆ ژنو مێردو باوکەکانو غەیری ئەوانیش، بۆ پاراستنی خێزان لە داب نەریتو دەمارگیری (تعصب)ی نەفامی (جاهیلی)و حەسودی، کە خێزان بەرەو هەڵدێرو داڕوخان دەبات. لەوانەیە خوای گەورە ویستبێتی لەم ڕوداوەی خاتو عائیشە ئەوە بە دیار بخات: تا مسوڵمانان سەرسام نەبنو بەلایانەوە نامۆ نەبێ، گەر شتێکی ئاوایان بۆ هەڵ بەسترا. لە سەریشیان پێویستە کاتێك قسەیەکیان بۆ هەڵ دەبەسترێ، دان بە خۆیان دابگرنو هێمنو لەسەرخۆو بە ئارام بنو، بەوردی لێی بکۆڵنەوە.

ئەوەی لێرەدا بە لامانەوە گرنگە هەڵوێستی بەرزو گەورەی پێغەمبەری خوایە ﷺ، لەو کاتەی ئەم قسە هەڵبەستراوەی بیست، هەرچەندە بەمە ئازاری دەرونی پێ گەیشت، بەڵام وێڕای بڵاوبونەوەی ئەم هەواڵە لە نێو مسوڵماناندا، تا ئەو کاتەی سروش (وحي) دابەزیو داوێن پاکی خاتو عائیشەی بەدەر خست، کە بێ تاوانو بەری یە دانی بەخۆدا گرتو لە حوکمدان پەلەی نەکردو هەڵنەچوو توڕە نەبو.

هەروەها هەڵوێستی جوامێری هاوەڵی بەڕێز (ئەبوبەکری صدیق)مان بەلاوە گرنگە، لەگەڵ ئەوەی بەڵاو موسیبەتەکە لەسەر دڵی ئەبوبەکر زۆر توندو کاریگەرو ناخۆش بو، دەربارەی خۆشەویسترین شت لەلای ئەو و عەرەبەکان، کە بریتی بو لە ئابڕوو شەرەف. بەڵام ئەو وەك نمونەی باوکێکی داناو لێزانو کارامە هاتە مەیدانو پەلەی نەکردو هەڵ نەچوو توڕە نەبوو، غیرەش پاڵی پێوە نەنا کارێکی خراپ ئەنجام بدات، وەك ئەوەی عەرەبەکان خۆیان پێ بە دیار دەخستو شانازی یان پێ ی دەکرد.

جا با باوکان لەم هەڵوێستە پڕ لە جوامێریو مەردانەیەدا، پەندو ئامۆژگاری وەرگرنو، دابو نەریتی جاهیلی زاڵ نەبێ بەسەریاندا.

سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی گوتی: ((جاء النبّي ﷺ الى بيت فاطمة فلم يجد علياً، فقال: أين إبنُ عمِّك؟! فقالت: كان بيني وبينه شيءٌ، فغاضبني فخرج! فقال النبّي ﷺ: أنظري أين هو؟ فقالت: هو في المسجد راقد. فجاء وهو مضطجع وقد سقط رداؤه عن شقه فأصابه تراب، فجعل النبّي ﷺ يقول: قُمْ يا أبا تُراب. قال سهل: وما كان له إسمٌ أحبَّ إليه منه))[١]، واتە: پێغەمبەر هاتە ماڵی فاتیمەی کچی. بینی عەلی لە ماڵەوە نی‌یە. فەرموی: ئامۆزاکەت لە کوێ‌یە؟!

فاطیمەش گوتی: ناخۆشی‌یەك کەوتە نێوانمانەوەو توڕەی کردمو چوە دەرەوە!

فەرموی: بزانە لە کوێ‌یە!

گوتی: لە مزگەوت خەوتوە.

پێغەمبەر ﷺ چوە مزگەوت، بینی ئەوا عەلی راکشاوەو عەباکەی لەسەر لایەکی کەوتودو لەشی بە خۆڵ بوە. بە گاڵتەوە پێی فەرمو: لەش بە خۆڵ، هەستە[٢].

---

١) رواه البخاري ومسلم.

٢) پەلەکردنی پێغەمبەر بۆ چاکردنەوەی پەیوەندی ژنو مێرد، وانەیەکە بۆ دایكو باوکانی کچ، چونکە ئەمرۆکە زۆربەیان گەر گوێبیستی ڕوداوێکی وەك فاطیمە (ڕەزای خوای لێبێ) بن، کچەکەیان دەبەنەوە ماڵی خۆیانو نایدەنەوە، تا مێردەکە خۆی بچوك دەکاتەوەو ملکەچ دەبێت! یان ئەم کارە پێچەوانە دەبێت، پیاو خێزانەکەی تەڵاق دەداتو! بەردی بناغەی خێزانەکەی دەروخێنێو، بەهۆیەوە مندالەکانی پەرتەوازە دەبن!

ڕودانی جیاوازیو کێشەی ژنو مێرد، شتێکی چاوەڕوان کراوە، پێویست بە هەراسانو ترس ناکات، بەڵکە ژیانی ژنو مێردێك جیاوازیو کێشەی تێدا ڕو نەدات، پێویستی بە توێژینەوە هەیە، جا کێشەو جیاوازی ژنو مێردایەتی شتێکی سروشتیەو دەبێ ڕو بدات.

لێرەدا گەر ژن و مێرد بۆ خۆیان ڕێگاچارەیان بۆ دانەنابو، پێویستە سەرپەرشتیارانی ژن، یان پیاو بە حیکمەتو ئامۆژگاری باش، بێنە ناو مەسەلەکە بۆ چارەکردنی ئەو کێشەو جیاوازیانە، وەك لە شێوازی پێغەمبەر ﷺ بە ئاشکرا بینیمان، کە پەلەی کرد بۆ چاکبونەوەی پەیوەندیەکانی ژنو مێردو، نەهێشتنی جیاوازیو خیلاف بە شێوازی گاڵتەکردنی لەگەڵ عەلیی زاوای (ڕەزای خوای لێبێ) بە ناونانی لەش بە خۆڵ! گەر عەلی لە ماڵەوە دەرنەچوایە، لەوانە بو فاطیمە (ڕەزای خوای لێبێ) پەلەی بکردبا بۆ ڕازی کردنیو نەهێشتنی تورەییەکەی.. لە ماڵ دەرچون، پێویستە کۆتا چارە بێت، نەك لە سەرەتاوە بێت، پێویستە هەردولا حیکمەتو داناییان هەبێ.

لە پەندێکی عەرەبیدا هاتوە: (إذا عز أخوك فهن) بە واتای گەر براکەت تورە بو ئەوا نەرمو نیانو خۆگر بە.

ئەو کردەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامیدا بە گەڕاندنەوەی زاواکەی بۆ ماڵەکەی، لە ترسی گەورەبونی کێشەی نێوان عەلی و نێوان خێزانەکەی بو، کە بە هۆی چونە دەرەوەی لە ماڵ ڕویدا..

ئەمڕۆکەش پاش تێپەڕ بونی چواردە سەدە، ئافرەتی زانای گەورە (ایفلین ملیس) بە هاوبەشی لەگەڵ (دۆفا) و غەیری ئەو، لە کتێبی (کیف تبني حیاتك الزوجیة)دا، ڕێنمایی دەدەن لەژێر سەردێری (لا تسرعي بمغادرة المنزل والذهاب الی والدتك) (پەلە مەکە لە ماڵ بەجێ هێشتنو چون بۆ لای دایکت):

یەکەم شت پێویستە بگوترێ ئەوەیە، بۆ چارەسەر کردنی ئەم جۆرە کێشەو ناکۆکیانە، نابێ هیچ کام لە ژنو مێرد ماڵەوە بەجێ بهێڵن، ژن بچێتەوە لای دایکی، یان پیاو بچێتە یانەو چایخانەکان، چونکە بەم هەڵوێستەیان، ناکۆکی یەکانیان چارەسەر ناکرێت، ئەوان بەم کارە چارەسەری کێشەکە دوادەخەن، یا بە ناچاری هەر دەبێ ڕوبەڕوی یەکتری ببنەوەو، کار بۆ چارەسەر کردنی ئەو کێشەی نێوانیان بکەن، جا زو بێ یان درەنگ.

ژن کە ماڵ بەجێ دێڵێو دەچێتەوە بۆ لای دایکی، کۆسپو ئاستەنگێکی تر دروست دەکات، خودی دایك هەست بەوە دەکات، کە بیری کچە بچوکەکەی دەکات، کە دەشگەڕێتەوەی لای هەست بە بەختەوەری یەکی گەورە دەکات، ئەمەش مەترسی یەکی حەقیقی دروست دەکات، کە هەڕەشە لە ژیانی ژنو مێردایەتی کچەکەی دەکات. مێردی دڵ بریندارو بێئارام، کە دەگەڕێتەوە بۆ لای دایکی، مەترسی یەکەی لە هۆی ژنەکەی کەمتر نیە لەسەر تێکدانی ژیانی هاوسەری یەتی، باشترین کردەوە، کە ژنو مێردی

ناكۆك لەگەڵ یەكتری بیكەن، خێرا یەكلاكردنـەوەی نـاكۆكی یەكانـە، كـە لـە نێوانیانـدا دروست دەبێت، جا لە هەر كوێ بێت، ئەو كاتە نابێتە هۆی دەسـت تێـوەردانی دایـكو باوك، یان هاوڕێی دڵسۆز، لەو ناكۆكی یەی نێـوان ژنو مێـرد، بـۆ ئـەوەی لایـەنگیری لایەك بكەن، یان بە هۆی هەڵوێستەكەیەوە بڵێن تۆ لەسەر حەقی، كـە ئەمـەش دەبێتـە مایەی درێژەدان بە ناكۆكی یەكەو ئاڵۆزكردنی.

بەم بۆنەیەوە، بۆ شارەزا بونو سودوەرگرتن، بە باشم زانـی بـە درێـژی بـاس لـە هۆیـە ریشەیی یەكانی زۆربەی جیاوازیو كێشە ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆكانی نێـوان ژنو مێـرد بكەین:

**یەكەم:** نەرم نواندنو ورد نەبون لە هەڵبژاردنی هەر یەكێك لە ژنو مێـرد بـۆ یـەكتری، وەك بە درێژی لە سەرەتای كتێبەكە باسمـان كـردوەو، كـار تێكردنـی خۆشەویـستی عاتیفی یانە، كە مرۆڤ كوێرو كەڕ دەكات، ئەم جۆرە خۆشەویستی یە لەسەر بناغەی ئارەزوبازیو هەڵەشەیی دامەزراوە، پاشان جیاوازی لە سروشتو پەروەردە بـە دیـار دەكەوێو ئیختیلافو ناكۆكی ڕو دەدات...

ئەمەو ئەگەر كار لەكار ترازاو خێزانیان پێك هێناو جیاوازیو ناكۆكی دروسـت بـو، پێویـست بـە نائومێـدیو جیابونـەوە لـە یـەكتری ناكـات، بەڵكـە دەبـێ حیكمـەت بەكاربهێنرێو لە پەروەردەو چاكسازیدا، پلەپلەیی بەكار بهێنرێ، ئـەویش بـە قـسەی خۆشو ڕێزگرتن، چونكە مرۆڤـ دیلی چاكەكردنە، وەك لە پەندە گـشتی یـەكانی نێـو خەڵك هاتوە (إنك علی ما ربیته، و زوجك علی ما دعوته!...).

نمونەی زۆری تریش هەیە، كە تیایدا سەركەوتن و چاكسازی دەستەبەر كـراوە، گـەر نیازەكان پاك بونو مامەڵەكردن بە باشی بوبێ و پشت بـە خـوای گـەورە بەسـترابێ، چونكە خوای گەورە دڵ و ڕەوشت وەرگێڕەرە!

هاوڕێیەكی سادەو ڕەوشت باشم هەبو قوتابخانەی تەواو كـرد، كـە بـە داخـەوە ئـەو قوتابخانەیە هیچ ئادابێكی ڕەفتارو گوزەرانی، بە تایبـەتی لەگـەڵ كـەسو كـاری فێـر نـەكرد... پاشـان هێنـدەی پێنەچـو ژنـی هێنـا، مامەڵـەو هـەڵسو كـەوتی لەگـەڵ هاوسەرەكەی باش نەبو، یان ئادابی ئەو هەڵسو كەوتەی هەر نەدەزانی، جـا لەگەڵیـدا زۆر دڵڕەقو توندوتیژ بو، بە خراپی ڕەفتاری لەگەڵـدا دەكـرد، هاوسـەرەكەشـی لـەلای خەسوەكەی سكاڵای لـێكرد.

خەسوەكەش ئامۆژگاری هاوسەری كوڕەكەی كرد و گـوتی: ((كـچەكەم! ئـەو پیـاوە

گەنجێکی ناشارەزایە، نیشانەی چاکسازی لێ بەدی دەکرێ، جا بە ئارام و خۆگر بە لەسەر کردەوەکانی و، پلە بە پلە ڕای بهێنەو ئامۆژگاری بکە، هەر دەبێ چاك ببێ)).

جا ئەو قسەیەی خەسوەکەی گوتی هاتە دی و پیاوەکە چاك بو، بو بە یەکێ لەمێردە باشەکان.

**دوەم:** خۆویستی (أنانیة)ی هەر یەکێك لە ژن و مێرد، یان هەردوکیان -پەنا بە خوا!- و، چاودێری نەکردن و دڵ ڕانەگرتنی، دەبێتە هۆی سودمەندی خەڵکی ترو ڕێز نەگرتنی کەسایەتی یەکەی. خۆویستی نەخۆشی یەکی کوشندەیەو زیادەڕۆیی یە لە خۆشویستنی خودو فەرامۆشکردنی مافی خەڵکی تر، ئەمەش پێچەوانەی ئیسلام و ئەو هاوسەریەتی یەیە، کە پێویستە لەسەر قوربانی دان و بەخشین بەر لە وەرگرتن بنیات بنرێ.

خۆویستی بنەڕەتی گشت کارە ناشیرین و تاوانکارییەکانە، هەر کاتێك خۆویستی گۆڕدرا بە خۆبەخت کردن، ئەوا خاوەنەکەی دەبێتە یەکێك لە گەورە پیاو چاکان، هیچ شتێکیش وەك ترسان لە خواو پەروەردەکردنی ئیسلامی، نمونەی ئامۆژگاری و پەروەردەو چاکسازی نیە.

چاکسازیش بە پلەپلەیی و مومارەسەکردن، نەبێ نایەتە دی، لە فەرمودەی (صحیح)دا هاتوە: ((**إنما الحلم بالتحلم، وإنما العلم بالتعلم، ومن يتحر الخير يلقه ومن يتق الشر يوقه**)).

ئایەت و فەرمودەی زۆر هەیە، جاڕی قوربانی دان و خۆبەخت کردن دەدەن، لەوانە ئایەتی: ﴿**وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ**﴾ (الحشر- ٩).

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه من الخير**)).

کەواتە ئەی ژن و مێردی سەنگین! لەخۆگرتنەوە (ایثار) لە بیر مەکەن، چونکە چاکسازی و بەختیاری تێدایەو پاداشتەکەی بەهەشتە.

**سێیەم:** هۆیەکی شاراوەی بوغزو قین و جیاوازی و کێشەی نێوان ژن و مێرد هەیە، کە سەرکێشی سەرپێچی کردنە، بە ڕاشکاوی دەڵێین: بریتییە لە تێر نەکردنی غەریزەی جنسی، بەتایبەتی لە هاوسەنگ نەبونی و بەدەمەوە نەهاتنی نێوان ژن و مێرددا.

بە باشم زانی لەم بابەتەدا ئەو لێکۆڵینەوەیە نەقڵ بکەم، لەبەر خاتری کۆمەڵی ژنە مێردداره‌کان‌و بانگەوازی کردنیان بۆ خۆڕاگرییەکی کەم، ئامۆژگاریش بێ بۆ هاوسەرگرتن، تاکو کارەکانیان لەسەر ڕۆشنایی بێ! جا هەر کەسێك خۆڕاگرو بە ئارام بو، ئەوا سەرفرازو سەرکەوتوە.

لە ڕاستیدا لە سەرەتای ژیانی ژن‌و مێردایەتیدا پەیوەندی یە جنسییەکان، تا ڕادەیەك شاراوەیەو بەباشی نازانرێ چۆنە، زۆر لەو کەسانەی تازە ژنیان هێناوە، خۆیان کەوتونەتە هەلۆیستی ناواوە، کە تێیدا شڵەژاون، جا چ لەبەرئەوەی شارەزایی یەکی پێشینەیان نەبوە، یان شارەزایی یەکانیان بە جۆرێك بوە بارودۆخەکەی جیاوازی هەبوە لەگەڵ ئەو هەلۆیستەدا، زۆر جاریش لە سەرەتادا توشی دڵەڕاوکێ دەبن، چونکە هەر یەکێك لە ژن‌و مێرد بۆ یەکتری بەپەرۆشن، هەندێ جار هەست کردن بە گوناه و داخ‌و ترس، دەبێتە مایەی زیاترکردنی شڵەژانەکە، بەلام هێندەی پێناچێ جێگیری‌و هێمنی‌و ئارامی شوێنی ئەو دڵەڕاوکێیە دەگرێتەوە، هەتا وای لێدێ پەیوەندی یەکەیان زۆر توندو خۆش دەبێ.

لێهاتویی‌و کارامەیی ژن یان مێرد، بە دروست بونی هۆگری‌و ئولفەتی نێوانیان و، هەلگرتنی داواکارییە زەحمەتەکانی نێوانیان بەرەو پێشەوە دەچێت و، هەر یەکێکیشیان زیاتر بەدەم ئارەزوەکانی ئەوی ترەوە دەچێت.

لە هاوسەرگرتنی سەرکەوتودا پەیوەندی یە جنسی یەکان، بە پێی تێپەربونی ساڵ زیاتر تێر دەبن، نابێ لە یەکەم شەوا چاوەڕوانی ئەوپەڕی چێژو تێربونی جنسی بکرێ، تەنانەت لە مانگەکانی یەکەمی ژن و مێردایەتیش دا.

## فێربونی بەدەمەوە هاتنی ژن‌و مێرد بۆ یەکتری

لەو کاتەی کچ‌و کوڕ دەبنە هاوسەری یەکتری‌و بەتەواوی هۆگری یەکتر دەبن، لەسەریان پێویستە فێربن، چۆن بەدەم داوای جنسی یەکتری یەوە دێن. بەدەمەوە هاتنی جینسی لە لای هەر یەکێك لە ژن‌و پیاو جیاوازی هەیە، چونکە پیاوان زوتر جنسی یان دەروژێ‌و دەگەنە خۆشی، بەلام ئافرەتان پێویستیان بە ئەندازەیەکی زۆرتری لاواندنەوەو قسەی خۆش‌و ئامادەیی جوتبون هەیە، ئەم جیاوازی یە شتێکی سروشتی یەو پێویستە لەبەرچاو بگیرێ.

لە گرنگترین ئەو شتانەی ژن‌و مێردی تازە روبەڕوی دەبنەوە، فێربونی زەبت کردنی

کاتی بەدەمەوە هاتنی جنسی هەر یەکێکیانە بۆ ئەوی تر، یان گەیشتن بە پێکهێنانی پەیوەندی یەك، کە هەردوکیان تێر بن، ئەم کردەیەش بەبێ زەحمەت ئەنجام دەدرێ، مادام هەر یەکێك لە ژن و مێرد ئامادەیە بۆ رازی کردنی ئەوی تر.

لە راستیدا ژنو مێرد دەزانن چۆن بەدەم یەکتریەوە دێن، ئەمە کارێکە لەوە گەورەترە، کە کردەیەکی فیسیۆلۆجی بێت، بەڵکو کردەیەکە هەمو کەسایەتی دەگرێتەوە، لە هەمان کاتیشدا ژیانی ژنو مێردایەتی دەگرێتەوە، زۆر جار پەیوەندی یە جنسی یەکان رەنگ دانەوەی دیاردەکانی تری ژیانی هاوسەری یە.

بۆ نمونە گەر ناکۆکی یەك دەربارەی گرفتەکانی دارایی هەبێ، ئەوا ژن یان مێرد توشی سەرقاڵیو دڵەڕاوکێ دەبێتو، قەدەغەی سەرجێی دەکات. بەڵام ئەگەر ژنو مێرد پێکەوە شەوێکی خۆش لە جوتبونەکەیان بەسەر بەرن، بێگومان شوێنەوارەکەی لە بەختیاریانو تێربونی جنسی یان رەنگ دەداتەوە. تەنگو چەڵەمەو حاڵەتەکانی دڵەڕاوکێو ماندوبون، کاریگەری خۆی هەیە لە کز کردنی ئارەزوی جینسی.

لە ڕاستیدا کەنەفتی جنسی (العجز الجنسي) لە لایەنی بایۆلۆجی یەوە، تاڕادەیەکی زۆر، بەدەگمەن ڕودەدات، جا کاتێ کۆسپو ئاستەنگ لەمبارەوە دێتە پێشەوە، پێویستە لە هۆکارە ڕاستەقینەکان بتوێژرێتەوە، نەك هۆیەکە بدرێتە پاڵ کەنەفتی جنسی.

## گرفتەکان چینو چۆن بەسەریدا زاڵ دەبیت؟

زۆرجار گرفتە جنسی یەکان لە نیشانەی ئەو دەردەسەری یانەیە، کە لە پەیوەندی ژنو مێردایەتی هەیە، لە چارەسەرکردنی ئەم گرفتانە بە دەگمەن دەرمانی پزیشکی، یان خوێندنەوەی یەکێك لە کتێبە باشەکانی لەمەڕ ئەم بابەتە سود دەگەیەنێ. هەندێ جار بە زویی ژنو مێرد هەست بە مەحاڵی بەردەوامی ژیانی هاوسەریەتیان دەکەن، کە چەند هۆیەك پاڵپشتی یەتی، جەستەیی یان عاتیفی. جا هۆیەکە هەرچی یەك بێت، پێویستە هەنگاوی یەکەمی چارەسەرکردن لەسەر دەستی پزیشکێکی کارامەدا بێت، پزیشکی تایبەت بە نەخۆشی ئافرەتان دەتوانێ بە زویی هۆی ئەندامیی (عضوي) دەردەکە ئاشکرا بکاتو چارەسەری بکات. بۆ چارەسەری ئەو لایەنە عەقڵی یانەی هۆکاری هەرەسن، پێویستی بە کاتێکی درێژخایەن هەیە، بەڵام زو دەست پێ کردن بە چارەسەر لە ژێر سەرپەرشتی رابەرێکی پسپۆڕ، کاریگەریی لە چارەسەری گرفتەکەدا دەبێت.

هەندێ جار پیاو دەستەوەستان دەبێت لە بەجێهێنانی تەواوی کردەی جنسی، کە لەمەشدا پیاو هەست بە زەبونیو زەلیلی دەکات. شتێکی سروشتی یە پیاو هەست بەمە بکات، چونکە هێزە جنسی یەکەیان بەڵگەی پیاوەتی یە. زۆرجاریش هۆیەکانی کزی جنسی (الضعف الجنسي) دەرونی‌یەو دەتوانرێ لەسەر دەستی شارەزایەکی دەرونی پسپۆڕ چارەسەری بکرێ.

وا دەبێ ژنو مێرد سکاڵای هاوسەنگی نەبون لە ژمارەی ئارەزوە جنسی یەکانیان دەکەن، کە خۆیان هەست بەمە دەکەن.

لە هەندێ حاڵەتدا ژنەکە سکاڵای لە رادەبەدەری جنسی مێردەکەی دەکات، لە چەند حاڵەتی کەمتردا دەبینین شێوازی چالاکی جنسی پیاوەکەو مەدای ئەو چالاکی یە، لە لایەنی جنسی یەوە، خێزانەکەی رازی ناکات. جا زیادەڕۆیی کردن لە حاڵەتەکانی ئەو دو جۆرەدا، گرفتێکی ترسناك دروست دەکات، کە پێویستی بە کارامەیی یەکی زۆر دەکات لە توێژینەوەی دا.

بۆ ئەم جۆرە گرفتانە رێنوێنی کارە پسپۆڕەکان، وا دەبینن ژنو مێرد دەتوانن رێگاچارەیەك بۆ ئەمجۆرە گرفتانە بدۆزنەوە، کە هەردولا رازی بکاتو ببێتە مایەی بەختیاریو ئاسودەیی ژیانی هاوسەرییان گەر بە گیانێکی سۆزو هاوبەشو لە یەکتری گەیشتن، بە یەکەوە ڕوبەڕوی گرفتەکان بونەوە.

## گرفتی خەسوەکان

ڕەنگە کێشەو سەرپێچی ژنو مێرد بۆ یەکتری، هۆیەکەی خەسو بێت، هەمو ئەمەش لە ئاکامی توندوتیژیو خراپ هەڵسوراندنە، لەوانەیە وتەیەکی خۆشی ژن، یان مێرد، دڵەکان چاك بکاتەوەو گرفتەکان نەهێڵێ، وەك لەوەی رابورد بینیمان، کە زاوایەك نامەیەك بۆ خەسوەکەی، دەنێرێ کە ژیان لە نێوانیاندا ساردو سەلامەت دەکات، جا لەم بابەتەدا لێکۆڵینەوەیەکی باش باس دەکەین، کە لە سەرچاوەی پێشو نەقڵ کراوە.

## ئایا بەڕاستی خەسو کارەساتە؟

دەبێ چەند هۆیەك لە دواوەی ئەو بیرۆچکە خراپە هەبێ، کە لە کۆمەڵگەکەمان لە مێشکی خەڵکی دایە، دەبێ چەند ڕەگو ریشاڵێك هەبێ لە دواوەی ئەو گاڵتەو قسە خۆشانەی لەمەڕ خەسوان دەگوترێ، چەند ڕەگێك لە دواوەی دورخستنەوەی هەریەکێك

لە ژن و مێرد بەرامبەر بە خەسو هەبێت.

دایك لە چینی نێوەڕاستدا، کە تەمەنی لە ناوەڕاست دایە، سێ گەنجی هێناوەتە دنیا، دوای ژن هێنانی کوڕەکانی، خۆی بە تەنهایی دەبینێتەوە، ئەو، هەمو ژیانی تەرخان کردوە بۆ پەروەردە کردنی منداڵەکانی، ئەو منداڵانە گەورە بون، یەك لە دوای یەك ماڵەوەیان بەجێهێشتوە، دایکیش ئەو گرنگی پێدانەی هەیەتی لە دوای منداڵەکانی شتێکی سەرەکی نی یەو تێپەڕ دەبێ، زۆر جاریش وا دەبێ مێردەکەی بە کاری تایبەتی خۆی سەرقاڵە. ماڵەکەشی لە کەلو پەلو رێكو پێکیدا تێرو تەواوە، جا گەر هیچ کارێکی حەقیقی نەبێ خۆی پێ سەرقاڵ بکات، ئەوا ڕوی بۆ لای ڕۆڵەکانی وەردەگێڕێ. تا کار دەگاتە مەترسی دەست خستنە ناو کاروباریان، ژن و مێردیش دەیانەوێ کاروباری خۆیان بۆ خۆیان چارە بکەن، لە ژیانیاندا حەز بە دەست تێوەردانی دایکیان ناکەن، جا لەبەر ئەم هۆیانە شێوازەکانی بەرگری دژی خەسوی خۆ لە شت هەڵقورتێن پەیدا دەبێ، کە لە شێوەی قسەی نەستەق و نوکتەبازیدا دەبیسترێ.

گرنگی دانی ژمارەیەکی زۆر لە دایکان بە ڕۆڵەکانیان، کە پێگەیشتون، کارێکی سروشتی و دروستە، ڕەنگە بەرژەوەندی خێزانی بچوکی تێدابێ، زۆر لە دایکان لە تەمەنی چل، یان پەنجا، یان تەنانەت لە شەست ساڵیدا، بەو شارەزایی و حیکمەتەی هەیانە، یارمەتی زۆر پێشکەش بە ژن و مێردو خێزانی تازە دەکەن، گەر رێگایان پێ بدرێ.

دایكو باوك لە کاتی تەنگو چەڵەمەدا باشترین پشتیوانن، جا گەر ژن و مێرد پێویستیان بە سستەرێك هەبو نەیان دەدۆزی یەوە، دایك یەکسەر بۆ یاریدەدانیان ئامادە دەبێت. گەر دایكو باوك لێیان نزیك بن، دەتوانن زۆر خزمەتگوزاری یان پێشکەش بکەن، وەك ئەوەی خێزانی بچوك لە بۆنەکانی وەك: منداڵبون، ماڵ گواستنەوە، سازکردنی ئاهەنگێکی گەورە پێویستی پێ دەبێ.

بەڵام مەترسی یەك هەیە، ئەویش پەیوەست بون و هۆگربونی زیاد لە پێویستی مرۆڤە بە دایكو باوکی یەوە، زۆر جار ئەمە دەبێتە هۆی گەڕانەوەی نەریتەکانی منداڵی، چونکە لە منداڵی یەوە هەر لەلای دایكو باوك بونو دور نەکەوتونەتەوە. گەنجانی تەواو پێنەگەیشتو، مەیلیان بە متمانەکردن لەسەر کەس و کاریان هەیە، زۆر جاریش باوکانیان لەو جۆرە کەسانەن لەسەر ئەمە هانیان دەدەن، ئەگینا منداڵ گەشە دەکات و پێ دەگاو، لە تەمەنی ژنهێنان متمانە لەسەر خۆی دەکات.

کردەی پشتگیری کردنی ژیانی هاوسەرێتی، کارێکی ئاسان نی یە، بەڵکە پێویستی بە

گرنگی دانی دو کەسی هۆشدار هەیە، کە دایكو باوكن، ژنو مێرد چەند پێگەیشتو بن، ئەوەندە لە مەترسی دەست تێوەردانی دایكو باوكیان دور دەبن، چونکە ئەو کاتە تواناو ئازایەتییەکی باشیان دەبێت، کە ژیانی تایبەتی یان پێی ببەنە سەر. هەروەها ئەو دایكو باوکانەی گرنگی پێدانی تایبەتی یان هەیە، کە دورن لە ڕۆڵەکانیان، دەتوانن بە هاوڕێیەتی خێزانی ڕۆڵەکانیان بەهرەمەند بن، بەبێ دەست تێوەردان لە کاروباریاندا.

## یەکلاکردنەوەی کێشەکان

ئەو کۆمەڵناسانەی بایەخ بە خێزان دەدەن، دەزانن، کە ڕودانی کێشەی نێوان ژنو مێرد، شتێکی چاوەڕوان کراوە، ئەوەتا دکتۆر تیرمان- مامۆستا لە زانکۆی ستانفورد-و ژمارەیەك لە هاوڕێیانی، لیستێکیان داناوە، کە نزیکەی شەست کۆسپو تەگەرەی لەخۆ گرتبو، کە ژنو مێرد دەیاندایە پاڵ یەکتری. بەڵام ئەمە مایەی ترسو هەراسانی نیە. چونکە هەر ژیانێکی ژنو مێردایەتی، هەرگیز کێشەو خیلافی تێدا نەبێت، دەبێ ئێمە لێی بکۆڵینەوەو توێژینەوەی دەربارەی بکەین.

ئێمە گەر لە کاری ئەم جۆرە ژیانە بکۆڵینەوە، دەبینین یەکێك لە ژنو مێرد تێیدا دڵنیاو ڕاستگۆ نەبووە. کێشەی نێوان ژنو مێرد شتێکی سروشتیەو هەر دەبێ ڕوبدات.

لەبەرئەوەی هاوسەرگیریی لە نێوان دوو کەسی جیاواز دروست دەبێ، جاری وایە کێشەکان لە نێوانیاندا فراوانو گەورە دەبێ. گەر ژن یان مێرد بە تەواوی لە دوو خێزانی لە یەکچو بوون، بێگومان شتی زۆر هەیە، کە لەسەر چۆنیەتی ئەنجامدانی جیاواز دەبن. ڕەنگە میزاجو بەهاکان جیاوازی هەبێت، کە هەردەم لەگەڵ نەریتە سادەکانو، ئارەزوەکانی کەسیی یەك نەگرێتەوە، هەوا گەر ژنو مێرد لە ژینگەیەکی زۆر لێك جیاواز گەورە بوبن، ڕەنگە کێشەکان زیاتر قوڵ ببێتەوە.

بەڵام ئەمە مانای وانیە، کە کێشەو ململانێی نێوانیان لە ئەنجامی کێشەی ڕاستەقینە لە شێوازی گوزەرانو مەعیشەت دروست دەبێت، چونکە کاتی وا هەیە کێشە لە نێوان ژنو مێرد لە ئەنجامی هۆی دەرەك بە تەواوی دروست دەبێت، دەربارەی هەڵوێستی ئەو ژیانەی کە لە بنەڕەتدا کێشەیان لەسەر دروست بووە.

بۆ نمونە: بەڕێوەبەری (مصلحه) وەلیدی بانگ کرد، کە فەرمانبەرە لەو (مصلحه)یەو لەسەر هەڵەیەك، کە ئەویش نەیوێرا بوو ڕەخنەی لێ بگرێ، یان هەڵوێستی خۆی بۆ بەڕێوەبەرەکەی ڕون بکاتەوە، بەڵام کە گەڕایەوە ماڵەوە زۆر تورەبوو لە ناخیدا خەفەی

سەهل گوتی: عەلی هیچ ناوێکی وەك ئەم ناوەی پێ خۆش نەبوە.

---

کردبوو، جا کاتێ لە پێڵاوە کۆنەکەی دەگەڕاو نەیدۆزیەوە، کە لە شوێنی خۆی دایانابوو، جا بە ڕوی خێزانەکەی تەقیەوە، بەڵام خێزانە زیرەك و تێگەیشتووەکەی، زانی ئەمڕۆکە مێردەکەی باری دەرونی تەواو نیە، چاوەڕوانی کرد، هەتا نانی ئێوارەیان خوارد، جا وردە وردە مێردەکەی دواند، کە چ شتێك وا پەستی کردووەو تووڕە بووە، ئەویش گرفت و ماندوێتی خۆی بۆ باس کردو بەمەش هەستی بە دڵنیایی کردو زۆر مورتاح بوو، جا کاتی وادەی نوستن هات، ڕوانینی بۆ ڕوداوەکە گۆڕاو، لەناکاو هەستی بە سۆزو حەنانێکی زۆر کرد، بەرامبەر بە خێزانەکەی.

ئەم نمونە سادەیە، دەکرێ بکرێتە نمونەیەك بۆ ئەو شێوازەی پێویستە بیگرینەبەرو بەکاری بێنین، بۆ دابین کردنی جێگری و دڵنیایی لە ژیانی ژن و مێردایەتیمان، لەو کاتەی هەندێ هەست و نەستی خراپمان بەسەردا دێت، جا گەر ژنی ئەم پیاوە سەبارەت بە میزاجی مێردەکەی هەستیار نەبایەوە ڕەچاوی میزاجی نەکردبا، توڕەبون و هەڵچونەکەی لێ قبوڵ نەدەکرد، ڕەنگە ئەو کاتە بگریاباو لەگەڵی تێك بگیرابایە، بەمەش کارەکە بەوە نەدەوەستاو دەبوە شەڕێکی گەرمی ڕاستەقینە.

## یـاخی بونی ژن لـه میـرد

پێش باسکردنی سەرپێچی ژن بۆ مێردەکەی، پێویـستە پیـاو زانیـاری هەبێ‌و شارەزابێ لـەوەی، ئـافرەت چـەند گۆڕانکـاری‌یـەکی جەسـتەیی‌و دەرونی بەسەر دادێ، ئەوەش لە کاتێـك دایـە، کـە توشـی حـەیز دەبـێ. حەیزیش وا لە ئافرەت دەکات گۆڕان بەسـەر هـەڵس‌و کـەوت‌و ڕەفتاریـدا بێت، کە وا دەخوازرێ تەحەمولی بکرێ. لەبەر ئەوە لە کاتی حەیزدا پیـاو نابێ ئەو مامـەڵەو هەڵسوکەوت‌و ڕەفتارەی لە کاتی پاکیدا لەگەڵ ژنەکەی دەیکات، بە هەمان شێوە لەکاتی حەیزیش دا هەمان ڕەفتارو شێواز بەکار بێنێ، بەڵکو پێویستە تەحەمولی هەندێك ڕەفتاری ژنەکەی بکات، گەر بە قسەی نەکرد.

جا هەندێك لەو گۆڕانکاری یانە باس دەکـەین، کـە لـە کـاتی حـەیزدا بەسەر ئافرەتدا دێن، کە لە کتێبی (الحجاب)ی مامۆستا مەودودی لاپـەڕە ١٨٥-١٨٦، نەقل کراوە، کە پشتی بە قسەو دیدو بۆچونی زانایـانی ژیـان ناسی‌و توێژکاری (تشریح) بەستوە:

١- بە هۆی حەیزەوە ئافرەت، هێزی نەگۆڕی پلەی گەرمی لە لـەش کـەم دەبێتەوەو، پلەی گەرمی دێتە خوارەوە.

٢- دڵ بە هێواشی لـێ دەدات، خوێنی کەم دەکات، ژمـارەی خانـەکانی کەم دەبێتەوە.

٣- رژێنی (الصماء)و ڕژێنی لەوزەتێن‌و لیمفاوی دوچاری گۆڕان دەبێ.

٤- وەرگەڕانی هیۆلینی کەم دەکات.

٥- خوێیەکانی فۆسفات و کلۆرید لە لەش کەم دەکات.

٦- هەرسکردنی خواردنی تێکدەچێ و، پێک نوسانی بەزو پارچەکانی هیۆلینی لەگەڵ پارچەکانی لەش، لە خواردن کەم دەبێت.

٧- دەرونی بێ هێز دەبێ، ئامێرەکانی قسەکردن دوچاری گۆڕانێکی تایبەتی دەبێ.

٨- هەستکردنی بە شت، بەرەو سستی دەڕوات و ئەندامەکانی لەش سست دەبێ.

٩- تێگەیشتن و زیرەکی و توانای تەرکیزی ئەفکاری دوادەکەوێ.

دکتۆر (أميل نودك)، کە لێکۆڵەرەوەیەکی گەورەیە لەم جۆرە لقە زانستە، نوسیویەتی:

ئەو نیشانانەی لەکاتی حەیزدا ئافرەت توشی دەبێ بریتین لە: سەر ئێشەو هەستکردن بە ماندویی و ئازاری ئێسقانەکان، لاوازی ئەعساب و میزاج تێکچون، تێکچونی میزڵدان و هەرسکردنی خواردن بە خراپی، هەندێک جار قەبزی، لە هەندێک حاڵەتیشدا دڵ تێک هەڵچون.

جا لەبەر ئەم هۆیانەی باسکران، حیکمەتی پێغەمبەر ﷺ دەردەکەوێ، کە تەڵاق دانی حەرام کردوە لە کاتێک ئافرەتەکە لە ماوەی حەیز دابێ.

هەندێک لە زانایان دەڵێن لە ماوەی حەیزدا تەڵاق ناکەوێ و، هەندێکی تر بە حەرامیان داناوە.

لەبارەی سەرپێچی ژن بۆ مێردەکەی، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾ (النساء- ٣٤)، واتە: لەو کاتەی دەترسن ژنەکانتان بە قسەتان نەکەن و

سەرپێچیتان بکەن، یان چاویان بۆ غەیری خۆتان دەگێڕن[١]، ئەوا بە گوتەی خۆش‌و شیرین ئامۆژگاری یان بکەن‌و بە یادیان بخەنەوە، کە ئەو ژنانەی بە گوێی مێردەکانیان دەکەن پاداشتیان بۆ دەنوسرێ، ئەگینا خوای گەورە سزای بۆ داناون بە ئاگری دۆزەخ[٢]. گەر ئامۆژگاری سودی نەبو، با

١) پێویستە مێرد بە نەریتی ئافرەتان ئاگادار بێ، خۆڕاگر بێ لەسەر ئەو کارە ناشیرینانەی دەیکەن، لە شوێنکەوتنی ئارەزوەکانیان نەرم‌و سادە نەبێ، لە پاش ئەمە سور بێت لەسەر چاوپۆشینیان‌و چاکسازی‌یان بکات، مافەکانیان بەجێ بهێنێ‌و چاوپۆشی لە هەڵەو ڕەتەڵ بردنەکانیان بکات.. گەر گوناهێکی کرد لێی ببورێ، با باسی چاکەکانی خۆی لەسەر خێزانەکەی نەکات. پێویستە وەك ڕێگا چارە هەرگیز بیر لە تەڵاق نەکاتەوە، کە هێشتا هیچ شتێکی چارە نەکردوە.

٢) ئەم ئایەتە ئاماژەی بە ڕیز کردنی تەمبێ‌کردنی ئافرەت دەکات، گەر سەرپێچی مێردەکەی کرد، جا پیاوەکە یەکەم شت دەیکات ئامۆژگاری کردنیەتی‌و بیرهێنانەوەی فەرمانەکانی خوای گەورەو مژدەدان بە پاداشتی ئافرەتی گوێڕایەڵ‌و، بیرخستنەوەی بە سزای ئاگری دۆزەخ، جا گەر ئامۆژگاری بێ سود بو، ئەو کاتە مێرد پشتی تێ دەکات لە سەرجێیی کردندا، بەمەرجێ شوێنی خەوتنی جیا نەکاتەوەو نەچێ لە لایەکی تر بخەوێ، ئەمەش بۆ ئەوەیە تاکو ئافرەتی یاخی بو و سەرپێچیکەر بزانێ بە چەکی جوانی یەکەی، پیاو گرنگی پێ نادات گەر گوێڕایەڵ نەبێت، تاکو لە ڕەفتارەکەی بگەڕێتەوەو تەنازول لە فیزو خۆ بەگەورە زانینەکەی بکات، گەر ئەمەش سودی نەبو، ئەوکاتە بە ناچاری‌و بۆ سوربون لەسەر سەلامەتی خێزان، پەنا دەباتە بەر کەمێك لە لێدان. فەرمودەی پێغەمبەریش شێوەی ئەو لێدانە ڕون دەکاتەوە.

مێرد بۆی جائیز نی یە ئەم سزایانە پێکەوە پیادە بکات، بەڵکە دەبێ پلە بە پلە بێ. ئیبن کثیر گوتویەتی: فەرمایشتی خوای گەورە ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾ هەڕەشەیە بۆ پیاوان، گەر بەبێ هۆ ستەم لە ئافرەتان بکەن.

هەندێك کەس ڕەخنەی لەسەر نیزامی لێدان هەیە، بەڵام گەر تاقی بکاتەوە، ئەو کاتە دەزانێ لێدان لە چەند حاڵەتێکی دەگمەنی پەروەردەدا چەندە پێویستە، وەك حاڵەتی شازو گوێڕایەڵی نەکردن. پەروەردەناسان لە ڕۆژئاوا دوبارە گەڕانەوە بۆ داواکردنی پەنا بردنەبەر سیاسەتی سزادانی جەستەیی، لە حاڵەتەکانی شذوذی قوتابی دا، دیارە ئیسلامیش لەو ڕێگا چارەو تەمبێ کردنە، چاکەو گەورەیی خۆی ڕون‌و ئاشکرایە.

مێردەکە سەرجێیی لەگەڵ ژنەکەی نەکات. گەر بەوەش چاك نەبو، ئەوا لێیان بدەن. جا گەر ئافرەتەکان هاتنەوە بەر فەرمان، ئێوە بیانوی ئازاردانیان مەدۆزنەوە، خودا جێبەرزو زانایە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((ألا واستوصوا بالنساء خيراً، فإنما هُنَّ عوانٌ عندكم، ليس تملكون منهن شيئاً غير ذلك، إلا أن يأتين بفاحشة[١] مبينة، فإن فعلن فاهجروهن في المضاجع واضربوهن ضرباً غير مبرح[٢]، فإن أطعنكم فلا تبغوا عليهن سبيلاً))[٣].

دەفەرموێ: ((لا يجلد أحدكم امرأته جلد العبد، ثم يجامعها في آخر اليوم))!! وفي رواية ((أيعمد أحدكم فيجلد امرأته جلد العبد، فلعله يضاجعها في آخر يومه)) ثم وعظهم في ضحكهم من الضرطة فقال: ((لم يضحك أحدكم مما يفعل؟!))[٤].

با هیچ کەسێك لە ئێوە لە خێزانەکەی نەدا وەك لێدانی کۆیلە، پاشان لە شەودا لەگەڵی جوت ببێ[٥]. لە ڕیوایەتێکی تردا: هیچ کەسێك لە ئێوە

١) مەبەست لە (الفاحشة) هەندێك کاری خراپە، نەك زینا کردن.

٢) غير مبّرح، مانای کاریگەر نەبێو زۆر بە ئێش نەبێ.

٣) رواه الترمذي وحسنه.

٤) رواه البخاري ومسلم.

٥) لەوانەیە بە مێشکی هەندێك کەس دابێت، کە دژایەتییەك لە نێوان فەرمودەکانی پێشەوە هەبێ، کە هەندێکیان ڕێگا بەلێدان دەدەنو، هەندێکی تریش بە کەراهەتی دادەنێ. لە ڕاستیدا هیچ دژایەتی یەك نی یە، یاساکانی ئیسلام دژی یەك نین، وەك خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا﴾(النساء-٨٢). ئەگەر قورئان کاری کەسێکی تر بوایە، غەیرەز خودا، دیارە مەبەستی ناڕێكو دژ بە یەکتریان فرە تێدا پەیدا دەکرد.

دەیەوێ لە خێزانەکەی بدا وەك لێدانی کۆیلە، کە لەوانەیە بە شەو لەگـەڵی جوت ببێ؟!..

پاشان پێغەمبەر ﷺ لەمەڕ پێکەنینیان بە دەرچونی بایەك ئامۆژگاری کردن[1] و فەرموی: بۆچی هەر یەکێك لە ئێـوە بەمـە پێدەکـەنێ، کـە بـۆ خۆیشی ئەم بایەی لـێ دەردەچێ؟!

---

ئیسلام -ئەو دینە هۆشیارکەرەوەیە- گەر ڕێگەی بە پیاو داوە بە لێدانی ژنەکەی، ئەمە بۆ هەندێ حاڵەتی دەگمەنەو، دەبێ لێدانەکەش بە ئێش و ئازار نەبێت و کاریگەر نـەبێت، واتە لێدانێکی سوك و ڕەمزی بێت، ئەمەش بۆ ئەو کاتەیە، کـە لـە دوای ئامۆژگـاری و سەرجێیی نەکردن لەگەڵی داو، هیچ چارەیەکی تر نەبێ لەگەڵی بەکاربهێنرێت.

لە کۆنەوە پەندێکی عەرەبی هەیە دەڵێ: (آخر الدواء الكي)، هـەروەها ئامرازەکـانی سزادان و لێدان لە کۆتاییدا ئەنجام دەدرێ، نەك لەسەرەتاوە، جا چ بـۆ ئـافرەت بـێ یـان منداڵ.

فەرمودەکەی تر بە خراپە باسکردنی ئەو پیاوانەیە، کە لە یەکـەم کـات داو بـە هـۆی هۆیەکی پوچەوە پەلە دەکەن لە بەکارهێنانی لێدان، پاشـانیش ملکەچـی خێزانـەکانیان دەبن و سۆزیان لەگەڵ دا دەنوێنن..!

١) لەوانەیە هەندێك کەس لەم بابەتە سەرسوڕماو بن، بەڵام گەر زانی عـەرەب چەندە ڕقیان لەم کارە دەبێتەوە، ئەو کاتە سەرسوڕمانی نامێنێ، تەنانەت با ئـەو کەسـەی دەیکـات لەدەست خۆی نەبێت. جا پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی ئەمەی کرد، بۆ ئـەوەی کـابرا لەم هەڵوێستەدا دەرباز ببێ.

دەگێڕنەوە دەشتەکی یەك لەبەردەم کۆمەڵێك لـە هۆزەکـەی بایـەکی لـێ دەردەچـێ، ئەوانیش سوکایەتی پێ دەکەن و گاڵتەی پێ دەکەن، ئەمەش بوە مایەی قسەی خـەڵکی، تا وای لـێ هات ناچار ببێ گوندەکەی بۆ ماوەی چەند ساڵێك بـەجێ بهێڵـێ... پاشـان گەڕایەوە، وای زانی خەڵکەکە بایەکەی ئەویان لـە بـیر چـۆتەوە، جـا لـە ڕێگـا توشـی کۆمەڵێك بو قسەیان دەکرد، یەکێکیان گوتی: دەزانی لە کامە ڕۆژدا فلانە کەس بایەکی لـێ بەربو، ئەم داماوەش یەکسەر ترساو، بۆ هەتا هەتایە گوندەکەی بەجێ هێشت.

## لاســاری‌و بێگوێـی مـێرد !!

خوای گەورە دەفـەرموێ:﴿وَإِنِ امْـرَأَةٌ خَافَـتْ مِـن بَعْلِهَـا نُـشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلاَ جُنَـاْحَ عَلَيْهِمَـا أَن يُـصْلِحَا بَيْنَهُمَـا صُـلْحًا وَالـصُّلْحُ خَيْـرٌ وَأُحْضِرَتِ الأَنفُسُ الشُّحَّ وَإِن تُحْسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُـونَ خَبِيرًا﴾(النساء- ١٢٨)، واتە: ئەگەر ئافرەتێك ترسـا لـەوەی، مێردەكـەی لاساری بكات، یا پشتی تێبكات‌و گـوێی نـەداتێ، ئـەوە هـیچ لــێیان ناگیرێت‌و كارێكی چاكە، ئەگەر نێوان خۆیان چاك بكەن‌و ئاشت ببنەوەو بە تەواویی رێك بكەون، هەمیشە رێكەوتن‌و تەبایی شتێكی چاك‌و پەسـەندە، هەرچەندە خەڵكی بە سروشت حەزی بـە رەزیلـی یـەو تـەنها بەرژەوەنـدی خۆیان دێتە بەرچاو، ئەگەر چاكەكارو رەفتار جـوان بـن‌و خـاوەنی تـەقواو پارێزكار بن، ئەوە دڵنیـابن، خـوا هەمیـشەو بـەردەوام ئاگایـە بـە كـارو كردەوەتان.

دیارە پێشتر باسی یاخی بونی ژنـان كـردو، چارەسـەر ئیـسلامیەكانمان ڕونكردەوە، هەر لە ئامۆژگاری، پاشان سەرجێیی نـەكردن، پاشـان سـزای جەستەیی سوك‌و ڕەمزیی، وەك لێدان بە بالیف‌و سەرین لەسەر قەرەوێڵەدا، كە بە شێوەی دەستبازی دێتە بەرچاوو بەچاكبونەوە كۆتایی دێت.

با ئێستاش باسی لاساری‌و یاخی بونی مێرد دەكەین، كەواتە ژن دەبـێ چ بكات؟

گەر لاساری‌و یاخی بونەكە لە لایەن مێردەوە بێت، با ژن هەموو فێـڵ‌و

زیرەکی خۆی بەکاربێنێ‌و هۆیەکانی دورکەوتنەوەی مێردەکەی بە نەرم‌ونیانی‌و ژیرانە بتوێژێتەوەو، هەموو هۆیەکانی چاکبونەوەی چارەسەر بکات، هیچی تێدا نیە ژن کەمێك ئازاری دەرونی ببینێ، یان بە سینە فراوانیەوە ماڵ سەرف بکات بۆ چارەسەرکردنی ئەم حاڵەتە، چونکە کە هەوڵ‌و کۆشش دەدات، ئەوا بۆ بەرزترین ئەرك هەوڵ دەدات، کە دوای عیبادەتی خوا، ژن شانازی پێ‌دەکات.

دەکرێ ژن لە هەندێ حاڵەتی لاساری‌و یاخی بوونی مێردەکەی، بە گەڕاندنەوەی کەمێك لە مارەیی‌یەکەی، مێردەکەی ڕازی بکات.

## داوەری کـردن

خوای بالاّ دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا إِنْ يُرِيدَا إِصْلاَحًا يُوَفِّقِ اللهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا﴾(النساء- ٣٥).

کاتێك ژن‌ومێرد جیاوازیان کەوتە نێوانەوەو سەرپێچی پەیدا بوو، ڕێگە چارە کە ئیسلام دایناوە بۆ ئەوەی پیاو لەگەڵ ژنەکەی بەکاری بهێنێ، هەر لە ئامۆژگاریو سەرجێیی نەکردن‌و لێدان، پاشان گەر نەگەیشتن بەیەك‌و تەفاهوم سودی نەبو، ئەو کاتە، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: گەر لەوە ترسان ئەو جیاوازی یە بگاتە ڕادەی لێك جیابونەوە، ئەوا با ناوبژیکارێکی صالح لە خزمی پیاوەکەو، ناوبژیکارێکی صالح لە خزمی ژنەکە بانگ بکرێ، تا لەم جیاوازی‌یە بکۆڵنەوەو هەوڵدەن بیان گەیەنن بە یەك‌و بەرەزامەندی هەردو لا چاکیان بکەنەوە[1]. گەر ئەوان بیانەوێ پەیوەندی

١) دەبێ دادوەری کردن بە ئارەزوی هەر یەکێك لە ژن‌و مێردی جیاواز بە یەکتری یەوە بێت‌و، ناوبژیکارێکی چاك (صالح) بێت، جا ئەو دو ناوبژیکارە سەیری کێشەو جیاوازی یەکەیان دەکەن‌و هەوڵی بەیەك گەیشتنیان دەدەن، گەر ئەمە هاتە دی، ئەوا شتێکی زۆر چاکە، ئەگینا لە یەکیان جیا دەکەنەوە، گەر گوناهەکە گوناهی مێردەکە بو، ئەوا حوکمی گەڕانەوەی هەمو مارەیی یەکەی دەدەن، ئەگەر لەگەڵ نەفەقەدا نەیدابو.. ئەگەر گوناهەکە گوناهی ژنەکە بوو داوای جیابونەوەی کرد، ئەوا حوکمی گەڕانەوەی هەمو مارەیی یەکەی دەدەن بۆ مێردەکەی، وەك لە فەرمودەی (صحیح)دا هاتوە، کە کورتەکەی ئەمەیە: ئافرەتێك داوای جیابونەوەی لە مێردەکەی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد مارەیی یەکەی بۆ مێردەکەی بگەڕێنێتەوە.

نێوانیان چاك بێتەوە، خوای گەورە سەرکەوتویان دەکات، خوای گەورە زاناو ئاگادارە بە هەمو شتێك.

گومانی تێدا نی یە ئەم دادوەری کردنە، لە دوای سەرنەکەوتنو سەرنەگرتنی کۆششی ئامۆژگاریو سەرجێیی نەکردنو تەمبێ کردن، بەسەرپەرشتی دادرەس (قاضي) ئەنجام دەدرێ.

# کاتێ ژن و مێرد بۆ حوکمی خوا بانگ دەکرێن چ دەڵێن؟

١- دەڵێن سمعنا و أطعنا[1]: واتە: فەرمودەی خوامان بیستو گوێڕایەڵ

---

١) پێویستە ژن، یان مێرد لە گوتنی ئەم قسەیەدا پەلە بکەن، با لەسەر دڵانیش گران بێت، هەروەها با ژن بە مێردەکەشی بڵێ: (لە خوا بترسە) لە پەروەردگارت بترسە، یان (خوای گەورە بکە چاودێریی خۆت)، لە کتێبی (النهر)ی أبی حیان هاتوە، جولەکەیەك بە هارونە رەشیدی گوتوە: ئەی گەورەی بڕواداران لە خوا بترسە!

هارونە ڕەشیدیش یەکسەر لەسەر ولاغەکەی دادەبەزێو سوجدەی بۆ خوا دەباتو پێویستی یەکەی بەجێ دێنێ، جا پێیان گوت بۆ ئەمەت کرد؟ ئەویش گوتی: فەرمایشتی خوای گەورەم هاتەوە یاد ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ﴾ (البقرة-٢٠٦)، واتە: گەر پێی گوترا: لە خوا بترسە ئەوا یەکسەر دەمار دەیگرێو خۆی بە گەورە دەزانێو ئامۆژگاری قبول ناکات، جا ئەو کەسە ئاگری دۆزەخی بەسە ببێتە فەرش بۆی.

بەم بۆنەیەوە سەرنجی ژنو مێرد رادەکێشم، کە تەنها قبولکردنی حوکمی خوای گەورە چارەسەری کێشەو جیاوازی یەکانە، بۆ راگیرکردنو مانەوەی ژیانی هاوسەریەتیان، کە لە بەرژەوەندی هەموانو بەرژەوەندی منداڵەکانیشە.. وێڕای ئەمەش کاتێ تاوانبار دان بە تاوانەکەی، یان کەمتەرخەمی یەکەی دێنێو، بە پێی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەر، بە پەلە خۆی چاك دەکات، ئەوا بەبێ مشتو مڕو دەمەقاڵێ ئەو ڕێگەچارەیە کۆتایی بە گرفتەکان دێنێ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾ (النساء:٥٩)، واتە: هەرکاتێك لەسەر شتێ لەنێوخۆیاندا پێك نەهاتن، ئەگەر بڕواتان بە خوداو ڕۆژی قیامەت هەیە، کێشەی خۆتان حەوالەی خواو پێغەمبەری خودا بکەن، ئەم کارە بۆتان باشترەو ئاکامی چاکتری هەیە.

بە بۆنەی قسەکردن لەسەر سەرپێچی کردن، من ویژدانی ژنو مێرد دەهەژێنم، کە

خوای گەورە بکەنە چاودێر دەربارەی منداڵەکانیان، با هەر یەکەیان لە پێناو ئەو منداڵە بێگەردانە، لەسەر خۆپەرستی یەکەی دابەزیو قوربانی بە هەندێ لە بەرژەوەندی‌یەکانی بدات، کە بەهۆی ئەو سەرپێچی یە توشی گەورەترین هەژاندنی رەوشتیو عەقڵیو چارەنوس دەبن، چونکە لە ئاکامی ئەم سەرپێچی یە ناکۆکیو دژایەتیو لێك جیابونەوە دروست دەبێت.

ئێمە باسی ئەوەمان کردوە، کە شەیتان چەند زیاتر دڵخۆش دەبێ بە لێك هەڵوەشانەوەی کۆڵەگەی خێزان، چونکە ئەو هەڵوەشانەوەیە ڕوخانی ئایندەی منداڵو ئاییندەی هەمو نەتەوەیە، مەگەر ئەوەی، خوا رەحمی پێ بکات!

لە کۆتاییدا با دروشمی هەر یەك لە ژنو مێرد فەرمودەکەی پێغەمبەر بێ ﷺ: ((لا يفرك مؤمن مؤمنة إن كره منها خلقاً رضي منها آخر)) (رواه مسلم)، واتە: پیاوی بڕوادار رقی لە ئافرتی بڕوادار نەبێت، گەر رەوشتێکی نابەدڵی لێ بەدی کرد، خۆ لە رەوشتێکی تری رازی دەبێت.

بە باشی دەزانم باشترین شت، کە کۆتایی باسی سەرپێچیو دادوەری کردنی نێوان ژنو مێرد بە چەند فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ لەمەڕ هێمنیو لەسەرخۆیی لە کاروبارو نەرمی نواندن لە مامەڵەو رەوشت باشی، بێنین، کە هەر کەسێك کردەوەی پێ بکات، دەتوانێ گەورەترین گرفت بە ئاسانیو دڵپاکی یەوە چارەسەر بکات و، لە جێی ئیختیلافو ناکۆکی، ئاشتیو خۆشەویستی دابنێ.

قال النبي: ((إن فيك الخصلتين يحبهما الله: الحلم والأناءة))(رواه مسلم) واتە: دو خەسڵەتت تێدایە خوا خۆشی دەوێن، هێمنیو لەسەرخۆییو نەرمو نیانی.

((إن الله رفيق يحب الرفق، ويعطي على الرفق ما لا يعطي على العنف، وما لا يعطي على ما سواه))(رواه مسلم)، واتە: خوا نەرمو نیانەو نەرمو نیانی خۆش دەوێ، ئەو شتەی لەسەر نەرمو نیانی دەیبەخشێ، لەسەر توندوتیژی نایبەخشێ.

لە ڕیوایەتێکی تردا، پێغەمبەر بە خاتو عائیشەی فەرمو: ((عليكم بالرفق وإياك والعنف والفحش، إن الرفق لا يكون في شيءٍ إلا زانه، ولا ينزع من شيءٍ إلا شأنه))، واتە: پێویستە لەسەرتان نەرمو نیان بن، نەکەی توندوتیژیو کاری خراپ بکەی، چونکە نەرمو نیانی لە هەر شتێکدا هەبێت جوانی دەکات، لە هەر شتێکدا نەمێنێت ناشیرینی دەکات.

((اتق الله حيث ما كنت، واتبع السيئة الحسنة تمحها، وخالق الناس بخلق حسن))

بوین‌و فەرمانبەریمان کرد.

٢- هەروا دەڵێن سمعاً وطاعةً: گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەرین.

بۆیە دەڵێن (سمعنا وأطعنا)، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿**إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ**﴾(النور- ٥١)، واتە: بە ڕاستی قسەی بڕواداران ئەوەیە، کاتێك بانگ دەکرێن بۆ حوکمی خواو پێغەمبەر دەڵێن: گوێمان گرت‌و بەرفەرمانیش دەکەین. ئەوانە سەرفرازو سەرکەوتون.

---

(رواه أحمد وغيره وسنده صحيح)، واتە: لەهەر شوێنێك بوی لەخوا بترسە، چاکە بەدوای خراپەدا بێنە خراپەکە دەسڕێتەوە، بە ڕەوشتی جوان لەگەڵ خەڵك هەڵسوکەوت بکە.

((من يحرم الرفق يحرم الخير كله))، واتە: هەرکەسێ لە نەرم‌و نیانی بێبەش بێت، ئەوا لە هەمو چاکەیەك بێبەش بوە.

تۆ دەربارەی جنس پرسیار دەکەی و، ئێمەش وەڵام دەدەینەوە[١]:

**١/ پرسیار: چۆن دەکرێ هاوسەنگی جنسی نێوان ژن و مێرد دروست ببێت؟**

وەڵام: جێی داخە هەندێ پیاو(مێرد) تەنها قەناعەتیان بە چێژ وەرگرتنی خۆیان هەیە، چاوەڕوانی ئەوە ناکەن ژنەکەشیان چێژو خۆشی وەرگرێ، دیارە ئەمەش دەبێتە هۆی تورە بونی ژنەکەی بەهۆی کارە جنسی یەکەی و خۆویستیەکەی، چونکە ژنیش حەز دەکات وەك مێردەکەی چێژ وەرگرێ، وەك قاعیدەکی گشتیش، یەکەم جار پیاو زوتر لە ژن دەگاتە چێژو خۆشی و ئاوی دێتەوە، لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر پیاو هەوڵ بدات ئاوی زو نەیەتەوەو دوای بخات، گوتراویشە ژیانی ژن و مێردی سەرکەوتو لەسەر ئەوە وەستاوە، کە هەردوکیان بەیەکەوە بگەنە چێژو خۆشی... جا لەبەر ئەوەی پیاو هۆکاری موجەبی کاری جنسی یە، پێویستە لەسەری، کۆنترۆڵی خۆی و جوتبونەکەی بکات، بۆ ئەوەی هەردو لا بگەنە مەبەستی ئەو جوتبونە، چێژ وەرگرتنی یەکتریش هەردەم بۆ هەردو لا باشترە...

**٢/ پرسیار: ئەو دەرمانە پزیشکی یانە چین، کە ئەندامەکانی زاوزێ بەهێز دەکەن؟**

وەڵام: دەکرێ بگوترێ گرتنەبەری ڕێگای ناسروشتی بۆ بەهێزکردنی ئەندامەکانی زاوزێ، بە واتای بەکارهێنانی دەرمانەکانی پزیشکی و دەرمانە بەهێزکەرەکان، سودێکی کاتی یان هەیە، هەر دوای

١) ئەم باسەمان لە زۆر کتێب و گۆڤارە زانستیە جیاجیاکانەوە وەرگرتوە.

بەکارهێنانی، کاری خۆی دەکات، پاشان هێندەی پێ ناچێ مرۆڤ هەست بە کاردانەوەی ئەم دەرمانە دەکات‌و، وردە وردە هێزە جنسی یەکەی کز دەبێت.. ئێمە ئامۆژگاری گەنجان دەکەین، ئەم دەرمانە پزیشکی یانە بەکار نەهێنن، لەبەر ئەوەی هێزی جنسی بە شێوەیەکی کاتی بەهێز دەکات، پاشان هێندەی پێ ناچێ بەرەو نەمان دەچێت.

هەر کەسێك دەیەوێ هێزە جنسی یەکەی بەهێز بێت، با رێسا (قواعد)ە سروشتی یەکان پەیڕەو بکات، وەك وەرزش‌و پشودان‌و خۆراك، دورکەوتنەوە لە غەم‌و دڵەڕاوکێ‌و شتی تر، چونکە پشودانی دەرونی، لە گەورەترین هۆیەکانی چالاك کردنی هێزی جنسی یە، چونکە هەر هەڵەیەك لە بەکارهێنانی دەرمانە بە هێزکەرە دەستکردەکان ڕو بدات، زیانێکی زۆر لە وەرگرەکەی دەدات، کە تەنها زیان بە ئەندامەکانی زاوزێ ناگەیەنێ، بەڵکە کار لە تەندروستی گشتی مرۆڤ دەکات.

**٣/ پرسیار: لە دوای میزکردن شلەیەکی مەنی دێتە دەرەوە، ئایا هۆی ئەمە چی یە؟ ئایا کار دەکاتە سەر تەندروستی مرۆڤ.؟ چارەسەرەکەی چی یە؟**

وەڵام: گەر ئەو شلە مەنی یە کەم بو، ئەوا هیچ زیانی نی یە، کە هۆیەکەی بۆ فراوانی داقلیشان دەگەڕێتەوەو، لە ئاکامی قەبزی یەوە دروست دەبێت، کە پاڵ بە پێکهاتوەکانی شلەی مەنی کۆکراوە دەنێت، کە لە ئاکامی دەرنەچونی یەوە، لەگەڵ میز دێتە دەرەوە.

بەڵام گەر بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بەردەوام بو، ئەو دڵۆپە ئاوە زۆر هاتە دەرەوە، ئەوا ئەو حاڵەتە حاڵەتی نەخۆشی یەو، بەڵگەی کزی دەمارە لە گوشراوەکاندا، یان هەوکردنی پرۆستاتە، کە بە بەکارهێنانی

ڤیتامین (E) و ئۆكۆتین چارەسەر دەكرێت، چونكە بە بەردەوام دەرچونی ئەو دلۆپە مەنی یە كار لە تەندروستی گشتی دەكات.

لەسەر گەنج پێویستە هەردەم لە شتە وروژێنەرەكانی وەك ئەو شوێنە ئارەزوبازانەی، كە دیمەنی روت، یان دەستبازی جنسی، یان خوێندنەوەی چیرۆك‌و كتێبە جنس بزوێنەكان دور بكەوێتەوە.

پێویستە نەهێڵێ قەبز بێ، با ئەو شتە نەرم كەرەوانە بخوات، كە یاریدەدەری بەتاڵكردنی ڕیخۆڵە دەدات، هەروا بوار نەدان بە كۆبونەوەو بەسەر یەكدا كەوتنی ماددە پیسەكان لە كۆمدا، باش وایە ئەو ماددانەی ئاماژەمان بۆ كرد بەسەرپەرشتی پزیشك، بەكاربهێنرێت.

**٤/ پرسیار: مەنی چی یە؟**

وەڵام: بڕی ئەو مەنی یەی، كە پیاو لە یەك جار فڕێی دەدات لە نێوان (پێنج) تا (دە) سانتیمەتر موكەعەبە، یەك سانتیمەتری موكەعەبی ئەو شلەیە، نزیكەی شەست ملیۆن گیانداری تۆواوی (حیوان منوي) پێك دێت، گەر مەنی سروشتی لە ژێر میكرۆسكۆب بپشكنین، ئەوا ژمارەیەكی زۆری (حیوانات منویة)ی چالاكی بەهێزی پێكهاتو لە ماددەی (سبرمن)ی تێدایە.

دكتۆر (فون بوهل) لە زانكۆی لینینغراد بە دیاری خستوە، گەر ماددەی سبرمن بخرێتە جەستەی مرۆڤ، ئەوا سودی پێ دەبەخشێ، ئەمەش شوێنەواری بەهێزكەری جوتبون لە لای ئافرەتانمان بۆ راڤە دەكات، گومانی تێدا نی یە بەشێك لەو مەنی یە، ئەندامی زاوزێی ئافرەت دەیمژێ.

**٥/ پرسیار: هۆیەکانی کزی گیانداری تۆواوی چی یە؟**

وەڵام: گرنگترین هۆیەکانی کزی گیاندارە تۆواوی یەکان بریتی یە لە:

١- بێهێزی گشتی، کە جەستە دوچاری دەبێ.

٢- سەیلانی توند کە کار دەکاتە سەر جوتە هێلکەی گون.

٣- سەیلانی کەڤنار (مزمن).

٤- زهری.

٥- سیل.

٦- زیادەڕۆیی کردن لە جوتبون.

٧- هەندێ جۆری تەسکی، کە قەنەواتی تۆواوی دوچاری دەبێت.

٨- دەست پەڕ (العادة السرية).

٩- زۆری ترشەڵۆك لە گوڵێنك (مهبل)دا.

**٦/ پرسیار: پەیوەندی نێوان مەمكو کۆئەندامی زاوزێی ئافرەت چی یە؟**

وەڵام: پەیوەندی‌یەکانی نێوانیان زۆر توندو تۆڵە، تەنانەت هەر چ شتێك کار لە یەکێکیان بکات، کار لەوی تریش دەکات.. خوێندنەوەی چیرۆكو گێڕانەوە وروژێنەرەکانو تەماشاکردنی ئەو فلیمانەی وەسفی ئەو شتانەی وەك ئەو دەکات، کارێکی خراپ دەکاتە سەر کۆئەندامی زاوزێی ئافرەت، کە مەمکەکانیش دەگرێتەوە.. ئەرکی هەمو کچێکە سور بێ لەسەر پاراستنی مەمکەکانی، ئەویش بە دور کەوتنەوە لە هەر شتێك کە زیان بە کۆئەندامی زاوزێی دەگەیەنێ، هەروەها کۆئەندامی دەمارەکانیش.. فەرامۆش کردنی گرنگی دان بە مەمکەکان، کاریگەری یەکی زیانبەخش دەکاتە سەر هەردوکیانو، سەر ئەو جوانییەی پێویستە

تیایاندا هەبێت.. یاری پێ‌کردنی پیاو بە مەمکی خێزانەکەی‌و مژینی سەرەگۆیەکەی، کاریگەری‌یەکی گەورەی هەیە بۆ وروژاندنی جنسی ئافرەت.

**٧/ پرسیار: گوتەی پزیشکیی لەمەڕ کزی جنسی (الضعف الجنسي) چی‌یە، ئایا دەکرێ دەرمان ببێتە چارەسەر؟**

وەڵام: بێگومان دەرمان کاریگەری زۆری هەیە لە چارەسەر کردنی کزی جنسیدا، دەرمانی وا هەیە دەکرێ بۆ ئەم نەخۆشیە بەکار بهێنرێت، بەڵام هەندێ دەرمان هەیە نابێ بەکار بهێنرێت، مەگەر لە چەند حاڵەتێکی نەخۆشی فعلی‌دا، کە بەکار هێنانیشی پێویستە لە ژێر چاودێری‌و ڕێنمایی پزیشك بێت.

**٨/ پرسیار: هۆیەکانی کزی جنسی چی‌یە؟**

وەڵام: کزی جنسی دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك، گرنگترینیان بەکارهێنانی ئامێری زاوزێ بە زو جوتبون‌و زیادەڕۆیی کردن لە جوتبون، یان دەست پەڕ (العادة السرية) کردن، یان دابەزینی تەندروستی گشتی‌و ماندوکردنی جەستەیی‌و عەقڵی‌و هەندێ نەخۆشی، هەروەها دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەکی دەرونی (نەفسی).. سروشتیشە کزی جنسی، جگە لە هۆیەکانی، ببێتە مایەی بێ‌هێزکردنی ئامێری زاوزێ، یان کامڵ نەکردنی هێزی ئامێرەکە، لەبەر ئەوە وا دەبینین ماندوبون‌و کەم نوستن لە نێو ئەو هۆیانەیە، کە دەبێتە هۆی کزی جنسی، بە گوزارش (تعبیر)ێکی تر هەر چ شتێك ببێتە هۆی بێ‌هێزکردنی کۆئەندامی دەمار، ئەوا لە هۆیەکانی کزی جنسی دادەنرێت.

نەخۆشی‌یەکانی بڕبڕەی پشت کاریگەری‌یەکی ڕاستەوخۆو خراپی

لەسەر ئاميرى زاوزێ هەيە، بەڵكە دەبێتە مايەى گرفتێكى هەمودكى، نەخۆشى يەكانى زاوزێ- وەك زوهرى و سەيلان- كاريگەريان لە كزى جنسى هەيە.

هەروەها تێك چون و شلەژانى كۆئەندامى هەرس بە جۆرە جياجياكانى يەوە، دەبێتە هۆى كزى جنسى، بە پێچەوانەى ئەوەى لە نێو خەڵكيدا باوە، مادده بێهۆشكەرەكان بە هەمو جۆرەكانى يەوە، وەك حەشيشەو كۆكاين و ترياك، كار دەكاتە سەر كزى جنسى، چونكە ئەو هێزە جنسى يەى مرۆڤ، لە يەكەم كاتى خواردنى ئەو ماددە بێهۆشكەرانە، هەستى پێ دەكات، تەنها هێزێكى لەناو چوە، هێندەى پێ ناچێ بەرەو كزى وەردەگەڕێ و پێويست بە چارەسەر دەكات. بە دياريش كەوتوە جگەرە كێشان كاريگەرى لە كزكردنى جنسيدا هەيە، ئەم گوتەيەش بە شێوەيەكى گشتى لەسەر مەى (عرق) پيادە دەبێ.

لە هۆيەكانى كزى جنسى ئەوەيە، هەندێك لە پياوان لەكاتى جوتبوندا، بە مەبەستى سك پڕ نەبون، تۆيەكەى لە دەردوە دەهێننە دەردوە.

زانراويشە كە زۆر دەستپەڕكردن هۆيەكى سەرەكى يە لە هۆيەكانى كزى جنسى.

**٩/ پرسيار: پزيشكان دەڵێن (ترسان) هۆيەكە لە هۆيەكانى كزى جنسى! جا مەبەست لەم گوتەيە چى يە و ماناى چى يە؟**

وەڵام: ترس لە كزى جنسى، كاريگەرى خۆى هەيە، نكوڵى لێ ناكرێ، كە بە چەند ديارديەك و شێوەى جيا خۆى دەنوێنێ، وەك ترسان لە دوچار بون بە نەخۆشى يەكى پيس، ئەوەش لە حاڵەتى جوتبون لەگەڵ ئافرەتێكى گومان لێكراو، يان لەوانەيە ترسەكە لە ئاشكرابونى

کارەکەی بێت، گەر جوتبونەکە ناشەرعی بێت، یان ترسان لە سك پڕبونی ئافرەتەکە، جا بەهەر هۆیەك بێت نەیەوێ سکی پڕ ببێ، یان ترسان لە زیان گەیاندنو ئازاردانی ئافرەتەکە.

جاری وا هەیە بە خەیاڵی پیاودا دێ، کە ناتوانێ جوت ببێ، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ هەست کردنی مرۆڤ بە کەمو کورتی لە بێ‌هێزی پێکهاتەی ئامێری زاوزێیدا، یان بێ‌هێزی لە خودی توانا جنسی یەکەیدا، ئەوەی مایەی سەرنجە ئەوەیە، ترسان لە جوتبون، گەر سنورێکی بۆ دانەنرێ، دەبێتە حەقیقەتێکی واقیعی، گەورەترین هۆیەکانی هەستکردن بە ترس، ترسانە لە قەبارەی ئەندامی زاوزێ، کە زۆر جار هەست کردنەکە وەهمی یەو هیچ شوێنەوارێكو مەترسی یەکی نی یە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەزانی ئەو کەسە، بە شێوازی ئامێری زاوزێو فیسیۆلۆجیو زانیاری یەکانی تری پەیوەندیدار بەم مەبەستە.

**١٠/ پرسیار: شوێنەواری پیشە، یان حاڵەتی دەرونی لە دوچار بون بە کزی جنسی چی یە؟**

وەڵام: بێگومان ئەو پیشەیەی مرۆڤ کردویەتی یە پیشەی خۆی، هەروەها حاڵەتی دەرونیش لە مومارەسەکردنی کردەی جنسی دا، کاریگەریان هەیەو شوێنەواریان دیارەو نکوڵی ناکرێ لە توش بون بە کزی جنسی.

ئەو پیشانەی سروشتێکی وەستاویان هەیەو پێویستی بە جوڵە نی یەو کەم جوڵەن بۆ چەند سەعاتێکی درێژ خایەن، زیانێکی زۆر بە هێزی جنسی دەگەیەنێ، هەندێ پیشە پێویستی بە دەستاو دەستکردنی کانزاکان یان پێکهاتە ژەهراوی یەکان هەیە، بە هۆی کارتێکردنی لەسەر دەمارەکان، دەبێتە هۆی کزی جنسی.

بەڵام سەبارەت بە حاڵەتی دەرونی یەوە، کزی جنسی بە زۆری، یان لەنکاوە (طارئ) یان کاتی یە، کە هێندەی پێناچێ نامێنێ بە نەمانی، ئەو هۆیانەی دەبنە مایەی ئەو کزی یە.

شوێنەواری حاڵەتی دەرونی لە کزی جنسی دا، تەنها لەسەر بێهێزو لاوازو نەخۆشی کورت هەڵنەهاتوە، بەڵکە تەندروستە باشەکانیش دەگرێتەوە، زۆریش پێویست بە گرنگی پێدان ناکات، چونکە زۆر جار بۆ خۆی نامێنێ.

لەوانەیە هەمو پیاوێکی لەش ساغ بە هۆی چەند هۆیەکی دەرونی، دوچاری کزی یەکی جنسی کاتی ببێت؟ خەمو پەژاردو هەراسان بون بە هۆی گرفتەکانی کارکردن، یان ماڵو سامان یان غەیری ئەمە، لەوانەیە بۆ کاتێك ببێتە لەدەستدانی توانای زاوزێی پیاو. هەروەها گەر پیاو لە ژیانی ڕۆژانەیدا ڕوبەڕوی گرفتێك ببێت، کە بە زەحمەت چارەسەر بکرێتو عەقڵی سەرقاڵ بکات، ئەوا توانای زاوزێکردنی کز دەبێت، چونکە عەقڵ، تا سنورێك بەم گرفتەوە سەرقاڵ دەبێت، کە هەمو شتێك لەگەڵ خۆی فەرامۆش دەکات، بەڵکە زۆر جار مرۆڤ خواردنەکەشی فەرامۆش دەکاتو ئارەزوی خواردنی نامێنێ، گەر هەندێك کەس هەرگیز ئەم حاڵەتە لە ناکاو (طارئ)انەی کزی جنسی تاقی نەکردبێتەوە، مانای ئەوە ناگەیەنێ لە لایەنی جنسی یەوە لەو کەسانە بەهێزترن، کە ئەم حاڵەتانەیان بەسەردا هاتوە، بەڵکە ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە ئەو کەسانە لە ژیانیاندا توشی تەنگو چەڵەمەی دەرونی توندو ناخۆش نەبون، یان ئەو کەسانە لەو جۆرە کەسانە بن، کە گرنگی بە گرفتو ئاستەنگو زەحمەتەکانی ژیان نادەن.

**١١/ پرسيار: زۆر گوێمان لە (وەرزشی جنسی) دەبێت، كە بۆ چارەسەری كزی جنسی بەكار دەهێنرێت، بۆئەوەی فيكرەيەكمان لە ماهی يەتی يەوە هەبێ.. جا ئەو وەرزشە چی يەو چۆن ئەنجام دەدرێ؟**

وەڵام: وەرزشی جنسی لە چارەسەركردنی كزی جنسیو بەهێزكردنی ماوەی رەپ بون (الإنتصاب)، بۆ ماوەيەكی زۆر سودی هەيە، ئەم كردەيەش بەوە ئەنجام دەدرێ، كە پێش ئەنجامدانی كردەی جنسی (جوتبون)، پارچە قوماشێكو قاپێك سەهۆڵاو بێنی، پارچە قوماشەكە بە ئاوەكە تەڕ بكرێو بۆ چەند جارێك چوكی پێ بسڕێتەوە، جا گەر ئەم وەرزشە بۆ چەند جارێك دوبارە كرايەوە، ئەو كزی جنسی يە نامێنێو هێزە جنسی يەكەی پياو بە كاملی دەگەڕێتەوە.

**١٢/ پرسيار: ئايا بە خەياڵ داهاتن (الإيحاء) كاريگەری لە كزی جنسی دا هەيە؟**

وەڵام: بەڵێ! گەر مرۆڤ وا بە خەياڵی دابێ، يان هاوڕێكانی، يان كەس‌وكاری وای تێ بگەيەنن، كە جنسی كزە، ئەوا گەر ويستو كەسايەتی يەكەی بێهێز بێت، بە ڕاستی دوچاری ئەو كزی يە دەبێت.

بە پێچەوانەشەوە، گەر بە خەياڵی دابێت جنسی بە هێزەو دەتوانێ جوت ببێو، لە دەرونی خۆيشی دا ئەمە دوبارە بكاتەوەو، گوێ نەداتە قسەی خەڵكی، بە تايبەتی شەوی ژن گواستنەوە گەر بە زاوا نەببو، ئەوا توشی كزی جنسی نابێ.

جا متمانە بە خۆكردن، هۆيەكی گەورەيە لە هۆيەكانی بەتواناييو سەركەوتن، نەك تەنها لە هاوسەرگرتن (الزواج)، بەڵكە لە هەمو ژياندا،

لە فەرمودەی (صحیح)دا هاتوە: ((**إنما العلم بالتعلم، والحلم بالتحلم، ومن يتحر الخير يعطه، ومن يتق الشر يوقه!!**)).

ئەمەو نابێ پاڕانەوەو بەردەوامی داواکردنی هێزو لێبوردنو لەش ساغی، لە خوای گەورە لەبیر بکرێ.

**١٣/ پرسیار: هەندێ کەس سکالای زو ئاو هاتنەوە دەکەن، هۆیەکەی چی یە؟**

وەڵام: ماوەی جوتبون لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی تر جیاوازی هەیە، بە گوێرەی جیاوازی ئەو کەسە، هەندێ کەس توانای درێژ خایەنی ماوەی جوتبونی دراوەتێ، کە ئارەزوەکانی خێزانەکەی تێر دەکات، هەندێکی تریش سکالای خێرا ئاو هاتنەوە دەکەن پێش جوتبون بە چەند ساتێك، کە ئەمەش دەبێتە هۆی خەمو پەژارەو دڵ گرانی بۆ پیاوو، تەنگیو وەڕسی بۆ ئافرەتەکە، جا گەر ئەم کارە چەند جار لە لای پیاو دوبارە بێتەوە، ئەوا لە بنەڕەتدا جۆرێك لە ترسانی بۆ دروست دەبێت، کە بیەوێ جوت ببێ، هەر لەگەڵ ئەمەشدا شتێکی تر ڕودەدات، کە بریتی یە لە رەپ نەبون (عدم الإنتصاب)، کە کار دەکاتە حاڵەتی کزی جنسی، کە پێویستی بە چارەسەرێکی تر دەکات.

وا دەبێ خێرا هاتنەوەی مەنی لە پێش جوتبون، هۆیەکەی بگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەکی جیا جیا، کە پیاو ژیانە جنسی یەکەی بە حاڵەتی خێرا هاتنەوەی مەنی دەست پێ دەکات، چونکە لەو کاتەدا لە دەرونی خۆیدا بڕیاری داوە، دەبێ کردە جنسی یەکە ئەنجام بدات، کە لەم مەسەلەیەدا شارەزایی یەکی پێشینەی نی یە.. جا فەحس کردنی حاڵەتەکانی خێرا هاتنەوەی مەنی، پێویستی یەکی زۆری بە لێکۆڵینەوە هەیە، بەر لە

گەیشتن بە بڕیاردانی چارەسەرێکی دیاریکراو.

خێرا هاتنەوەی ئاو بە ماندوبونی ئەعساب، دوای یاری و دەست بازی یەکی درێژ خایەن بەستراوەتەوە، یان هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زۆر هەستیاری بۆڕی میزکردن، ئەم زۆر هەستیاریە، بە تەنها دەتوانێ پیاو دوچاری کاردانەوەیەکی خێرا بکات، کە ئاکامەکەشی خێرا هاتنەوەی مەنی دەبێ. ئا بەم شێوەیە جۆراوجۆری هۆیەکانی خێرا هاتنەوەی مەنی، جۆراوجۆری ڕێگاچارە دەخوازێ.

**١٤/ پرسیار: چارەسەری ئاو زوو هاتنەوە بەر لە جوتبون چی یە؟**

وەڵام: یەکەم هەنگاوی چارەسەرکردن لەسەر دەست نیشان کردنی هۆی نەخۆشی یەکەوە دەوەستێ، جا هەر کاتێك هۆیەکە زانرا، ئەو کاتە چارەسەرکردنەکە ئاسان دەبێت، ئەمەش بە هۆی بەگوێ کردنی ڕێنماییەکانی پزیشکەوە دێتە دی.

**١٥/ پرسیار: باشترین کاتەکانی جوتبون چ کاتێکە؟**

وەڵام: باشترین کاتەکانی جوتبون ئەو کاتەیە، کە مرۆڤ جەستەو دەرونی ئاسودە (مرتاح) بێت، ئەم ئاسودەیی یەش بە زۆری دوای نوێژی بەیانیان دەستەبەر دەکرێ، کە ژن و مێرد لەو کاتەدا بە جەستەو دەرونەوە ئاسودەن و، هەلی خەوتنەوەشیان بۆ دەرەخسێ.

**١٦/ پرسیار: باشترین بار(وضع)ی جوتبون چ بارێکە؟**

وەڵام: هەمو جوتبونێك پێویستی بە فیکر هێمنی و خاوی لەش هەیە، هەر جوتبونێك لە بارودۆخێکی شەکەت، یان لە باری ماندویەتی یەوە ئەنجام بدرێ، ئەوا جەستەو ئەعساب ماندو دەکات.

هەندێ کەس بە ڕاوەستانەوە لەگەڵ خێزانیان جوت دەبن، کە ئەمەش

زۆر زیان‌و ئازار به‌ ته‌ندروستی ده‌گه‌یه‌نێ، جوتبون دوای نان خواردنیش هه‌مان زیان ده‌گه‌یه‌نێ، باشترین شێوازی جوتبون پاڵکه‌وتنی ئافره‌ته‌، ده‌شکرێ هه‌ندێ جار به‌ پێچه‌وانه‌وه‌ بکرێت.

**١٧/ پرسیار: بۆچی هه‌ندێ ئافره‌ت به‌ جوتبون ئازاری پێ ده‌گات؟**

وه‌لام: ئه‌و ئازاره‌ی، یان ئه‌و ته‌نگی یه‌ی ژن له‌ کاتی جوتبون هه‌ستی پێ ده‌کات، ده‌لاله‌ت له‌ هه‌بونی کۆسپێك، یان هه‌وکردنی بۆڕی زاوزێ ده‌کات، ئه‌گه‌ر ئه‌و ئازارو ته‌نگی یه‌ له‌ ئه‌نجامی ڕه‌فتاری توندی مێرده‌که‌ی نه‌بێت له‌ کاتی جوتبوندا، یان نه‌زانینی پێ‌ی... وه‌ك قاعیده‌یه‌کی گشتیش هۆی ئازار، یان ته‌نگی نه‌زۆکی یه‌... فه‌حسی پزیشکی ئه‌وه‌ ده‌گه‌یه‌نێ" ئه‌و نه‌زۆکی یه‌ زۆر جار له‌گه‌ڵ جوتبونێکی به‌ ئازاره‌وه‌یه‌، ئاکامی خودی کرده‌ جنسی یه‌که‌ نی یه‌، به‌ڵکه‌ له‌ ئاکامی ئه‌و هۆکاره‌یه‌، که‌ ده‌بێته‌ مایه‌ی هه‌ست کردن به‌ ئازار له‌ کاتی جوتبوندا. ئه‌مه‌ش بۆ ته‌سکی فه‌تحه‌ی منداڵدان، یان زۆر هه‌ستیاری یه‌تی، یان هه‌وکردنی هه‌ردو شفره‌ ده‌گرێته‌وه‌، یان هه‌بونی کولك (قرحة)ی زهری یان فتق، یان هه‌بونی نه‌خۆشی یه‌ك له‌ میزڵدان، یان کۆم دا.

**١٨/ پرسیار: هۆی به‌ره‌به‌ره‌کانێ یه‌کانی ژن چی یه‌؟**

وه‌لام: هۆیه‌کانی به‌ره‌به‌ره‌کانێ‌ی ژن چه‌ند شتێکن، گرنگترینیان هه‌ڵنه‌ستانی پیاوه‌ به‌ ئه‌رکه‌ جنسی یه‌که‌ی له‌ ده‌ستبازی کردن‌و یاری‌و شتی تر، به‌م بۆنه‌یه‌وه‌ ئه‌م نوکته‌ خۆشه‌ باس ده‌که‌ین:

پیاوێك هه‌ستی به‌ به‌ره‌به‌ره‌کانێ‌ی خێزانه‌که‌ی‌و فه‌رامۆشکردنی کاروباری ماڵه‌وه‌ی ده‌کرد، جا پیاوه‌که‌ له‌ پارچه‌ کارتۆنێك ئه‌م په‌نده‌ی

نوسیو لە ژووری چێشتخانەی هەڵواسی: (کارەکەت بە چاکی بکە، هیواکەت دێتە دی)، جا ژنەکە ئەو پارچە کارتۆنەی هێناو لەسەر قەرەوێڵەی نوستنی هەڵواسی.

**١٩/ پرسیار: ئامۆژگاریت بۆ پیاوان چی یە، بۆ ئەوەی خۆشەویستی پتەویان و گەنجێتیان لە هێلانەی هاوسەریەتی بپارێزن؟**

وەڵام: پێویستە لەسەر پیاو بەپێی توانا ئەم ئامۆژگاری یانە پیادە بکات:

١- گوڵێکی سوری بۆ ئامادە بکە (بۆ تێبینی یەك گوڵ لە کۆمەڵە گوڵێك سەرنج راکێشەر ترو شاعیری ترە).

٢- هەندێ جار لەسەر جێ، نانی بەیانی لەگەڵ بخۆ.

٣- یادگاری یەکانی ڕۆژانی خاڵیو بێکاری، وەك مانگی هەنگوین لە یادت بپارێزە.

٤- لە شوێنی کارەکەت تەلەفۆنی بۆ بکە، پێی بڵێ بیر لە تۆ دەکەمەوەو بیرت دەکەم.

٥- لە ڕۆژانی پشودا لەگەڵ خۆتی ببە بۆ گەشتێکی خاڵی لە خەڵك.

٦- تەسجیلێکی بۆ ئامادە بکە بۆ یادگاری یە بە نرخەکانتان.

٧- هەردەم باسی هیواو ئاواتەکانتی بۆ بکە، بەشداری بکە لە بیرۆکەو هەستەکانت.

٨- سوربەلەسەرکرێنی ئەو بۆنەی، کە خۆی حەزی لێیەتی بە گوتەیەکی شیرین پێی بڵێ تەنها لە ماڵەوە بەکاری بهێنێ نەك بۆ دەرەوە.

٩- هەردەم کەل و پەلەکانت بە ڕێكو پێکی دابنێ، جلەکانت ڕێك بخەو بە شوێنی خۆی هەڵواسە، گۆرەویو پێڵاوەکانت لە خوارەوەی خێزانو لە ژێر کورسی فڕێ مەدە.

١٠- هیچ شتێك لەماڵەوە فەرامۆش مەکە، کە پێویستی بە چاك کردنەوە، یان گۆڕینەوە هەبێت، هەر چەندە بچوکیش بێت.
١١- هەردەم لەگەڵی بچۆ بۆ کڕینی شتومەکەکانی.
١٢- هەردەم باسی ئەندازەی دڵخۆشیو گەورەییو شانازیتی بۆ بکە.
١٣- گەر هەر چ یاری یەکی شەرعیتان کرد، لێگەڕێ با بۆ چەند جارێك ئەو لێت بباتەوە.
١٤- هەردەم بە ئیعجابەوە تەماشای بکە، پیا هەڵدان بە جلو بەرگیو قژ شانە کردنیو شۆخو شەنگی ئەوت لە بیر نەچێ.
١٥- پێش دەرچونت لە ماڵەوەو، گەڕانەوەت بۆ ماڵەوە بە گەرمی ماچی بکە.
١٦- ئارەزو (هیوایە)تێکی نوێو هاوبەشو خۆشی لەگەڵیدا دەست پێ بکە! باشترینیشی خوێندنەوەی بە سودە.
١٧- هەر چ شتێکت دەزانی دڵخۆشی دەکاو عاتیفەو هەستە شەرعی یەکانی دەوروژێنێ، ئەوەش بخە ناو ئەو لیستەیەوە.

**٢٠/ پرسیار: چ ئافرەتێك لە هەمو ئافرەتان جوانترە ؟**

وەڵام: جوانی نمونەی وەکو بەزەیی خوای گەورە وایە، کە بەسەر روی زەوی دابەش کراوە، جوانی جوانی گیانو پەروەردەو رەوشتە، هەمو ئافرەتێك بەشی لە جوانی هەیە، بە مەرجێ بەدیاری بخاتو چاودێری بکاتو پارێزگاری لەسەر بکات، بەڵام جوانی وێنەو جوانی جەستە، سەرەڕای خێرایی کارتێکردنەکەی، ناگاتە پلەی جوانی گیانی (الروحي) لە بەهاو بەرزیو مانەوەیدا.

**٢١/ پرسـیار: چ پیاوێـك بە دڵـی ئـافرەتـە ؟**

وەڵام: نزیکترین پیاو لە دڵی ئافرەت ئەو پیاوەیە، کە هەڵس‌وکەوتی لەگەڵ باش بێ، بەمەرجێ ئەو مامەڵەیە دروست کراو نەبێت، بەڵکە لە ناخـەوە سەرچاوەی گرتبێ. هەڵس‌وکـەوت لێـرەدا مانـای رێـزو زەوق‌و بەخـشین‌و رەوشت‌و موجامەلەی خۆشە، کە هەمو ئەمانە لە پارێزگاری کەسـایەتی پیاوە، چونکە هیچ شتێك لە لای ئافرەت وەك پیـاوی بـێ شەخـسییەت، یان شەخسییەت کز ناشیرین تر نی‌یە!

**٢٢/ پرسیار: چ شتێك پێویستە بۆ ئەوەی ببێتە هۆی دەرنەچونی پیاو لە ماڵەوە بۆ چایخانەکان‌و شوێنـی تر؟**

وەڵام: پیاو لە ماڵەوە پێویستی بە خۆشەویـستی‌و سـۆزو حـەنان‌و پـشوو هێمنی‌و جێگیری یەکی زۆرو جوانی‌و رازاوەیـی‌نوێکـار هەیـە، جـا گـەر خێزانەکەی هـەمو ئەمانـەی بـۆ فەراهـەم نـەکات، ئـەوا ئەمـە پـاڵ بـە مێردەکەیەوە دەنێت، بۆ راکردن‌لە ماڵەوەو روکردنە چـایخانەکان‌و شـوێنی تر، گەر شەخسی یەتی کز بێـت‌و بـەهرەکانی سـادە بێـت. چـایخانەو هـاو وێنەی لە دوژمنە هەرە سەختەکانی خێزانە..[١]

**٢٣/ پرسیار: گرفتـەکانی شـەوی ژن گواسـتنـەوە (ليلـة الزفـاف) چی یـە؟**

وەڵام: وا دەبێ پیاو لە شەوی گواستنەوەدا دوچـاری خاوبونـەوەی ئـامێری نێرینەی دەبێت، کە پێی دەڵێن خاوبونەوەی شەوی یەکـەم، ئەمـە کـاتی

---

١) چەند ساڵێك بەر لە ئێستا وتارێکم بڵاوکردەوە لەژێر ناونیشانی (المقهى نادي الشيطان) (چایخانە یانەی شەیتانە).

یەو بە نەمانی هۆیەکانی لەنێو دەچێ، جا هۆیەکە، یان لە ئاکامی ترسی سەرنەکەوتنە، یان شارەزا نەبونیەتی لەم بارەوە، یان بە هۆی نەبونی متمانە بە خۆیەتی، بەڵام ئەمە بە دەگمەن نەبێ ڕو نادات، بەتایبەتی گەر ژنو مێرد خۆشەویستی یەکتری بن، ئەو کاتە هەرگیز ئەمە ڕو نادات.

خۆشەویستی مسۆگەری بەخشینی متمانە بەخۆبونی پیاوە، هەروەها هاوبەشی ژن بۆ مێردەکەیو یاریدەدانی لەم شەوەدا مسۆگەری ئەم متمانەیە... کە نابێ ماندو بێ.

پاش ئەمە قۆناغی سکاڵا کردن دێتە پێشەوە، کە لە ئاکامی هەندێ نیشانەی لە نکاوەوە دروست دەبێت، وەك بە پەلە فیچقە کردنی مەنی (سرعة القذف)، ئەمەش لە ئاکامی مێشك شڵەژانی پیاوەوەیە، یان هەبونی هەستیاری یەکی زۆری ئامێری نێرینەیی یە. بە تاقیکردنەوەو مومارەسەکردن دەکرێ ئەم دیاردیە نەهێلرێ.

## ٢٤/ پرسیار: کاریگەری یەکانی جگەرە لەسەر جوتە هێلکەی گون چی یە؟

وەڵام: جگەرە دەبێتە هۆی کزی جنسیو، ئامێری نێرینە بێهێز دەکات، جگەرەکێشانی درێژ خایەن، گون ژەهراوی دەکاتو بەرهەمی تۆو(نطفة) کەم دەکات، بەڵکە تۆوی زۆربەی جگەرەکێشەکان مردوە، چونکە توتن لە ترشی (تسیان هیدریك) پێکهاتوە، دەریشکەوتوە ئەم ترشە تۆوی پیاو ژەهراوی دەکات، بەم هۆیەشەوە بینراوە رێژەی نەزۆکی لەپیاوە جگەرەکێشەکان زۆرترە لە جگەرە نەکێشەکان.

**٢٥/ پرسیار: ئایا جگەرەکێشان کار دەکاتە سەر هێلکە دانی ئافرەت ؟**

وەڵام: هێلکەدانی ئافرەت بریتی‌یە لە گلاندێکی بچوکی تێکەڵ، کە لە خوارەوەی سك دایە لە لای منداڵ دان، هێلکەدان ئەو هێلکانە بەرهەم دەهێنێ، کە لەگەڵ تۆوی پیاو یەك دەگرێ. لە یەکگرتنی ئەو دو تۆخمە (هێلکەو تۆو)دا، خوای گەورە مرۆڤێك دروست دەکات.

بەم دوایی‌یە دەرکەوت نیکۆتین دەبێتە هۆی تێك دانێکی فراوان لەم ماوە زۆرەدا، ئەم تێك دانە لە زۆر حاڵەت دا دەبێتە مایەی نەزۆکی.

دکتۆر (هۆفستاتر) شارەزای ئەم کارە گوتویەتی: ئەو ئافرەتانەی لە کارخانەکانی توتن کار دەکەن بە کەمی منداڵیان دەبێ، گەر منداڵیشیان بو، منداڵەکانیان بێ‌هێزو لاواز دەردەچن[١].

**٢٦/ پرسیار: دوای لادانی پەردەی کچێنی، ئامۆژگاریت بۆ پیاو (مێرد) چی‌یە؟**

وەڵام: دوای لادانی پەردەی کچێنی، گەر جوتبونەکە ئازارو گرفتی لەگەڵ بو، پێویستە پیاوەکە جوتبون دوا بخات، بۆ ماوەی دو یان سێ ڕۆژ، پێویستە جوتبون لە مانگی یەکەمی هاوسەرگرتن (الزواج)، موتعەو خۆشی بێ بۆ ژنو مێرد پێکەوە، بۆ ئەوەی ژنەکە لە جوتبون وەڕس نەبێ، بەڵکە لە مانگەکانی یەکەمیشدا، لەوانەیە ئەندامی زاوزێی ژنەکە نەگەیشتبێتە ڕادەی وروژاندنی جنسی سروشتی، لەبەر ئەوە لەسەر مێرد پێویستە جوتبون کەم بکاتەوە، مەگەر هەستی بە ئارەزوی

---

١) (لە -رسالة طرق التدخين وأضراره- بە کورتکراوەیی وەرگیراوە).

هاوسەرەکەی کرد بە بەشداری کردنی، بە مانایەکی تر پێویستە مێرد واز لە خۆویستی خۆی بهێنێ، با هاوسەرەکەی هەست بەوە بکات، کە ڕێز لە هەستی دەگرێ، تا ئەویش ڕێزی بگرێ... با مێرد دودڵ نەبێ گەر لە سەرەتاوە ساردی یەکی لە هاوسەرەکەی بینی!

## ٢٧/ پرسیار: ئایا هیچ گردەیەك هەیە کە نەهێڵێ پیاو ئاوی زو بێتەوە ؟

وەلام: لە چەند بۆنەیەکدا ئەمەم باسکردوە، دەکرێ ئەمە زیاد بکەین:

یەکەم: هەر کاتێك هەستی بە نزیك بونەوەی هاتنەوەی مەنی کرد، با یەکسەر بیرو هۆشی لای جوتبون لابدات، بەوەی کە لە سەدەوە بژمێرێ بە ئاوەژویی، واتە لە ١٠٠-٩٩-٩٨-٩٧-٩٦-... هتد.، لەسەر ژن پێویستە لەمەدا بە باشی ڕۆڵی خۆی ببینێو ئاگادار بێت لە ئاراستە نەکردنی گوتەیەکی ڕەخنەگرانە بۆ مێردەکەی، نەبادا ئەم ڕەخنەیە ببێتە برینێکی قوڵ لە دڵیدا.

دوەم: مێرد دەتوانێ لە کاتی جوتبون دا شتێك بخاتە سەر ئامێرەکەی، تاوەکو هەستیاریەکەی کەم بکاتەوەو، خێرایی فیچقەکردنی مەنی یەکەی دوا بخات.

هەروا دەکرێ هەندێ هەتوان (مرهم)ی سڕکە بەکاربهێنرێ، کە دەماری چوك (ذکر) سڕ دەکاتو هەستیاریی سەرەگۆی زەکەر کەم دەکات وەك هەتوانی (زایلۆکاین).

زۆر پیاو توانیویانە بە بەکارهێنانی ئەمجۆرە هەتوانانە ئەنجامێکی زۆرباش وەدەست بهێنن، بەلام هەندێکیش ئەنجامی باشیان وددەست نەهێناوە.

گرنگ لەم شێوازە ئەوەیە، کە بەر لە ماوەیەکی دیاریکراو لە جوتبـون، هەتوانەکە بەکاردەهێنرێ، بۆ ئەوەی دەمارەکان، کاتی پێویست وەرگـرن بۆ سـڕکردنی، هـەروا پێویـستە هەتوانەکـە بـە زویـی لانـەبرێ، نـەبادا کاریگەریەکەی نەمێنێ.

واتـە ماوەیـەك بـەر لـە جوتبـون، هەتوانەکـە بـە سـەرەگۆی زەکـەر بـمێنێتەوە.

**٢٨/ پرسـیار: ئایـا ڕاسـتە ئـارەزوی جنـسی لـە لای ژن و پیـاو لـە دوای تەمـەنی چـل ساڵی نـامێنـێ؟**

وەڵام: کەسێك بیروباوەڕی وابێ، ئەوە شتێکی هەڵەیە، چونکە ئەو کەسـەی تەندروستی یەکی باشی هەیەو هیچ نەخۆشـی یـەکی ئەنـدامی (عـضوي) نییە، دەتوانێ تا دوای تەمەنی حەفتا ساڵی مومارەسەی جنسی بکـات. زۆربەی حاڵەتەکانی هەسـت کـردن بـە کـزی جنـسی لـە قۆنـاغی ئـەم تەمەنەدا، دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەکی دەرونی، یان بۆ هەوڵـدانی پیـاو بۆ دەرخستنی پیاوەتی یەکەی لە ڕێگای جنسەوە، ئاکامیش ئـەوە دەبـێ کە جوتبونەکە بە ڕێگای کـار پێکردنـەوە دەبێـتو، زاتیـەتی خـۆی لـە دەست دەدات، کە ئەساسو زەروری یە بۆ سەرکەوتنی. جا لێرەدا پیاو لـە گەیشتن بە ئامانجەکەی هەرەس دێنێ، ئەوەی بە بیریدا دێ ئەوەیە، کە بـە هۆی تەمەنو پیری یەوە توانا جنسی یەکـەی نـەماوە. ڕاسـتە بەساڵاچـون ئـارەزوی جنـسی کـەم دەکـات، بـەڵام توانـای ڕەپ بـون وەك خـۆی دەمێنێتەوە، بەڵکە توانای تەحەکوم پێکردنەکـەی بـە درێـژایی مـاوەی جوتبونەکە زیاد دەکـات. ژنـیش بـە هـۆی زۆر پێکـەوە ژیـانی لەگـەڵ مێردەکەی، توانای زۆرتر دەبێ، کە خۆی لەگـەڵ مێردەکـەی بگونجێنـێ،

بەمەش دەتوانێ بە ماوەیەکی کەم بگاتە چێژی جنسی.

هەر لەو هەڵانە ئەوەیە، کە بیروباوەڕ وابێ تەمەنی نائومێدی (سن الیأس)، مانای کۆتایی چالاکی جنسی ئافرەتە، چونکە زۆربەی ئەو کارتێکردنانەی لەگەڵ وەستانی حەیز دەکەوێ، ئەساسەکەی نەفسی یە.

داو دەرمانی چالاککەری جنسیش، زۆربەی رۆڵی خۆی لە رێی کارتێکردنی نەفسی یەوە دەبینێ و، هیچ سودێکی حەقیقی نی یە، مەگەر لە چەند حاڵەتێکی دەگمەندا نەبێ، کە بریتی یە لە حاڵەتەکانی کەمی رژێنی هۆرمۆنی نێرینەیی لە گون دا.

بەڵام گەر ژن و مێرد ئارەزوی ئەنجامدانی کاری جنسی یان هەبو، بە واتای ئامادەیی جوتبونیان تێدا هەبێ، ئەوا ئەمە مسۆگەری گونجاندنی جنسی یە، جا تەمەنی ژن و مێرد هەر چەندێك بێت.

**٢٩/ پرسیار: ئایا دڵەڕاوکێ، پەیوەندی بە کزی جنسی یەوە هەیە؟**

وەڵام: بەڵێ، زۆر حاڵەتی کزی جنسی هەیە، بە تایبەتی لای پیاو، هۆیەکەی دڵەڕاوکێ(قلق)یە. ئەمەش مانای ئەوە نی یە ئەو دڵەڕاوکێیە لە ساتێکەوە پەیدا بوە، بەڵکەلە ئاکامی بارودۆخ و تێکەڵ بونی ڕاستی و ناڕاستی نوێ و کۆن دروست دەبێت... هەندێکی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی یەکەمی منداڵی، ئەو کاتەی منداڵ یەکەم زانیاری لەبارەی جنسەوە وەردەگرێ... ئەمەش مانای ئەوە نی یە دەرباز بون لە دڵەڕاوکێ زەحمەت و مەحاڵ بێ، بەڵکە بە دەستنیشانکردنی هۆیە حەقیقی یەکەی دەکرێ لێی دەرباز ببی.

**٣٠/ پرسیار: ئایا خواردەمەنی پەیوەندی بە توانای جنسی یەوە هەیە؟**

وەڵام: پەیوەندی خواردەمەنی بە پێکهاتەی جەستەی مرۆڤ، پەیوەندی یەکی لێك نزیکی تەواویان هەیە، تەنها بە تەماشاکردنی جەستەی هەر پیاوێك، پزیشك دەتوانێ بزانێ توانای جنسی ئەم پیاوە چەندە، بەتایبەتی ئەگەر شێوازی نان خواردنەکەی بزانێ.

جا پیاو دەتوانێ گۆڕانێکی زۆر بەسەر توانا جنسی یەکەی بهێنێ، ئەویش بە گۆڕینی چۆنیەتی شێوازی نان خواردنەکەی، لێرەدا مەبەست ئەوە نی یە، کە کەمێکی تری خواردەمەنی توانای زیاتر دەکات، بەڵکو مەبەست لەمە ئامادەکردنی جۆرە خواردنێکی دیاریکراوەو بە ئارەزویەکی تایبەتی یەوە بیخوات، لەو نان خواردنانەش گەر خۆراکی ڕۆنی و نیشاستەیی لەگەڵ بێ، بێگومان کاریگەری یەکی جەوهەری دەکاتە سەر جەستەی پیاو...

**٣١/ پرسیار: ئایا پیاوان لە توانای جنسی یەکسانن؟**

وەڵام: پیاوان هەموی لە توانای جنسی دا یەکسان نین، پیاوانی جنسی سەرکەوتو ئەوانەن، کە تەندروستی یەکی باشیان هەیەو، دەتوانن تەحەکوم بە غەریزەکانیان بکەن، دەتوانن بە دەم وەڵام دانەوەی جنسەکەی ترەوە بێن، زۆر تەمبەڵ نین، یان چالاکی یان بە پلەی زیاد لە پێویست نی یە. ئەو پیاوەی لە ئارەزوە جنسی یەکانی خێزانەکەی تێ دەگات، ئەو پیاوەی کە ماوەیەکی درێژ دەدات بۆ گەیشتن بە خۆشی وەرگرتن، ئەو پیاوە لە ژیانی هاوسەرێتی سەرکەوتوە.

بەڵام بە ئارەزوی خودی خۆ جۆرەها خواردن بخوری، کاریگەری یەکی

گەورەی لە باش کردنی حاڵەتی تەندروستی و جەستەیی ئەو کەسە هەیە، جا زیانی زۆر، لە زۆر قەڵەوی و زۆر لاوازیدا دەبینرێت.

**٣٢/ پرسیار: چۆن پیاو (مێرد) دەتوانێ تا کۆتا تەمەنی توانا جنسی یەکەی بمێنێتەوەو پارێزگاری بکات؟**

وەڵام: بۆ ئەوەی مرۆڤ تا کۆتا تەمەنی، پارێزگاری بە هێزە جنسی یەکەیەوە بکات و جنسەکەی بگەڕێتەوە تێکڕای ئاسایی یەکەی، ئامۆژگاری دەکەین بە دەست گرتن و میانەڕەوی کردن لە جوتبوندا، کە لە هەفتەیەکدا، دو جار، یان سێ جار ئەنجام بدرێ و، لە ڕۆژێك دا لە یەك جار زیاتر نەبێت، ئەمەش دوای ئەوەیە، کە پیاو لە ڕوی نەفسی و مەعنەوی جنسی، خێزانەکەی ئامادە دەکات بە دەستبازی و گەمەو یاری کردن، تاکو بگاتە لوتکەی چێژی جنسی، جا بەمە پیاو بە باشترین شێوە بە ئەرکە جنسی یەکەی خۆی هەستاوە، کە دەبێ ئەمە لە مانگی هەنگوین پیادە بکرێ، دوای ئەمە لە هەفتەیەکدا دو جار ئەنجام بدرێ، ئینجا یەك جار لە هەفتەیەکدا گەر کرا، بەتایبەتی دوای تەمەنی چل یان پەنجا ساڵی.

**٣٣/ پرسیار: ئایا ڕاستە ئامێری قەبارە گەورەی پیاو ئافرەت تێر تر دەکات؟**

وەڵام: لە چیرۆکە جنسی یەکان، کە بە نهێنی دەفرۆشرێ، لەو چیرۆکە دەگمەنانەی، کە کۆمەڵێك خەڵکی سادە باوەڕی پێدەکەن... گوایە ئافرەت حەز بە پیاوی ئامێر گەورە دەکات، چونکە مسۆگەری گەیشتنە ئەوپەڕی چێژ وەرگرتنە لە کاتی جوتبوندا... ئەو ڕاستی یەی کە پشکنینی زانستی دۆزی یەوەو ئاشکرای کرد ئەوەیە، قەبارەی ئەندامی

زاوزێ‌و دەوروبەرەکەی... بەبێ بەکارهێنانی ئامێری نێرینە، بـە دەسـت بازی‌و یاری کردن دەگاتە خۆشی.. زۆر لـەو چـیرۆکانە بـە درێـژی باسـی درێژی‌و توندی ئامێری نێرینە دەکات، لە ڕاستیدا هیچ وجودی نی یە.

به زۆری درێژی ئامێری نێرینە لـە نێـوان ١٣-١٨ سـەنتیمەتر دایـە، بەلام ئەو حالەتانـەی، کـە زیـاترن، یـان کـەمترن، ئـەوەیان شـازەو زۆر دەگمەنە. بە هەمان شێوەش لـە گولێنـك (مهبـل)ی مێیینـەدا. بـەلام دەلێن گولێنك جگە لە کونی دەرەوەی، هیچ شوێنێکی تری بەشداری لـە کردەی چێژ وەرگرتن ناکات، لەبەر ئەوە لەوکاتەدا درێژی ئامێری نێرینـە هیچ نرخێکی نی یە، بۆیە پێویست بە دڵـەڕاوکێ‌و نـاکۆکی‌و ترسـان لـە بچوکی یەکەی ناکات!

## ٣٤/ پرسـیار: ئایـا هـۆی تـری سـاردی جنـسی (البـرود الجنـسي) هـەیـە ؟

وەلام: لە هۆیە گرنگەکانی ساردی جنسی، توندو تیژی‌و هەڵەشەیی پیاوە، کە زۆر جار دەبێتە مایەی سـاردی جنـسی ئافرەتەکـە، چـونکە ئـافرت پێویستی بە ماوەیەکی درێژخایەن هەیە بۆ وروژاندن، تـاکو بـە تـەواوی جنسی ئامادە دەبێ.

جا گەر پیاو ئەم ڕاستی یەی نـەزانی، یـان بـە هـۆی پەلەکردنەکـەی‌و گەیشتن بە چێژو خۆشی، خۆی لـێ گێل کرد، ئەو کاتە ئاکامەکەی ئـەوە دەبێ، کە ئافرەتەکە هەرگیز ئامادە نەبێ بـۆ جوتبـون، بەڵکـە لەمـەش زیاتر لەو جوتبونە دەترسێ، بۆیە جنسی وەك سەهۆڵ سارد دەبێ.

**٣٥/ پرسیار: ئایا هۆی تری ساردی جنسی هەیە؟**

وەڵام: لەو هۆیە گرنگانەی لەم ڕۆژانەدا بڵاووباوە بۆ ساردی جنسی، ترسان لە سك پڕی یە. چونكە ئازاری سك پڕیو لە دایك بون زۆر توندە، بە پلەیەك شوێنەوارێكی كاریگەر لە دەرونی ژن دروست دەكات، جا ئاكامەكەی وازهێنانی دەبێ لە هەمو شتێك، كە پەیوەندی بە پەیوەندی یە جنسی یەكانەوە هەبێت.

**٣٦/ پرسیار: پیاوێك دەناسم خێزانەكەی لە چێژ وەرگرتنەكەی، بەشداری لەگەڵ ناكات هۆیەكەی چی یە ؟**

وەڵام: ڕەنگە ژنەكە بە هۆی فەرامۆشكردنی مێردەكەی بۆ ئەوو، خراپی هەڵس و كەوت و مامەڵە لەگەڵیدا دەرونی ئاسودە نەبێت، جا لەم حاڵەتەدا بەشداری لەگەڵ ناكات. پێویستە لەسەر پیاوەكە هەڵس وكەوتی باش بكات و خێزانەكەی بەختەوەرو ئاسودە بكات، چونكە دڵشادیو دڵخۆشی دەستەبەر دەكات، كێشەی جنسیش میكانیكی نی یە، وەك زۆر جار لەلای پیاو ئاواهی یە! سۆزو عاتیفە یەكەم جارە، دواتریش جنس!...

**٣٧/ پرسیار: ئەگەر ژن مێردەكەی خۆشدەویست، مێردەكەشی چەند سیفەتێكی تێدا بێ لەگەڵ میزاج و ئامانجی ئەو لە ژیاندا یەك نەگرێتەوە، ئەم ئافرەتە چ بكات ؟**

وەڵام: لێرەدا كارامەیی ئەو ژنە لە چارەسەركردنی هەڵوێست و ئارامگرتنی لەسەر ئەو چارەسەرە بەدەردەكەوێ، لەمەدا هەر دەبێ سەركەوتن بەدەست بێنێ، بە تایبەتی گەر متمانەو خۆشەویستی مێردەكەی بە دەست هێنابو، چونكە خۆشەویستی، خۆشەویستی لێ پەیدا دەبێت، كە

باشترين ريگاى چاكسازى يە.

ئافرەت بە خەندە جوانەكەى دەتوانى كار لە دەرونى مرۆڤ بكات، ئەم خەندەيە شتى زۆر دەكات و، زۆر شت دەستە بەر دەكات.

بەختياريى ژن و ميرد تەنها بە دەستى پياو نييە، بەلكە بە دەستى پياو و ژنە. چەندەها ئافرەت دەناسم توانيويانە بە خۆشەويستى و دانايى و حيكمەتەوە، چاكسازى ميردەكانيان بكەن.

**٣٨/ پرسيار: ئايا راستە كەشكەك (الهريسة) جنس بەهيز دەكات، وەك لەو فەرمودەيە هاتوە: ((شكوت الى أخي جبريل ضعفي في الجماع، فوصف لي الهريسة، فإن فيها قوة أربعين رجلاً))؟ واتە: پيغەمبەر ﷺ فەرمويەتى: بە جوبرائيلى برام گوت كە لە جوتبونندا كزو بىهيزم، ئەويش پىى گوتم كەشكەك بخۆ، چونكە هيزى چل پياوى تيدايە.**

وەلام: ئەم فەرمودەيە بە درۆ بە زمانى پيغەمبەرﷺ گوتراوە، ئەم بە ناو حەديسە، كابرايەكى كەشكەك فرۆش هەلى بەستوە بۆ رەواجدان بە هەريسەكەى.

هەروەها ئەوەى ئەم حەديسە پوچەل دەكاتەوە ئەوەيە، پيغەمبەر ﷺ هيزيكى جنسى هەبو، نمونەى نەبوە، لە صحيحدا هاتوە: زۆر جار لە يەك شەودا دەچوە لاى هەمو خيزانەكانى!

**٣٩/ پرسيار: ئايا ئاوى پياو سودى بۆ ئافرەت هەيە؟**

وەلام: دكتۆر محمد زكى الشافعى لە كتيبەكەى (الأزمات الزوجية و علاجها) وەلامى ئەم پرسيارەى داوەتەوەو گوتويەتى: ((با پياو بزانى

جەستەی ئافرەت ڕژێنەکانی ئەو دەمژێ‌و سودی لێ وەردەگرێ، وای لێ دەکات هەست بە بەختیاری‌و خۆشی بکات‌و، چالاکی زیاد بکات، لەبەر ئەوە پێویستە ئافرەت زۆر حەلەقەی منداڵ نەبون بەکار نەهێنێ)).

**٤٠/ پرسیار: ئایا بەکارهێنانی پەردەی بەرگری بۆ منداڵ نەبون زیانی هەیە؟**

وەڵام: هەندێ ژن‌و مێرد ئەو پەردەیە بەکاردەهێنن بۆ منداڵ نەبون، کە ناهێڵێ لە کاتی جوتبوندا گیانداری تۆواوی (حیوانات منویة) بگاتە ملی منداڵ دان، ئەم ڕێگایە زیانی هەیە، ئەگەر لە پەردە بەرگری یەکەدا کونی بچوك هەبێت، کە بە چاو نابینرێت، ئەوا سك پڕی ڕو دەدات، هەروەها ئەو پەردەیە هەستیاری پێستی سەری ئامێری پیاو کەم دەکاتەوە، کە دەبێتە هۆی کەمێك دوا کەوتن لە فیچقەکردنی تۆو، ئەویش دەبێتە مایەی حاڵەتێکی تێر نەبونی تەواوی جنسی پیاوەکە، هەروەها ژنەکەش، ئەوەش لە زۆر حاڵەت دا کەمێ لە دڵەڕاوکێ‌و شلەژانی دەرونی لێ دروست دەبێت.

**٤١/ پرسیار: ئایا لە کاتی جوتبوندا مەنی هاتنەوە لە دەرەوەی گوڵێنك (مهبل)دا، زیانی هەیە ؟**

وەڵام: ڕێگایەکی تری منداڵ نەبون هەیە، ئەویش مەنی هاتنەوەیە لە دەرەوەی گوڵێنك، کە چەندەها زیانی بۆ ژن‌و مێرد هەیە، ئەویش ئەوەیە: بە هۆی ئەمەوە پیاو تێربونی جنسی یەکەی کامڵ نابێ، گەر هەڵەی کردو نەیتوانی مەنی یەکە بێنێتە دەرەوە، یا لەسەر شێوەی دڵۆپی کەم بێت، دەبێتە هۆی منداڵ بون. هەروەها ئەم ڕێگەیە دەبێتە مایەی

تێزانی کۆئەندامی زاوزێی پیاوو نیشانەی دڵەڕاوکێو شڵەژانی دەرونی لێ دەکەوێتەوە، وێڕای تێر نەبونی ئارەزوی ژنەکە، ئەمەش دەبێتە مایەی تێزانی کۆئەندامی زاوزێی مێینەو ئازاری پشتو ئارەزوی جوت نەبونو شڵەژانی دەرونی، کە جیاوازیو ناکۆکی‌یەکانی بەردەوامی ژنو مێرد دەروژێنێو ژیانیان جێگیر ناکات.

**٤٢/ پرسیار: جیاوازی نێوان دەست بازی (مداعبة)و لاواندنەوە (مغازلة) چی‌یە؟**

وەڵام: جیاوازی‌یەکی زۆر هەیە، نابێ پیاو تەنها دەستبازی بکاتو واز لە موغازەلە کردن بێنێ! دەربڕینی ئەم موغازەلەیەش بە پیاهەڵدانو ئیعجاب بون بە جوانی خێزانەکەیو ڕوخۆشیو ڕازاوەیی یەکەی دێتە دی.

ئەم دەربڕینەش سودی بۆ ئافرەت هەیە، تەنانەت دوای کۆتایی هاتنیش نابێ بخەوێ. کەواتە نەکەن بێدەنگ بن، گەر دانایان گوتویانە: (الصمت حكم و قليل فاعله)، ئەمە بۆ سەرەتاو کاتی جوتبون نی‌یە.

باڵندەش بۆ ئێمە جێی وانە یان چەند وانەن، کە بەر لە جوتبون لە دەورەی باڵندەکەی دەسوڕێتەوەو گۆرانی زۆری بۆ دەڵێ.

**٤٣/ پرسیار: ئایا دەگرێ نمونەیەك لە لاواندنەوەی نێوان ژنو مێردمان بۆ باس بکەی، چونکە زۆر لە پیاوان عاتیفەیان وشکە... ؟**

وەڵام: باسکردنی ئەمە زەحمەتە، دەربڕینو پیاهەڵدانو لاواندنەوە نهێنی‌یە، هەر کەسەو جۆرە شێوازو لێهاتوییەکی خۆی هەیە بە گوێرەی خێزانەکەی.

بەم بۆنەیەوە دەڵێم باش وایە ئەو پیاهەڵدانو دەربڕینە لە نێوان ژنو

مێرد دا ببێت، نەك تەنها لە لای یەکێکیان، ئامۆژگاری ژن دەکەم لێهاتو بێتو وا لە مێردەکەی بگەیەنێت کە بەهێزە... پاڵەوانە... کەواتە ئاگاداربە ئاگادار! نەکەی گەر بە گاڵتەش بێ پێی بڵێی بێهێزو کەنەفتو دەستەوەستان، چونکە لە ڕێی ئاگا لێ نەبونو عەقڵی ناودوە بە خێرایی، بەمە کاری تێ دەکرێ، بە تایبەتی گەر ویستی بێهێز بێتو بە خێرایی کارتێکردنی دەرەکی کاری تێ بکات، ئەمەش زۆرجار لە شەوانی یەکەمی زاوایەتی ڕو دەدات، زۆربەی ئەوانەی لەمبارەوە هەرەس دێننو سەرناکەون، لە ئاکامی ئەو قسەیەی هاوڕێیانی مێرد یان کەس‌وکاری یەوە ڕو دەدات، کە بۆ خۆی وا هەست دەکات.

هەروەها بەم بۆنەیەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەم، زۆربەی ڕوداوەکانی کەنەفتی جنسی (العجز الجنسي) هۆیەکەی دەرونی یە، کەواتە وریا بن! وریا.

جا ئەی پیاو (مێرد)! خوای گەورە هێزی پێ بەخشیوی، تۆش متمانەکی زۆرت بە خۆ هەبێت، داوای بەردەوام بون لەسەر لەش ساغیو هێزو توانا لەخوا بکە..

**٤٤/ پرسیار: پێشەکی یەکانی لابردنی پەردەی کچێنی چی‌یە؟**

وەڵام: بەر لە لابردنی پەردەی کچێنی، دەربڕینو پیاهەڵدانو قسەی خۆشو دەستبازیو یاریکردنی درێژخایەن شتێکی پێویستەو هەر دەبێ ببێ، لەبەر ئەوەی گلاندەکان (الغدد) لە ئاکامی ئەمەدا شلەیەك دەڕژێننو شوێنە هەستیارەکان ڕەپ دەبنو دەوروژێن، ئەوکاتەش ئامێری نێرینە بە ئاسانی دەچێتە گوڵێنك (مهبل)، دوای ئەوەی کە تەڕ دەبێو نەرم دەبێتەوە.

**٤٥/ پرسیار: شێوازەکانی لابردنی پەردەی کچێنی چین ؟**

وەڵام: چەند شێوازێك هەیە کە ئەمانەن:

یەکەم: ئافرەتەکە لەسەر پشت پاڵ کەوێ‌و هەردو ڕانی بکاتەوەو کۆی بکاتەوە بەلای شانی‌دا لاری بکاتەوە، جا بەمە هەردو شەفرە بچوکەکە دەکرێنەوەو بە ئاسانی چوك دەچێتە ژورەوە. ئەم شێوازە شێوازی نوێیە.

دوەم: پیاو لەسەر پشت پاڵ بکەوێ‌و، ئافرەتەکەش بێتە سەر چوکی پیاوەکە، بە هێواشی‌و هێمنی، تا دەگاتە ئەو حەرەکاتەی، کە ڕێی پێ‌دەدرێ، جا چوك زۆر بە وردی‌و هێمنی دەچێتە ناوەوە.

ئەم شێوازە یەکەمجار مرۆڤ بەکاریان دەهێنا، وەك لە نوسین‌و وێنەکانی کۆن دەرکەوتوە. ئەم جۆرە سودی بۆ هەندێ پیاوی ماندو هەیە.[1]..[2]

**٤٦/ پرسیار: هۆی دورکەوتنەوەی هەندێ پیاو لە خێزانەکانیان‌و نزیك نەبونەوە لێیان چی یە؟ هەرچەندە خێزانەکانیشیان جوانن ؟**

وەڵام: ڕەنگە هۆیەکەی لەمەدا (قێز) بێ، کە بە زۆری لە ئاکامی پیسی‌و بۆن ناخۆشی‌یەوە دروست دەبێت، هەندێ ئافرەت عەیبێك لە کۆئەندامی زاوزێی هەیە، پێویستە لەسەر ژن نەهێڵێ مێردەکەی هەمو بەشەکانی کۆئەندامی زاوزێی ببینێ، چونکە هەندێ پیاو تەنها بە تەماشاکردنی

---

١) (لە کتێبی حیاتنا الجنسیة بە دەستکاریەوە وەرگیراوە).

٢) ئەم زانیاری یە گرنگانە کوڕی مسوڵمان‌و کچی مسوڵمان لە کوێ دەستیان دەکەوێ، گەر دایك‌و باوکیان نەوێرن باسی ئەم بابەتەیان بۆ بکەن، کە دەبێتە هۆی سەرنەکەوتن‌و هەرەس، یان سڵ کردنەوە یان دەست درێژی کردنە سەر خەڵکی.... جا ئایا لەسەر ئەم ڕاشکاوی یەمان گازاندە دەکرێین؟!

قێزی دەبێتەوە، بەتایبەتی گەر گرنگی بە پاك‌و خاوێنی نەدات، یان بۆنێکی ناخۆشی لێ بێت.. یەکێك بینی وا مەرێك گۆشتەکەی دادەماڵن، جا بە بینینی ئەمە بە درێژایی تەمەنی گۆشتی لەبەرچاو کەوت!!

هەندێ ئافرەت لە کاتی جوتبوندا ئاوێکی سپی لێ دێتە دەرەوە، جا پێویستە لەسەریان هەردەم پاکی بکەنەوەو بیسڕنەوە، گەر زۆر بەردەوام بو پێویستە لەسەریان بچنە لای پزیشکی پسپۆڕ، بۆ ئەوەی تەندروستی‌و مێردەکەی لە دەست نەدات.

ئەوەی لەسەر ئافرەت پێویستە - هەروەها لەسەر پیاویش- پارێزگاری سینگ‌و بەرۆکی بکات‌و قژی شانە بکات، خاوێنی رابگرێ‌و بە بەردەوامی بۆنی جیاجیا بەکاربهێنێ، بەتایبەتی لە کاتەکانی جوتبوندا، هیچ کامێکیان شوێنێکی جەستەیان بۆ یەکتری دەرنەخەن، کە حەزی پێ نەکەن!

لەسەر ژن پێویستە -هەروەها پیاویش- لە سروشت شت فێر ببێ، ئێمە دەبینین، کە باڵندە لە کاتی ئارەزو هەستانیدا خۆی بە پەڕی جوان دەڕازێنێتەوە، هەروەها ماسی‌و گیاندارەکان لە وەرزی بەهاردا، کە کاتی بەرهەم هێنانی یەتی، پەڕەکانی بە پەڕی نوێ دەگۆڕێ، تەنانەت ڕوەکیش لە وەرزی موتربەکردندا دەگەشێتەوە، لە بەهاردا دەگوترێ سروشت لە بوکێنی دایە!

نابێ ئافرەت بە زانستەکەی لەخۆبایی ببێ -بە تایبەتی زانستی وشکی قوتابخانەو دور لە ژیان-، هیچ شتێك جێی ڕازاوەیی‌و جوان کردن ناگرێتەوە، بە مەرجێ لە سنوری خۆی دەرنەچێ‌و، زۆر تەکلیف نەکات‌و، دور بێ لە جل‌و بەرگی بێگانە.

پێویستە جوانی ئافرەت، مندال‌و کەل‌و پەلی ماڵەوەش بگرێتەوە،

پێویستە ماڵ وەك بوك بێت لە جوانیو رێكو پێكی دا، لەگەڵ ئەوەش حەزەر بكرێ لە زیادەڕۆیی، كە هەڕەشەی مایەپوچیو نەگبەتی لە خێزان دەكات.

جا هێنانەوەی چەپكەگوڵو هەندێ لە دیمەنی سروشتی، وەك دەریاو تاڤگەو دارستانو بێستانو غەیری ئەمانە بۆ ماڵ، سیحریو جوانی بەسەر خانودا دێنێ، دەبێتە بەهەشتی پیاو، كە تەندروستیو بەختەوەریو لەسەرخۆیی لە هەمو ئەندامانی خێزان ڕەنگ دەداتەوە. لە سودەكانی ئەمە ئەوەیە، كە پیاو ماڵەكەی خۆی خۆشدەوێت، ڕاناكات بۆ چایخانەكان (یانەكانی شەیتان)، وەك لە وتارێكدا چەند ساڵێك پێش ئێستا بلاوم كردبۆوە.

ئەوەی لەمەڕ ژن گوتم، بە پیاویشی دەڵێم، فەرامۆش كردنی جەستەو لەشی، هەروا خۆ جوان نەكردنی دەبێتە مایەی قێزبونەوەی خێزانەكەی، صەحابی بەڕێز عبداللەی كوڕی عەبباس گوتویەتی: (حەز دەكەم خۆم بۆ خێزانەكەم جوان بكەم، وەك چۆن حەزم لێیە خۆی بۆم جوان بكات).

جا كۆتایی ئەم باسە گرنگە بە چەند فەرمودەیەكی (صحیح)ی پێغەمبەر ﷺ دێنین:

جابر دەڵێ: ((**أتانا رسول الله ﷺ زائراً، فرأى رجلاً شعثاً، قد تغرق شعره، فقال: أو ما كان يجد هذا ما يغسل به ثوبه؟!**))، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە میوانی هاتە لامان، پیاوێكی بینی چڵكنو قژ ئاڵۆزو درێژو ناشیرین بو، فەرموی: ئەوە كەسێك نیە جلی بۆ بشوات؟!

(ابو الاحوص) لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە،كە گوتویەتی: ((**أتيت رسول الله ﷺ وعليّ ثياب دون، فقال: ألك مال؟ قلت: نعم، من كل المال،**

قد أعطاني الله من الأبل والبقر والغنم.. قال: فإذا أتاك الله مالاً، فلير أثر نعمة الله عليك وكرامته))، واتە: چومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و جلێکی شڕم لەبەردابو، فەرموی: ماڵو سامانت هەیە؟ گوتم: بەڵێ، هەمو ماڵێکم هەیە، خوا حوشترو مانگاو مەڕو ماڵاتی پێداوم..

فەرموی: خوای گەورە کە ماڵی پێداوی، با شوێنەواری نیعمەتو ڕێزی خوا بەسەرتەوە ببینرێ.

ئەبوهورەیرە گوتویەتی: قال رسول الله ﷺ: ((الفطرة خمس: الختان والأستحداء، (حلق العانة) وقص الشارب، وتقليم الأظافر ونتف الأبط)).

(أم هانيء) گوتویەتی: ((قدم رسول الله ﷺ علينا بمكة قدمة. وله أربع ضفائر (الضفيدة).))، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە هاتە لامان، چوار کەزی هەبو.

(عطاء کوڕی یسار) گوتویەتی: ((كان رسول الله ﷺ في المسجد، فدخل رجل ثائر الرأس واللحية، فأشار إليه رسول الله ﷺ بيده، كأنه يأمره بإصلاح شعره ولحيته، ففعل، ثم رجع فقال رسول الله ﷺ: أليس هذا خيراً من أن ياتي أحدكم وهو ثائر الرأس كأنه شيطان!))، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت بو، پیاوێك هات، قژو ریشی ئاڵۆزاویو نارێك بو، پێغەمبەریش بە دەستی خۆی ئاماژەی ئەوەی کرد، کە قژو ریشی چاك بکات، ئەویش قژو ریشی ڕێك وپێك کرد، جا کە گەڕایەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەدی ئەوها باشتر نیە لەوەی یەکێك لەئێوە قژی ئاڵۆزاوی بێ وەك بڵێی شەیتانە!

(ابن المسيب) گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بو دەیفەرمو: ((إن الله طيب يحب الطيب، نظيف يحب النظافة، كريم يحب الكرم، جواد يحب الجود، فنظفوا أفنيتكم، ولا تشبهوا باليهود)) وفي رواية: ((ان الله جميل يحب الجمال))، واتە: خوا پاکەو پاکی خۆش دەوێ، خاوەن ڕێزەو ڕێزی خۆش دەوێ، سەخیەو سەخی خۆش دەوێ، کەواتە پێش دەمی خۆتان پاك بکەنەوەو، خۆتان بە جولەکە مەچوێنن ..

—لە گێڕانەوەیەکی تردا-: خوا جوانەو جوانی خۆشدەوێ.

**٤٧/ پرسیار: بۆچی پیاو دوچاری کەنەفتی جنسی (العجز الجنسي) یان ئامێر نەرمی دەبێ ؟**

وەڵام: کەنەفتی جنسی، یان نەرمی ئامێر لە لای پیاو، لە ئاکامی هۆکاری ئەندامی یان نەخۆشی یەکەوە دروست دەبێت، کە کار دەکاتە سەر میکانیکیەکەی ڕەپ بون، وەك هۆکاری دەرونی، کە ترسان لە سەرنەکەوتن و هەرەس (فشل)، یان کەم و کورتی ئارەزوی جنسی، یان نەبونی ئارەزوی جنسی دەگرێتەوە، یان ترسان لە ئاکامی مەترسی یەك، یان هەستکردن بە تاوان، یان شلەژانی لە خۆ ئامادەکردن لە ئامادەبون، وەك هەندێ کەس کە ئارەزوی جنسی یان لەلا دروست نابێت، مەگەر بە تەماشاکردنی چەند دیمەنێك نەبێت، کە کاری وەحشیەت گەری، یان ئازاردانی خەڵکی تری تێدا بێت، یان توندو تیژی، یان لێدانی لایەنێکی تر، لە حاڵەتەکانی سادیزم[1] و

---

١) سادیزم (سادية) بریتیە لە چێژ وەرگرتن لە ئەنجامی توندوتیژی و ئازاردانی خەڵك.

ماسۆشیزم[١]، کە ئەمەش بە نەخۆش دادەنرێت.

وا دەبێ ئامێر نەرمی لە یەکەم جوتبونەوە، یان یەکەم شەوی زاوایی دروست دەبێت، یان لە کاتی هەست کردن بە بچوکی ئامێریی یەوە، یان هەبونی هەر چ شێوانێك، یان نەخۆشی یەك لە کۆئەندامی زاوزێدا

وشەی (سادیة) دەگەڕێتەوە بۆ نوسەری فەرەنسی (المرکیز دی ساد)، کە لە نێوان سالآنی (١٧٤٠-١٨١٤) ژیاوە، دەڵێن خۆی دوچاری ئەم جۆرە نەخۆشیە دەرونیە بووە، کە ئافرەتی دەهێنا بەروتی لێی دەدا.

سادیزم زۆرجار بە جنسەوە پەیوەستە، دەتوانین بڵێین حاڵەتەکانی دەستدرێژی کردنە سەر ئافرەت، نمونەیەکی سادیەت بێت، چونکە بە زەبرو زۆر جنسەکە ئەنجام دەدرێ.

سادیەت دو جۆری هەیە:

١/ سادیەی ڕواڵەتی درۆ: ئەوەش ئەو پیاوانە دەگرێتەوە، کە وادەزانن بە بەدیارخستنی هێزی ماسولکەییان، ئافرەت زیاتر جنسی دەوروژێ.. جا سادیەتی ئەوانە، تەنها چەند جوڵەیەکی نمایش کردنە بۆ ئەوەی بزانرێ بەهێزن.

٢/ سادیەی ڕاستەقینە: ئەوە کاتێ بەدەردەکەوێ، کاتێ پیاو هێزو توندوتیژی بەرامبەر ئافرەت بەکاردێنێ، تا ئافرەتەکە ئازار بچێژێ، بەمەش چێژی لێ وەردەگرێ.. هەندێ پیاو هەیە لە شەوی زاوایی، کاتێ پەردەی کچێنی ئافرەتەکە ناهێڵێ و ئافرەتەکە توشی بەربونی خوێن دەبێ، چێژی لە ڕادەبەدەر وەردەگرێ و، وا هەست دەکات بە هەمو واتاکانی پیاوەتی، پیاوە.

١) ماسۆشیزم (ماسۆشیەت) دەگەڕێتەوە بۆ نوسەری نەمساوی (لیوبولد دەشیرو ماسۆشی) ١٨٣٦-١٨٩٠، گشت چیرۆکەکانی باس لە بابەتە جنسیە شازەکان دەکات، کەوا پاڵەوانی چیرۆکەکانی، کاتێ ئەو ئافرەتانەی دڵدارو ئەوینیانن لێیان دەدەن، ئەوان هەست بە چێژی زۆر دەکەن.. ئا لێرەدا ماسۆشیەکان ناگەنە چێژو خۆشی، هەتا کاری توندوتیژیو ئازاردانی، لەلایەن ئافرەتەوە بەکارنەهێنرێ. جا دەکرێ بڵێین: ماسۆشیەت، بریتیە لە چێژ وەرگرتن بە ئازاردانی دەرون، بابای ئازاردراو حەز بەوە دەکات زەبونو ملکەچو ژێردەستی کەسانی تر بێت.

(الإنحرافات الجنسية عن الرجل والمرأة- جمال مصطفى مردان) (وەرگێڕ)

دروست دەبێت، یان لە ئاکامی ترسان لە لادانی پەردەی کچێنی، یان قسەی هاوڕێو خزمان دروست دەبێت.

وا دەبێ ئامێر نەرمی بە هۆی ترسان لە شوێنەواری دەست پەڕ (العادة السرية)، یان ترسان لە ئازاردانی لایەنی تر، یان ترسان لە دروست بونی سك پڕی، یان هەست کردن بەوەی ئەو کەسە تاوانێك ئەنجام دەدات، یان ترسان لە دوچار بون بە نەخۆشیەکانی زاوزێ وەك سەیلانو زوهری، یان ترسان لە نەمانی شلەی تۆواوی، دروست دەبێت.

وا دەبێ نەرمی ئامێر لەوەوە دروست ببێت، گەر مرۆڤ ماوەیەکی درێژ لە جوتبون دورکەوێتەوە، لە ژینگەیەکی دور لە ژیانی جنسیو کارتێکردنەکانی یەوە بێت، وەك سەفەری درێژخایەن. یان وادەبێ نەرمی ئامێر، هۆیەکەی درێژەدان بە ماوەی دەست گیرانی یەوە بێت، چونکە ئەمە دەبێتە مایەی تێزان (الأحتقان)ی گلاندی پرۆستاتو پێکهاتەکانی تۆواویو زۆر ئیحتیلام بون، لەگەڵ ئازاری جوتە هێلکەی گون.

وا دەبێ نەرمی ئامێر لە زۆر بەردەوامی دەست پەڕ، یان جوتبونی ناسروشتی یەوە دەبێت.

وا دەبێ ئامێر نەرمی هۆیەکەی ژنە، ئەمەش بە هۆی هەڵسوکەوتیو چۆنیەتی ڕەفتاری لەگەڵ مێردەکەی دەبێت، چونکە هەندێك پیاو زۆر هەستیارن.

وا دەبێ ئامێر نەرمی بەهۆی بەهێزی کەسایەتی ژنەوە دەبێت، ئەمەش لە کاتی سەردانی هەندێ نەخۆش بەدی دەکرێت، کە خێزانەکانیان دەبەنە لای پزیشك.

وا دەبێ ئامێر نەرمی هۆیەکەی جنس ساردی هەندێك ئافرەتو،

گرژبونی گولێنك (مهبل)و، ڕێ نەدان بە کردنەوەو خاوبونەوەی گولێنکە، لە کاتی چونە ناوەوەی ئامێری نێرینەدا.

هەندێ جار هۆیەکانی ئامێر نەرمی، یان ڕەپ نەبون پێکهاتەیی یە، وەك پێکنەهاتنی ئەندامی زاوزێ، یان لە پێکهاتەکەیدا شێواوی تێدایە، یان دوچاری نەخۆشی ئەندامی دەبێت وەك ئاوسان، یان فەوتانێك کە دەبێتە چەمینەوەی بەلای ڕاست، یان چەپ، یان خوارەوەدا، ئەوەش بە زۆری لە کاتی دوچار بون بە نەخۆشی شەکرەوە دروست دەبێت.

وا دەبێ ئامێر نەرمی لە ئاکامی کەم‌و کورتی ئەرکی، یان ئەندامی جوتە هێلکەکانی گون بێت، کەم‌و کورتی لە هۆرمۆناتی نێرینەوە پەیدا دەبێت، کە بە بناغەی کردەی ڕەپ بون‌و پێکهاتنی ئەندامی زاوزێ‌و کۆئەندامی زاوزێی ناسەرەکی(ثانوي) وەك پرۆستات‌و پێکهاتەکانی تۆواوی، هەروەها بە هۆی ئەو کەم‌و کورتی یەی، کە لە لای بەتەمەنەکان هەیە، ئامێر دوچاری تێزان دەبێ.

وا دەبێ ئامێر نەرمی لە ئاکامی چەند نەخۆشیەکی دەماری، لە ناو نێوەندی ڕەپ بون لە مۆخ، یان مەغزی دڕکی، یان پەتەدەماری یەکان دروست دەبێ، کە کاردەکاتە سەر ڕەپ بون، وەك لە نەخۆشی یەکانی شەکرە ڕو دەدات، هەر چ نەخۆشی یەکی بڕبڕەی پشت هەبێ، چ پێکهاتەیی بێ، یان نەخۆشی بێ، کار دەکاتە سەر ڕەپ بون.

**٤٨/ پرسیار: گرنگترین هۆیەکانی ئامێر نەرمی چی یە؟**

وەڵام: باری تەندروستی گشتی، کار دەکاتە سەر ڕەپ بون، وەك کەمی خۆراك‌و ڤیتامین، هەروا نەخۆشی شەکرەو باڵەپەستۆی خوێن‌و ئەنفلەوەنزاو مەلاریاو نەخۆشی یە کەڤنارەکان (المزمنة) وەك: نەخۆشی

دڵو گورچیلەو جەرگ، کە دەبێتە هۆی کزی ئارەزوی جنسی، هەروەها دەبێتە هۆی ئامێر نەرمی، هەر چ نەخۆشیو شلەژانێك لە گلاندەکانی وەك: گلاندی نێرینە لە گون داو، گلاندی نخامیو گلاندی سەروی هەردو گورچیلەو، گلاندی دەردقی، هەروەها قەڵەوی، ئارەزوی جنسی کەم دەکاتەوە.

هەروەها وا بەدی دەکرێ جگەرە کێشان لە لای هەندێ نەخۆش دەبێتە مایەی ئامێر نەرمی، هەروەها مادە هۆشکەرەوەکانو تریاكو حەشیشەکانیش، جا ئارەزوی جنسی کز دەبێت، نێوەندی دەمارەکانی بەرپرس لە ڕەپ بون سڕ دەبێ.

## ٤٩/ پرسیار: باشترین مێرد کێیە؟

وەڵام: لە گۆڤاری (الحرفيون) وتارێك لە ژێر سەردێری (أفضل الأزواج — باشترین مێرد)دا هاتوە کە پیاوی ئینگلیزی باشترین مێردە لە ئەوروپا، ئەمەو لێکۆڵینەوەیەك بەم دوایی یە ئەنجام دراو ئاشکرای کرد کە.. دەرکەوتوە مێردی ئینگلیزی بەشداری خێزانەکەی دەکات لە کاروباری ماڵەوەدا.. بۆ نمونە: لە ٨٥٪ی پیاو(مێرد)ی ئینگلیزی قاپ بۆ خێزانەکانیان دەشۆن.. کەچی ئەم ڕێژەیە لەنێو پیاوانی تری ئەوروپا تەنها ٥٣٪ یە.

ئای لەم ڕوانگە کورتەیە لە ناسینی باشترین مێردا!... لەگەڵ ئەمەشدا، پێغەمبەر ﷺ وێڕای مامەڵە باشی بۆ خێزانەکانی، وەك بە درێژی باسمان کرد، سەرەڕای کارە سیاسیو سەربازی یەکانیو کاری تری، هەرگیز یارمەتی دانی خێزانەکانی فەرامۆش نەکردوە.

لە خاتو عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێ- پرسیار کرا، سەبارەت بە

کاری پێغەمبەر کاتێك دەهاتە ماڵەوە، ئەویش لە وەڵام دا گوتی: ((يكون في مهنة أهله))[1]..، واتە: لە خزمەتی خێزانەکەی دەبێت.

هەروەها لە ڕیوایەتێکی تردا لە وەڵامی هەمان پرسیاری پێشو گوتی: ((كان بشراً من البشر: يحلب شاته، ويخدم نفسه))..[2]، واتە: مرۆڤێك بو وەك هەمو مرۆڤێکی تر (بە واتای کاری پێغەمبەر تەنها لە گەیاندنی پەیامی خوا کورت هەڵنەهاتبو)، بۆ خۆی مەڕەکەی دەدۆشیّ، خۆی خزمەتی خۆی دەکرد.

ئەم پێغەمبەرە گەورەیە ﷺ باسی باشترین پیاو دەکات و دەفەرموێ: ((خيركم خيركم لأهله!! وأنا خيركم لأهلي!)) [3]، واتە: باشترینتان ئەو کەسەیە، کە بۆ ئافرەتان باش کردەوەیە، منیش لە هەموانتان بۆ خێزانەکەم باشترم. هەروەها فەرمویەتی: ((خيركم خيركم للنساء!!))[4].

ئەم پێغەمبەرە گەورەیە ﷺ ڕێسایەکی گرنگی قاپ شوشتنی بەخشیوە بە پیاوان (مێرد)و غەیری ئەوان، ئەمەش بە نەهێشتنەوەی هیچ شتێکی خواردن لە ناو قاپەکەدا گەر کەم بێت: ((فكان يلعق الصفحة، بلسانه))[5]، واتە: پێغەمبەری خوا قاپەکەی بە زمانی دەلێسیەوە.

١) رواه البخاري .

٢) رواه أحمد وغيره بسند جيد.

٣) رواه الترمذي وغيره وسنده حسن .

٤) رواه الحاكم وسنده صحيح.

٥) رواه مسلم .

ئای لەم رێسا ئابوری یەی سیستمی خۆراکە! کە خواردەمەنی لە فڕێ دان رزگار دەکات. ئای لەم رێسا کردەییەی خێرا پاك کردنەوەی قاپو دەفر لە مادە رۆنی یەکانو هاو وێنەیان.!

زۆر کەس بە هۆی خۆ بەگەورە زانو نەزانیو زیادەڕۆیی کردنی، سەری لەم کردەوەی پێغەمبەر دەسوڕمێ.

بیرم دێ چەند سالێك لەمەو بەر چوم بۆ تورکیا، منو هەندێك لە بانگبەرانی ئیسلام بانگ کراین بۆ وەلیمەی خێزانێکی تورکی، منیش قاپەکەم بە نان سڕی یەوە بۆ سودو فێربون، جا ئەو بانگبەرە بە سەرسوڕمانەوە قێزی لە کارەکەم بۆوە، ئەمە رێسایەکی ئابوریو سودێکی مالەوەیە.

بێگومان ئەم دو فەرمودەیە پێ ناچێ بە هەندێ خەلك نامۆ بێ، ئەگەر مێژوی جاهیلی یەتی پێش ئیسلامیان دیراسە بکردایەو رادەی بە ناشیرین روانینی ئافرەتو کارەکانی مالەوەیانی بزانیایە، کە بەگەورد زانو زەبر بەدەستەوە دەچونەوە مالەوەو دانیان بە هیچ مافێکی خێزانەکانیانو خۆشویستنو سۆزی مندالەکانیان نەدەهێنا.

ئەوەی جێی داخە، ئەوەی دل پەژارە دەکات ئەوەیە" لەو دو فەرمودەیەی سیرەی پێغەمبەر ﷺ، کە لە مالەوەی باس دەکات، ئێستاکەش نامۆیە یان ونە، نەك تەنها لە رۆژهەلاتی جیاجیادا، بەلکە لە رۆژئاواش دا، کە خەلکەکەی لافی رێزگرتنی ئافرەتو سۆزداریان بەسەردا لێ دەدەن، جا ئەم کردەوەی پێغەمبەر ﷺ بەلگەیەکە لە بەلگەکانی بەرزیو گەورەیی، بەلکە لوتکەی شارستانی یەتە.

کردەوەی پێغەمبەر ﷺ لە یارمەتی دانی خێزانەکەی، ئاماژەی چەند

شتێك و چاكە (فـضائل)ی زۆر دەكات، سەرەڕای ئـەوەی پێـشو، لەوانـە: بـەزەیی هاتنـەوەی بـە خێزانەكـەی و وانـە بەخـشینی كردەوەیـی بـۆ مسولْمانان! پێویستی یاریدەدانی خێزان بە پێی توانا، كە ئەو ئافرەتە بە درێژایی چەند سەعاتێك لە چێشتخانە ڕادەوەستێ، ماڵەوە پاك و خـاوێن رادەگـرێ، بـە كاروبـارە جیاجیاكـان هەڵدەسـتێ، لـە پێـشەوەیان پـەروەردەكردنی منـداڵ كـە ئـەركێكی پـیرۆزەو، هـەروەها شـەوخونی لەسەریان.

هەمو ئەمانە پەیوەندی نێـوان ژن و مێـرد بـەهێز دەكـات و سـۆزداری یەكەی زیاد دەكات، هـەروەها وانەیـەكی كاریگـەرو كردەوەیـی یـە بـۆ منداڵ، لە متمانەكردن لەسەر خۆ و پشتگیری كردنی خەڵكی دا.

**٥٠/ پرسـیار: ئێمـە كۆمـەڵە ئـافرەتێكین، تەمـەنمان لـە چـل سـاڵی تێپەڕی كردوە، یان وەك دەڵێن گەیشتوینەتە تەمەنی نائومێدی (سن اليأس) و عادەمان وەستاوە، هیوای سك پڕی و منداڵ بونمان نی یە، ئایا ئەمـە مانـای ئەوەیـە كـە ئێمـە گەیـشتوین بـە خـاڵی نەگەڕانـەوە؟.. كـە بتـوانین ژیـانی خـۆش لەگـەڵ مێردەكانمـان ببەینە سەر، وەك لە پێشان دەمان بردە سـەر، ئایـا ئـەم خۆشـی وەرگرتنە تەنها بە دروست بونی عادەو سك پڕی و منداڵ بونەوە بەندە؟ یان دەكرێ ئەمە دەستەبەر بكرێ؟!**

وەڵام: نازانین كێ ناوی لەو ماوە ژیانەی ئافرەت ناوە تەمـەنی نائومێـدی، ئەم ناونانە ناونانێكی ستەمانەیە، بەڵكە هەڵەیە، ئافرەت لـە دوای ئـەم تەمەنەش دەتوانێ ژیانێكی شاد بباتە سەرو سنوری بۆ نـی یـە.. بـەڵام بەمەرجێ گەر ئـەو هـەمو خـەیاڵات و بیرۆكـە نەخۆشـانە لـە مێـشكی

بهێنێتــە دەرەوەو، تارمــایی ملکــەچ بــون بــۆ نائومێــدی لــە ژیانیــدا دەربکات.

سەرەڕای هەمو ئەو گۆڕانکاری یانەی بەسەر ژیانیدا دێ، دەتوانێ خۆشی وەربگرێ بە گەیشتنی بە مێردەکەیەوە.. ئەو ئەم خۆشــی وەرگرتنــە بــە هیچ حاڵێك قەدەغە ناكات، هەرگیز نابێتە بەربەست لــە نێــوان خــۆیو مێردەکەی.. هیچ بەربەستێك لــە نێــوان هەردوکیانــدا نــی یــە لــە دورو نزیکەوەدا، ئافرەت بۆ خۆی ئەم بەربەســتە دروســت دەکــات، وا دەزانــێ ئەرکی تەنها بریتی یە لە سك پڕیو منداڵ بون!! پاشان هیچ رۆڵێکی نی یە. هەمو شتێك بە لایەوە کۆتایی هاتوە. جا حوکمی لەناوچــون لەســەر خۆی دەدات، چاودڕوانی چارەنوسی حەتمی دەکــات.. ئەمــە ڕوانینێکــی ڕەشبینانەیە بۆ ژیان، بەڵکە ئەوپەڕی ڕەشبینی یە، ئافرەت تا کۆتا ساتی ژیانی دەتوانێ خۆشی لە ژیانی خۆی وەربگرێ. دەتوانێ سەرنج ڕاکێشەر بێت، تاکو تەمەنی ژیانی ویستراو بێت، تەنها لەسەری پێویستە گرنگــی بە تەندروستیو شۆخوشەنگی (رشاقة)ی خۆی بــداتو پارێزگــاری دەرون ساغی یەکەی بکات.

گومان نەبات بــە گەیــشتنی بــەم تەمەنــە، ئــەگینا حــوکمی نــەبونی بەسەردا دراوەو دەبێو زەرورە نائومێد بێو ڕەشبین بێو بــە ڕوانینێکــی ڕەشەوە بڕوانێتە دنیــــا[١].

---

١) جارێك بەرناردشۆ لە خەسوەکەی پرسی -کە تەمەنی هەشتا ساڵ بو-: لــە چ تەمــەنێك ئافرەت خۆشەویستی بۆ پیاو لە دەست دەدات؟

ئەویش بە گوێیدا چرپاندیو گوتی: (کوڕەکەم جۆرج، ئەم پرسیارە لــە ئــافرەتێکی لــە من بەتەمەنتر بکە!).

**٥١/ پرسیار: مەرجەکانی جوتبون لەگەڵ ئافرەتی دووگیان (حامل) چین؟**

وەلاّم: پێویستە لە جوتبوندا مام ناوەندی بێت، واتە لەگەڵ ئافرەتی دووگیان، مێردەکەی بۆی هەیە لە هەفتەی یەك جار لەگەڵی جوت ببێ هەتا سەرەتای نۆیەمین مانگ، بەلاّم بە درێژایی نۆیەمین مانگی، نابێ لەگەڵی جوت ببێ، نەبادا جوتبون لە کۆتا مانگدا، منداڵەکە زوو لە دایك ببێ، لە ئەنجامی پاڵەپەستۆی چوك (ذکر) لەسەر ملی منداڵدان، پاشان شتێکی باش نیە لە کاتی بونی منداڵ مەنی هەبێ، بە تایبەتی گەر زوخاوی لەگەڵ بێ، ئەو کاتە دەبێتە هۆی هەوکردن (إلتهاب)ی چاوی منداڵەکە.

## لە کـۆتـایی دا

خوێنەری بەڕێزو عەودالّی راستی: ئەوەی باس کـرا لـە پەیوەنـدی ژنو مێردو نهێنی‌یـەکانیانو چـۆنییەتی هەڵس‌وکـەوتو ڕەفتـارکردنو بـەڕێز دانانی ژنو نەرمو نیانی لەگەڵی بە پێی قورئانو سوننەتو قسەی زانایان، هەر ئاوا شتێکی سـادە نـی‌یـە بیخوێنیتـەوەو بەسـەریدا تێپـەڕی بـەبێ پەیڕەوی‌و پیادەکردنی.

پەیڕەو کردنی ئەم ئایەتو فەرمودەو راستی‌یە زانستی‌یەکان دەربـارەی ژنو مێرد، دەوری ئەساسی دەبینێ لـە بەختـەوەری‌و کامـەرانی خێـزانو کۆمەڵ. کەواتە وریا بە ئەم تەوجیهاتانەی، کـە بـاس کـراون لـەم کتێبـە فەرامۆشیان نەکەی.

چونکە فەرامۆش کردنیان تـاڵ کردنـی پەیوەندی‌یـەکانی ژنو مێـردە. خوای بەخشندەو میهرەبان هەمو ژنو مێردێکی چاك لێك پـیرۆز بکـاتو خۆش بەختیان بکات لە دنیاو ئاخیرەت. پێشیان دەڵێم: (بـارك الله لـك و بارك عليك و جمع بينكما في خير).

(بارك الله لك وعلى خير طائر).

**وەرگێـر**

## وەرگێڕ لە چەند دێڕێکدا:

- لە ساڵی ١٩٦٥ لە شاری کۆیە لەدایك بوە.
- لە ساڵی ١٩٩٠ بۆتە ئەندامی کۆمەڵەی خۆشنووسانی عێراق - بەغداد.
- ئەندامی کۆمەڵەی خۆشنوسانی کوردستانە.
- ئەندامی سەندیکای هونەرمەندانی کوردستانە.
- ئەندامی سەندیکای رۆژنامەنوسانی کوردستانە.
- ئەندامی رۆژنامەنوسانی نێودەوڵەتی (**IFJ**) ە
- لە ساڵی١٩٨٠ بەشداری کردووە لە پیشانگای دواناوەندی کۆیەی کوڕان، کە لە شاری کۆیە لەگەڵ قوتابخانەکانی دی (چالاکی قوتابخانەکان ساز کرد).
- لە ساڵی ١٩٨١ بەشداری کردووە لە پیشانگای مەڵبەندی لاوانی کۆیە کە لە هۆڵی قوتابخانەی دواناوەندی کۆیەی کوڕان لە شاری کۆیە ساز کرا.
- لە ساڵی ١٩٨٢ بەشداری کردووە لە پیشانگای تایبەتی قوتابخانەی دواناوەندی کوڕان لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی لە شاری کۆیە ساز کرا.
- لە ساڵی ١٩٨٢ بەشداری کردووە لە پیشانگای مەڵبەندی لاوانی کۆیە کە لە شاری سلێمانی لەسەر ئاستی حوکمی زاتی سازکراو توانی پلەی یەکەم بەدەست بێنێ‌و خەڵات بکرێ.
- لە ساڵی ١٩٨٣ بەشداری کردووە لە پیشانگای مەڵبەندی لاوانی کۆیە کە لە شاری سلێمانی لەسەر ئاستی حوکمی زاتی سازکراو توانی پلەی دووەم بەدەست بێنێ‌و خەڵات بکرێ.
- لە مانگی (١٢)ی ساڵی ١٩٨٧ بەشداری کردووە لە پیشانگای رۆشنبیری‌و جەماوەر (الثقافة والجماهير) کە لە هۆڵی قوتابخانەی (أولى)ی سەرەتایی لە کۆیە سازکراو بە (١٠) تابلۆ بەشداری کرد.

- لــە (١٩٨٨/٢/٨) بــە (٢٠) بیــست تــابلۆ بەشــداری کــردووە لــە پیــشانگای هونەرمەندانی کۆیە کە تیپی باواجی کۆیە پێی هەڵسابوو لە قوتابخانەی (أولی)ی سەرەتایی کۆیە.
- لە (١٩٨٩/٨/٢٠) بە هاوکاری تیپی باواجی کۆیە پیشانگایەکی تایبەتی لە هۆڵی قوتابخانەی (ئاسۆس)ی سەرەتایی لە شاری کۆیە کردۆتەوە کە (٢٠) تابلۆی لەخۆ گرتبوو.
- لە ساڵی ١٩٩٣ بە (٥) تابلۆ بەشداری کردوە لە پیشانگای مەڵبەندی لاوانی کۆیە.
- (٢٠٠٠/١٠/١) بــە (٤) تــابلۆ بەشــداری لــە ڤیــستیڤاڵی دووەمــی هــەولێر بــۆ خۆشــنووسیو نەخشەسازی کردووەو بڕوانامەی رێزلێنانی پێدراوە.
- بە خەتی نەسخو دیوانیو تەعلیق بەشداری کــردووە پێــشبڕکێی دەولی پێنجــەمی خۆشنووسی کە لە شوباتی ٢٠٠١ لە ئەستانبول سازدرا.
- بەشداری کردووە لە پێشبڕکێی خۆشــنووسی خاچی ســووری نێونەتــەوەیی کــە لــە (٢٠٠١/١٠/١٤) سازکراو بڕوانامەی رێزلێنانی پێدراوە.
- بەشداری کردووە لە پێشبڕکێی کۆمەڵەی خۆشنووسانی کوردستان لەســەر ئاسـتی هەولێر کە لە کۆتایی ســاڵی ٢٠٠٢ ســازدرا، ئــەوەبوو لــە خــەتی نەســخ پلــەی یەکەمی بەدەست هێنا.
- لە رۆژنامەی هاوکاریو پاشکۆی عێراقو ئاسۆ، سەبارەت بە هونەری خۆشنووسی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا سازدراوە.
- بە خەتی نەسخو دیوانیو تەعلیق بەشداری کــردووە پێــشبڕکێی دەولی شەشــەمی هونەری خۆشنووسی کە لە شوباتی ٢٠٠٤ لە ئەستانبول سازکرا.
- لە ٢٠٠٤/٧/١٨ بەشــداری کــردووە لــە پیــشانگای خۆشنووســانی هــەولێر، کــە بەڕێوەبەرایــەتی رۆشــنبیری و هونــەری پارێزگــای هــەولێر بــۆ (٢٠) خۆشنوســی سازکردبوو، لەژێر ناونیشانی ((پیتە رەنگینەکان لە سایەی ئازادیدا)).
- لە مانگی ئاداری ٢٠٠٥ بەشداری کردووە لە پێشبڕکێی خۆشنووسانی کوردستان، کە لە هەولێر ساز درابوو، لە خەتی دیوانی پلەی دووەمی بەدەســت هێنــاو، لــە خەتی (نەسخ)یش پاداشت (مكافأة).

- لە (٢٠٠٦/٢/١٥) بەشداری کردووە لە پێشبڕکێی قەڵاومنارە بۆ خۆشنووسی کە لەسەر ئاستی کوردستان لە هەولێر سازدرابوو، لە خەتی دیوانی پلەی یەکەمی بەدەست هێناو خەڵاتی پێبەخشرا.
- لە ساڵی (٢٠٠٦) بەشداری کردووە لە پێشبڕکێی خۆشنووسی (عبدالحمید الکاتب) کە لە سوریا سازدرابوو. بڕوانامەی ڕێزلێنانی پێبەخشرا.
- لە (٢٠٠٧/٢/٢٦) بەشداری کردووە لە پێشانگای کۆڕبەندی هزری ئیسلامیی بۆ خۆشنووسی، کە لە هەولێر لە هۆڵی خانزاد ساز درابوو.
- لە (٢٠٠٧/٢/٢٨) بە خەتی دیوانی بەشداری کردووە لە پێشبڕکێی حەوتەمی جیهانی هونەری خۆشنووسی بە ناوی (هاشم محمد البغدادی) کە لە تورکیا ساز درابوو.
- لە (٢٠٠٧/٣/٣١) بەشداری کردوە لە پێشانگای فۆتۆکۆپی تابلۆی پێشبڕکێی خۆشنووسانی کوردی بەشدار بوو لە پێشبڕکێی حەوتەمی جیهانی – تورکیا بە ناوی خۆشنووس (هاشم محمد البغدادی) کە لە هەولێر لە بارەگای کۆمەڵەی خۆشنووسان ساز کرابوو.

## ئەم کتێب‌و نامیلکانەی لە زمانی عەرەبی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی:

١- ژن‌و مێردی ئیسلامی بەختەوەر (شەش جار چاپ کراوەتەوە).
٢- سوپاکەی پێغەمبەرﷺ.
٣- چەند وانەیەك لە پێغەمبەری سەرکردە لە شاراوەی نهێنیدا.
٤- چۆن بونیەو بناغەی ئیسلامیمان لە ڕوخان دەپارێزین.
٥- ٣٠ نیشانەی مونافیقان (دو جار چاپ کراوەتەوە).
٦- مەرجەکانی حیجابی ئافرەتی مسوڵمان لە قورئان‌و سوننەتدا (دو جار چاپ کراوەتەوە).
٧- باڵاپۆشی ئافرەتی مسوڵمان (دوجار چاپ کراوە).
٨- ئایا دەزانی جۆرەکانی شیرك چین؟
٩- ئایا دەزانی جۆرەکانی کوفر چین؟

١٠- ئایا دەبێ ولاء و براءمان بۆ کێ بێ؟
١١- منداڵی مسوڵمان چی دەڵێ؟ (پێنج جار چاپ کراوەتەوە).

## ئەو نامیلکانەی ئامادەی کردوە:

١- لە فیقهـ شارەزا بە بە پرسیارو وەڵام (دوجار چاپ کراوەتەوە).
٢- گوڵبژێرێك لە فەتوای هاوچەرخ سەبارەت بە ئافرەتان (سێجار چاپ کراوەتەوە).
٣- ١٠ ئادابی کۆمەڵایەتی لە قورئانو سوننەتدا.
٤- فرەژنی لە نێوان فیقهی ئیسلامو ویستی پیاودا.
٥- خێزانەکەت بە پارە مەزەندە ناکرێت.
٦- کچ لە نێوان واقیعی ئیسلامو دابو نەریتی جاهیلیدا.
٧- وێنەی سەر تابلۆو وێنەی فۆتۆغرافی لە ڕوانگەی ئیسلامدا.
٨- مافەکانی ژنو مێرد لە ئیسلامدا.(دوجار چاپ کراوە).

# پێڕست

